والمنكرون لوجود الجملة الأسمية فى اللغة الكردية انقسموا فى معالجة المشكلة الى قسمين : فمنهم من استعار من الوهم والعدم فعلا تخيل وجوده في الجملة حيث لا وجود حتى لشبح الفعل فقال انه في جملة « من كوردم ـ انا كردى » فان الصوت الذي هو كالكسرة المختلسة في نهاية كلمة « كورد » هي بقية فعل كان موجودا . وهذا القول ينكر جملة حقائق ترقى الى مرتبة البديهيات : منها ان هذه الكسرة المختلسة ، وأسميها أنا الحركة المحايدة ،[١] جاءت بها الضرورة لأمكان تلفظ حرف « الدال » التي تأتي بعدها الميم[٢] ساكنة فانك لا تستطيع لفظ الدال ساكنة والميم بعدها ساكنة . وهذه الضرورة ملحوظة حتى فى الكلمة الواحدة ، وليست فقط الكلمة التي بعدها ضمير أو اداة فلا يمكن مثلا لفظ حرف الكاف ساكنه في كلمة « شه‌كر ـ سكر » مع تسكين الراء بعدها . والحروف في الكردية متفاوته في قابليتها لتتابعها ساكنة ، وموضوعها غير مطروق حتى الآن وان كنت انا قد كونت فكرة مجملة عنها ودرست قرابة مخارج بعض منها وصلاح التقائها ساكنة ولا مجال هنا للخوض فيه .

ثم ان هذه الكسرة المختلسة تنعدم اذا كانت الكلمة منتهية بأحد حروف الحركة كقولك « من ئازام ـ أنا جرىء » فها هنا جاءت الالف حركة مطلقة لا كسرة مختلسة فيها ولا يحزنون وجاء بعدها ضمير المتكلم

---

(١) أسميها الحركة المحايدة لان النية لم تتجه فيها الى اي من الحركات المعلومة وغاية أمرها أنها نقل « Stress » يوقع على الحرف لامكان تلفظه حين يلتقى ساكنا مع ساكن اخر فاذا حرك هذا الحرف الاخير اختفى الثقل من الحرف الاول لانتفاء الحاجه اليه .

(٢) الميم هنا ضمير نشبط للمفرد المتكلم ويفيد الاسناد والخبرية في الجملة .

المفرد « م » ساكناً مطمئناً . وحتى في الكلمة التي هي مثل ال « كورد » في المثال السابق فانه لا وجود للكسرة المختلسة اذا جاء بعدها الضمير النشيط للمفرد المخاطب او جمع المتكلم لان الضمير فيهما يبدأ بحرف حركة هو « الياء » فتقول « تۆ كوردیت ـ انت كردي و ئێمه كوردین ـ نحن اكراد » فاين هو هذا الفعل وما أثر وجوده في الكلام ؟ لا شيء مطلقاً من فعل وغيره بين نهاية الكلمة وبين الضمير النشيط ولا يمكن أن يقع بينهما شيء لان الضمير النشيط مغن وحده عن كل ما عداه من أقسام الكلام ويخلق الاسناد ومعنى الخبرية بنفسه بل انه يبلغ من الفعالية حداً ينهض معه هذا السؤال : هل فى الامكان ان يفيد الفعل خبرا اذا خلا من الضمير النشيط ؟ فالضمير يفيد الحكم والاسناد ليس في الجملة الاسمية فقط بل في الفعلية أيضا ولا حياة للكلام بدونه .

والقسم الاخر الذي انكر وجود الجملة الاسمية فى الكردية تجنب الوقوع في توهم وجود شيء معدوم ولكن وقع فيما هو أدهى وأمر وهو اعتبار الضمائر النشيطة في تلك الجمل هي الافعال وقد ساواها بما يسمى في الانجليزية « فعل الكينونة Verb to be » . على ان أيسر ملحوظة تفند هذه الدعوى هى ان افعال الكينونه في الانجليزيه تتصرف الى ماض ومضارع في حين ان الضمائر النشيطة لا تتصرف لانها ليست أفعالاً فضمير المفرد المتكلم هو نفسه فى الجملة الاسمية من مثل « من كوردم انا كرديّ » وفي الجملة الفعلية « من ديتم ، انا رأيت » وحين يأتي مضافا اليه « برام دارا ، أخي دارا » أو فاعلا او مفعولا بحسب مكانه في الجملة في احوال أخرى لا يمر بها غير الضمير النشيط . أفيعقل ان يكون هذا الضمير فعلاً وهو مضاف اليه في الجملة ؟ أو حين يأتي فاعلاً ومنشئاً للاسناد والحكم بعد الفعل مباشرة ؟ وهل

يصح في فكر سليم ان يكون التاء في « ذهبتُ » فعلاً جاء بعد الفعل .. كلام ماكان أحراه ان لا يخرج من بين الشفاه ولكنه التعصب لفكرة « انعدام الجملة الأسمية في اللغات الهندية - الاوروبية » يدفع بحامله الى تناسي البديهة . يبقى ان يقال ان الضمائر النشيطة هي افعال حيث تختفي الافعال الظاهرة فهي تكون مرة ضمائر ومرة أفعالاً ولا ادري ماذا تكون في حال الأضافة حيث لا يوجد فعل ظاهر . وخلاصة القول ان الجملة الأسميه موجودة في الكردية بل انها مؤكدة الوجود ويصح ان اقول انها محتومة الوجود لان كون الضمير النشيط هو منشىء الاسناد والخبر والحكم يقتضي مجيء جمل خالية من الفعل الذي هو مظنة انشاء الاسناد والخبر والحكم في الجملة دون سائر اقسام الكلام ليتأكد انحصار هذه الخاصية في الضمير النشيط .

وقد تركت في المقال مناقشة خمسة من اقسام الضمير التي حوتها القائمة السباعية الانفة ، واقتصرت على شرح « الضمير النفسي » لكونه هو وحده من بين الاقسام الأخرى يصح أن يأتي في الكلام صدر الجملة ويكمل معناها الضمير النشيط المناسب من متكلم أو مخاطب فكيف أمكن مجيء الضمير النشيط العائد على المتكلم حصراً بعد مبتدأ أو فاعل مثل« خوّم - نفسى » ؟ .

يقال :

خوّم هاتم — نفسى جئت .

خوّمان هاتين — نفسنا جئنا .

وقد جاز ذلك لان لفظ « خوّ - نفس » يستغرق معنى « من ، ئيّمه - انا ونحن » فهو يساويهما تماماً . ثم انه يؤكد معناها فضلا عن انه لايجوز هذا الاسناد الا اذا كان « خوّ - نفس » مضافاً الى الضمير النشيط من « انا ،

نحن » فمتى ما انحل التركيب الاضافي عادت كلمة « خۆ » كلمة قاموسية تعنى الذات والنفس وال « self » . وتظهر هذه الحقيقة بوضوح اكبر اذا لاحظنا استعمال كلمة « هەمو » التى تعنى الكل حين تضاف الى الضمير النشيط للمتكلم او المخاطب فأنت اذا قلت « هەموومان ـ كلنا » جاز لك ان تأتي بعده بالضمير النشيط للمتكلم لتكمل به الجملة فتقول : « هەموومان ديتمان ـ كلنا رأينا » فانه لما كان لفظ « هەمو » في هذه الجملة يستغرق جمع المتكلم ويؤكد معناه وهو في الوقت نفسه مضاف الى الضمير النشيط العائد على الجمع المتكلم فكأنه بهذا أصبح هو الجمع المتكلم فامتنع مجيء ضمير نشيط غير عائد على الجمع المتكلم لأكمال الجملة . لكنك اذا قلت « ثلثنا ، أو ربعنا » وهما بعض من الكل جاز في الكردية وجهان للكلام فلك ان تكمل الجملة فتقول « ربعنا جئنا » لأن الربع هنا وان كان لا يستغرق جمع المتكلم فهو لايشمل انساناً من خارجه لذلك امتنع اسناد الجمعية في الجملة الى جمع غير المتكلم ، وجاز أيضاً ان تقول « ربعنا جاء » باسناد الفعل الى لفظ الربع لا معناه . وأوقع في سليقة الكردي ان يجيء الفعل « مفرداً » باعتبار لفظ «الربع» مفرداً فانه لما افترق فعل «جاء» من المتكلم من حيث الشخصية، حسن افتراقه منه من حيث « الجمعية » أيضاً . ولا يستقيم في سليقة الكردي ان تقلب المتكلم الى غائب ثم تستبقى من المتكلم معنى الجمعية فتسنده الى الغائب ليصبح جمعاً . ومن اجاز في الكردية « ربعنا أو ثلثنا جاءوا — سێيه كمان هاتن » تنكب في قواعدها شوارعها العامة وسلك الأزقة . .

ومن البديهي ان لفظ « هەمو » لا يضاف الى المفرد من متكلم ومخاطب وغائب لان المفرد لا يقبل الانقسام كي يأتي لفظ قابل له ( الا اذا كان الضمير المفرد يعود على لفظ معناه جمع وفي ذلك تفصيل لا يتسع له المقام )

ففي الكردية لايقال « هەمۆم هاتم — هەمۆت هاتى — دارا هەمۆى هات » اي « كلي جئت — كلك جئت — داراكله جاء » ولا يتأتى ايضاً قول « نيوەم هاتم — نيوەت هاتى — دارا نيوەى هات » أى « نصفي جئت — نصفك جئت — دارا نصفه جاء » فليس للواحد نصف . [ وتميز الغائب في الأمثلة المتقدمة بايراد اسم علم مفرد فيها لاحتمال عودة ضمير المفرد الغائب على مثل « الجيش والعشيرة والجمهور وما اليها » وهي في معناها جموع تقبل القسمة ] .

فالألفاظ تدخل في الجملة وتقع منها مواضع حسب مفهومها وطبيعتها ولا علاقة لذلك كله بالقواعد فاذا كان لفظ « خۆ » يقبل الاضافة الى المفرد ولا يضاف « هەمۆ » الى المفرد ، او اذا كان من خصائص « هەمۆ » قبول التجزئة وكان « خۆ » لا يتجزأ ، فأن اختلاف استعمالها في الجملة تبعاً للاختلاف في الخاصية لا يدخل ضمن اهتمام « قواعد اللغة » . ثم انه يمكن حذف الضمير النشيط الذي يضاف اليه « هەمۆ — كل » فيقال « هەمۆ هاتين — كل جئنا » بحذف ضمير جمع المتكلم وذلك لا يدل قطعاً على ان « هەمۆ — كل » هو الضمير وان المحذوف ليس ضميراً .

وفي المقال تفصيلات في أمور اخرى كثيرة لا تفيد غير المتمكن من الكردية فآثرت عدم ذكرها هنا . وهذه الخلاصة لم يلحظ فيها التسلسل الذي التزمته في الأصل الكردي ، وانما كان همى سرد الأفكار الملخصة في وضوح ما امكن .

* * * * * *

# وشەی کوردی

ئەندامی کارا : عەلائەدین سەجادی

کورد وەکوو هەموو نەتەوەیەکی تر نەتەوەیەکە خاوەنی زمان و نەریت و خاکێکە ، کەوتۆتە شوێنێکی سنووردارەوە لە رۆژهەڵاتدا و لە رەگەزی ئارییە . ئەم ئارییانە لە سەردەمی کۆچی یەکەمیانا هەندێکیان رووبەرووی ئەورووپا بوونەوە ، ئەوانەیان کە مانەوە لە پاش ماوەیەکی درێژ ئەمانیش بوون بە دوو بەشەوە : بەشێکیان روویان کردە هیند و بەشەکەی تریان بە ناو بانی ئێراندا بڵاو بوونەوە . ئەوانەیان کە لەم ناو بانەدا مانەوە (پارس) یان دروستکرد ، ئەوانەشیان کە رووبەڕووی زنجیرە کێوەکانی زاگرۆس بوونەوە (ماد) یان دروستکرد . لە پارس (فارس) و لە ماد (کورد) هاتە ناوەوە . کەوابوو کورد ـ کە مەبەستمان لێرەدا زمانەکەیەتی ـ واتە زمانەکەی زمانێکی سەربەخۆ و خاوەنی رەگ و رەگەز و ریشەیەکی پتەوە ، لە بەرەبەیانی مێژوویەوە بە سەربەخۆیتی ژیاوە ، هەرچەندە کۆسپی هاتبێتە سەر رێگا

هەمتوی ساف کردووە و کەسیەتی خۆی بەرەلا نەکردووە . پاش ئەوە کە ئیسلامەتی داهات زمانی عەرەبی بە هۆی ئایینەوە کەوتە ناویەوە و تا ئەندازەیەك کنەی تیا کرد . ئەمیش هەر نەیتوانی — وەکو لەمەودوا باسی ئەکەین — زاڵ ببێ بەسەریا ، هەر ئەوەندە هەبو توانی بە هۆی ئایینەکەوە هەندێ وشەی خۆی فڕێ بداتە ناویەوە . کەوابو تا ئەم رۆژە زمانی کوردی چ لە بارەی ریشەوە و چ لە بارەی ئەدەبەوە هات و چۆیەکی ئەگەر بوبێت تەنها لەگەڵ ئەو دوو زمانەدا بووە و هیچی تر .

بەشی یەکەم کە شێوەی بە ناو زمانی فارسییە لەبەر ئەوە کە هەر لە سەردەمی کۆنەوە پێشهات و دام و دەزگای وای بۆ هێناوەتە پێشەوە بووە بە خاوەنی حوکم و جڵەوی فەرمانڕەوایتی سیاسی گرتۆتە دەست . لە بارەی زمان و ئەدەبەوە سەردەمی پێش لێشاوی ئەسکەندەری ماکدۆنی لە پلەی یەکەمدا و ئەو و هاتنی ئیسلام و سەرکەوتنەکانی عەرەب لە پلەی دووەهەمدا زۆر تاریکە ، لە سەدەی هەشتەم و نۆیەمی میلادیدا بەرە بەرە شوێن هەواری ئەدەب و زمانی بە تەواوی هەر بە هۆی فەرمانەوە دەرکەوت و رۆژ بە رۆژ رووەو گەشە بۆن هەنگاوی زل زلی ئەنا . گومانی تێدا نییە حوکم لە هەر شوێنێکا بۆ زمانی ئەو شوێنە رەو پەیدا ئەکا . ئەو شێوە زمانی فارسییە کەوتە ناو ئەدەبەوە و بە هەمتو لایەکدا بڵاو بووەوە . یەکێ لەو شوێنانە کە بە ناو زمانی فارسی و

ئەدەبی فارسی تیا بڵاو بووەوە وڵاتی کوردەواری بۆ ، بە درێژایی یازدە ســەدە ئەم شێوە زمان و ئەدەبە لە ئاسمــانی کوردەواریدا ئەستۆرایەوە ، لە بارەی تاکە تاکەی وشەوە بە جۆرێ خۆی چەسپاند کە هەر وشەیەك لە کوردیدا بوترایە و ئەو وشەیە لە هۆنراو وە یا رستەیەکی فارسیدا هــەبوایە خێرا ئەوترا ئەوە فارسییە . ئەم جۆرە رایە لە ناو خوێندەوارانی کورد و تەنانەت رۆژهەڵاتی ناسەکانیشا بە تەواوی بڵاو بووەوە و کەس بەلای هیچی تردا نەئەچۆ ؛ نەچۆنەکەش لەبــەر ئــەوە بــۆ کە لێکۆڵینەوەیەك لە باری زمانی کوردییــەوە — چونــکە حوکمی بە دەستەوە نەبۆ — نە ئەکرا و کەس بە تەنــك ئەوەوە نەبۆ کە بنج و بناوانێك تاقی بکاتەوە . وەکو وترا باوەڕەکە وای لێ هاتبۆ هەر وشەیەك کە کوردەکە بەکاری ئەهێنا هــەر بەو مەرجە فارسیش بەکاری بهێنایە ئیتر بە بێ دوو دڵی خێرا ئەوترا ئەوە فارسییە ! . نەوەك هــەر ئەوەندە بەڵــکو ئەم جۆرە باوەڕە ئیشێــکی وای کردبۆ کە زۆر کەس لەوانە وا خۆیان بە زانا ئەزانی بە هەندێ لە رۆژهەڵاتی ناســەکانیشەوە — بەڵام ئەمان لەبەر مەبەستی تایبەتی — ئەیانوت زمانی کوردی لقێــکە لە زمانی فارسی . وای لێ هاتبۆ زمانی کوردی هەر بە ناو ناو ئەبرا بە زمان ئەگینا لە باوەڕی ئەوانا زمان نەبۆ ! . زانایانی پێشــوی کوردیش لەبەر ئــەوە بە زمانەکەی خۆیان نەیانخوێندووە و نەیاننوسیوە وا دیارە بەلای ئەو بیرەدا نەچوون کە لە زمانەکەی خۆیان بکۆڵنەوە و قسەیەك لە ریشە و بنج و بناوانیەوە بکەن . جا لەم رووەوە باوەڕی من ئەمەیە :

جارێ لە باری ئەو زمانەوە کە پێی ئەڵێن فارسی :

وەکو لە پێشەوە وترا زمانی فارسی لەگەڵ زمانی کوریدا لە ریشــەیەکی مام ناونجیەوە یەك ئەگرنەوە ، پاشان فەرمان و حوکم وای کرد کە ئەو لە لقەکە بووە و بۆ بە خاوەنی ئەدەب و کتێب و پەروەردە کردنی بەشی خۆی ، فەرمانەکە بۆ بە هــۆی ئەوەکە کەسانی تر بێنــە ناویەوە و بە خۆیان و بەوانیترەوە دەست بکەن بە بەخێو کردنی . گومانی تێدا نییە زمانێك کە کەسانی تری تێکەڵاو بۆ ئەو زمانە هەرچەندە لە باری سیاسەت و فەرمانەوە بەرز ئەبێتەوە بەڵام لە باری جەوهەرەوە تا رادەیەك کەسیەتیەکەی خۆی ون ئەکا .

ئەدەب زۆر بۆ لە زمانی فارســیدا و لە وشــەی غەیری تێکەڵاو بۆ ، ئەو ئەدەبە بەو وشــەی بێگانانەوە کەوتــە ناو کوردیشەوە و بڵاو بووەوە ، بە جۆرێك بڵاو بووەوە و دەستی کێشا بە سەر دڵا ناکە بە بێ هیچ دوو دڵیــەك ئەوترا ئەمە فارسییە ، بە مەرجێك ئەو وشــانە کە بە فارسی ناو ئەبران ئەوانە هەمو ئەو وشــە کوردییانە وە یا ئەو وشــانە بۆن کە فارس و کوردەکە هەردوکیان تیایانا هاوبەش بۆن و بە هۆی ئەدەبە بە ناو فارسەکەوە کە حوکمی بە دەستەوە بۆ گەڕابووەوە بۆ کوردەکە ، کوردەکەش ئەمەی نە ئەزانی کە ئەمە هی خۆیەتی و بە زەوتکراوی بە دیاری بۆی هاتۆتەوە ، هەر لەگەڵ ئەیبینی لە ناو ئەدەبە فارسییەکەدایە و ئەویش ئەو وشەیە لە قســەو باسیا بەکار دێنێ ئەیوت ئەمە فارسییە لەگەڵ ئەوەشــا

وا نەبوو بەڵکو هی خۆی بوو ئەو وای لێ تێ ئەگەیشت ! .

بە وێنە وشـــەکانی وەکوو : ( ئـارام ، گومان ، کەمان ، جیهان ، ئاسمان ، ریشە ، پیشە ، خوێش ، نۆش ، گۆش ، هۆش ، چالاك ، چابوك ، چامە ، خامە ، نامە ، دلـێر ، کار ، بار ، سەرکار ، پێشکار ، زێوەر ) و بە سەدەها وشەی تر بۆچ ئەبێ بە فارسی بزانرێن و بۆچ کوردی نەبـن ؟! ، بۆچ ئەبـێ بەوە نەزانرێن کە زەوت کراون و دەستمان کەوتوونەتـەوە ؟! . هـەر لەبەر ئەوە کە فارس خستوونیە ناو نووسینەوە و ناردوونیەوە بۆ کورد ئیتر ئەمە بوو بە هۆی فارسی بوونیان ؟! . دیارە ئەمە نابێ بە هـۆی فارسی بوونیان بەڵـکوو کاڵای خۆمانە و بۆمان گەڕاوەتەوە .

جگە لەمە هەندێ وشە هـــەن کە « و » و « ی »یان تیایە و هەر دوو شێوەکە بەکاری دێنن ـ شـێوەی کوردی و فارسی ـ وەکوو : « کوشش ، گۆڕسـتان ، کۆپارە ، کۆچ ، شـــێر ، دێـر ، بێزار ، بێکار ، بێـگار » و زۆری تریش . ئەم « و » و «ی»یە لە شێوەی کوردیدا کراوەن و لە شێوەی فارسی ئێستەدا گوشـراون ، فارسەکان ئـــەو ( و ) و ( ی )یە بە ( واو ) و ( یێ )ی مەجهوول نـاو ئەبەن ؛ واتە بەو چەشنە کە کورد ئەیانڵێ ، ئەڵێن ئەوانە بە چاو ریشـە بناغەییەکەوە راسـتترن و لە ناو شێوەی زمانی فارســـیدا نەماون .

بەڵێ وشەی واش هەیە کە ئێستە کوردەکان بەکاری نایەنن و

فارسی سەردەمی سەدەی سێهەم و چوارەمی هیجری بەکاریان هێناوە ، وەکو : ئاوەند ـ تەخـت و پایە ، ( کاز ـ قەیچی و برنـگ ، فەرسـەب ـ حـەماڵـی خانو ، بتفوز ـ پـۆزە ، ئاژیـر ـ وشـیار و ئامادە ، گوشـن ـ نێر و داوا کردنی مێنگە بۆ نێر لە گیانلەبەردا ) و گەلێ وشەی تریش . ئەمانە ئێمە ناتوانین بە موڵکی تەواوی فارسی دابنێین ، بەڵکو موڵکی کورد و فارسن و ئەوەندە هەیە ئەوان لە نوسینا بەکاریان هێناوە .

ئەنجامی ئەم قسانە دێتە سەر ئەوە :

ئەو وشانە کە بە سـەر زاری کوردەوەن و بە فارسـی ناویان دەرکردووە من ئەو وشانە بە کوردی ئەزانم و وشەیەك نین کە فارسی وە یا فارسی رووت بن ، ئەو پەڕی ئەوەیە وشـەیەکن فارس و کورد وەکو یەك تیایانا هاوبەشن بەڵام لەبەر ئەوە کە تا ئێستە چونە بنج و بناوانێك لە زمانی کوردیدا بە تەواوی نەکراوە فارسەکان و ئـەوانەی کە بە ناو خەریکی تاقی کردنەوەی بنج و بنـاوانی زمانی رۆژهەڵاتیان کردووە ـ رۆژهەڵاتی ناسەکان ـ بە فارسییان داناوە و کوردەکەش هەر کەوتۆتە شوێن ئەوان و وتویە فارسییە ! .

* * * *

ئەمجا زمانی عەرەبی :

سەرکەوتنەکانی ئیسلام پەرەی سەند ، ئەم سەرکەوتنە لە رێگای کوردەواریەوە رو بە روی وڵاتی فارسی ئەو سـەردەمە بووەوە .

وڵاتی کوردەواری کەوتە ژێـر ئاڵای ئیسلامەتیەوە . زمانی ئیسـلام لەو سەردەمەدا زمانی عەرەبی بو ، تا کە تاکەی ئەم زمانە تا ئەندازەیەك هـەر لە سەرەتاوە لە وڵاتا بڵاو بووەوە . ئەم تاکە تاکە وشانەش دوو جۆر بون : هی ئاینی و هی بێجگە لە ئاینی . ئەو وشە ئاینیانە کە پێشتر لە ناو کوردەواریدا مەعناکانیان هەبـو وشـەی عەرەبی نەیتوانی ئەوانە فڕێ بدا و خـۆی لە شوێنیان دابنیشێ ، وەکو وشـەکانی : ( مزگەوت ، نـوێـژ ، رۆژو ، دەسـتنوێژ و شتی تریش ) . ئەم جۆرە وشانە لەبەر ئەوە کە لە پێش هاتنی ئیسلامدا چەمکەکانیان لە ناو کورددا هەبون وشەکانیان هەر لە سەردەمی خۆیانا بۆ داناون ، ئەو وشانە وەکو خۆیان مانەوە ، زمانی عەرەبی نەیتوانی ئەوانە بگۆڕێ و لایانبەرێ . ئەو شتانەش کە لە پێشوترا بەو جۆرە کە لە ئاینی ئیسلامدا هەیە لە ناو کورددا نەبو زمانی عەرەبی توانی وشەی خۆی بچەسپێنێ ، وەکو : « حەج ، زەکات » « ظهار ، ایلاء » لە زمانی ئەهلی شەرعدا ، ئەمانە وەکو خۆیان کەوتنە ناو کوردەوە و هەر لە سەر ئەو گوزارانە مانەوە .

بەڵێ ! زمانـــی عەرەبی لە سەردەمەکانی پـاش پەرەسەنـدنی ئیسلامدا بەهۆی ئاین و حوکمەوە خزمەتێکی زۆر کرا ؛ لە لایشاوی مەعانی زمانەکانی تر رژێنرایە ناویەوە و بـو بە زمانێـکی زینـدو ، وەکـو لە مەعانی زمانەکانی تری وەرگرت لە وشەی ئـــەو زمانانەش هەر کەوتە ناویەوە . ئێستە من بە تەواوی قسە لەوەوە ناکەم کە

لە وشەی زمانی کوردیش کەوتە ناویەوە ؛ ئــەو وشــانە کە لە رەچەڵەکدا کوردی بوۆن و پاشان زمانی عەرەبی دەستکاریی کردن و کردنی بە هی خــۆی وە لە راستیشدا بۆ بە هی ئــەو ، وەکو وشەکانی : « جوالق » کە جواڵە ،« الجوهــر » گەوهــەر ، « کردن » گەردن ، « جلنار » گوڵ هەنار ، ئەمانە بوۆن بە هی ئەو .

گەلێ وشەی واش هەیە کە رێختی وشەکە لە هــەردوو زمانەکەدا وەکو یەك وایە ، بەڵام گوزارەکانیان جیایە وەکو بەوێنە : «ریش» لە عەرەبیدا بە پەڕ و لە کوردیدا بە ریشی ریش ئاسایی ئەڵــێن . « دور » لە عەرەبیدا خانۆەکان ، لە کوردیــدا پێچەوانەی نزیك . « زور » لە عەرەبیدا درۆ ، لە کوردیدا زبر . « کەیل » لە عەرەبیدا ئەوزاری پێوانە ، لە کوردیدا پڕ . وە یا بە زیاد کردنی « أل » لەسەر وشەکە لە عەرەبیدا و بەبێ ئەو لە کوردیدا وەکو : « الــبراز » لە عەرەبیدا بە دەشتێکی بڵاو و پان و پۆڕ ئەڵێن ، لە کوردیدا بەبێ « أل »ەکە بە خۆك ئەڵێن . « الــکودن » لە عەرەبیدا یەختــە ئێستر ، لە کوردیدا بەبێ ئەو ئەلف لامە بە زەین کوێر ئەڵــێن ، ئەمانە و هی تریش .

ئەمە لێرەدا ئــەو حوکمە ناکرێ کە هی عەرەبییە و کەوتۆتە ناو کوردییەوە ، وە یا کوردییە و کەوتۆتە ناو عەرەبییەوە ، بەڵــکو ئەمانە هەر یەکە شتێکی سەربەخۆن و کەســیەتی زمانەکەیان ئــەو مەعنایانەی بۆ دروست کردووە .

بەشی دوەهەم ئەو وشـــانە کە ئەوترێن عەرەبین کەوتونەتە ناو زمانی کوردییەوە . ئەمانە ئەگەر سەیری ئەم قسەیە بکەین لە رواڵەتا زۆر زۆرن ؛ هەر لە ناو « اسماء الاعلام » ، کردەوە « فعل »ەوە ، وەکو : « عبدالله ، طاهر ، عبدالرحمن ، فاطمه ، رضا ، رمضان ... هتد »ی ، « مقصد ، قصیده ، محافظ ، حارث ، شـــط ، حضور ، صحیفه .. هتد » .

جا لەم لایەنەوە لێکۆڵنیەوەیەك پێویستە :

زمانی زمانێك ئەوەیە کە خاوەنی ئـەو زمانە کاتێ کە وترا لێی تێ بگا ، وەخۆکمی پلەشی لە زمانا هەیە ؛ واتە نابێ بیر و باوەڕی ئێستە بسەپێنرێ بەســەر ســەد ساڵ لەمەوپێشترا ، زمانیش ئەوەیە کە خاوەنەکەی بیزانێ . ئەم وشـــانە کە باسکران لە هەواری خۆیان پەڕیون و کەوتونەتە ناو زمانێکی ترەوە کە زمانی کوردییە ، کوردەکە دەستکاریی وشەکەی کردووە : « عبدالله » بووە بە عەولا ، « طاهر » بووە بە تایەر ، « عبدالرحمن » بووە بە ئەورەحمان ، «فاطمه» بووە بە فاتە ، « رضا » بووە بە رەزا ، « رمضان » بووە بە رەمەزان . هەروەها « مقصد » بووە بە مەقسەد ، « قصیده » بووە بە قەسیدە ، « محافظ » بووە موحافز ، « حارث » بووە بـــە حارس ، « شط » بووە بە شەت و « حضور » بە حوزوور ...

وەرە تۆ بچۆ لە دۆرگەی عەرەب وە یا دەشتی شام و بەسرە یەکێ ناوی (عبدالله) وە یا (عبدالرحمن) وە یا ( فاطمه ) بێت

بانگی بکە عەولا وە یا ئەورەحمان وە یا فاتە بە بێ گومان کەس هەر لاشت لێ ناکاتەوە چونکە تێ ناگا کە تۆ ئەوت مەبەستە. وە یا لە قسە کردنت لەگەڵیانا بڵێ موحافز وە یا شەت وە یا مەقسەد دیسان گومانی تێدا نییە بەو جۆرە دوانە کە تۆ لەگەڵیان ئەدوێیت لێت تێ ناگەن و نازانن چی ئەڵێیت. کەوابێ ئەو جۆرە وشانە لە مۆڵکی ئەوان دەرچوون و بوون بە مۆڵکی تۆکە کوردیت.

یەکێکی وەکو مەولەوی ئەڵێ «شەتاوان» کە ئەمە بریتییە لە «شەت» و «ئاو» و «ان» گەل و مەبەستی رووباری بەفراوەکانە. چ عەرەبێك لەمە تێ ئەگا کە ئەمە «شط، ئاو، ان» جمعە؟. چ کوردێك ئەمەی بە دڵا دێت کە ئەمە «شط، ئاو، ان»ی گەلە؟.

ئەمجا بە پێچەوانەی ئەمە عەرەبێك بچێت لە دۆڵی شارەزووری جارانا وە یا لە ناوچەی موکریدا باسی ئەستێرەی (گەلاوێژ) بکا و بڵێ: «کلاویش، کلاویج، کلاویز» وەکو راست هەروا ئەیڵێین، وە یا لە باتی (چەرمەڵە) لەو شوێنانەدا بڵێ «جرملە»، وە یا لە باتی (گۆیژە)، بڵێ «کویجە»، لەباتی (گاورتەپە) بڵێ «کاورتبە» بە بێ گومان کەس لێی تێ ناگا و نازانن چی ئەڵێ. کەوابێ ئەم وشانە بەو جۆرە کە ئەو ئەیانڵێ کوردی نین و ئەگەر کوردیش بن لە موڵکی کورد دەرچوون و بوون بە موڵکی عەرەب.

تەنانەت هەر لەم سەردەمەدا کە وا هاتوچۆیش بە تەواوی

باوی سەندووە وشەیەکی وکو ( دوکان ) کە عەرەبەکان بە دەنگێکی تر ئەیڵێن و ئەڵێن « دۆکان » ئەم وشەی « دۆکان »ە بۆ ئەو (دوکان)ە لە باوەڕی منا کوردی نییـــە و لە موڵـکی کورد دەرچووە چونکە کوردەکە خۆی ناڵێ « دۆکان » بە واوی کراوە ـ بەڵـکو ئـەڵێ ( دوکان ) بە بێ کراوەیێ .

دوور نییـــە بوترێ ئەم وشانە بەو جۆرە و ئـــەو رێختە لە موڵـکی کورددا هەر نەبووە و نییە تا تۆ بڵێیت لە موڵـکی دەرچووە، ئەگەر ئەوان دەربچن ئەبێ مەعناکانیشیان هەر دەربچن !.

ئەڵێین : مەعنا دەرنەچووە ، مەعنا شتێکی چەســپاوە ؛ ئەو کابرایە گوزارەیەکی وەکو چەمکی گەلاوێژ ، وە یا گوێژە ، وە یا گاورتەپەی بەر دەست کەوتووە خۆی هاتووە نـاو و وشـەیەکی بۆ داناوە ، گوایە بە بیری خۆی ناو و وشەی ئەو شـوێنەیە کە ئەوی تێدایە و ئەیڵێن ، کەچی ئەوە نییە بەڵـکو شتێکی ترە و ئەو خـۆی دروستی کردووە .

ئەمە لە لایەن گوزارەوە ، لە لایەن وشەکەشەوە ئەو لای وایە وشەی « کلاویج » ـ بە وێنـە ـ ئەوەیە کە خەڵـکی ئەو ناوچەیە ئەیڵێن و ئەویش بەو جۆرە وتویەتی ، کەچی لە راستیشدا ئەوە نییە، ئەگەر لە باوەڕی ئەودا ئەوە بێ و موڵـکی ئەو ناوچەیە بێ گومانی تێدا نییە کە ئەوە لە موڵـکی ئەو ناوچەیە دەرچووە و بووە بە هی ئەو چونکە باوەڕەکەی ئەو لەگەڵ « واقع »دا یەکی نەگرتەوە .

دیسان لێرەدا قسەیەکی تر ئەکرێ ، ئەوترێ ئێستە تێکەڵاوی مەردم و نزیکبونەوەیان بە هۆی هۆی هاتوچۆوە بە پوختی کردوێیەتە کارێ کە ئەگەر کوردەکە لە دۆرگەی عەربی و دەشتی شــامدا ناوی عەولاّ و فاتە و حوزۆر و شەت ، وە عەرەبەکەش لە دەشتی شارەزۆر و موکریاندا بڵێ « کلاویج » و « کاورتبە » زۆر چاك دانیشتوی هەردوَ جێگاکە لە مەبەستەکە تێ ئەگەن ، کابرای عەرب ئـەزانێ کوردەکە کە ئەڵێ رەمەزان « رمضان »ی مەبەستە ، عەرەبەکەش کە ئەڵێ « کلاویج » کوردەکە ئەزانێ کە ئەمە ( گەلاوێژ ) ی مەبەستە. کەوابو هیچیان لە موڵـکی ئەویتریان دەرنەچون .

لە وەڵامی ئەمەشدا ئەڵێین : جارێ لە تێکەڵاوی و هاتوچۆی دوَ زمان بەسەر یەکەوە گومانی تێدا نییە کە گەوهەری خاوێنی هەردوَ زمانەکە تێك ئەچێت . ئەمجا بە پێی پلەیەك کە لە لێکۆڵینەوەدا بۆ هەمو شتێك بە مەرج گیراوە نابێ تۆ بیر و باوەڕی ئێستە ســەرەونخون بکەیتەوە بە سەر هی سەد ساڵ لەمەوپێشترا ، وە نابێ یەکێ دوَسەد ساڵ لەمەوپێشتر شتێکی وتووە ، تۆ کە لە سەر بیروباوەڕی ئێستە گۆش کراوی بڵێی ئەبوا وای بوتایە و حوکمی ئێستە بگێڕیتەوە بۆ ئەو سەردەمە .

ئێستە راستە کە خەڵـك لە یەك نزیك بونەتــەوە، بــەڵام لە سەردەمی خۆیا ئەو نزیکیە نەبووە . ئەو وشــەیە کە لە زمانێکەوە پەڕت بووە و کەوتۆتــە ناو زمانێکی ترەوە و روخسارەکەی لە

زمانەکەی ترا گۆڕاوە ، ئەو وشەیە بەو وتنـە ئەگەر بنێررایەتەوە بۆ شوێن هەوارە بناغەییـەکەی خۆی کەس لێی تێ نەئەگەیشت ، کەوابێ ئەوە لە موڵـکی ئەو دەرچووە و بووە بە موڵـکی یەکێکی تر. بـە وێنە : وشەکانی ( عەولا ، فاتە ، حوزوَر ، مەقسەد ) ، هـــەر لەو رۆژەوە کـە پەڕت بوون و کەوتونەتـــە ناو زمانی کوردییەوە مافیان بەسەر زمانی عەرەبییەوە نەماوە و بوون بەماڵی کورد . زمان هی نەخوێندەوارە ، نەخوێندەوارەکە ئەڵێ ( رەمەزان ، حوزوَر ) ، خوێندەواری زمانەکەش لە کاتی قسەکردنیا هەر ئەو نەخوێنـدەوارە رەچەڵەکیەکەیە ؛ خوێندەواری شتێـکی لاوەکییە و هاتووە بەسەریا ، ئەویش هەر ئەڵێ : رەمەزان و حوزوَر . ئەمجا ئەو خوێندەوارە لە کاتی لێکۆڵینەوەدا کە ئەکەوێتە لێکوڵینـــەوەی وشـــە ئەڵێ ئەم ( حوزوَر ) ە لە بناغەدا « حضـــور » بووە ، ( فاتە ) « فاطمە » بووە . ئەم لێکۆڵینەوە و چوونە بنج و بناوانە ئاشنایەتی و پەیوەندی لەگەڵ زانیاریدا هەیە کە ئەمە شتێکە و بەسەر زمانا ئەچێت ؛ واتە زمان بنجە رێزمان و زانیاری و قەواعد لە سەر ئەو هەڵئەستن نەوەك زمان لە سەر ئەوان .

ئەو وشانە کە پەڕت بوون و کەوتونەتە ناو زمانێـکی وەکو زمانی کوردییەوە ، زمانەکە کە هی نەتەوەکەیە کردنی بـە ماڵـی خۆی ، تۆکە لە بنج و بناوانیـان ئەکۆڵیتەوە لێکۆڵینەوەکەت لە رووی زانیارییەوەیە ، ئەسڵی زمانەکە ، واتە پەیـدا بوونەکەی هیچ

پەیوەندی بەو زانیاریەوە نییە ، زانیاری شتێکی عەرەزییە و هاتووە بەسەریا . دیسان کە تۆ لێ ئەکۆڵیتەوە لێکۆڵینەوەکەت بۆ دەستەیەکی تایبەتییە کە خوێندەوارانە ، رەچەڵەکی نەتەوەکە کە خاوەنی زمانەکەیە ئاگای لەو لێکۆڵینەوەیە نییە . لە شارەزوری سەد ساڵ لەمەوپێشترا ئەگەر تۆ بتوتایە : « عرض بحضوری ئاغای باسعادتی خۆم بکەم طلبەکەم مقصدی هەمتو اطرافیکە لازمە بگاتە حدی اجرا ! » کابرای شارەزوری ئەیوت : « قوربان نوشتەکە بکەم بە شاخی گایەکەدا یا بیکەم بە ناو چەوانیەوە ! » .

دیسان ئەگونجێ رەخنەگرێك بڵێ : ئەم وشە بێگانانەی وەکو (رمضان ، قصیدة ، فاطمة ، حضور ... هتد) ئەمە زەوتکردنە کە زمانێکی وەکو کوردی ئەیانڵێ ، داگیرکردن و زەوتکردنیش کەی مڵکایەتییە ؟ ! .

ئەڵێین : داگیرکردن و زەوتکردن بۆ شتێکە کە بارستایی و قەوارەیەکی هەبێ وەکو زەویەك ، یا بەراوێك ، یا کتێبێك کە یەکێك لە یەکێکی تری داگیر ئەکا . ئەمانە وەکو ئەوانە نین چونکە خودی وشەکە نەماوەتەوە تا بوترێ کوردەکە داگیری کردووە ، خودی وشەکە « رمضان ، قصیدة ، فاطمة ، حضور » ، کورد هەرگیز بەو جۆرە و لە سەر ئەو دەنگ و مەخرەجە نایانڵێ ، ئەگەر هەر بەو جۆرە بیانڵێ و هەر بۆ ئەو مەعنایانە بەکاریان بێنێ و بشڵێ ئەمانە هی منن راستە ئەمە داگیرکردنە ، بەڵام ئەو بەو چەشنە نایانڵێ

بەڵکو بە جۆرێکی‌تر دێن بەسەر زاریا ، کەوابو ماڵی خۆی بۆ هیچ داگیرکردن نەبو .

هەروەها وا رێ ئەکەوێ هەندە وشەیەك ، یا بڵێین هەر بەو کەلەخەیەوە لە زمانێکەوە پەڕت ئەبێ بۆ زمانێکی‌تر ، ئەو وشەیە لە شوێن هەوارەکەی خۆیا گوزارەیەکی هەیە کە ئەکەوێتە زمانێکی‌ترەوە و گوزارەیەکی‌تر دروست ئەکا ، وەکو وشەکانی — بە وێنە — (دار) ، ئەمە لە کوردییەوە پەڕت بو بێ بۆ عەرەبی ، وە یا لە عەرەبییەوە کەوتبێتە ناو کوردی ، لە عەرەبیدا بە خانو ئەڵێن و لە کوردیدا بە چلاك ئەڵێن ، وە « ئاراستە » لە فارسیدا بە رازێنراوە و لە کوردیدا بە واتای بۆ هاویشتن ، ئاهەنگ لە فارسیدا بە مەبەست و ئارەزو ، لە کوردیدا بە کۆبونەوە بۆ بەزم و شادی ئەڵێن . ئەمانە شکڵی وشەکە و کەسیەتی نەتەوەکە دروستی کردون ، ناتوانین بڵێین بەکار هێنانی ئەمانە لە کوردیدا بەو مانایە هەڵەیە و بەهەڵە بەکار هێنراون . رۆزگار وەکو چەمك و مەفاهیم دروست ئەکا لە ناو نەتەوەیەکدا هەر ئەو رۆزگارە زەوینەی واش دروست ئەکا کە وشەش دروست بکا بە تایبەتی ئەو وشانە کە ئەوترێ ئەمە بنەچەکەیان فارسییە و لەبەر ئەوە کە فارسی و کوردی لە ریشەدا یەکن ئەبێ ئەو وشانە کە کەوتنە ناو زمانی کوردییەوە ئەبێ هەر وەکو واتا فارسییەکەی خۆیان بەکار بهێنرێن . ئەم قسەیە ناچێتە سەر چونکە ئەمە زوربەی کۆمەڵی نەتەوەکە ئەو وشەیەی وا بەو جۆرە بەکار هێناوە لە دەسەڵاتی من و تۆدا نییە .

لە ئەنجامی ئەم قسانەدا ئەڵێین : زمانی کوردی زمانێکە خاوەنی سامان و کەسیەتیەکە ، ئەبێ بەشی مەردمیش بدا و لە خەڵکی تریش وەربگرێ ، ئەوەی کە دای بە خەڵك وەکو موڵکی عەینی لە موڵکی ئەو دەرئەچێ ، ئەوەش کە لە مەردمی تری وەرئەگرێ مادام لە رووی روخسار وە یا ناوەرۆکەوە دەستکاری کرد و شکڵە ئەسڵیەکەی تێکدا تازە لە موڵکی لێ وەرگیراوەکە دەرچووە و بووە بە هی ئەم . تەنانەت ئەتوانین بڵێین بەم جۆرە لێ وەرگرتنە کە وەری ئەگرێ سامانێك بۆ زمانەکە زیاد ئەبێ جگە لە سامانە بناغەییەکەی خۆی ، نەوەك هەر ئەوەندە بەڵکو کەسیەتیەکی بەهێز پیشان ئەدا ، بەتایبەتی ئەگەر وەرگرتنەکەی لە زمانێکەوە بێ کە لە ریشەدا بە تەواوی لەگەڵ ئەودا جیا بێ .

* * *

ئەمە شتێکی ئاشکرایە کە ئەبێ لە پێشا گوزارە هەبێت ئەنجا وشەی بۆ دابنرێت ، کەوابێ لە پلەی یەکەما پێویستی و ئاتاجی ئەکاتە کارێ کە گوزارە وە یا وشەکە پەیدا ببێ . رەوڕەوەی رۆژگار هەمو دەم رووەو پێشەوە ئەڕوا ؛ ئەو رۆژگارە جاری وا هەیە ئیشی وا ئەکا کە گوزارەکە نەهێڵێ ، کە گوزارە نەما وردە وردە وشەکەش سەری تیا ئەچێ ، وە جاری واش هەیە گوزارەیەك دروست ئەکا ئەو گوزارەیە بە بێ گومان ئەبێ وشەیەکی بۆ دابنرێت . ئەو گوزارەیەش لە گۆشەیەك لە گۆشەکانی سەر زەویەوە ، وە یا لە ناو

دەستەیەك لە دەستەکانی سەر زەویەوە پەیدا ئەبێ ، هەر ئەو گۆشە زەویە وە یا هەر ئەو دەستەیە لە سەر چەشەی زمانەکەی خۆی وشەکەی بۆ دائەنێ ، ئەو گوزارە و وشەیە پەڕت ئەبێ بۆ شوێنێکی تر و مەردمی ئەو شوێنە یا ئەمەیە وشەکە وەکوو خاوەنە ئەسڵیەکە ئەڵێن بۆ گوزارەکە ، یا ئەمەتە بە پێی مەفاهیمێك کە لە ناویانا هەیە و ئەو مەفهوومە خۆیان وشەیەکیان بۆ داناوە دێنن ئەو وشەیە ئەدەن بەو گوزارەیە کە کەوتۆتە ناویانەوە ، وەیا وشەی خاوەن زمانەکەی تر دێنن بۆ لای ئەم بەلام بۆیان ڕێنا کەوێ وەکوو ئەو بیڵێن بەڵکوو تێکی ئەدەن و بە جۆرێکی تر ئەیڵێن ، لێرەدا ئیتر وشە تێکدراوەکە ئەبێ بە ماڵی ئەمان .

بە وێنە : ئەو گوزارەیە کە لە زمانێکا داهاتووە و هەر ئەو زمانە وشەی بۆ داناوە و وشە و گوزارە ئەکەوێتە ناو نەتەوەیەکی تر و ئەو نەتەوەیە وشەکە هەر وەکوو خۆی ئەیڵێ وەك ( حەج ، زەکات ، تەلەفوون و تەلەفیزیۆن) ئەمانە کە کەوتوونەتە ناو کوردەوە و وەکوو خۆیان ئەیانڵێن ئەمە راستە وشەی بێگانەیە و کەوتۆتە ناویەوە . ئەو مانا و وشەیەش کە لە دەرەوە هاتوون و کەوتوونەتە ناویەوە و بە پێی وێنەی مەفهوومێك کە لە زمانەکەیا هەبووە و ئەو مەفهوومە لەسەر سەلیقەی خۆی وشەیەکی بۆ داناوە دێنێ ئەو وشەیە ئەدا بەو مەعنا تازەیە کە کەوتۆتە ناویەوە ، وەکوو : « میترالیۆز ، متروسایکل » کە ( شەستتیر ) و ( ئەسپەدارینە )ی دایێ . ئەوانەش کە بە گوزارە و

وشەوە کەوتۆنەتە ناویەوە و گوزارەکە ماوە بەڵام وشـەکەی گۆڕیوە وەکو « قصیدە ، حضور ، عبدالرحمن و فاطمە » کە کردۆیە بـە (قەسیدە ، حوزوّر ، ئەورەحمان و فاتە ) ئەمـە وشەی ئەســڵیەکە گۆڕاوە و بووە بـە هی کوردەکە و مافی ئــەو ئەسڵەی بەسەرەوە نەماوە .

دیارە ئەم جــۆرە شتانە هەمو لە پێشهاتی زەمان و لە ئاو و هەوای ناوچەوە دروست ئەبن ، ئێمەش باسەکەمان لە ســەر زمانی کوردییە ، لەبەر ئەوە ئەم زمانە بەم شتانە دەوڵەمەندیەکی پەیدا کرد زیاد لەوەی کە خۆی هەیبو .

جگە لەمانە و وەکـو لە سەرەوەش باسکرا ، زمـان هی نەخۆێندەوارە ، هەر شتێکی لاوەکی کەوتە ناویەوە ئەو بە هی خۆی ئەزانێ و وا ئەزانێ کە ئەمە لە بڕبڕەی زمانەکەیەتی ، ئەو دەنگ و باسی زانیاری نازانێ تا بێنێ لە روّی ئــەو زانیاریەوە ئەسڵەکە و لاوەکیەکە جیا بکاتەوە بەڵـکو هەموی قوت ئەدا و بە هی خـۆی ئەزانێ !.. وەکو ئەمە هەیە ئەوەش هـــەر هەیە ؛ ئەگەر کوردی ناوچەیەك کە بـە شـێوەیەك قسە ئەکا وشـــەیەکی کوردی جگە لە ناوچە و شێوەکەی خۆی گوێ لێبێ ئەو ئـەوە بە کوردی نازانـێ بەڵـکو خێرا ئەڵێ ئەمە کوردی نییە !.

لەسەر ئەم باسە دوّ وێنە بۆ هەر دوّ قسەکە دێنمەوە :

ئەڵێن : سەردەمی زوّ جارێك کابرایەکی تایشەیی رێی ئەکەوێتە

بەسرە ، وە وای بیستبۆ کە شاری بەسرە هەمۆیان عەرەبن ، پاش گەڕانەوەی بۆ وڵات لێیان پرسیبۆ بەسرەت چۆن هاتە بەر چاو ؟. وتی : « وەڵلە هەمۆ بە عەرەبی قسەیان ئەکرد تەنها نوێژەکەیان نەبێ ئەویان بە کوردی ئەکرد ! » .

ئەو شتانە کە لە نوێژدا ئەخوێنرێن دیارە هەمۆیان عەرەبین ، ئەم کابرایەش لە وڵات و شۆێنی خۆی هەر وای نۆیژ کردووە و هەر بەو جۆرەی خوێندوە ، بەڵام لە باوەڕی خۆیا شتێکی بۆ مەعناکان دروستکردوە و وای زانیوە ئەو وشانەش هەر کوردین کە ئەو لە نۆیژەکەیا ئەیانڵێ !.

بۆ دووەمەکەش جارێ کابرایەکی وڵاتی ئەردەڵان رێی ئەکەوێتە وڵاتی دزەیی ، لەناو دەغڵ و دانا چۆلەکەیەکی زۆر ئەبینێ بۆیان ئەگێرێتە ئەڵێ : « مەلیچکێکی فرەم چاو پێ کەفت لە ناو دەغڵەکەتان » . ئەڵێن : مەلیچك چییە ؟. بەهەر جۆر بێ تێیان ئەگەیەنێ کە مەلیچك چییە . ئەمجا پێی ئەڵێن : باوکم تۆ بە کوردی قسە ناکەی ؟. بۆچ ناڵێی ( کێشکە ) ، مەلیچك چییە ؟!. ئەوان مەلیچکیان بە کوردی نەزانیوە !..

ئەم شتانە هەمۆ بۆن بە بەڵگە بۆ ئەوە کە زمانی بناغەیی زمانی نەخوێندەوارە و ئەسڵ ئەوە ، هەر شتێك کە کەوتە ناویەوە و لە مەفهۆمەکەی تێ گەیشت ئەو ئەوە بە هی خۆی ئەزانێ ، شتێکیش کە لێی تێ نەگەیشت بە لاوەکی ئەزانێ ، جیاکردنەوەی ئەم بنەچەیی و

لاوەکیە هی وردبونەوە و لێکۆڵینەوەی خوێندەوارەکانە و ئــەوانن کە بە هۆی زانیاریەکەیانەوە لێکیان ئەکەنەوە .

بەڵێ ! ، راستە ئەو جۆرە شێوە ناوچەییانە شێوەی گشت نەتەوەکە نییە ، بەڵام ئەبێ ئەوەش بزانرێ کە لە هەمو نەتەوەیەکدا شـێوەی جیا جیا هەیە و ئـەم شـێوانە بە هەمویانەوە کەیان و کەسیەتیەکیان بۆ زمانەکە دروسـتکردوە ، لێکۆڵینەوە لەم بـارەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە چــۆن شێوەی ناوچەیی لە ناو زمانێکا دروســـتبووە ؟. ئەوە زەوینەیەکی تایبـەتی هەیــە و بابەتێکی تری سەربەخۆیە ، بەڵام ئەمە ئەوە هەر پیشان ئەدا کە لە هەر جێگایەك و لە هـەر ناوچەیەکدا ئەوەی خۆی بە رەوانتر و بە بنـجتر ئەزانێ ، لێکۆڵینەوەکە ئەکەوێتە ئەســـتۆی زانایان هەم بـــۆ دروستبونی شێوەکە هەم بۆ وردبونەوە لە بنج و بناوانی وشـــەکە ، ئەوەندە هەیە زمان هی نەخوێندەوارە ، ئـەو بێ ســـەوادە بێ ســـەوادی هـەر ناوچەیەك بێت ، بۆ بەڵـگەو بۆ پتەوکردنی رەچەڵەکی زمانی تێکڕایی نەتەوە وتنەکەی ئەوان بناغەیە بۆ هەمو شت .

* * * * * *

- ملخص المقال -

# الكلمة الكردية

العضو العامل : علاء الدين سجادي

الأكراد شعب كبقية الشعوب في العالم لهم لغة خاصة و موطن خاص في الشرق له حدود معينة وهم ينتمون الى الشعوب الآرية ، والآريون بعد رحلتهم الاولى من سلاسل جبال القفقاس انقسموا الى قسمين : قسم وجه رحيله الى اوروبا والقسم الآخر بعد مرور فترة من الزمن انشطر شطرين - شطر ذهب الى الهند والشطر الآخر انتشر في هضاب ايران ، والذين سكنوا في تلك الهضاب آضوا منشأ لپارس ، والقسم الذي توجه الى سلاسل جبال زاگروس كونوا الشعب المادي . فالفرس من سلالة الپارسيين والكرد من الماديين . فأذن الشعب الكردي شعب له موطن خاص ولغة خاصة ، عاشت تلك اللغة في ادوارها التأريخية عيشة مستقلة فكافحت كل العقبات التي اعترضت طريقها وحافظت على شخصيتها اللغوية الراسخة . ولكن بعد ظهور الاسلام وانتشاره بين الأكراد تسربت اليها اللغة العربية بواسطة الدين تسربا جزئيا ، الا ان هذه اللغة ، كما سنرى ، لم تتمكن ان

تسيطر عليهـا كما فعلت بالنسبة للعديد من لغات الشعوب الاخرى التي اعتنقت الدين الحنيف الجديد ، بل وحتى انها حرفت ما في وسـعها من مفردات الطقوس التى وجدت الطريق اليها بسـهولة ، وهكذا فان اتصال الكردية سواء كان من حيث جذور مفردات كلماتهـا او من حيث ادبها إقتصر الى حد كبير على اللغتين الفارسية والعربية .

فاللغة الفارسية التى تنسب الى الشعب الفارسي مهدت الحوادث والتطورات منذ عهود ما قبل الاسلام ساحة واسعة لها لـكي تكون صاحبة الحـكم والسياسة ، ولـكن في بداية هجوم اسكندر المقدوني خيم الظلام عليها من الناحية اللغوية والأدبية كما ساعد نجاح الفتوحات الاسلامية في مرحلة معينة على خمولها الى ان إنتعشت ثانية منذ بداية القرن الثامن الميلادي حيث ظهرت الآثار الأدبية واللغوية فيهـا مرة ثانية وكان ذلك مرتبطا بشكل مباشر بوضع ايران السياسي فما لاشك فيه ان الحـكم عامل رئيسي لنمو اللغة التي تكون صـاحبة الحـكم والسيطرة . ان اللهجة الفارسية منـذ استردادها الحـكم صارت لغة السيف والقلم ، فتوسعت في حـد ذاتها وتمـكنت ان تدخل مناطق وبقاع مختلفة ، فمنها بلاد الـكرد أو كردستان ، فـكانت هي وادبها تمرح في سماء كردستان طوال احد عشر قرنا ويطير ادبها فيهـا يمينا وشمالا مما ساعد على توطيد بعض المفردات ذات الجذور المشتركة ، في اللغتين الفارسية والـكردية ، الا ان ذلك دفع بالـكثيرين الى اعتبار كل كلمة يتلفظ بها اي كردي اثناء تخاطبه الأعتيـادي فارسية الاصل ما دامت هي موجـودة في ذلك الأدب المسمى بالأدب الفـارسي !

وتوغلت هـذه الفكرة بين الأكراد انفسهم وحتى بين قسم من

المستشرقين الذين صرفوا جل جهودهم للمقارنة بين اللغتين الكردية والفارسيه . وسبب نشؤ هذه الفكرة يرجع بالدرجة الاولى الى كون اللغة الفارسية لغة حكم على عكس اللغة الكردية ، وبالدرجة الثانية الى عدم وجود دراسة عميقة بالنسبة لجذور الكلمات ، وبالأخص بالنسبة الى اللغة الكردية لذا أن رأيي في هذا الموضوع يتركز على ما يلي :

ان اللغة الفارسية كما سبق وان ذكرت ، تتصل الى اللغة الكردية من حيث الجذور منذ زمن غير قريب ، وتثبيت الحكم نفسه بين ظهراني الفرس مهد السبيل الى انفكاك اللغة الفارسية عن اصلها الحقيقي وجعلها فرعا مستقلا ، فدخل فيها اناس اجانب ومن الواضح ان اللغة التى يدخل فيها غير ابنائها الحقيقيين بالرغم من انها تعلو من الناحية السياسية ولكن يقل وزنها ويضمحل جوهرها من الناحية الثانية ، اي من حيث اصالتها ونقاوتها .

انتشر الأدب الفارسي فدخلت فيه كلمات لاصلة لها بلغته من حيث الجوهر ، فتسرب الى زوايا البلاد التى كانت خارجة عن سلطانه السياسي فنطقت به الأقوام الخاضعة لتلك السياسة أو الخارجة عنها ومن جملة تلك الأقوام الشعب الكردي الذي صارت قلوب ابنائه دوحة له بدرجة انه كلما يقرأ او يسمع الشخص الكردي ذلك الأدب المملوء من كلماته يذعن ويقول بلا تردد انه — اي الأدب — فارسي لا من حيث المعنى فقط بل من حيث كلماته ايضا في حين ان الكلمات الواردة فيه والمقولة فى حقها انها فارسية كلمات كردية صرفة ، او كلمات مشتركة بين الكردية والفارسية على السواء ولكن الحكم السياسي كان

بيد الفرس فيصدرون الأدب واللغة الى البقاع الكردية كهدية عابرة غاضين النظر عن ان اكثر الكلمات الواردة فيه هي بضاعتهم التى ردت اليهم ولكن بغير اسمهم ! .

فعلى سبيل المثال ان كلمات « ئارام ، كومان ، ئاسمان ، هوش ، چالاك ، چامه ، نامه ، پيشكار » الى النهاية ، كلمات يستعملها الاكراد كاستعمال الفرس لها ، فما هو إذن سبب الرجحان لفارسيتها ؟ . وما هو الدليل الذي جعلها اصيلة في الفارسية ودخيلة في الكردية ؟. فاذا كان استعمالها في الكتابات والادب المسمى بالفارسي دليلا على رجحان اصالتها في الفارسية فهذا لا يستند لاعلى العلم ولاعلى المنطق ، لان مجرد استعمال الكلمة في لغة من اللغات لا يكون دليلا على اصالتها فيها حيث ان سنة المهاجرة تثبت بانه كما يقهز شخص من روضة الى روضة وبقعة الى بقعة كذلك تثب كلمة من دوحة الى دوحة ومنطقة الى منطقة ، بل الدليل الحقيقي لهذه الميادين هو وجود جذر الكلمة في مشتقات اللغة بالنسبة اليها والتطورات التي تطرأ عليها في ازمنتها المختلفة . فاذا امعننا النظر في جذور تلك الكلمات والكلماتِ الاخرى التي تدعي اللغة الفارسية ملكيتها لها نرى رؤية واضحة انها لغة الام الحقيقية ، فاستعمال فرع من فروع تلك اللغة لها في كتاباتها لا يجعلها ملكا صرفا لها ولا يخصها بها .

نعم توجد بعض الكلمات الاخرى التي لا يستعملها الأكراد في الوقت الحاضر واستعملها الادب المسمى بالفارسي في القرنين الثالث

والرابع الهجريين كامثال : « باره » بمعنى الحصان . « آوند » العرش . «كاز » المقراض . « فرسب » الخشب الرئيسي لسقف الدار . « بتفوز » اطراف الاسنان والشفة . « كشن » طلب الانثى الذكر « آژنگ » الانكسار والاعوجاج ... انها كلمات لا تعد ملكا خاصا للفرس بل هي مشتركة بين الفرس والكرد غير انهم استعملوها في كتاباتهم في حينه .

وفي الاخير اقول ان الكلمات التي يستعملها الكرد ويقال في حقها انها فارسية ، هي كلمات كردية وليست فارسية محضة ، او كلمات مشتركة بينهما ولكن لعدم وجود البحث والدراسة في اللغة الكردية نسبها الفرس وقسم من الدارسين المستشرقين الى اللغة الفارسية البحتة فتبعهم الاكراد ايضا شأنهم شأنهم ! ..

واما بالنسبة للغة العربية فقد توسعت الفتوحات الاسلامية التي امتدت الى جميع المناطق الكردية ، فاعتنق الاكراد الدين الاسلامي الحنيف الذي كانت العربية لغتهَ فكان من الطبيعي ان تتسرب مفرداتها الى لغتهم ، وهي - اى تلك المفردات - كانت على قسمين : قسم منها مختص بالطقوس والتعاليم الدينية ، والقسم الاخر متصل بالحياة العامة ، والقسم الاول منها كان ايضا على نوعين ، النوع الذى يعبر عن المفاهيم الدينية التي كانت مصطلحاتها موجودة بين الاكراد قبل مجيء الاسلام فلم يظهر اي داع لنبذها مثل « مزگەوت ، مزگت - المسجد . نوێژ - الصلاة . رۆژو - الصوم . دەستنوێژ - الوضوءه . » والنوع الاخر الذي يعبر عن الكلمات الغير موجودة مفاهيمها بين

الاكراد مثل ما هي موجودة في الاسلام . فهذا النوع تمكن ان يفرض نفسه لتلك المفاهيم ويثبت قدمه فيها ، ك « الحج ، والزكاة ، والظهار ، والايلاء » في الاصطلاح الفقهي .

وبفضل انتشار الاسلام في مختلف الارجاء اصبحت اللغة العربية لغة علم وثقافة بالنسبة لمعظم الشعوب التي دخلت فيه وقدم لها ابناؤها اجل الخدمات إذ صبت فيها من المعاني اروعها فزادت من رقتها وقوتها وشمولها لانها بحكم تطورها العارم بدأت تستفيد بدورها من خصائص غيرها فصبت مفرداتها فى صيغ جديدة تتفق مع قواعدها وطابعها وبضمنها كلمات ومصطلحات كردية تصرفت فيها لدرجة حولتها الى جزء منها مثل الجوالق والجوهر وكردن وجلنار وكثير غيرها . وتقابل ذلك ايضا كلمات مشتركة من حيث اللفظ ومختلفة من حيث المعنى في اللغتين ومنها كلمة الـ « ريش » التي تأتي في العربية بمعنى ( كسوة الطائر ) بينما في الكردية تعنى ( اللحية )، و ( دور ) فى الاولى جمع لـ « الدار » وفي الثانية تعني « البعد » وتأتي كلمة « زور » في العربية بمعنى الكذب بينما في الكردية تعني ( خشن ) وكيل في الأولى بعنى المكيال و في الاخيرة تعني (المملوء) وهكذا . وفي بعض الاحيان زيدت «ال» على الكلمة في العربية في حين انهَا في الكردية مجردة عنها ، مثل « البراز » بمعنى الفضاء الواسع في العربية ، و « براز » بمعنى الخنزير في الكرديه . « الكودن » في العربية البرزون الهجين و « كودن » في الكردية بمعنى الغبي . إن امثال هذه الكلمات المعرفة او الغير المعرفة لا تعتبر كرديه وقعت في العربية أو عربيه انتقلت الى الكردية ، بل انها كلمات مستقلة ذات صلة خاصة

بلغتها سواء كانت في العربية ام في الكردية .

والى جانب المصطلحات الدينية دخلت كلمات عربية اخرى عامة غير قليلة الى اللغة الكردية سواء كانت من باب الاسماء كـ « عبدالله ، عبدالرحمن ، محمود ، فاطمة » او غيرها ، كـ « المقصد ، القصيدة ، الشط ، الحضور » الى اخره ، وهذا موضوع علمي شيق قائم بذاته يستحق الدرس والتمحيص :

ان اللغة بالنسبة الى الاقوام عبارة عن فهم ناطقها منها ، وهذا الفهم هو المعيار الحقيقي لتغاير لغة عن الاخرى وتباين قوم عن الاخر . ان الكلمات المار ذكرها اذا بدل شكلها او حرفت صياغتها لا يفهمها صاحبها الاصلي لانها خرجت عن هيئتها المصوغه . فـ (عبد الله) صارت في الكردية « عەوڵا » ، عبد الرحمن « ئەورەحمان » ، محمود « خوله » ، فاطمة « فاته » ، المقصد « مەقسەد » ، القصيدة « قەسیده » ، الشط « شەت » الحضور « حوزوَر » .

ففي الجزيرة العربية او بادية الشام او البصرة اذا كان اسم الشخص عبدالله او محمود او فاطمة وناديته (عەوڵا) ، او (خوله) ، او (فاته) لاريب انه لايفهم منك ولا يلتفت اليك وحينما تقول في تلك البقاع « مەقسەد » ، او « قەسیده » ، او « شەست » ، او « حوزوَر » حتما لايفهم سكانها ماذا تقول وماذا تقصد ، ففى رأيي ان تلك الكلمات بشكلها المحرف وصياغتها الجديدة اصبحت في الواقع ملكا لغير اصحابها الاصليين . يصح نفس القول على الكلمات الكردية فالعربي

الذي يذهب الى سهل « شارەزوَر » ، او « موكريان » ، ويرى « الشمري اليماني - كەلاوێژ » فيتلفظه بـ « كلاويش ، أو كلاويز أو كلاويج » - كما يتكلم بها العربي - ، وحينما يجعل من « چەرمەڵە » « جـرملة » ، « گـاورتەپە » « كاورتبه » ، « گوێژە » « كويجه » لاشك ان سكان المنطقة الاصليين لايفهمون قصده ، فأذن خرجت تلك الكلمات على هيئاتها الملفوظة من ملـكية اللغة الـكردية وصارت ملكا للغة العربية .

لا يستبعد ان يقول قائل ان هذه الـكلمات بهيآتها الحاضرة غير موجودة في اللغة الـكردية حتى تخرج من ملـكيتهـا وتدخل في ملـكية الغير وهكذا الحال في العربية ، في حين انه إذا حكمنا بخروجها لابد أن نحـكم بخروج معانيها فيهـا ايضاً ! . وجوابا على ذلك نقول ان معاني الاشياء ثابتـة بالنسبة الى اللغة فهي تبقى ولا تزول . ان الشخص الذي يدرك مدلول « كـەلاوێژ » ، او « چـەرمەڵە » او « گـاورتەپە » يتصور ويظن ان سكان المنطقة يتلفظون بالأسماء الدالة عليها كما هو يتلفظ بهـــا في حين ان تلفظه بهـا مغاير لها ولتلفظهم اياها مغايرة تامة .

وهنا يجب ايضاً الا تفوتنا حقيقة اخرى وهى أن اختلاط الأقوام فيما بينها وتداخـــل لغاتها يقلل بشـكل أو آخـــر اصالة اللغـــة ويضعفهـا من حيث الجوهر والنقاوة ، ولـكن يجب في نفس الوقت ان نلاحظ وبلاستناد الى قانون طاقة التدرج وخاصة بالنسبة الى مفاهيم اللغة ومعانيها الاصيلة واقع عـــدم جواز التعبير في عبارة قيلت قبل مئات السنين لمعني مقصود فيها في حينه بمعني يتطلبه هذا العصر ، لايجوز

ذلك لانه اذا اخذ بهذا المقياس يزول التدرج في عالم الوجود لا فقط في مجالات الأدب واللغة بل في كافة المجالات ، وهذا شيء لا يقر به العلم بتاتا بل يرفضه . هذا وان اتصالات الناس فيما بينهم ولو ازالت نوعا من الخلافات اللفظية الا انها لم تقض عليها كليا لذا فان كلمات عبدالله وفاطمة وحضور وقصيدة حينما إنتقلت الى اللغة الكردية ، أو «كەلاوێژ و گوێزە و چەرمەڵە» الى العربية تغير شكل الكلمات في كلتا اللغتين ، فعربت وكردت ، فاذا اعيدت الكلمات المعربة أو المكردة الى صاحبها الاصلي لا يفهم منها شيئاً ولا يتصور انها تلك الكلمات التى كانت موجودة في ذهنه ! . فأذن خرجت كل من هذه الكلمات عن ملكية صاحبها الاصلي وصارت ملكا للآخر .

ثم ان دراسة الكلمات من حيث أرومتها واصالتها هي من جهود الطبقة المثقفة ، والثقافة والجهود العلمية شيء خارج عن واقعية الموضوع . ان اللغة الفصيحة في كل قوم هي عبارة عن الكلم والالفاظ التى تأتى بها الطبقة الغير المتحضرة والمتعلمة لانها هي الموجدة للغتها الأصيلة ، فالقاريء والعالم في قوم او لغة هو قبل ان يتحلى بعلمه وقراءته فرد كافراد جمهرة الناس العامية ، بل انه بعد بلوغه العلم يبقى محافظاً على نفس كلام بني قومه . فأذن الكلام الفصيح في كل قوم بالنسبة الى اصالة اللغة هو الكلام المتداول من قبل عامة الناس .

وتوجد ايضاً بعض الكلمات في لغة من اللغات اذا نظرنا الى هيكلها وصياغتها نجدها بنفس الهيكل والصياغة في لغة اخرى ولكن

من حيث المعنى مختلفتان فيهما ، فكلمة « دار » سواء انتقلت من العربية الى الكردية أو من الكردية الى العربية فانها تبقى في اللغة العربيــة تعني البيت وفي الكرديه الشجر . وينطبق نفس الشيء على « ئاراسته » في الفارسية التى تأتى بمعنى المزين — بصيغة المفعول — وفي الكردية تأتى بمعنى التوجيه كما أن « ئاهنگ » فيها بمعنى القصد وفي الكردية حفل الناس للافراح . هذه الكلمات من صلب مصافات اللغة في كلتا اللغتين ليس لنا المجال ان نقول بان استعمالها في اللغات الكردية أو العربية أو الفارسية من الاغلاط الشائعة الواردة فيها ، ليس لنا هذا لان المفاهيم كما هي من مخترعات الزمن فالكلمات ايضاً تمر بنفس الادوار والمراحل ، خاصة بالنسبة الى شكل الكلمات التى يقال في حقها انها في الاصل فارسية وحين استعمالها في الكردية لابد ان تستعمل كما استعملها الاصل . لا يقال هذا لان استعمال هذه الكلمات في معانيها بالنسبة الى لغة من اللغات من صنع مجموع القوم لا من صنع الفرد ، ليس للفرد اى حق ان يغيرها أو يلبسها معنى غير معناها الاصلي في تلك اللغة .

وفي الختام اقول : ان للغة الكردية شخصية مستقلة ، تعطى وتأخذ ، الكلمات التي اعطتها للغير خرجت من ملكيتها كما تخرج العينيات من ملكية صاحبها الاول ، والتي تأخذ من الغير اذا تصرفت فيها صورة او سيرة تصير ملكا لها وتخرج من ملكية

صاحبها الاول ايضا ، بل اتمكن ان اقول انها تضم ثروة لغوية الى ثروتها الاصلية وتبرز شخصيتها من هذه الجهة خاصـــة اذا كان اخذها من لغة لا تمت لها بصلة من حيث الارومة ، وهذا هو شأن كل لغة بالنسبة الى الاخذ والعطاء .

* * * * * *

# کوردستان
# له ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا

ئەندامی کارا : د. کەمال مەزهەر

## بەشی دوەم

## باری گشتی کوردستان

بەر لە دەست پێ کردنی شەڕ

لاوازی و پەککەوتەیی ئێران و تورکیا بەر لە دەست پێکردنی شەڕی یەکەم بە چەند ساڵێك گەیشتبوە رادەیەك ، بەولاوەی تەنها کەوتن و روخان بو . شەڕی ساڵی ۱۹۱۱ی نێوان تورکیا و ئیتالیا و شەڕی ساڵی ۱۹۱۲ی تورکیا لەگەڵ وڵاتانی ناوچەی بەلقاندا و ناکۆکی نێوان « ائتلاف »ی ئیتیحادیەکان لە ناو تورکیا خۆیدا و هەراوبگری ئێران و تورکیا لە سەر سنوری نێوان هەردو لایان و باری ئاڵۆز و سەختی ژیانی ئابوری و کۆمەڵایەتی ئەم دو وڵاتە و گەلێك هۆی تر بەو دەردەی بردبون کە لە هەمو

قوژبنێکیاندا هەستی پێ دەکرا . لە کوردستاندا دەسەڵاتی ئەم دوَ دەوڵەتە تا رادەیەکی ئاشکرا کز بوَ بوَ وە لە هەندێك لە ناوچە سەخت و ناو هۆزە بەهێزەکانیدا تەنانەت هەست بە بوَنی نەدەکرا . لاوانی ئەو جۆرە ناوچانە بە ئاشکرا و بێ ترس مل پێچییان لە سەربازیَ دەکرد و جوتیارانی زۆر شوێنیش باج و سەرانەیان نەئەدا و وایان لێ هاتبو زەبتیە و جاندرمەکانی میرییان بە هیچ ئەزانی ؛ وەك توَسەری عەرەب صەدیق دەملوَجی دەیگێڕێتەوە لە و سەردەمەدا کاربەدەست و زەبتیەکانی میریَ تەنها بەگوند و لادێ بچوَکەکانی فەلەکانیان دەوێرا و توخنی زوربەی گوندی هۆزە کوردەکان نەدەکەوتن[1] .

(سوارەی حەمیدی) ش کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیددا بۆ پاراستنی دەسەڵاتی خۆی و لێدانی بزوتنەوەی ئازادیَ ـ نەتەوەیتی گەلە ناتورکەکان لە چەکدارانی هەندێك لە هۆزە کوردەکان پێکهێنرابوَ بەر لە ساڵەکانی شەڕ ببوە لەشکرێکی بێ گیان و توانا و بەو جۆرە بە جارێك سەنگی جەنگیَ خۆی لە دەست دا بوَ و ئەوەندەی تر لە ناو کۆمەڵدا سوَك و ریسوا بوَ بوَ ، بۆیەکا هەموَ هەوڵ و کۆشی کاربەدەستانی تورکیا بۆ ئەوەی گیانی بکەنەوە بە

(١) صديق الدملوجي ، إمارة بهدينان الكردية ، ص ٨١ . شایانی باسە دانەری ئەم کتێبە خۆی بەر لە شەڕ بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە بادینان کاربەدەستی میری بووە .

بەردا بە فیڕۆ چوو وە لە زۆر شوێن بووە بار بە سەر کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانەوە .

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا فەرمانڕەوایانی تورکیا هەر لە هەوڵ و کۆششدا بوون بۆ ئەوەی کەڵك لە هێز و توانای هۆزە کوردەکان وەربگرن و دەیانویست بۆ شەڕی داهاتوو ئامادەیان بکەن چونکە دەیانزانی بێ ئەوە کەلێنێکی دیار دەکەوێتە ناو توانای جەنگییانەوە . کاربەدەستانی تورکیا دەیانویست گەلی کورد بکەنە یەکێك لە قەڵا سەختەکانی بەربەرەکانێی ڕوس کە لەم کاتەدا زۆر چاوچنۆکانە دەیانڕوانییە خاکی دەوڵەتی عوسمانی بۆیەکا تورکەکان دەیانویست زیاتر خۆیان لە هەندێك لە سەرەك هۆزە دەسەڵاتدارەکانی کوردستان نزیك بخەنەوە و دژی ڕوسیا بیانجوڵێنن و بۆ ئەم مەبەستەیان پەیمانی چەوریان دەدانێ و بەو جۆرە تەنانەت توانییان چەند تیپێکی سوارەی حەمیدی لە سەر سنووری ئەو وڵاتە ڕیز بکەن[٢] .

لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵ و تەقەلای تورکەکان لەم مەیدانەدا تەواو کەم ئەنجام و بێ سوود بوو چونکە تەنها ژمارەیەکی کەم لە سەرەك هۆزە کوردەکان بە دەنگیانەوە چوون کەچی لە هەمان کاتدا هەندێك سەرەك هۆزی تر بە ئاشکرا و بێ ترس بڵاویان دەکردەوە کە وا لە کاتی شەڕدا دژی لەشکری تورك دەوەستن و دەدەنە پاڵ

(٢) بڕوانە : م. س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٩٥ .

ڕوس . ئەوەی لەم بارەیەوە شــایانی باسە ئەوەتە کە وا ژمارەیەك لە نیشتمانپەروەرە داخ لە دڵەکانیش تا ڕادەیەکی زۆر پشتگیریی ئــەو بیرەیان دەکرد چونکە زوڵم و زۆری عوسمانییان وای لێ کردبوون تەماع و پیلانی چینە کاربەدەستەکانی ڕوسیا نەبینن .

بەر لە شــەڕ باری نالەباری ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی کوردسـتان وەك زوربەی هــەرە زۆری ناوچەکانی تری ئێران و دەوڵەتی عوسمـانی گەیشتبووە ڕادەیەك زیاتر لە جاران کۆمــەڵانی خەڵك بجوڵێنێ و هەسـتی نەتەوەییان بزوێنێ . ئەمە و چەنــد هۆیەکی تر کارێـکی وایان کردبوو ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی ئەو کەسانەی سـەربەخۆیی ، یان بەلای کەمەوە خودموختاری ( ئۆتۆنۆمی) کوردیان دەویست لە زیاد بووندا بێ و ئەمە لە پەرەسەندنی هەندێك چالاکی سیاسی و کۆمەڵایەتیدا خۆی نواند ، ئەوە بوو بەر لە شەڕ ژمارەی کۆمەڵ و ڕێـکخراوە سیاسییە نهێنیـکانی کوردستان زۆر بوو وە تا دەهات سەنـگیان لە ناو کۆمەڵانی خەڵك و بە تایبەتی ڕۆشنبیراندا پتر دە بوو . ئەم کۆمەڵ و ڕێـکخراوانە بە هەر چوار لادا کەوتنە بڵاو کردنەوەی بەیاننـامە و بەخشــە « نشرە » ی ئەوتۆ کە پڕ بوون لە هەستی نەتەوەیی و ڕق و کینەی ڕەوا بەرامبەر زۆر و زۆرداری میری و کاربەدەستانی . یەکێك لەو بەخشـانە لە ژێر ئـەم ناوە پڕ مانایەدا بڵاو دەکرایەوە : « ئەڤ خۆڵە خۆڵی ئەمەیە » کە بە ئاشکرا دژی دەسـەڵاتی تورك دەدوا و دەیگوت « تورك بە هیچ جۆرێك

بەڕێوە بردنی کوردستانیان لە باردا نییە » . وەك کوردناسی سۆڤێتی م . س . لازەرێف باسی دەکا ئەم پەخشەیە لە ناو خەڵکدا دەنگی دا بۆوە و دەگەیشتە زۆر قوژبنی کوردستان[٣] . شایانی باسە زوربەی ئەو پەخشە و بەیاننامانە لە کوردستانی باکوور و هەندێکیان لە کوردستانی ئێران دەر دەکران بەڵام ژمارەیان لێ دەگەیشتە کوردستانی باشووریش و بە شێوەیەکی تایبەتی دەنێررانە تەکیەکانی بارزان و لەوێوە بڵاو دەکرانەوە[٤] .

هەر لەو ساڵانەشدا هەندێك کۆمەڵ و ڕێکخراو کە لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشی تورکە لاوەکانەوە پەیدا ببوبوون[٥] بە ئاشکرا کاریان دەکرد و چاپەمەنیی خۆیان بڵاو دەکردەوە و سەنگیان ، بە تایبەتی لە ناو ڕۆشنبیرانی کوردا ، تا دەهات قورستر دەبوو . بەر لە شەڕ « کورد طلبە هیڤی جمعیتی » ( کۆمەڵی هیڤی شاگردانی کورد ) لە هەموو ڕێکخراوێکی تری کورد چالاکتر لە کاردا بوو و

---

(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٠٠ .

(٤) بڕوانە : صديق الدملوجي ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٩٥ .

(٥) بەشێکی گرنگ لە زانیاریەکانی بەشی دووەمی ئەم وتارە ، بە تایبەتی ئەوانەیان کە پەیوەندییان بە چالاکی ڕێکخراو و کۆمەڵە سیاسی و سەردارەکانیانەوە هەیە لەلایەن نووسەر خۆیەوە کۆکراونەتەوە و لەم بارەیەوە کەڵکێکی زۆری لە مامۆستایان مەمدوح سەلیم و ئەکرەم جەمیل پاشا وەرگرتووە کە خۆیان لە دامەزراندنی زوربەی ئەو کۆمەڵانەدا بەشدار بوون .

تەنانەت توانیبوشی چەند لقێك لە هەندێ شاری ئەوروپا دابمەزرێنێ. ئەم کۆمەڵە ئۆرگانێکی تایبەتی خۆی بە ناوی ( رۆژا کورد ) ەوە بڵاو دەکردەوە کە دوایی ناوی گۆڕرا بە ( هەتاڤا کورد ) و ئینجا بە ( ژین ) . ( هیڤی کورد ) تا دەست پێ کردنی شەڕی یەکەمی جیهان لە کار نەکەوت ، بەڵام دوای ئەوەی بە بۆنەی ئەو شەڕەوە زوربەی کادرەکانی راپێچ کرانە ناو سوپاوە ئیتر وەك هەمو کۆمەڵ و رێکخراوانی تری ئەو سەردەمەی کوردستان توانای کار کردنی نەما.

کۆمەڵێکی تری کاریگەری سیاسی ئەو سەردەمەی کوردستانی تورکیا « کورد تعالی و ترقی جمعیتی » ( کۆمەڵی بەرزی و پێشکەوتنی کورد ) بو کە یەکەم رێکخراوی سیاسی کوردستان بو وە ژمارەیەك گەورە پیاوی ناوداری وەك ئەمین عالی بەدرخان و شەریف پاشا و شێخ عەبدولقادری شەمزینی تێدا کۆبوبوەوە[٦] ، بەڵام سیاسەتی شۆڤێنی تورکە لاوەکان کارێکی وای کرد چالاکی ئەم کۆمەڵە بەر لە دەست پێ کردنی شەڕ لە سنورێکی تەسکی نهێنی تێپەڕ نەکا .

هەرچەندە لەبەر چەند هۆیەکی تایبەتی نیشتمانپەروەرانی کوردستانی تورکیا لەو سەردەمەدا لە هەمو لا زیاتر لە جم و جۆڵدا بون ، بەڵام لە هەمان کاتدا هەست بە وریابونەوە و راپەڕینی کوردستانی ئێرانیش دەکرا . بەر لە شەڕ و لە ساڵەکانی شەڕدا لەو بەشەی کوردستاندا

(٦) بڕوانە : الدکتور بلەچ شیرکوە ، القضیە الکردیە . ماضی الکرد وحاضرهم ، القاهرە ١٩٣٠ ، ص٥١ .

کۆمەڵی « ئیستخلاصی کوردستان » بە گەرمی کەوتبووە خۆ و دروشمی یەکگرتنی کورد و سەربەخۆیی کوردستانی بەرز کردبۆوە. هەر لەو دەور و بەرەشدا ( ساڵی ١٩١٢ ) کۆمەڵی «جیهاندانی»[٧] لە کوردستانی ئێران دامەزرێنرا؛ ئەم کۆمەڵە دەیویست خەباتی گەلی کورد بە رێبازێکی راستدا بەرێ و لە چوارچێوەیەکی یەکگرتوودا کۆی بکاتەوە[٨].

یەکێك لە رووە هەرە گرنگە نوێکانی خەباتی رۆشنبیری کۆمەڵ و رێکخراو و پیاوە سیاسییە ناودارەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان بریتی بۆ لە بایەخدان بە بڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لە ناو منداڵ و لاوی تازە پێگەیشتوی کوردا لەگەڵ خزمەت کردنی زمان و ئەدەبی گەلی کورد وەك دوو هۆی کاریگەری

(٧) لەوە ئەچێ دامەزرێنەرانی ئەوکۆمەڵە خۆیان ئەو ناوەیان بۆ داڕشتبێ کە وا دیارە مەبەستیان مەعریفەت و شارەزاییە.

(٨) بڕوانە :

И.О.Фаризов, Место национально-освободительного движения курдов в борьбе народов Ближнего и Среднего Востока против империализма, Канд.дисс. (реферат), Москва, 1953, стр.19.

ئی. و. فاریزۆف، شوێنی بزوتنەوەی ئازادی ـ نەتەوەیی کورد لە خەباتی گەلانی رۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاستدا دژی ئیمپریالیزم، ( کورتەی نامەی دوکتۆرێکەی ) ، مۆسکۆ ، ١٩٥٣ ، ل ١٩ .

پاراستن و پەرە پێدانی نەریت و هەستی نەتەوەیتی لە ناو کۆمەڵانی خەڵکدا . مامۆستا خەلیل خەیالی یەکێك بو لەوانەی لە کار و خەباتی رۆژانەیاندا جێگەیەکی بەرز و شایانیان بۆ ئەم باسە دانابو . ئەم نیشتمانپەروەرە دڵسۆزە بە گەرمی هانی رۆشنبیرانی کوردی دەدا بە چاوێکی دوربینەوە بڕواننە ئەم ئەرکە گرنگەی سەر شانیان و هەمیشە و لە هەمو شوێنێك باسی ئەوەی کردوە کە نەخوێندەواری یەکێکە لە دەردە گەورەکانی کۆمەڵگای کورد . بە هاندانی مامۆستا خەیالی ژمارەیەك لە رۆشنبیرانی شاگرد و هاوەڵی ، « کورد تعمیم معارف جمیتی » ( کۆمەڵی بڵاوکردنەوەی خوێندەواری کورد )یان دامەزراند کە بەر لە شەڕ فێرگەیەکی تایبەتی لە ئەستەنبول بۆ منداڵانی کورد کردەوە[9] .

هەر لەو سەردەمەدا عەبدوڕڕەزاق بەدرخانی بەناوبانگ جێگەی مامۆستا خەیالی لە ناو کوردی ئێراندا گرتبۆوە و بە گەرمی لە هەوڵ و کۆششدا بو بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندن و خوێندەواری لە ناویاندا و یەکێك لە باسە گرنگەکانی دیوەخانی ئاوەدانی بریتی بو لە باسی نرخی خوێندن و هاندانی خەڵکی بۆ ئەوەی بایەخی پێ بدەن . چالاکی عەبدوڕڕەزاق بەدرخان لەم مەیدانەدا بەوەوە نەوەستا ، لە سەرەتای ساڵی ١٩١٣دا لە شاری

(٩) لەم فێرگەیەدا خوێندن بە زمانی کوردی بو و شاگردەکانی بە گیانی کوردایەتی گۆش دەکران ، بەڵام بە داخەوە زۆری نەخایاند بە ناچاری دەرگای ئەم فێرگەیە داخرا .

دیکتاتۆرتی کاربەدەستانی تورکیا نەبتونە هۆی وەستاندنی خەباتی گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا ، بەلاَم لەگەڵ ئەوەشدا ئەم خەباتە بە هیچ کامێك لە ئامانجە گەورەکانی نەگەیشت و سەرەڕای باری سیاسی نێوان دەوڵەتان چەند هۆیەکی تریش بتوبتونە کۆسپی ئەو کارە کە هەمتوشیان لە راستیدا ئەنجامی دواکەوتوییتی و نزمتی رادەی تێگەیشتنی خەڵکی ئەو سەردەمەی کوردستان بتون . بەر لە هەمتو شتێك راپەڕینەکانی ئەو سالانەی کورد لە رێچکەیەکی تایبەتی یەکگرتودا کۆنەبتونەوە تا بتوانن خۆیان لە بەردەمی هێزی دوژمندا بگرن و بەو جۆرە ئەنجامی گەورە بەدەست بهێنن . شایانی باسە لەگەڵ ئەوەشدا کە هەندێك لەو راپەڕینانە لە یەك کاتدا لە شوێنی جیاوازی کوردستاندا دەقەومان کەچی سەردارەکانیان بیریان لە دامەزراندنی پەیوەندی و یەکگرتن نەدەکردەوە . سەرەڕای ئەوە سەرکردایەتی هیچ یەکێك لە راپەڕینەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان تاکتیك و ستراتیژێکی دیاریان نەبتو ، بە وێنە بە نیسبەت شێخ مەحمتودەوە هەستی ئایینی بەس بتو بۆ ئەوەی لە سەرەتای شەڕدا دژی ئینگلیز چەك بۆ دوژمنەکانی خۆی هەڵبگرێ ، ئەمە جگە لەوەی لە کاتێکدا بە نامە و نامەکاری داوای یارمەتی لە رۆس دەکرد لە هەمان کاتدا بە چەك هێرشی دەبردە سەر هێزەکانیان .

بەلاَم لەگەڵ هەمتو ئەمانەشدا پێویستە دان بە بایەخ و گرنگی خەباتی گەلی کورد لە ساڵەکانی شەڕدا بنێین کە بووە یەکێك لە هۆ

یاریدەرەکانی هەرەس هێنانی بناغەی رژێمی عوسمانی و پەرەسەندن و پێشکەوتنی هەستی نەتەوەیی خەڵکی کوردستان و زیاتر جێگیر بوونی دروشمی ئۆتۆنۆمی و تەنانەت سەربەخۆیی کوردستان کە ئەمانەش هەموو رێگەیان بۆ قۆناغی نوێی دوای شەڕی خەباتی رزگاریخوازی گەلی کورد خۆش کرد .

لە هەمان کاتدا بەردەوام بوون و پەرەسەندنی خەباتی کورد لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهاندا ئەوەندەی تر رقی فەرمانڕەوایانی تورکیایان لێ هەڵساندن و زیاتر رەگی رەگەزپەرستیی بزواندن بە تایبەتی دوای ئەوەی لەوە دڵنیا بوون کە وا گەلی کورد بە دڵ شەڕیان بۆ ناکات و رۆڵەکانی پۆل پۆل ریزەکانی لەشکری عوسمانی بەجێ ئەهێڵن[٧٥] و زۆر جار بە چەکەکانیانەوە دەدەنە پاڵ شۆڕشگێڕانی گەلەکەیان ، وە ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر رقی عوسمانییەکانی لە کورد هەڵساند ئەوەبوو ، وەك بە درێژی لە شوێنێکی تری ئەم باسەدا دەیبینن ، کە وا نەیانتوانی رۆڵەکانی بکەنە داردەستی خۆیان دژی کەمینە ئاینییەکانی دەوڵەتی عوسمانی وە بە تایبەتی گەلی ئەرمەنی دراوسێیان . بەم جۆرە چینە کاربەدەستەکانی تورکیا لەوە دڵنیا بوون کە وا گەلی کوردیان لە کیس چووە بۆیەکا لە دوا ساڵەکانی شەڕدا دووبارە بە نیازی تواندنەوەیان بە رەقی کەوتنەوە گیانیان و وایان

(٧٥) تا کۆتایی شەڕ کار بەوە گەیشت لە ناو ریزەکانی لەشکری عوسمانیدا زۆر بە دەگمەن سەربازێکی کورد دەبینرا .

دەزانی ئەمە باشترین ڕێگەیە بـــۆ نەدۆڕاندنی کوردستان ؛ شایانی باسە لەمەدا ئەڵەمانەکانی دۆستیشیان هاوبیریان بوون . کاربەدەسـتانی تورکیا بۆ جێ بەجێ کردنی ئـــەم نیازەیان لە نزیـك کۆتایی شەڕدا چەند یاسا و فەرمانێـکیان دەرکرد بۆ پـــەرژ کردنـەوەی گەلی کورد بە ناو گوندە تورکەکاندا بە مەرجێك نیسبەتیان لە هیچ شوێنێك لە ٥٪ تا لە ١٠٪ی دانیشتوانی ناوچـــەکە تێپـەڕ نەکا و بڕیاریشیان وابوو سەرەك هۆز و پیاوماقوڵانی کورد بە دەست بەسەری بنێرنە شـــارەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆل و نەهێڵن بە هیـچ جۆرێك پەیوەندی لەگەڵ پیاوەکانیاندا ببەستن(٧٦) . عوسمانێـکان بێ دواخستن بەر لە کۆتایی شەڕ کەوتنە جێ بەجێ کردنی فەرمان و یاساکانیان لەم بارەیەوە و بەر لە هەموان کەوتنە گیانی ئەو هۆز و ســـەرەك هۆزانەی بە لایانەوە « لاســـار » بوون و بۆیان دابـین نەدەکران و توانییان بە زۆری چەك بە هەزارەهایان لێ دوور بخەنەوە بۆ ناوچە هەرە کەلا و دوورەکانی ڕۆژئاوای ئەنادۆل . بەم جۆرە فەرمانڕەوایانی تورکیا لە ساڵەکانی شەڕدا توانییان دەوروبەری ٧٠٠ هەزار کەس لە کوردستان دوور بخەنەوە کە پتر لە نیوەیان لە ڕێدا لە برسانا مردن یان لە ســەرمانا ڕەق هەڵهاتن یان بە نەخۆشی لەناو چـوون(٧٧) و تەنـها

---

(٧٦) بلەچ شێرکوە ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٦٠ .

(٧٧) بڕوانە :

« Memorandum sur la situation des Kurdes.. », P.11;
=A. Safrastian, Op. Cit, pp. 76, 81; D. A. Shmidt,

ژمارەیەکی کەمیان ، ئەویش دوای شـــەڕ ، توانییان بگەڕێنەوە مەڵبەندەکانی خۆیان ، ئەوانەشـیان کە لەوێ جێگیر بون ژیانێـکی سەختی پڕ لە نەخۆشی و بێ کارییان دەبردە ســـەر و لە ئەنجامی ئەوەشدا گەلێـکی تریان لێ مردن(٧٨) .

ســـەرەڕای ئەوە لەشکری عوسمانی زوربەی هـەرە زۆری دانیشتوانی دیاربەکر و موش و بتلیسی بە ناوی پێداویستی جەنگەوە دەربەدەر و ئاوارە کرد و ئەمانە بەشێـکیان تەنانەت ناچار بون پەنا بەرنە بەر شارانی وەك حەلەب و موسڵ و بە سەرمای زستان و گەرمای هاوین لەسەر شەقامەکانیان بژین و لە برسانا لاشەی کەس و

Journey among brave men, Toronto, 1946, p. 52. =

بە پێی هەندێك سەرچاوە ئـــەم ژمارەی ٧٠٠ هـــەزارە لە فایـــلەکانی « مهاجره إدارەسی»ی ئەستەنبوڵدا هەیە ( بە وێنە بڕوانە لاپەڕە ٦٢ی کتێبەکەی بلەچ شێرکوە ) . هەرچۆنێك بێ رۆژنامەی « ســـربستی » کە لە ئەستەنبوڵ دەردەچـــو لە ژمارە ٣٠ی نیسانی ساڵی ١٩١٩یدا باســـی چەند هەزار کوردێـکی بلاو کردبۆوە کە لە ساڵەکانی شـــەڕدا بە زۆر دور خرابونەوە بۆ هەندێك ناوچەی رۆژئاوای ئەنادۆل .

(٧٨) ئەم بارە قورسەی ژیانیان زیاتر هانی دەدان هەرچۆنێك بێ بگەڕێنەوە کوردستان و ئەوەبـــو دوای تەواو بونی شـــەڕ بەکۆمەڵ داوایان لە کاربەدەستانی تورکیا کرد رێگەی گەڕانەوەیان بدەن و زۆریشیان بـــێ ئەوەی گوێ بدەنە بڕیاری قەدەغە کردنی گەڕانەوەیان بە دزییەوە دوای شـــەڕ لـــەرانەوە خاکی باووباپیرانیان ( بـــڕوانە : عبدالعزیز یاملـــکی ، کوردستان و کرد إختلال لری ، جلد ١ ـــ ، تهران ، ١٩٤٦ ، ص ٧١) .

کاری مردوی خۆیان و کەلاکی ئاژەڵی لە برســا تۆپیوی ئەو ناوە بخۆن[٧٩] .

کار بەوەشــەوە نەوەستا ، هەزارەها رۆڵەی ناوچـــەکانی تری کوردستان بونە قۆچی قوربانیی برسێتی و نەخۆشی و ماڵ وێرانی . بە وێنە دەوروبەری هەشت هەزار کەس لە نزیکەی دوازدە هــەزار دانیشتوی تەنهـــا بیست گوندی یەکێك لە ناوچەکانی کوردســتانی تورکیا لە ماوەی شــەش حەوت مانــگی یەکەمی شــەڕدا بە نەخۆشی مردن[٨٠] . تەنانەت شوێنێــکی وەك کوردستانی عیراقیش کە لە هەموو پارچەکانی تری کوردستان لە ئاگری شــەڕ و کارەساتەکانی دورتر بو لەگەڵ ئەوەشـــدا بە هۆی شەڕەوە توشی مەینـــەتی و نەهامەتیێــکی زۆر هات کە ئەمانە تەنهـــا چەنــد نمونەیەکی کەمینی : ژمارەی دانیشتوانی شاری سلێمانی تا کۆتایی شەڕ گەیشتە سێ یەکی ژمارەی پێش شـــەڕی و هەر بە و نیســبەتە و خراپتریش ژمارەی دانیشــتوانی گوندەکانی دەوروبەری کەم بونەوە[٨١] . پتر لە نیوەی

(٧٩) گەلێك مێژونوس باسی زۆر روی ئەو دەرد و ئازارە بێ شومارەیان کردوە کە لە ساڵەکانی شەڕدا توشی گەلی کورد هاتوە ، مامۆستا ئەمین زەکی بەگی خۆشمان کە هەندێــکی بە چاوی خۆی دیوە ، بە درێژی باسی کردووە ( بڕوانە : محمد أمین زکی ، ســەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٨٠ — ٢٨٣ ) .

(٨٠) م . س . لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣١٤ .

(٨١) C.J . Edmonds, Op. Cit, P. 81

خەڵکی خانەقین هەر لەو ماوەیەدا لە تاو برسێتی و نەخۆشی و زۆرداری داگیرکەران ناچار بوون شار بەجێ بهێڵن[٨٢] ؛ وەزعی رەواندزیش زۆر لەوە باشتر نەبوو[٨٣] .

بەم جۆرە بە هەزارەها و بە سەدەها هەزار رۆڵەی کورد بوونە قوربانی شەڕی یەکەمی جیهان ، مامۆستا ئەمین زەکی ژمارەی ئەو کەسانە بە دەوروبەری نیو ملیۆن لە قەڵەم دەدا[٨٤] کە هیچ دوورنییە لەوەش زیاتر بووبێ [ بەپێی زانیاریەکانی ناوکتێبەکەی دوکتۆر لازەرێف کە لە دەکومێنتە دیپلۆماسیەکانی زەمانی چاری دەرهێناون ، خێزانی ٢٠ ـ ٣٠ کەسی زۆر ناوچە ژمارەیان لە ساڵەکانی شەڕدا هاتۆتە سەر سێ چوار کەس[٨٥] ] . جگە لەوە کوردستان بە هۆی شەڕەوە ژیانی ئابووریشی لە بنەڕەتەوە هەڵتەکا کە یەکێك لە هۆ گرنگەکانی ئەوەش بریتی بوو لە کز بوونی هێزی کار لە کوردستاندا بەوەی لە لایەکەوە هەرچی رۆڵەی بەکاری هەبوو نێررانە مەیدانەکانی شەڕ یا یاخی بوون و دایانە کێو و لە لایەکی تریشەوە لەشکری عوسمانی دەستی بەسەر زوربەی وڵاغی ئەو ناوچانەدا گرت

A. T. Wilson, Loyalites Mesopotamia, P. 266 (٨٢)

(٨٣) بڕوانە : حسین حوزنی موکریانی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١١٤ .

(٨٤) محمد أمین زکی ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣٨٠ .

(٨٥) م. س. لازەرێف ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٣١٤ .

کە بەشێکی زۆری لە کاری کشتوکاڵدا بەکار دەهێنرا بۆیەکا تەنها پیاوی پیر و ئافرەت و منـــداڵ لە وەرزەکاندا کاریان دەکرد ، تەنانەت بەشێکی زۆر لەو پیاوانەش کە هێشتا بە بەریانەوە مابوو ، لەبەر کەمیێك داهاتی زیاتر گوندیان بەجێ دەهێشت و دەچوونە شارە گەورەکان یا بنکە سەربازیەکان و ئەو ریگەو بانانەی بۆ مەبەستی شەڕ دروست دەکران . لە ئەنجامی هەموو ئەم هۆیانەدا لە ساڵەکانی شـەڕدا زەوی و زاریێکی زۆر بەرەڵا کرا ـ تەنها لە کوردسـتانی عیراق نزیکەی لە صەدا پەنجای ئەو زەوی‌وزارەی بەر لە شەڕ دەچێنرا هەر وا بە نەکێڵراوی مایەوە . بەم جۆرە داهاتی کوردستان بە جاریێك هاتە خوارێ و ئەو دەغڵ و دانە کەمەش کە بە هـــەزار کوێرەوەری و ئەمسـەر و ئەو سەر دەهێزایە بەرهەم تا لەشکری عوسمانی بوەستایە بە خەڵکی‌تر حەرام بوو ، لەشکریش یا زەوتی دەکرد یا بە نرخێکی زۆر هەرزان و بە پارەی بێ « رصیـــد » دەیکڕی(٨٦) . وەزعی مەڕوماڵاتیش لەوە باشـــتر نەبوو ، ئەویش یا لە ناو چوو یا سەرباز و جەندرمەی تورك قڕی تێ خست ؛ تەنانەت مەڕوماڵاتی ئـــەو هۆزانەی کوردستانی تورکیاش کـــە پەنایان بردە بەر لەوەڕگاکانی ناوچەی هەولێر و موسڵ بەرگەی نەگرت و

---

(٨٦) هەنـــدێك لە دەوڵەتە شـــەڕکەرەکان لە ژێر زەبری باری قورسی ئابووریياندا کەوتنە لێدانی دراوی بێ « رصید » .

زۆری فەوتا[87] و لە ئەنجامدا گرانییەکی بێ وێنە ڕوی کردە هەمو ماڵێك و هەمــو گوندێك و بازاری هەمو شــارێك کە خەڵــکەکەی زۆر جار ناچار دەبون بە گژوگیای دەشتودەر خۆیان بژێنن . نرخی حۆقەی گەنم لە شارێــکی وەك سلێمانیدا کە بــە نیسبەت زوربەی شارەکانی تری کوردستانەوە لە ئاگری شــەڕ دوور بــو و ژمارەیەکی کەم سەرباز و ئەفسەری تورکی تێدا بو ، گەیشتە لیرەیەکی زێڕ بۆیەکا وەك مامۆستا ڕەفیق حیلمی دەیگێڕێتەوە « نانی وشك و پاقــلەی کوڵاویش بو بو بــە دەرمان و تەنیا خــواپێداوەکان ـ ئەویش بــە دەگمەن ـ دەستیان ئەکەوت ... » و « شاردنەوەی نەرمەی مردوەکان لە تەواناى بەلەدیەدا نەما » و هەندێك ئافرەت « بە فرۆتنی لەشیان» ماوەیەك بە کولەمەرگتی دەژیان[88] .

بەم جۆرە چوار ساڵی شەڕی یەکەمی جیهان تەنها برســێتی و نەخۆشی و مردن و ماڵوێرانی و سەرگەردانیی بــۆ کورد و کوردستان هێنا و وابزانم لە ڕاســتی دوور ناکەومەوە ئەگەر بڵێم هیچ گەلێکی تری ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاست بە ڕادەی ئەرمەن و ئاسوری و کورد بە هــۆی شەڕەوە توشی نەگبەتی و نەهامــەت

(٨٧) بڕوانە :

« League of Nations . Question of the frontier between Turkey and Iraq », Geneva, 1924, P. 42.

(٨٨) ڕەفیق حیلمی ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەرگی یەکەم ، ل ٣٠ ـ ٣٢ .

نەهات و له هەمووشی سەیرتر ئەوەیە کە وا کاربەدەستانی تورکیا بە هەموو جۆرێك هەوڵیان دەدا دەستی بە خوێنی ئەرمەن سووربوویان بەسەر گەلی کوردی شەتەك دراو و زیندوی مردودا بسوون ، وەك له بەشی داهاتوی ئەم باسەدا بە درێژی دەیخەینه بەر چاو .

* * * * * *

# كردستان خلال الحرب العالمية الاولى

العضو العامل : د. كمال مظهر احمد

## القسم الثاني

### الوضع العام لكردستان قبل نشوب الحرب

كانت تركيا وايران قبيل الحرب قد وصلتا الى حافة الانهيار ، ففد كانت الحرب التركية — الايطالية والحرب التركية — البلغارية ، وخلافات الائتلافيين والاتحاديين فيما بينهم ، ومشاكل الحـدود بين تركيا وايران ، والوضع الاقتصادي والاجتماعي المتردي في كلا البلدين وعوامل ضعف اخرى ، واضحة للعيان . وكانت سـيطرة الدولتين في كردستان ولا سيما في مناطقها الجبلية وبين القبائل شبه معدومة إذكان الشباب يتمردون على الجندية وكان الفلاحون لا يعيرون اهتماما لرجال الدرك والشـرطة . اما فصائل فرسان الحميدية التي كانت قد الفت من بين القبائل الكرية للحفاظ على سيطرة الحكومة في المنطقة الكردية ولسحق

الحركة التحررية بين الشعوب غير التركية ، فقد تحولت الى جثة شبه هامدة ، وظلت مساعي الحكومة لبعث الحياة فيها دون طائل .

ومع ذلك فلم يكن الحكام العثمانيون يدخرون وسعا للاستفادة من قوة القبائل الكردية اذا ما نشبت الحرب ، فقد كانوا يدركون ان ثغرة ستحدث في صفوف قواتهم لا يمكن سدها الا عن طريق رجال القبائل الكردية . ولذلك ركزوا هممهم على ان يحولوا كردستان الى احدى قلاعهم الحصينة لمقاومة الروس الذين كانت لهم مطامع في الممالك العثمانية .

ومع ان العثمانيين استطاعوا حشد بعض الوحدات من الفرسان الحميدية على الحدود الروسية و عقدوا لهم صلات مع بعض الرؤساء الاكراد ، فان جهودهم لم تسفر الا عن نتائج ضئيلة ، وكان الكثير من رؤساء القبائل الكرديه يعلنون صراحة انهم سيقفون الى جانب الروس اذا ما نشبت حرب بينهم وبين العثمانيين . بل ان كثيرا من المثقفين الكرد كانوا يشجعون هذه الفكرة ، فمظالم العثمانيين كانت تحول دون ان يدركوا شرور خطط الروس ومطامعهم .

كان سوء الوضع الاقتصادي والاجتماعي في كردستان قبل الحرب بلغ حدا اثار اكثر من اي وقت مضى جماهير الشعب وايقظ فيهم المشاعر القومية . وكان هذا الى جانب عوامل اخرى مما جعل المطالبين بالحكم الذاتي يزدادون يوما بعد يوم . وقد برزت هذه الظاهرة في عدد من النشاطات السياسية والاجتماعية . فقد ازداد قبيل الحرب عدد المنظمات السياسية السرية العاملة في كردستان وكان وزنها يزداد سيما بين اوساط المثقفين . واخذت هذه المنظمات تصدر البيانات

والنشرات التي تبث الروح القومية وتثير مشاعر الكره تجاه مظالم العثمانيين وموظفيهم . وكانت هذه النشرات تصل الى انحاء عديدة من كردستان حيث يتداولها الناس .

وفي تلك السنوات كانت هناك ايضا منظمات اخرى نشأت بصورة علنية في ظروف انتصار ثورة الاتحاديين والتي كانت لها صحف ومجلات توزع بصورة واسعة ولا سيما بين المثقفين وكان لها وزن كبير بينهم . وظلت هذه المنظمات تعمل حتى نشوب الحرب حيث حلت بسبب سوق كوادرها الى ساحة القتال .

وبالرغم من ان اسباب عدة ادت الى ان يكون نشاط الوطنيين الاكراد في تركيا اكثر منه في اي مكان آخر ، فان كردستان الايرانية هي الاخرى لم تخل من نشاط سياسي كردي ملموس . فهناك ايضا تأسست عدة منظمات وابرازها منظمة ( جيهانداني ) التي تميزت بانها كانت تعمل لقيادة الحركة الكردية وفق نهج صحيح وفي اطار موحد.

كان من ابرز وجوه النضال الثقافي للجمعيات والمنظمات والشخصيات السياسية الكردية آنئذ العمل لنشر التعليم بين الناشئة والجيل الفتي الكردي والعناية ببعث التراث الادبي الكردى والتقاليد القومية في كردستان . وقد تاسست لهذا الغرض عدة جمعيات ثقافية كان ابرزها ( جمعية نشر التعليم الكردي ) التي انشأها خليل خيالي وقد اقامت هذه الجمعية مدرسة خاصة للاطفال في استانبول .

وفى ايران كان يوجد ايضا نشاط مماثل قادها عبدالرزاق بدرخان. وقد اتسع نشاط بدرخان هذا الى حد كبير ، حيث انشأ جمعيه ثقافية

وكان يعمل لانشاء مطبعة وعـدة مدارس . وتمكن اخيراً من فتح مدرسة كردية في ( خوي ) من تبرعات الاهالي .

وفي هذه الفترة اتخذت خطوات تدل على الاهمية الخاصـة التي كان يتسم بها النشاط الثقافي والفكري الكردي آنئذ ففي تركيا اتجه التفكير نحو ايجاد طرق لتوحيد اللهجتين الكرمانجية والســورانية . وفي ايران كان عبدالرزاق بدرخان يسعى عن طريق القنصل الروس في ( خوي ) لجلب المستشرق المعروف اوربيلي الى كردستان لوضع قواعد اللغة الكردية وتأليف قاموس كردي وترجمة نتاجات الادب الروسي الى الكردية . كما انه طالب بتأسيس قسم كردي في معهد الاستشراق بپتراوگراد تكون مهمته الاولى وضع ابجديه خاصـــة للغة الكردية على اساس الابجديه الروسيه .

ومع أن كردستان الجنوبيـة ( كردستان العـــراق ) كان بمعزل عن هذه النشاطات الا أن اصداء احداث كردستان تركيا كانت تنعكس في هـذه المنطقة ايضاً . فكانت اعداد من النشرات الكردية الصادرة في كردستان تركيا تصل الى بعض انحاء كردستان الجنوبيـة . وقد بدأ اصـــدار جريدة كرديه — تركيه فيهـــا قبيل الحرب باسم ( بانـك كرد — نداء الكرد ) كانت تهتم بمسائل نشر التعليم ودور الثقافة في حياة الامم . كما كانت تعنى بالحياة الاقتصادية واحياء التاريخ الكردي . ومن الامثلة الاخرى على نشوء ونمو الفكرة القومية في كردستان الجنوبية ايضاً ان الشيـخ محمود أقام له صلات مع البدرخانيين في عام ١٩١٣ وكان يسعى للاتفاق معهم في النضال لتحرير كردستان من السيطرة العثمانية واقامة دولة فيدراليه فيهـا ، كما ان الشيـخ اوفد

بعض انصاره الى روسيا ايضاً للتداول حول مستقبل كردستان .

ومرة اخرى بلغ الاستياء الشعبي لدى الجماهير الكردية ونضالها من اجل التحرر حد الانفجار قبيل الحرب فاندلعت نيران الثورة في مناطق عديدة وحدثت عدة انتفاضات كان اهمها ما وقع في ربيع ١٩١٤ في منطقة بتليس تحت شعار العمل وفق احكام الشرع والقضاء على مظالم الاتراك . وقد اشترك في هذه الانتفاضة عدة قبائل كردية وانتشر لهيبها حتى شمل مناطق واسعة ، بل وأن عدداً كبيراً من جنود الجيش العثماني من الاكراد انضموا اليها . وقد تفاوض الثوار مع الارمن والآثوريين لتوحيد مساعيهم معهم وضمان ضمهم اليهم . وتوجس العثمانيون خيفة من هذه الانتفاضة التي جاءت في ظروف عسيرة بالنسبة لهم بسبب من ان اندلاع الحرب كان واضحاً في الافق السياسي فجمعوا جيشاً كبيراً للقضاء على الانتفاضة وساعدهم في ذلك خطأ استراتيجي كبير وقع فيه الثوار الا وهو تركهم مواقعهم وقيامهم بمحاصرة بتليس التي استطاعوا تحريرها ، حيث تمكن العثمانيون من تطويقهم داخل المدينة والسيطرة عليهم واخمدوا الحركة واعدموا عدداً من قادتها وملأوا السجون بالمواطنين .

وقبيل الحرب كان الوضع في منطقة بارزان ايضاً متدهورا ، وكان الناس على وشك ان يحملوا السلاح حيث التفوا حول الشيخ عبدالسلام البارزاني الذي كان بدوره يحرض رؤساء القبائل الكردية على الاتحاد فيما بينهم للضغط على الأستانة للتخلي عن سياسة اهمال كردستان . ولكن الحكام العثمانيين لم يكونوا مستعدين للانصياع لمثل هذا الضغط ولا كان بوسعهم ذلك . وهكذا فبعد ان زادت السلطة

الضرائب على الفلاحين تمردت معظم مناطق بهدينان في ربيع ١٩١٤ وكان الشيخ عبدالسلام يسعى لاشعال نار الثورة في كردستان كلها ويعمل لتحريك بعض الدول الكبرى (سيما بريطانيا وروسيا) لمساندة مطالب الاكراد واكراه العثمانيين على الانصياع لهم .

كان العثمانيون يخشون ان تفلت الامور من ايديهم من جراء هذه الثورة سيما وانه كان بوسع الشيخ عبدالسلام كسب ود عدد كبير من القبائل الكردية في العراق وايران وان يضيق الخناق على العثمانيين عن طريق حروب العصابات ، مما قد يؤدي الى ان يفلت زمام الامور من ايديهم في الموصل وبغداد ايضاً . ولذلك بادروا الى تعبئة جيش كبير هاجموا به الثوار في حزيران ١٩١٤ واخمدوا الانتفاضة في معظم مناطقها واضطر الشيخ عبدالسلام وبعض رفاقه لاجتياز الحدود الى ايران حيث استقروا هناك ردحاً من الزمن .

كل هذه الحركات والانتفاضات لم تقنع العثمانيين بانتهاج سياسة اخرى سليمة ، بل بالعكس كانوا يتشددون في نهجهم كل يوم اكثر فاكثر . فكان « ارقى » المراحل التي بلغها هذا النهج هو خطة تهجير الاكراد الى مناطق الاناضول الغربية وتوزيعهم بين اتراك تلك المناطق بقصد صهرهم واذابتهم . ولكن نشوب الحرب حال دون تنفيذ هذه السياسة .

وهكذا فقد كان الاستياء والغليان الشعبي وانتشار الوعي القومي ومظاهر اخرى هي التي تشكل الاطار العام للوضع السائد في كردستان قبيل الحرب بل يمكننا القول انه لو لم تنشب الحرب لكان بالامكان

ان تتحول كردستان الى بلقان جديدة للامبراطورية العثمانية ، ولكن نشوب الحرب ترك آثاراً اخرى على حياة الشعب الكردي ومصير وطنه ، حتى ان كردستان باتت واحدة من اهم ميادين القتال في الشرق الاوسط ، وقد استطاع العثمانيون ان يجندوا ، مستغلين المشاعر الدينية لدى الاكراد ، عدداً كبيراً منهم وساقوهم الى ميادين القتال .

## القسم الثالث

## كردستان في اتون الحرب

وهكذا فرغم الاستياء الشامل الذي كان يعم اوساط الشعب الكردي فان العثمانيين استطاعوا ان يزجوهم في القتال مستغلين في ذلك ضروب الحيل والمكائد واهمها اثارة الحس الديني لديهم ، عدا الوعود التي كانوا ينشرونها يميناً وشمالا باقامة الحكم الذاتي لهم ، رغم انهم كانوا يعلقون تنيفذ ذلك الوعد على انتهاء الحرب . والواقع ان الشعب الكردي لم يكن بمستطاعة البقاء بمعزل عن القتال بعد ان اصبحت بلاده ميداناً لقوات ثلاث دول هي تركيا وروسيا وانكلترا ، سيما بعد ان دخلت تركيا الحرب ضد الحلفاء . ومنذ ان اصبحت تركيا طرفاً رسمياً في القتال اخذ الحلفاء ، ولا سيما الروس يحرضون الاكراد ضدهم وعقدوا لهذه الغاية اتفاقيات مع بعض الرؤساء الاكراد وحتى ان الشيخ عبدالقادر شمزينان وعدهم بالمساعدة بكل قواه شريطة ان يضمنوا الحكم الذاتي للاكراد . وعلى هذا الاساس فقد نشر نداء في

كردستان يطالب فيها الاكراد بعدم الوقوف بوجه الجيش الروسي . وهكذا اخذت قوات المتحاربين تتقاتل في كردستان حوالي اربع سنين ، وقد تركت بعض هذه المعارك اثراً كبيراً في تحديد مصير المعركة . ودمرت مساكن الالوف من القرويين الاكراد وخر الالوف من الشباب الكرد صرعى في ميادين القتال ، فقد كان بعض القطعات التركية تتألف في معظمها من الاكراد .

ولكن لم تنقض مدة طويلة على نشوب الحرب حتى اخذ الجنود الاكراد يفرون افراداً وجماعات من سوح الوغي ، وفي بعض مناطق القفقاس كان رؤساء القبائل الكردية ينضمون مع قبائلهم المقاتلة واسلحتهم الى الجانب الروسي . ولذلك فان الجيش العثماني في مناطق آذربايجان والقفقاس كان يمنى بالهزائم الشنيعة فيتراجع أو يستسلم . وقدم الجيش العثمانى في الجبهة الشرقية ضحايا كثيرة في الارواح والمعدات واستطاع الجيش الروسي احتلال مواقع كثيرة في المدن التركية الشرقية مما سهل مهمة ضرب الجيش العثماني في ايران ايضاً .

ومع ان ايران اعلنت رسميا حيادها الا انها لم تكن بمعزل عن نار الحرب . فكانت آذربايجان وكردستان بين ميادين القتال ، وكان الاتراك والالمان قد اعطوا اهمية خاصة لهذه المناطق في تقديراتهم العسكرية إذ كانت تركيا تريد الاستيلاء على هذه المناطق وكانت المانيا تريد من خلال ذلك تثبيت مواقع اقدامها في ايران كلها . ولذلك فان عملاء الاتراك والالمان سواء بسواء كانوا يعملون لاثارة المشاعر الدينية لدى الأكراد الى جانب العثمانيين ضد الانكليز والروس الذين

كانوا احتلوا المناطق الشمالية الغربية والجنوبية الغربية لايران .
ولكن الروس كانوا يعملون بدورهم لكسب رؤساء القبائل الكردية الايرانية . وهكذا فان الفريقين استطاعا كسب عدد من هذه القبائل الى جانبهما .

ولكن لم يتوقف الامر بالنسبة لكردستان ايران عند هذا الحد فعند بدأ الحرب مباشرة احتلت القوات التركية بعض انحاء كردستان ايران حيث كانت تريد بالاشتراك مع الألمان وضع العراقيل في طريق التعاون الروسى الانكليزي ولهذا الغرض كانت تركيا تعمل لابعاد الروس من منطقة اورمية واتخاذها قاعدة حصينة لها حيث استطاعت احتلالها وكسب بعض رؤساء قبائلها الى جانبها مما ساعد على تحسين مواقع الاتراك و الالمان في مناطق اخرى من كردستان ايران . ففى كرمانشاه تأسست حكومة من عملاء الترك والالمان باسم (الحكومة الوطنية) كان يرأسها الاقطاعى المعروف نظام السلطنة . وهكذا عم النفوذ التركي - الألماني كردستان الأيرانية وتقدم الاتراك حتى وصلوا مشارف همدان وبذلك بدأوا يشكلون عقبة كبيرة في طريق مخططات الحلفاء في الشرقين الادنى والاوسط مما دفع بالانكليز والروس الى وضع مخططات جديدة مضادة بحيث استطاعوا خلال اشهر قلائل استرجاع المناطق المحتلة وانهاء السيطرة التركية عليها . وهكذا وصلت القوات الروسية الى الحدود التركية الايرانية ، غير ان الاتراك استطاعوا استرجاع كرمانشاه وهمدان ثانية بعد اشهر قلائل . الا ان الروس مالبثوا ان اعادوا الكرة وهزموا الأتراك ، وفي اوائل عام ١٩١٧ أصبحت ايران ثانية تحت قبضة الروس والانكليز بل ان القوات

الروسية استطاعت التوغل الى داخل العراق بحيث وصلت الى مناطق بينجوين وخانقين ورواندوز مستهدفة من ذلك تسهيل مهام القــوات الانكليزية في جنوب ووسط العراق .

ان ايا من الدول التي كانت تتبادل احتـــلال المناطق الكرديه والاذربايجانية لم تكن تعيـــر للحكومة الايرانية أي انتباه ، وكانت تعامل الأهلين بقسوه متناهية بحجة انهم وقفوا الى جانب الدولة الاخرى . فالاتراك مثلا كانوا يضطهدون المسيحيين اضطهادا بشـعا ويحرقون قراهم ، وكانوا يعاملون مناوئيهم بوحشية . وفي سقز شنقوا زعيمين كرديين وابقوا جثتيهما معلقتين عدة ايام وهكذا كان شأن الروس الذين لم يقلوا عن الاتراك في بشاعة الاعمال .

وقد اثارت مظالم المحتلين جماهير كردستان فهبت لمقـاومتهم . وهكذا حدثت انتفاضات جماهيرية في معظم انحاء كردستان سواء ضد الروس او ضد الترك . وفي الواقع لم يضع حـدا لمظالم الجنود الروس غير ثورة اكتوبر الاشتراكية التي ابعدتهم عن كردستان ايران وتركيا ، مما مهد الطريق لعودة الاحتلال التركى مجددا لهذه المناطق . لقد قلبت ثورة اكتوبر موازين القوى ونسف مخططات الدول الكبرى وأهدافها البعيدة في مختلف المناطق ومنها الشرق الاوسـط ، مما ادى الى تبدل ملموس في سياسة بريطانيا تجاه كردستان . فبخلاف موقفها في سني ماقبل اكتوبر ، اخذت بريطانيا تعمل لتثبيت اقدامها في كردستان وكان من نتائج ذلك ان نار الحــرب امتدت في السنه الاخيرة من الحرب الى كردستان الجنوبية ايضا والتي لم يكن قد وطأ ارضهـا الى ذلك الحين سوى الجيش الروسى ولايام قلائل .

لم يمض على دخول تركيا الحرب رسميا الا يوم واحد عندما هاجمت القوات الانكليزية العراق واحتلت ميناءه الواحيد (الفاو)، ثم احتلت البصرة في ايام قليلة، واخذ الاتراك يحرضون الناس على الجهاد ضد «الكفار» وهكذا احتشد حوالي عشرة ألاف مقاتل كان اكثر من الف مقاتل منهم من الاكراد قرب الناصرية لمساندة الترك، ولكنهم هزموا في معركة الشعيبة نيسان ١٩١٥ هزيمة شنعاء. وقد ادى هذا اضافة على المعاملة السيئة التي كان يتلقاها المقاتلون من الضباط الاتراك الى ان ينسحبوا من ساحة القتال ويعودوا الى مناطقهم.

واخذ الجيش البريطاني يزحف نحو بغداد بدون ان يلقى مقاومة حتى بلغ الكوت حيث استطاعت القوات التركية تطويقه واجباره على الاستسلام، الا ان البريطانيين مالبثوا ان اعادوا الكرة واضطروا الاتراك الى الانسحاب وإقتحموا بغداد في مايس ١٩١٧.

وبعد انتصار ثورة اكتوبر اتخذت خطط البريطانيين طابعاً جديداً ونهجا اخرا، إذ دخلت القوات الانكليزية في سباق مع الزمن لاحتلال كردستان واضعة نصب اعينها الاستيلاء على ميراث القياصرة. ومن ابرز معالم هذا النهج الجديد ان الانكليز لم يحتلوا مابين البصرة وبغداد الا خلال حوالي ثلاثة اعوام من الحرب، حين انهم خلال العام الاخير منها فقط احتلوا معظم مناطق العراق الاخرى وفرضوا سيطرتهم عليها. منها ايضا ان الانكليز خاضوا معركة ضارية فى جنوب الموصل قبل توقيع الهدنة باثني عشر يوما ضحوا خلالها بحوالي الفي جندي في حين ان الكل كانوا يدركون ان تركيا و حلفاءها يستسلمون اليوم او غدا، كل ذلك في سبيل ان يضمنوا

لانفسهم التقدم مسافة اكثر باسرع مايمكن و ذلك ليكونوا في اقرب نقطة من الحدود الروسية .

وهنا يجب الاشارة الى ان الانكليز اخذوا بعد احتلال بغداد يرسلون ضباطهم المطلعين الكفوئين ولاسيما الذين عملوا في الهند الى كردستان لتمهيد الطريق لجيوشهم واقامة سلطتهم السياسية فيها . وهكذا فقد استطاعوا بسط سيطرتهم على اجزاء عديدة من كردستان واحتلوا الموصل ايضا رغم التوقيع على هدنة مودروس لتكون جزء من الدولة التي كانوا يريدون اقامتها فيها بعد وتنفيذاً لمخطط قديم لهم كان ينصب على ان حدود الهند الغربية تمتد عبر الفرات وان هذه الحدود « لايمكن السيطرة عليها الا عبر الموصل » .

وهكذا فان كردستان بأسرها تحولت خلال أعوام ١٩١٤ ـ ١٩١٨ الى احد الميادين الهامة للقتال في الشرقين الادنى والاوسط وكان الانكليز والروس والترك والقبائل الكردية المساحة وفرسان الحميدية وعملاء الالمان يلعبون دورهم على مسرحها كل وفق اسلوبه الخاص . ولو لم تقع ثورة اكتوبر لما ظلت كردستان في ايدي اي من محتليها القدامى . ومع هذا فان الحرب ادت الى حدوث تغييرات سياسية واقتصادية مهمة في معظم انحاء كردستان ولاسيما كردستان الجنوبية التي وقعت تحت سيطرة الانكليز مباشرة ، كما انها سببت نتائج مدمرة لها وادت الى دمار وتشرد وأضرار كبيرة للالوف من الاكراد .

## القسم الرابع

## نضال الشعب الكردي في سنوات الحرب والاضرار التي اصابته في تلك السنين

مع ان الحرب سببت للشعب الكردي محنا وويلات كثيرة وصارت عقبة كبيرة في طريق تطوره وتعمق محتوى حركته التحررية الوطنية ، فان هذا الشعب لم يكف عن النضال خلال سنوات الحرب ، وكانت العوامل المحركة لهذا النضال باقية على حالها الى حد كبير ، بل ان بعضها تعمقت اكثر فاكثر . فقد اشتدت السياسة الشوفينية للحكام العثمانيين بسبب الحرب وازداد استياء الناس من اساليب الاتراك الدكتاتورية . وهكذا ففي ربيع ١٩١٥ حمل اهالي بوتان السلاح بوجه الاتراك ، كما ان اهالي درسيم طردوا الجنود الحكوميين من منطقتهم في تلك الفترة وحكموا انفسهم ذاتيا مدة تربو على السنة الواحدة . وفي السنوات الاخيرة من الحرب واثر الهزائم المتكررة للجيش العثماني اشتد النضال التحرري الكردي وعم كردستان الجنوبية ووقعت عدة تمردات في العمادية والسليمانية واماكن اخرى . واخذ الشيخ محمود يخوض النضال ضد الاتراك بقصد القضاء على سيطرتهم في كردستان الجنوبية على الاقل حيث اقتربت منها القوات الانكليزية الغازية ، كما أخذ يقيم العلاقات مع اعداء الدولة العثمانية حيث طلب المساعدة من الروس وراسل شريف مكة وفيما بعد عقد الصلات مع الانكليز .

وفي كردستان تركيا كان السخط الشعبي في غليان مستمر ، ففي صيف ١٩١٧ هب سكان درسيم ثانيـة وهب معهم لاول مرة سكان خربوط وفيما بعد سكان ماردين وديار بكر ومعهم عرب تلك الديار . وكانت لهم صلات مع الجيوش الروسية التي كانت تقاتل في تلك المناطق . وفي خريف العام ذاته هب سكان بتليس مجددا بوجه الجيش العثماني .

وفي تلك السنوات اخذ اكراد ايران ايضاً يخوضون غمرة النضال بشدة وحملوا السلاح في مناطق عديدة بوجه الحكام ، وساهم كثيرون منهم في حركة الجنكليين في منطقة گيلان . وكان للمنظمات الثورية العاملة في صفوف الجيش الروسي صلات مع بعض المثقفين الاكراد ، وحتى انه تكونت في كرمانشاه لجنة سرية ثورية مشتركة من ممثلي الطرفين .

وفي هذه الفترة تعدى النضال الكردي حدود كردستان ، فبعد ان لاح في الافق بوضوح ان الدولة العثمانية اصبحت قاب قوسين او ادنى من الموت اخذ المثقفون الاكراد خارج كردستان ينشطون من اجل إثارة المسألة الكردية في مجالات العمل السياسي العام آنئذ . ففي القاهرة اسس ثريا بدرخان جمعية سياسية لتوضيح المسألة الكردية اقامت الصلات مع المثقفين الاكراد الاسرى لدى الجيش الانكليزى . وكان ثريا بدرخان ينوي حتى عقد مؤتمر للمثقفين الاكراد في الخارج في احدى المدن الاوروبية لدراسة الوضع السياسي وبحث مستقبل المسألة الكردية على ضوء الوقائع الراهنة آنئذ .

وهكذا فان احداث الحرب ومآسيها والسياسة الدكتاتورية لحكام تركيا لم تستطع وقف النضال القومي للشعب الكردي في سنوات الحرب ، الا ان هذا النضال لم يبلغ اهدافه الكبرى وقد حالت دون ذلك فضلا عن الوضع السياسي عوامل اخرى ناجمة عن تخلف المجتمع الكردي وانخفاض مستوى الوعي لدى جماهير كردستان آنئذ . فقبل كل شيء ظلت كل إنتفاضة كردية تسير في مجراها الخاص ولم تنصب جميعها في اطار موحد المستطيع الصمود بوجه العدو وفرض اهدافها التحررية . فمع ان كثيراً من تلك الانتفاضات كانت تحدث في وقت واحد الا ان قادتها ماكانوا يفكرون باقامة اي صلة ورابطة فيما بينهم . هذا فضلا عن ان ايا من هذه الانتفاضات ما كانت تملك تاكتيكا وستراتيجا واضحاً . ومع كل ذلك ينبغي الاقرار بان النضال الكردي في سني الحرب كان احد العوامل المساعدة لانهيار السلطة العثمانية وتطور الوعي القومي لدى الجماهير الكردية وترسخ شعار الحكم الذاتي وحتى شعار المطالبة باستقلال كردستان ، مما مهد الجو الملائم لانتقال حركة التحرر - الوطني للشعب الكردي الى مرحلة اعلى جديدة .

ومن ناحية اخرى فان استمرار النضال الكردي ادي الى المزيد من الحقد لدى الحكام الاتراك ضد الشعب الكردي وحركته التحررية في سنوات الحرب سيما بعد ان تاكدوا ان هذا الشعب لا يقاتل لهم بأخلاص وان ابنائه الجنود ينهزمون من ساحة القتال وينضمون الى جانب ثوار شعبهم ، وعندما ايقنوا انهم لن يستطيعوا استخدام الشعب الكردي آلة طيعة بايديهم ضد الاقليات الدينية . ولذلك فانهم تاكدوا

من ضياع الشعب الكردى من ايديهم ، فبدأوا يعملون من اجل صهره في بودقتهم ، ولتحقيق هذه الغاية اصدروا في السنوات الاخيرة من الحرب اوامر ومراسيم خاصة لتشتيت الشعب الكردي بين القرى التركية على ان لا تزيد نسبة كل مجموعة كردية من ٥٪ — ١٠٪ من السكان كما اتخذوا قرارا حول ابعاد الرؤساء الاكراد الى غرب الاناضول ومنع اقامة اي نوع من الصلة بينهم وبين اتباعهم . وقد بدأوا بتنفيذ هذه الخطة قبل انتهاء الحرب واستطاعوا بقوة السلاح ابعاد حوالي ٧٠٠ الف كردي من كردستان الى المناطق النائية ومات حوالي النصف منهم جوعا او من شدة البرد في الطريق ، ولم يستطع معظم من بقي على قيد الحياة ان يعودوا الى اماكنهم الا بعد انتهاء الحرب .

وفضلا من ذلك فان الجيش العثماني ابعد غالبية سكان دياربكر وموش وبتليس الى اماكن اخرى تحت شعار متطلبات الحرب ، وقد اضطر العديد من هؤلاء للجوء الى المدن والعيش في ظروف قاسية بحيث كانوا ياكلون جيف الحيوانات او جثث الموتى من شدة وطأة المجاعة المخيفة التي خيمت عليهم ولم يقف الامر عند هذا الحد فقد سببت سنوات القتال البؤس والشقاء لآلاف العوائل الكردية وعم القحط والمجاعة معظم انحاء كردستان ، ولم تكن اي منطقة كردية بمنجى من هذه الكارثة الداهمة ، ففي العديد من المناطق مات اكثر من نصف السكان حتى ان البعض قدروا ضحايا المجاعة بنصف مليون شخص .

وبسبب من ظروف الحرب تدهورت اقتصاديات كردستان تدهوراً

فظيعا ، حيث ان الايدي العاملة سيقت كلها الى ميادين الحرب بحيث لم يبق في الحقول الا الشيوخ والنساء والاطفال ، حتى وترك العديد من هؤلاء ايضا قراهم الى المدن بحثا عن لقمة الخبز وطلبا للامان . وهكذا فقد بارت الاراضي واهملت زراعتها فانخفض الانتاج ، وكان الجيش العثماني يستولي على الجانب الاكبر من ذلك المنتوج القليل وذلك اما بالقوة او مقابل أوراق نقدية لم يكن لها رصيد ولم يبق امام سكان معظم المناطق سوى ان يقتاتوا على الاعشاب البرية .

وهكذا فان سنوات القتال الاربع لم تجلب لكردستان الا البؤس والشقاء والدمار والموت والجوع ، ولا نغالي إذا قلنا ان اي شعب لم يعاني من ويلات القتال ما عاناه الارمن والآثوريون والاكراد ، ومع ذلك فان الحكام الاتراك كانوا يعملون لالقاء تبعة ما قاساه الارمن على ايديهم على عاتق الاكراد كما نتحدث عن ذلك فيما بعد .

* * * * * *

# پێشگر و پاشگر

ئەندامی کارا : شێخ محەمەدی خاڵ

پێشگر و پاشگر دوَ زاراوەی تازەن ، یەکەمیان دانراوە بۆ ئەو بەشە لێکدەر« جزئی ترکیبی »یەی کە ئەکەوێتە پێش بەشی کرداری « جزئی حدثی » یەوە ، وە لەگەڵیا ئەبێ بە یەك وشـە ، بە جۆرێك کە مەبەستێـکی تازە بگەیەنێ ، کە جاران هیـچ بەشێك لەو دوَ بەشە ، ئـەو مەبەســتەی نەگەیاندووە ، وەك : « هەڵماڵین ، داماڵین ، راماڵین » کە مەبەستیان جیایە لەگەڵ مەبەستی « ماڵین » دا .

دوَهەمیان دانراوە بۆ ئەو بەشە لێـکدەرییەی کە ئەکەوێتە پاش بەشی کردارییەوە ، وە لەگەڵیا ئەبێ بە یەك وشە ، بە جۆرێك کە مەبەستێـکی تازە بگەیەنێ ، کە جاران هیـچ بەشێك لەو دوَ بەشە ئەو مەبەســتەی نەگەیاندووە ، وەك : « هاتنەوە ، کردنەوە ، لەرینەوە » .

دکتۆرە نەسرین فەخری لە ژێر ئەم باسەدا ، وتارێـکی دوَر و

درێژی نوسیوە ، لە ژمارە یەکی گۆڤاری کۆڕی زانیاری کوردا[1] ، وە دوَ سێ رەخنـــەی گرتووە لەو باسی پاشگرەی کە لەسـەرەتای فەرەهەنـگی خاڵـەوە نوسراوە زۆر بە کورتی ، نەك بـــە ناوی دەستورێـکی تێـکراییەوە بۆ زمانی کوردی ، بەڵـکو هـــەر بۆ ئەوەندەی کە نیشـــان بدات بۆچی « هەڵهاڵتین . پێ‌لێ‌خستن . پێ لێ‌هەڵبڕین . پێ‌لـــێ‌داگرتنەوە » کراون بە وتەی فەرهەنـگ و راڤە کراون ، لە کاتێـکا کە یەکەمیان بە دیەن دوَ وتە و ، دوَهەمیان سێ وتە و ، سێهەمیان چوار وتە و ، چوارەمیان پێنج وتەیە . ئنجا وا لەم ژمارەیەدا نەختێ بە درێژتر قسەی لێ ئەکەین ، وە تۆزێ زیاتر روَنی ئەکەینەوە .

جا بـۆ ئەوەی کە لە ناوقەدەوە تێ‌هەڵنەکەین نەمویست هـەر وەرامی رەخنەکان بدەمەوە بە بێ روَن کردنەوەی باسەکە ، لەبەر ئەوە ناچار لە ســەری باسەکەوە دەستمان پێ کرد ، وە لە بنـــەڕەتەوە باسەکەمان دامەزراند ، تا خوێندەوارانی بەڕێز چەواشە نەکەین .

## واژە گۆڕیی
„ تصریف „

واژەگۆڕیی : زانینێـکە قسـە لە هەڵـگێڕان و وەرگێڕانی

(۱) « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، بەرگی یەکەم ، بەشی یەکەم ، سالی ۱۹۷۳ ، ل ۲۳٤ ـ ۲۷۳ .

وتەی کوردیی ئەکات . ئەم هەڵگێڕان و وەرگێڕانە هەر لە ناو کردارا ئەبێ ، نەك لە ناو پیتا .

کردار « فعل » لە چاووگ « مصدر » دروست ئەکرێ .

## چاووگ

چاووگ : بە وتەیەك ئەڵێن کە کردەوەیەك بگەیەنێ بە بێ کات « زمان » و بکر « فاعل » ، وە لە دواییەکەشییەوە « ن » ببێ . ئەم نوونە پیێ ئەڵێن : ئامراز « أداة » ی چاووگ . پیتەکانی تر ـ کە کردەوە ئەگەیەنن ـ پێیان ئەڵێن : مایە « مادە » ی چاووگ .

چاووگ پێنج جۆری هەیە (١) ئەلفی (٢) تائی (٣) دالی (٤) واویی (٥) یائی ، چونکە لە پێش نوونی چاووگەوە ، هەمیشە یەکێك لەم پێنج پیتانە ئەبێ ببێ ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ، هەر یەکەی ناو ئەبرێ بە ناوی یەکێك لەم پیتانە :

١ـ چاووگی ئەلفی وەك : پێچان . برژان . سووتان . بێژان . هەڵسان .

٢ـ چاووگی تائی وەك : نوستن . کوشتن . گرتن . کەوتن . خەوتن .

٣ـ چاووگی دالی وەک : کردن . بردن . مردن . خـواردن . چاندن .

٤ـ چاووگی واویی وەک : چوّن . چوّن . بـوّن . روّن . گورۆن .

٥ـ چاووگی یائی وەک : برّین . درّین . زانین . روانین . نوسین .

## چاووگی سادە و لێکدراو

چاووگ بە هەر پێنج جۆرەکەیەوە ، یا سـادە ئەبێ ، یا لێکدراو ، سـادە : ئەوەیە کە تەنیـا وتەیەک بێ ، وەک ئەو میسالانەی کە رابوردن .

لێکدراو : ئەوەیە ، کە دروست کرابێ لەدوَ پارچە ، وەک : ( هەڵماڵین ) ، یا لە سـێ پارچە ، وەک : ( پێ لێ خستن ) ، یا لە چوار پارچـە ، وەک : ( پێ لێ هەڵبرّین ) ، یا لە پێنج پارچە ، وەک : ( پێ لێ داگرتنەوە ) .

ئەو پارچەیەی کە ئیـش و کار ئەگەیەنێ ، وەک : ( ماڵین . خستن . برّین . گرتن ) لەم نموونانەدا ، پێی ئەڵێن : بەشی کرداریی « جزئی حدثی » ئەوانیکەی تر وەک : ( هەڵ ، پێ لێ . پێ لێ

هەڵ . بێ لێ دا . ... ـەوە ) پێیـان ئەڵێین : بەشـی لێکدەریتی « جزئی ترکیبی » واتە بە هۆی ئەم پارچانەوە ، لێکدراوەکە پێک دێ .

بەشی لێکدەریتی لە پێشـەوە ئەبێ ، وەك : ( هەڵکردن . داکردن ) ؛ لە دواوە ئەبێ ، وەك : ( هاتنـــەوە . چوونەوە ) ؛ لە هەردوو سەرەوە ئەبێ ، وەك : ( داکردنەوە . راکردنەوە ) . ئەوی لە پێشەوە بێ پێی ئەڵێین : ( پێشـــگر ) ؛ ئەوی لە دواوە بێ پێی ئەڵێین : ( پاشگر ) .

ئەو بەشە لێکدەرییەی کە لە دواوە ئەبێ ، هەمیشـە واوێك ئەبێ لە ناوەندی دوو «ە» دا بـــەم جۆرە ( ەوە )[2] یاخو بڵێین : واوێك ئەبێ لە ناوەندی دوو سـەرا ، یا دوو بزوێنـدا ، ئنجا خوای ئەکرد بزوێنی یەکەم ، پیتی پەیوەند ئەبوو ، یا لە پیتـە بنەڕەتییەکانی ئەم پاشگرە ئەبوو ، مەبەسی ئێمە لێرەدا هەر ئەوەندەیە ، کە پاشگر هەر لەم شێوەیەدا دەرئەکەوێ ـ کە واوێکە لە ناوەندی دوو بزوێنا ـ وە بە بێ ئەم شێوەیە هەرگیز دەرناکەوێ لە ناوچەی ئێمـەدا ، وە

(٢) ئـەو دەســتووری زمانی کوردییـەی کە لە سـاڵی ١٩٤١ و ١٩٤٢دا نووسیومە ، بە دەستی خۆم ، وە ئێستا ئەو دەستنووسە ماوە ، ئاوا ( ەوە ) نووسراوە ، نەك وا ( هـ و هـ ) وە ئەم هەڵەیە کە کراوە لە سـەرەتای فەرهەنگی خاڵەوە ، یا هەڵەی چاپە ، یا هەڵەی ئەو کەسەیە کە نسخەی چاپی نووسیوەتەوە ، یەکێك وتەی ( بردنەوە . چوونەوە . کردنەوە . خواردنەوە ) ئاوا بنووسێ ، چۆن نەڵێ ئەم پاشگرە « هـ و هـ » یە ؟!!!.

هیچ مەبەستێك لە مەبەستەکانی ناگەیەنێ .

لێرەدا دکتۆرە نەسرین ئەڵێ ئەم پاشگرە هەر (وە)یە نەك (ـەوە)یە ، چونکە بە لای ئەوەوە ئەم (ـەوە) هەر لەگەڵ ئەو وتانەدا دەرئەکەون کە کۆتاییان بە پیتی دەنگدار « حرف صحیح ساکن » دێ ، نەك بە پیتی بزوێن « حرف علە » ، کەواتە بزوێنی یەکەم لای دکتۆرە نەسرین لە پیتە بنەڕەتەکانی ئەم پاشگرە نییە ، بەڵکو پیتی ناوەند « حرف ربط »ە ، ئەو وشانە ئەبەستێ بەم پاشگرەوە کە کۆتاییان بە پیتی دەنگدار دێ ، وەك :

کردن — کردنەوە

بردن — بردنەوە

چوّن — چوّنەوە

جوّن — جوّنەوە

هاتن — هاتنەوە

بەڵام ئەگەر وشەکە کۆتایی بە پیتی بزوێن هات ، ئەو حەلە هەر ( وە ) دەرئەکەوێ ، نەك (ەوە).

ئەمە ئەگەر واش بێ ، لە ناوچەیەکی زۆر بچکۆلانەدایە و دەستوری لە سەر دانارێ ، بەڵام ئەوی ئێمە دەستورەکەمان لە سەر داناوە ، هەمو ناوچەی سلێمانی و کەرکوك و خانەقین و دهۆك و بەشی زۆر لە ناوچەی هەولێرە ، وە هەمو کوردوستانی ئێرانە بە

هەمۆ بانە و سەقز و سنە و سابڵاغ و کرماشان و سەردەشتەوە . تەنانەت ئەوانەی کە کۆتاییان بە پیتی بزوێنیش دێ ، هەمۆیان لەم ناوچە گەورەیەدا هەر وەك ئەوانە وان کە کۆتاییان بە پیتی دەنگدار « حرف صحیحی ساکن » دێ ، وەك : کرایەوە . ژیایەوە . خولایەوە . دایەوە . پێچایەوە . بێژایەوە . هەڵسایەوە . بڕییەوە . دڕییەوە . نوسییەوە . درۆیەوە . جۆیەوە » .

ئنجا کاتێك کە ئەمەمان زانی ، ئەبێ ئەمەش بزانین کە ئەم پاشگرە هەمیشە یەکێك لەم سێ مەبەستە ئەگەیەنێ ، گەڕانەوە « عودە » ، دوبارەکردنەوە « تکرار » ، هێواشی و بەرە بەرە « تدریج » :

١ـ گەڕانەوە ، وەك : « هاتنەوە . چونەوە » لەم دو نمونەیە زیاتر نەدۆزراوەتەوە[٣] ، ئێستا لەم دو نمونەیەدا « هاتن » واتە بێیت بۆ جێگایەك یەکەم جار ، ( هاتنەوە ) واتە بێیتەوە بۆ ئەو جێگایە دوهەم جار .

« چون » واتە بچیت بۆ جێگایەك یەکەم جار . « چونەوە » واتە بچیتەوە بۆ ئەو جێگایە دوهەم جار[٤] .

---

(٣) ئەگەر گەڕانەوەش ئەڵێیت ، ئەمە لە « هاتنەوە » و « چونەوە » بەدەر نییە ، چونکە یا گەڕانەوەیە بۆ لای تۆ ، ئەوە هاتنەوەیە ، یا لەڕانەوەیە بۆ لای یەکێکی تر ، ئەوە چونەوەیە .

(٤) بەڵام چونەوەی بەفر ، یا رەنگی شتێك بەرە بەرە و لە سەر خۆ ، ئەوە لە بەشی سێهەمە ، کە تەدریجە .

٢ـ دوبارەکردنەوەی کارێك ، وەك ( دانیشتنەوە ، هەستانەوە ، سەرکەوتنەوە ، نوستنەوە ) واتە دوبارە دانیشتن و هەستان و سەرکەوتن و نوستن .

٣ـ هێواشی و بەرە بەرە « تدریج » :
نمونەکانی ئەم بەشە هێندێکیان سادەیان هەیە و هێندێکیان نییانە ، ئەوانەی کە هەیانە وەك ئەمانە :

| سادە | لێکدراو |
| --- | --- |
| بردن (ی شتێك ) | بردنەوە (ی یاریی بە هێواشی و دزە دزە ، تا هاوڕێکەت زەبون ئەکەیت ، بەڵام بردنەوەی بە مەعنا دوبارە شتێك ببەیتەوە بۆ جێگاکەی پێشوی ، ئەوە لە بەشی دوهەمە کە دوبارە کردنەوەیە ). |
| بەردان ( بەرەڵلا کردن ) | بەردانەوە (ی ئاو ) . |
| بیر چون ( بە شتێك ئەوترێ کە بۆ ساتێك لە بیرت چوبێت ) . | بیر چونەوە ( بە شتێك ئەوترێ کە بە ئێجگاریی لە بیرت چوبێ ). |
| بیرکردن ( یاد کردنی | بیر کردنەوە (لە شتێك بە وردیی و |

| | |
|---|---|
| شتێك له کاتێکا ) | به قوڵی ) . |
| پاڵدان (ی شتێك به شتێکەوه ) | پاڵدانەوه (مرۆڤ به ئاهیستە و هێواشی ) . |
| پەڕین (له شوێنێکەوه بۆ شوێنێك ) | پەڕینەوه (ی ئاو له شوێنێکەوه بۆ شوێنێك به هۆی شتێکەوه ، یا پەڕینەوه له ئاو ، یا قوتاربون له چورتێك ) . |
| بەستن | بەستنەوه(ی بانێك یا گوێسوانه ، یەك له سەر یەك ) . |
| جوڵان | جوڵانەوه(ی یەك له دوای یەك ) |
| چاکبون | چاکبونەوه(ی نەخۆش له سەر خۆ و به هێواشی ) . |
| چنین | چنینەوه(ی شتی وردی رژاو . بەڵام چنینەوەی شوێنی دڕاو له گۆرەویی له بەشی دوهەمه که دوباره کردنەوەیه ) . |
| جوین(ی خواردن ) | جوینەوه (ی مەکینه بۆ ئەو گۆشتەی که تێی ئەکرێ ). |

| | |
|---|---|
| چۆن | چۆنەوە ( ی رەنگ بە هێواشی ) . |
| خواردن | خواردنەوە(ی شتی شل بە هێواشی و قوم لە دوای قوم ، بەڵام خواردنەوە ، بە مەعنا دوبارە خواردن لە شتێك ئەوە لە بەشی دوهەمە ، کە دوبارە کردنەوەیە ) . |
| خوێندن | خوێندنەوە(ی باسێکی نوسراو وردە وردە ) . |
| دادان( ی قەڵەم ) | دادانەوە( ی پەردە ) . |
| دۆزین | دۆزینەوە( ی شتێکی ون بو ) . |
| دەست گرتن ( ی یەکێك بە یارمەتی دانی ) | دەست گرتنەوە( ی شکاو یا لە جێ چو ) . |
| دەمدان ( لەوەڕین ) | دەمدانەوە ( ی گوڵ و گەشانەوەی ). |
| ژیان | ژیانەوە( ی دارودرەخت لە بەهارانا ) . |
| سوتان | سوتانەوە ( ی برین و تەنینەوەی ). |

| | |
|---|---|
| كردن | كردنەوە(ى دەرگا يا بەرى درەخت يا گرێ بە هێواشى و لە سەر خۆ ، بەڵام كردنەوەى كارێك دوبارە ، ئەوە لە بەشى دوهەمە ). |
| كوشتن | كوشتنەوە(ى ئاژاڵ بە زۆرى ). |
| كۆكردن ( سڵ كردن ) | كۆكردنەوە ( ى شتى وردى رژاو ). |
| گرتن | گرتنەوە( ى تۆپ يا ئەندامى لە جێچو ) . |
| گۆڕين | گۆڕينەوە( ى شتێك بە شتێك ، يا گۆڕينەوەى پارە بە وردە ) . |
| لێكدان( ى دو شت لە يەك ) | لێكدانەوە ( بيركردنەوە لە شتێك بە وردى ) . |
| ماڵين ( ى گەسك ) | ماڵينەوە ( ماشينەوەى خواردن : هەرچى لە سەر خوانەكە بو هەموى ماڵييەوە ، يا ژنى فلان كەس هەرچى لە ماڵى مێردەكەيا بو هەموى ماڵييەوە و بردى ) . |
| نوسين( ى شتێك ) | نوسينەوە ( وێنە دەرهێنانى نوسراوێك ) . |

| | |
|---|---|
| وێستان | وێستانەوە(ی ئاو و خوێنی لوت ، یا لە سك وێستانەوەی ژن ) . |
| هەڵدان(ی شت سەر بەرەوژوور ) | هەڵدانەوە(ی سەری پێر و سەرقاپی شت ). |
| هەڵگەڕان ( بە دارا ) | هەڵگەڕانەوە ( یاخی بوونی یەکێك لە یەکێك ) . |

## ئەوانەی کە سادەیان نییە وەك ئەمانە

| | |
|---|---|
| ئاوڕدانەوە | تاقی کردنەوە |
| بریسکانەوە | تلانەوە |
| بوورانەوە ( ی نەخۆش ) | چەوسانەوە |
| بوژانەوە | حەسانەوە |
| پاڕانەوە | حەوانەوە |
| پلیشانەوە | خولانەوە |
| دڵخۆشی دانەوە | دامردنەوە |
| دورخستنەوە | کوژانەوە |
| ڕشانەوە | گواستنەوە |

| | |
|---|---|
| ڕوَتانەوە | گەشانەوە |
| سڵەمینەوە | لالانەوە |
| شاردنەوە | لاواندنەوە(ی مردوَ) |
| شەکانەوە | لاواننەوە (ی یەکێکی زەبوَن) |
| فلیقانەوە | لەرینەوە |
| کزانەوە | ماشینەوە(ی خواردن) |
| کوڵینەوە | هۆنینەوە . |

ئەگەر لەم بەشی سێهەمە ، بتەوێ ڕێژە « صیغە »ی دوَبارە کردنەوە دروست بکەیت ، ئەبێ یەکێك لە وتەی (دیسان ، هەمیسان ، دوَبارە) بخەیتە سەر ، بەم ڕەنگە بڵێیت : (دیسان ئاوەکە بخۆرەوە . یا دوَبارە بەفرەکە چووەوە . یا هەمیسان دەرگاکەی کردەوە . یا سێبارە یارییەکەی بردەوە).

* * * * * *

ئەم بەشە لێکدەرییانە ، هێندێکیان مەبەسدار و هێندێکیان بێ مەبەسن ، هەرکامێکیان بێ ، کە لەگەڵ بەشی کردارییەکەدا یەك کەوتن ، زۆر جار مەبەسێکی تر ئەگەیەنن ، وەك : (سەرخستن . ڕاکردن) ئێستا لە نموَنەی یەکەمدا « سەر » مەبەستێکی تایبەتی هەیە « خستن » مەبەستێکی هەیە ، بەلام کە یەك خران ،

مەبەســتەکەیان ئەبێ بەمە کە یەکێك لەزماتیەکەوە ، شتێك بخاتە بەرزاتیەك .

لە نمونەی دوەمدا « را » مەبەستی نییە ، « کردن » مەبەستەکەی ئەوەیە کە کارێك بکەیت ، بەڵام کە بۆن بە یەك ، مەبەستەکەیان ئەبێ بە هەڕا کردن .

* * * * * *

ئەم ( ەوە ) یە ـ کە یەکێك لە سێ مەبەستەکەی پێشو ئەگەیەنێ لە گەڕانەوە « عودة » و دوبارە کردنەوە « تـکرار » و هێواشی و بەرە بەرە « تدریج » ـ قیـاسییە ، وە لە هیـچ شــوێنێك ـ بە دەگمەنیش ـ دوا ناکەوێ ، وە بە هەمو چاووگێکیشەوە ئەنوسێ ، بەڵام دکتۆرە نەسرین ئەڵێ : « یەکەم و دوەـەمیان کە گەڕانەوە ، دوبارە کردنەوەیە » تەواوە . سێیەمیان نا ( واتە تەواو نییە ) چونکە هەر سێ نمونەکە پێـکەوە ( کە خواردنەوە ، چونەوە ، بردنەوەیە ) ئەچنە ژێر بەشی دوەم ( کە دوبارە کردنەوەیە ) .

ئەمە وانییــە ، چونـکە نمونەکانی فەرهەنـگی خاڵ هــەر « خواردنەوە . چونەوە . بردنەوە » ی تەنیا نییە ، تا بڵێیت — با لە روەکی تریشــەوە بێ — ئەچنەوە ژێر بەشی دوەم ، بەڵـکو نمونەکانی :ـ

« خواردنەوە » ی شتی شلە ، قوم قوم و بە هێواشی .

« چونەوە » ی بەفرە ، بەرە بەرە و لەســەر خـۆ .

« بردنەوە »ی یارییـــە ، کەم کەم و بە دزە دزە ، کە بـەم مەعنایانە نە ئەچنە ژێر بەشی یەکەم و نە بەشی دوەهـــەم ، بەڵـکو هەر لە ژێر بەشی سێهەمان و هیچی تر .

بەڵێ ئەگەر نمونەکانی فەرهەنـگی خاڵ هـەر « خواردنەوە . چونەوە . بردنەوە » بوایە ، ئەگونجا بوترایە کە ئـــەم نمونانە لە بەشی دوەهەمیشن ، بەلاّم ئەمان لە کوێ و نمونەکانی فەرهەنـگی خاڵ لە کوێ ؟!!.

لە پاشـــا دکتۆرە ئەڵێ : « نمونەی دووەم و سێهەم ( کە چونەوە ، بردنەوەیە ) ئەچنەوە ژێر بەشی یەکەمیش »(٥) کە عەودەتە .

جارێ وەکو لە پێشەوە وتمان ، نمونەکانی فەرهەنـگی خاڵ « چونەوە »ی بەفر و « بردنەوە »ی یارییە ، کە ئەمانە هەر لە ژێر بەشی سێهەمان ، وە بە هیـچ جۆرێ ناچنەوە ژێر بەشی یەکەم و دوەهـەم . جگە لەوە کە « بردنەوە » ئەگەر بە مەعنـــا بردنەوەی یاریش نەبێ « عودة » نییە ، بەڵـکو « اعادە »یە ، چونـکە « عودة » لازمە و « إعادة » « متعدی »یە ، وە ئەم دوانە ئێجگار لە یەکەوە دورن .

هەر وا دکتۆرە ئەڵێ : « سەرەڕای ئەوە ، کە هەرسێـکیان پێکەوە واتای نوێیان بە یارمەتی ئەم پاشـگرە دروست کردووە » بەلاّم ڕوداني کارەکە ( واتـــە خواردنەوە . چونەوە . بردنـەوەیە

(٥) « گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد » ، ژمارە یەك ، ل ٢٤٨ .

ـ خاڵ ـ ) وردە وردە ناگەڕێتـەوە بـۆ پاشـگری ( وە ) ، بەڵـکو ( ئەگەڕێتەوە ـ خاڵ ـ ) بۆ سروشتی کارەکە خۆی »[٦] .

ئاشکرایە لە هەمو لایەکەوە ، کە ( خواردن . چون . بردن ) ـ کە سـادەی « خواردنەوە ، چونـەوە ، بردنەوە »ن ـ خـۆیان بە بێ پاشگرەکە ، ئەم مەعنا تازانە ناگەیەنن ، بەڵـکو هەر پاشگرەکەیە کە ئەم مەعنایانە ئەبەخشێ بە ئەسڵی وتەکە ، وەك دکتۆرە خۆشـی ئەمەی گەیاندووە ، بەلام بۆچی خێرا پەشـیمان بۆتـەوە ، وە لە ناوقەدی رێـگادا پاشەوپاش گەڕاوەتەوە و ئەڵێ : « بـەلام روَدانی کارەکە کە بە وردە وردە و بەرە بەرە ناگەڕێتەوە بۆ پاشگری ( وە ) ، بەڵـکو ( ئەگەڕێتەوە ) بۆ سروشتی کارەکە خۆی » .

ئەگەر ئەمە وابێ وەکو دکتۆرە ئەڵێ ، ئەبێ وتە سادەکان خۆیان بە بێ پاشگرەکە مەعنای وردە وردە و بەرە بەرە بگەیەنن ، کە واش نییە ، کە نەشـیان گەیاند مەعنای وایە کە پاشـگرەکە ئەمە ئەگەیەنێ .

ئنجا دکتۆرە ئەگەڕێتەوە بۆ جێ گیر کردنی ئەو قسـەیەی کە وتی : « روَدانی کارەکە بە وردە وردە ، ناگەڕێتەوە بۆ پاشـگری ( وە ) بەڵـکو ئەگەڕێتـەوە بۆ سـروشتی کارەکە خۆی » ، وە بە یازە جۆر نیشانیان ئەدا ، هـەر یەکەی بە رەنگێك ، بەلام لە راستیدا هەمویان هەر گەڕانەوە و دوَبارەکردنەوە و هێواشی و بەرە

(٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٤٨ ـ ٢٤٩ .

بەرەیە کە هەر پاشگرەکە ئەیگەیەنێ ، وە سروشتی کارەکە دەستی تێدا نییە .

* * * * * *

خۆلاسە ئەم پێشگر و پاشگرە ، وەك « دینەمۆ » وان بۆ مەکینەی کارەبا ، بە هەر وتەیەکەوە کە نوسان جۆرە مەعنایەك پەیدا ئەکەن ، جگە لەوە کە وتەی :—

« هەڵ » زۆرتر جوڵانەوەی سەربەرەوژوور ئەگەیەنێ ، وەك : هەڵکێشان ، هەڵکشان ، هەڵگرتن ، هەڵماڵین ، هەڵپەڕین ، هەڵپێچان ، هەڵنان ، هەڵکردن ، هەڵوەشاندن .

« دا » زۆرتر جوڵانەوەی سەربەرەوخوار ئەگەیەنێ ، وەك : داکێشان ، داکشان ، داگرتن ، داماڵین ، داپەڕین ، داپێچان ، دادان ، دانان ، داکردن ، داوەشان .

« را » زۆرتر جوڵانەوەیەك ئەگەیەنێ کە خشکەیی و بە سەر زەویدا بێ ، وەك : راکێشان ، داکێشان ، راگرتن ، راماڵین ، راپەڕین ، راپێچان ، رادان ، راکردن ، راوەشاندن .

پاشگر : هەمیشە واوێکە لە ناوەندی دوو بزوێنا ، وە لەم جۆرە زیاتری نییە .

پێشگر : چەند وتەیەکی تایبەتین کە پێش هێنـــدێ چاووگ ئەکەون وە مەبەستێکی تازە ئەگەیەنن .

ئەو وتانە ئەمانەن : هـــەڵ ، دا ، را ، ڕۆ ، ڕێ ، راو ، لێ ، تێ ، پێ ، پیا ، سەر ، تێك ، تیا ، پێك ، بەجێ ، فڕێ ، پێوە ، ڕێ تێ ، تێـــك بەر ، پێ لێ ، رۆ لێ ، رۆ تێ ، ڕێ پێ ، رۆ لێ وەر ، پێ لێ دا ، پێ لێ هەڵ .

نموونەی هێندێك لە « بەشی لێکدەریتی » و لە بەشی « کرداریتی » .

| بەشی لێکدەریتی | بەشی کرداریتی | بەشی لێکدەریتی | بەشی کرداریتی | بەشی لێکدەریتی | بەشی کرداریتی | بەشی لێکدەریتی | بەشی کرداریتی |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەڵ | پەڕین | دا | پەڕین | را | پەڕین | ڕۆ | چوون . |
| هەڵ | کێشان | دا | کێشان | را | کێشان | ڕۆ | کردن . |
| هەڵ | کشان | دا | کشان | را | کشان | ڕۆ | نیشتن . |
| هەڵ | ماڵین | دا | ماڵین | را | ماڵین | راو | نان . |
| هەڵ | هێنان | دا | هێنان | را | هێنان | ڕێ | کەوتن . |
| هەڵ | کردن | دا | کردن | را | کردن | ڕێ | خستن . |
| هەڵ | گرتن | دا | گرتن | را | گرتن | ڕێ | بڕین . |
| هەڵ | هاتن | دا | هاتن | را | هاتن | ڕێ | گرتن . |
| هەڵ | وەشان | دا | وەشان | را | وەشان | پێ | خستن . |
| هەڵ | دان | دا | دان | را | دان | پێ | کردن . |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەڵ | وەستان | . . . | . . | را | وەستان | | |
| هەڵ | وێستان | . . . | . . . | را | وێستان | سەر | کەوتن . |
| هەڵ | دڕین | دا | تن | را | مان | سەر | خستن . |
| هەڵ | گیرسان | دا | گیرسان | را | پسکان | تێك | دان . |
| | | | | | تلەقان | | |
| هەڵ | کەوتن | دا | کەوتن | را | بوردن | پێك | هێنان |
| هەڵ | نان | دا | نان | لێ | خوڕین | تێ | خوڕین . |
| هەڵ | نیشتن | دا | نیشتن | لێ | بڕین | تێ | بڕین . |
| هەڵ | دۆشین | دا | دۆشین | لێ | کەوتن | تێ | کەوتن . |
| هەڵ | شێلان | دا | شێلان | لێ | نان | تێ | نان |
| هەڵ | سوڕان | دا | سوڕان | لێ | دان | تێ | دان . |
| هەڵ | پڕان | دا | پڕان | لێ | چوون | تێ | چوون . |
| هەڵ | چوون | دا | چوون | لێ | خستن | تێ | خستن. |
| هەڵ | بەزین | دا | بەزین | لێ | بردن | تێ | بردن . |
| هەڵ | بڕین | دا | بڕین | لێ | خشان | . . | . . . |
| هەڵ | پاچین | دا | پاچین | لێ | قەومان | . . | . . . |
| هەڵ | چوڕان | دا | چوون | لێ | کردن | تێ | کردن . |
| هەڵ | خزان | دا | خزان | پیا | چوون | تێ | چوون . |
| هەڵ | کزان | . . | . . . | پیا | چوونەوە | تێ | کوتان . |
| هەڵ | هێنجان | . . | . . . | پیا | کردن | تێ | مان . |
| هەڵ | سوڕان | دا | سوڕان | پیا | بردن | تێ | کێشان . |

. . .   . . .   دا   مردن   پیا   نان   تێ   وەردان .
. . .   . . .   دا   نەوتین   پیا   ماڵتین   تێ   شکان .
. . .   . . .   دا   مان   پێ لێ خستن   تێ   خزان .
فڕێ   دان   پێوە   بوون   پێ لێ بڕین   تیا   چوون .
ڕێ تێ   چوون   پێوە   کردن   پێ لێ نان   تیا   مان .
ڕێ پێ   بردن   پێوە   کردن   تێک بەر بوون   بەجێ   هێنان .
ڕوو لێ   نان   پێ لێ   داگرتن   تێک بەردان   بەجێ   هێشتن .
ڕوو تێ   کردن   پێ لێ   بڕین      بەجێ   مان .
ڕوو لێ   گێڕ   هەڵ   بڕین
وەر

* * * * * *

# السابقة واللاحقة

العضو العامل : الشيخ محمد الخال

للسابقة واللاحقة دورمهم في الادب الكردي ، وفي بيان المعاني المقصودة فمثلها في ذلك كمثل المولد للمحرك الكهربائي ، فكما أن كل ضغط على أحد ازراره يولد نوعا من التأثير ، كذلك السابقة واللاحقة في اللغة الكردية ، فاذا أردت حركة صاعدة ، تأتي بكلمة « هەڵ » وتقول « هەڵکێشان » ، واذا أردت حركة نازلة ، تأتي بكلمة « دا » وتقول : « داکێشان » ، واذا أردت حركة مستوية على الارض ، تأتي بكلمة « را » وتقول : « راکێشان » .

فالسابقة واللاحقة أقسام للمصدر ، والمصدر مايدل على حدث بدون زمان وفاعل ، وهو ينتهي بالنون ، فهذه النون يقال لها اداة المصدر ، والاحرف الباقية يقال لها مادة المصدر .

المصدر على خمسة أقسام : الفى ، وتائي ، ودالي ، وواوي ، ويائي ، لان اداة المصدر يسبقها احدى هذه الاحرف الخمس ، وبهذه المناسبة يسمى كل قسم منها باسم تلك الحرف التي تسبق النون .

المصدر باقسامه الخمسة اما بسيط واما مركب ، والمركب : ما ركب من جزئين مثل « هەڵھاتن » أو من ثلاثة اجزاء مثل « پێ لێ خستن » أو من اربعة اجزاء مثل « پێ لێ هەڵبڕین » او من خمسة أجزاء مثل « پێ لێ داگرتنەوە » . فالجزء الذي يدل على الحدث مثل « هاتن . خستن . بڕین . گرتن » يقاله الجزء الحدثي ، والباقي مثل « هەڵ . پێ لێ . پێ لێ هەڵ . پێ لێ دا . ەوە » يقاله الجزء التركيبي .

فالجزء التركيبي يلتصق باول الكلمة مثل « هەڵكردن . داكردن » وبآخرها مثل : « هاتنەوە . چوونەوە » ، وبهما جميعاً مثل : « داكردنەوە . راكردنەوە » ، فالذي يلتصق بالاول يقاله : « السابقة » والذي يلتحق بالآخر يقال له : « اللاحقة » .

فالجزء الذي يلتحق بالآخر يكون دائماً واوا بين فتحتين ، سواء كانت الفتحة الاولى حرف ربط ، أو حرفاً اساسياً من احرف اللاحقة ، بمعنى ان اللاحقة لاتظهر في اكثر المناطق الكردية الا في هذه الصورة .

وهذه اللاحقة تؤدي احدى المعاني الثلاثة الآتية :

١ـ العودة مثل : « هاتنەوە . چوونەوە » ولا ثالث لهما ، فـ « هاتن » بمعنى المجيء الى مكان لأول مره ، و « هاتنەوە » بمعنى المجيء الى نفس المكان ثانية .

« چوون » بمعنى النصاب الى مكان لاول مرة ، و

« چوونەوە » بمعنى النصاب الى عين المكان ثانية .

٢ـ التكرار مثل : « دانیشتنەوە » بمعنى الجلوس مرة ثانية ، و « هەستانەوە » بمعنى القيام ثانية .

٣ـ التدريج مثل : « بردنەوە » بمعنى التقلب على اللاعب تدريجيا .
« خواردنەوە » بمعنى الشرب جرعة بعد جرعة .
« چوونەوە » بمعنى زوال اللون وذوبان الثلج تدريجيا .

فهذه المعاني الثلاثة للاحقة قياسية لا تتخلف ، ويلتحق بكل مصدر الا نادرا ، مثل : « مردن » بمعنى الموت ، فلا يقال : « مردنەوە » لان الموت واحد لا يتكرر .

والجزء الذي يلتصق بالاول كلمات معدودة مثل : « هەڵ . دا . را . رۆ . ڕێ . راو . لێ . تێ . تێك . پێ . پێك . پێ لێ . ڕوَ لێ . ڕوَ تێ . ڕێ پێ . ڕێ تێ . ڕوَ لێ وەر . پێ لێ دا . پێ لێ هەڵ .

« هذه بعض الامثلة للجزء التركيبي والجزء الحدثي »

| الجزء التركيبي | الجزء الحدثي | الجزء التركيبي | الجزء الحدثي | الجزء التركيبي | الجزء الحدثي | الجزء التركيبي | الجزء الحدثي |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هەڵ | پەڕین | دا | پەڕین | را | پەڕین | سەر | کەوتن |
| هەڵ | کێشان | دا | کێشان | را | کێشان | سەر | خستن |
| هەڵ | کشان | دا | کشان | را | کشان | بەجێ | هێنان |

هەڵ ماڵین دا ماڵین را ماڵین بەجێ هێشتن
هەڵ هێنان دا هێنان را هێنان بەجێ مان
هەڵ کردن دا کردن را کردن رێ تێ چوون
رێ پێ بردن
لێ خوڕین تێ خوڕین رۆ چوون رو لێ نان
لێ بڕین تێ بڕین رۆ کردن رو تێ کردن
لێ کەوتن تێ کەوتن رۆ نیشتن پێ لێ خستن
پێ لێ بڕین
لێ نان تێ نان راو نان پێ لێ نان
لێ دان تێ دان رێ کەوتن تێك بەر بوون
لێ چوون تێ چوون رێ خستن تێك بەر دان
لێ خستن تێ خستن رێ بڕین پێ لێ دا گرتن
رێ گرتن پێ لێ هەڵ بڕین
پیا چوون تیا چوون پێك هێنان رو لێ وەرگێڕان
پیا کردن تیا مان تێك دان
پیا بردن تیا دانان تێك خستن

* * * * * *

# کورد و سەربەخۆیی زمان

ئەندامی کارا : هەژار

وشەی خۆیبون یان سەربەستی و سەربەخۆیی کە هەرسێك بە مانا یەکن لەم دەوروزەمانانەدا کە مەمانان تیا دەژین وەك بیزانم پتر لە هەمو واژەیەك بەسەر دەمو زارانەوە دێت و دەچێ و زۆرجارانیش بۆ واتا ئاڵوگۆڕ کردن رستێك یان وشێکی تری وەك پاشکۆ لێ شەتەك دەدەن ، وەکو : سەربەستی نەتەوایەتی ، خۆیبونی گەل و نیشتمان ، سەربەخۆیی بیروباوەڕ ، سەربەخۆ بونی ئابوری یان خۆژیوتی . وەك دەشزانین هەمو مرۆڤی سەرزەمین بە هەمو زار و زمانان چ بە دەستی گەل چ بە تاك ئەویندار و بەندەواری مانای ئەو رستە رەنگینەن و بۆی سەوداسەر و هەڵوەدان و خوێنی لە پیناو دەرێژن و لاشی لە رێدا دەنێژن و ئەوانەی لەسەر ئەم بیرە خراونە چاڵ و زیندان و لەگرتوخانانادا گیرن هەرگیز لە بیریان دەرناچێ و بە هیوای وەدیهاتنی ئەو نیاز و دۆزە پیرۆزە رۆژ دەسەر شەو دەخەنەوە و شەوی بۆ رۆژ دەکەنەوە . .

بەڵام بە ناشکوری ناڵێم ئێمەی گەلی کوردی کڵۆڵ چەندین چەرخە ئێستا و ئێستاش خۆیبونە بێ پاشکۆیەکە و سەربەخۆییە کاکەدارە نرخدارەکانی ترمان لە هیچ لا بۆ نەڕەخسیوە و وەختە بشڵێم : خەونیشمان پێوە نەدیوە ! ! .

لە لایەکی تریشەوە لە ســایەی شایتی بە خۆیتی بێ کاکڵ و ئارەزوی رەگــەڵ رەگەڵی هەربەدەم و شـــەرم و فەدتی لە عالەم خۆهەڵاوردن . . ئەشێ هیچ نەبێ : لاسایەك ، چاولێکەریەك — با لاســا و چاولێکەریەکەش بێ بەهرە بێ — رەچاوکەین و بە جۆرە سەربەخۆبونێك کە وەك دەڵێن نە شیش بسوتێ و نە کەباب خۆمان نیشانی مەردم دەین و نەڵێن کورد دەستەوستانن و قەدری سەربەستی نازانن ! . دەڵێن قسە قسە دێنێ : لە بیرمە رۆژێك لە رۆژان بە زەمانی (عەهدی باید) کە ئەوســـا لە « شارع غازی » دوکانی وێنەگریم بو ، ســـەر و کەللەی مامۆستایەکی موحتەرەم گەورەی کردم . . لە پاش من خۆش و تۆ خوشێ گەرم و گوڕ و برایانە مەزبەتەیەکی دەرێنـــا و فەرموی : ئەگەر زەحمـــەت نەبێ بیخوێنــەوە و پەنجەمۆرێکی پێوە نێ ! .

نوسرابو : لە بریکاری گەلی کورد بڕیار دراوە : مامۆســـتا فلانی شاعیر بــە نازناوی (ئەمیرالشـوعەرای کوردان) خەڵات بکرێ . . .

بێ لام و جوم و خۆگرتن لە لای ســەروی چەند ئیمزایەکی

دیکەوە ئیمزایەکی خوانا و درشتم لێ کرد و وێم دایەوە ، بە بزەیێکی پڕ بەزەیی و کەزەب بزاوانە گوتم : مامۆستا گیان زۆر سەیرە : لە ناو میللەتێك کە هێشتا هێندێك فەیلەسوف بە میللەتی حەســاو ناکەن و مافی رەوای خواداویشی هێمان بێ رەوا نابینن ، لە ناو ئەو هەمو ملیۆنە کوردەی لە بەر پێی پلیشاوەدا لە ناو کتولەکەی تەڕیشدا ناوی ئەمیرێك نابیسرێ !! ئەوە چۆن بە بێرتاندا هـات کە لە ناو وێژەواناندا پێویستە میرێـکمان هەبێ ؟؟. سور دەشزانن کە چینی شاعیر و نوسەر لە کوردستان نەخوازەلا لەم چاخەشـــدا لە هەمو جون و دەستەیەك حەتتا لە دۆم و دەروێشیش رەجاڵتر و بێ ئەنوا و بێ بژیوترن !! ، مامۆســـتای خۆم نازناوی مێر لە ناو گەلێـکی یەخسێردا زۆر ئەشتێـکی زەق و زۆپە و دەترسم ناقۆلا دەرچێ !. دەگـەڵ ئەوەش بەو مێرە شوکـرانە بژێرم ، چونـکە کوردە و لە خۆمانە .. خوا نەیبڕێ و پیرۆزمان بێ ..

هەرچەند مامۆستای ناونەبراو جیا لەوەی بە عەقلی من پێی‌بکەنێ درکانێـکی نەخستە سەر ... بەڵام دەیتوانی بفەرموێ : نەقلی مێری شاعیرانمان وەك ئالای گۆڕخانەکانە ، هەمو کورد لە کوردستاندا ئەوانەی دەجوڵێنەوە و ناوی خۆیان ناوە زیندو ، کوتە پەڕۆیەکیان نیـــە کە درۆشمی ناسینیان بێ ، کەچی هـــەمو گۆڕستانێك لە کوردستان هەزار ئالای سەوز و شین و سپی و مۆر و بۆر و بێ رەنـگی پێوەیە !! . فەرقی چیە .؟!

ئەو مەبەستەی بزم پێدا و چیرۆکم تێدا وەگێڕا : باسی مێری شاعیران و ئالآی سەرگۆڕستانەکان دێننەوە بیر کە بۆ یەکدی یان پسمامن یان هیچ نەبێ بە بۆرە خزمایەتیەکی بە یەك دەگەن !! .

بەشێکی باش لە خوێندەوارە کوردەکان ، ئەوانەی لە پاش شۆرشی چاردەی تەمووزی پیرۆزرا دەستیان داوەتە قەڵەم و نیازیان وایە خزمەت بە زمان و ئەدەب و دیرۆك و چیرۆکمان بکەن و لە گەرداوی کوردیی نەزانینی پێشوو دەرمان بخەن و بۆ پلەی سەربەخۆ بوونێك ـ جا هەرچی بێ ـ بە بارێکدا سەرمان بخەن .

وەختێ بیریان لێ کردەوە کە سەربەخۆیی روت و قوت داواکردن مانای زۆر لێ دەدرێتەوە و هەویرێکی ئاو هەڵگرە و لەوانەیە ئەو ئاگرە پزیشکێکی ریشی خۆیان بگرێتەوە ، بایان داوە سەر سەربەخۆیی بەکلکە و کاتێ ئەوانیشیان دۆزی روانیان ئەویش رەوانابن ، چون سەربەخۆیی ئابوری یان سەربەستی بیر و بڕواش بە بێ خۆیبوونە بفەکە نایەتە جێ ... ئەدی چیکەن ؟! ، لە هەموی باشتر ئەوەیە : بۆ سەربەخۆ بوونی زمان تێکۆشن و بە پلارێك چەند چوێلەکەیەك دەپێکن ... وشە خۆش و شیرینەکەی هەموو دنیای لەدوو وێڵـە کوردیش دەبێ .. زانایی و رێبەری خۆیان بە نامۆ و خۆ نیشان دەدەن و چونکە وشەی سەربەخۆیی بە زمانەوەش بەستراوە .. هیچ کەسیان لێ دزدۆنگ ناکا و هەر لەسەر داری بە مازوون ...

بەڵام ئاخۆ ئەو سەربەخۆیی زمانە وەك ئەوانە دەیانەوێ قازانجیانە ؟ یان زیانە ؟ . گەلێك لەو تازە نووسەرە تازەپەیداکەوتوانەمان لایان وایە هەر وشەیەك کە دە زوانی عەرەبدا بەکار هاتبێ - با کوردی نەخوێندەواریش هەمووان بزانن چییە و بەچی دەڵێن - ئەوە دەبێ دەراوێژرێ و وشەیەکی داتاشراوی لە عەرەبی بۆ سەر کوردی وەگێردراوی لەجێ دانێن !!. بۆنموونە : دوکان کراوە بە کۆگا ، لە باتی نوختە دەڵێن خاڵ ، خەت بۆتە هێڵ ، قەڵەم کراوە بە پێنووس ، بۆ نەگبەتی کاغەزی کاغەزئاسایێش بە کوردی حەساو نەکراوە و کردوویانەتە هاوکێش و قافیەی پێنووس و هێندێك ناویان ناوە تێنووس ! .

لەو جۆرە بابەتە زۆرە و ئەگەر درێژەی پێ بدەین دەبێتە درێژەدادڕی و لە وتاری وا سەرچڵدا دوایی نایە و دبێتە هۆی سەرەگێژەی خوێندەواران ..

بەڵام ئەگەر کوردێکی پشوو درێژو خۆڕاگر تاقەتی هەبێ و یەکدوو جار ئێزگەکەی بەغدای بەشی کوردی سەرلەبەری گوێ لێ بگرێ و بە وردی سەرنجی بدا ئەوسا دەزانێ چباسە و کوردی تازە لە سایەی مامۆستای تازەی کوردیتاشی عەرەبیزان بە چۆن مەرەدێك براوە !! ئەگەر ئەو تابشتەش نەبوو بڕوانن وردە کتێبان کە لە پەستاو بێ بڕانەوە دێنە بازاڕ و پڕیانە لەو پەڕۆ و پاڵ و خشتۆخاڵە ..

هەر دانەرەی بە هەوای خۆی وشـە و رسـتی پێداویسـتی کتێبەکەی بە عەرەبی لە مێشکیدا داڕژتوە و ئەوسا هاتوە دەنك دەنك عەرەبیەکەی بە کوردی تەرجەمە کردوە و دەیان رستی وەك هەواڵی تەندروستی و خولی ئاوەکانی گشتی دێنە بەر چاو و پەیمانگا لە جێی معهدە و ناوی جامیعەی عەرەبی بۆتە مزگەفتی عەرەبان و هێندە شتی سەیر و سـەمەرە دەردەچن کە پیاو متوی لێ گرژ دەبن و لە تاوی زمانەکەمان کە لە سایەی لەسەر وەجواب نەهاتنی خاوەن کاران خەریکی ئاویلکە دانە ! . ناچارین هەر ئاخ هەلکێشین و بۆ چروکان لە هەناوان بێ !! من گەرەکمە دەگەڵ ئەو جۆرە کوردانەی کە بە نیازی بژاری زمانی کوردی لە عارەبی چڵوپنجە بە کەڵکەکانیش دەشێلن و دەریداوێن و لەجیاتی خاوێن کردنەوە سەروگوێلاکی دەشـکێنن ، تۆزیك بدوێم .

لە سەرانسەری دنیادا هیچ زمانێـکی سـەربەخۆ بەو مانایە کە هیچ وشەی هەندەرانی تێدا نەبێ دەس ناکەوێ[1] ، هیچ گەلێـکیش بە تێکەڵاوی چەند وشـەی بێگانە لە زمانەکەیدا توشی هیچ زیانێك نابێ و توشیش نەبوە .

با لە زمان زانان بپرسین : داخوا زوانی گەلانی خودا پێداوی خاوەن تەخت و بەخت چۆنە ؟؟ پێیان دەڵێن : ئیتالیایی و ئەسپانی و

(١) لە ولاتە ئەوروپاییەکان فەرهەنگـی تایبەتی بۆ وشـەی هەندەرانی ناو زمانەکەیان دادەنێن .

ئەڵمانی و ئینگلیسی و فەرانسی و گەلێك لە زمانی ئوروپایی تر چونکە بنیچە لاتینین بە سەتان وشە و رستەیان وەك یەك دەچن و هیچ کامیش بە تەنگەوە نین کە ئەو وشە هاوبەشیانە وەسەر یەکتر بکەنەوە . دەڵێن رۆسی کە زمانێکی سلاڤی‌یە جگە لەوەی کە زۆر وشەی وەك بۆلغاری و چیکی دەچێ بە سەتان وشەی ئینگلیسی‌و فەرانسیشی تێخزاوە و هەرگیز رۆسی دوای شۆرشی ئۆکتۆبریش نەیانگوتوە ئەو وشانە کاپیتالی و بۆرجوازی و کۆنەپەرست و فاشیستن ، بێ دەسکاری هێشتویانن و جیا لە قازانج زیانێکیان لێ نەدیون . با دوور نەرۆین ، هەر لەم ناوە و لەم رۆژهەڵاتە نزیکە و لە نزیك خۆمان بڕوانین .. تورك ، فارس ، ئەفغان و هیند و پاکستان بەنگلادیشیشیان دەگەڵ بێ ، بە سەتان تا بە هەزاران وشەی عەرەبی رەسەنیان خوازتۆتەوە ، دەیان نوسن و دەیانخوێنن و دەناو فەرهەنگی خۆیاندا ریزیان دەکەن و بە هی خۆیانی دەزانن و وەك دەزانین هیچ زیانێکیش بە عەمرومالیان نەگەیوە و لە سۆنگەی وشەی بێگانە دەکارهێنان کەس ئازادی و نانی شەوی لێ نەبڕاوە و بە دەردی کوردەگوتەنی زەرەدی لە پەز نەداوە .

پسپۆڕانی زمانی فارسی لە ئێران لایان وایە : سەعدی و حافزی شیرازی چاکەی زۆریان بەسەر ئێرانەوە هەیە چونکە زۆر وشەی عەرەبیان هێناوەتە ناو شیعری فارسی خۆیان و وایان دەگەڵ فارسیەکەدا پیلۆز کردوَن کە تازە هەڵناوێرێن و بەو کارەیان زمانە

فارسی‌یەکەی خۆیان دەوڵەمەند و بە پێزکردوە و ئەو گش وشـــە عەرەبیانەی کە خوازراون و راگوێزراون خزمەتی فارسـی دەکەن و خزمەتکاری بێ مۆچە و مز خێری خوایە .

بژار و خاوێن کرنەوەی زمان ئەگەر لە باری بزانین و بـــە لەبارتی خەریکی بین کارێـکی بێ بەهرە نیە . بەڵام بژاری بەهرەدار زانا و پسپۆڕی گەرەکە و هـەرکەس ددستی قەڵەمی گرت و کوێرە سیوادێـکی هەبێ مل لە ددسکاری زمان و وێژە بنێ دروست نیە و لە جیاتی کل دەچاو کێشان کوێری دەکا !!.

بەر لە هەر شت پێویستە ئەوەی بزانین : ئەو وشانەی بـۆرە پیاگو نەخوێندەواری گەلەکەت دەیانزانن و لەبەریانە و کە بۆیان دەڵێی تێی دەگەن با ردسەنیان عارەبی نەبێ ترکی بێ ، با فارسـی نەبن روستی بن ئەوە تازە بۆتە کـوردی و ماڵی حەلاڵی خۆمانن و خزمەتکاری زمانمانن و ئەرکیشیان لەسەرمان نیە . کـورد گوتویە : نۆکەر بێ خەلات و بەرات تانجی سەری ئاغایەتی . .

بۆ نموونە ئەو وشانەی وەکو : دوکان و قەڵەم و خـــەت و خاڵ و خەیاڵ و ماڵ و ئیش و کشمیش و ســـەدەقە و خـــێر و صندوق و نەغد و وەفا و دۆڵمە و یاپراغ و شـــێخ و زەکات و تەزبیح و خودبە و مێزەر و شەربەت و قەساب و بەقاڵ و چەرچی و هەرچی وەك ئەوانە دەچن و هەمو کوردێك دەزانێ چن ئەگەر باپیرەی هەزار ساڵ لەمەوبەریشیان نامۆ بێ هیچ قەی ناکا .. ئـەو وشانەش

وەکوو عەولاد رەسووڵەکان زۆر لە مێژە بوونە کورد و هۆگریان بوین و ناسراون و شانازیشیان پێوە دەکەین .. ئەو جۆرە وشانە ناشێ بە هیچ ئاوا لە شوێن خۆیان بیانبزێوین .

بەڵام هێندێك وشەی وا هەن کە مەلا و کاڵی ساویلکە و کۆڵکە میرزای بافیشکەر و هێندێ ئەفەندیی دەر دیتووی خۆ لە کوردان نەبان کردوَ هەر بە هەوا و بۆ ئەوەی خەڵك وابزانن ئەو بۆتە پیاوێکی دیکە و لە کوردی رەمەکیی خزمی جووێ بۆتەوە خستوویاننە ناو کوردیەکە و نەك هەر چینی نەخوێندەوار ، خوێندەواریش بە بێ قاموس تێیان ناگا ...، دیارە دەبێ ئەوانە وەدەر بخرێن و وشەی کوردیی رەسەن و لەسەر زمان سووك لە شوێنی ئەوان دابندرێن ، بەڵام دیسان ئەم وەدەرنان و دانانەش کاری هەموو رەشکە و پێشکەنووسێك نیە . هەرگیز تاك و تەرای زاناش بە بێ یاریدەی هاوکاران ئەو ئەرکەی پێ هەڵناسوڕێ .. گەرەکە کۆڕی زانیاری یان کۆمەڵێك لە زمانزانانی بژاردە کە دەست بەو بژارە دەکەن بەر لە هەر کار هەموو وشەی هەموو زاراوەکانی جووێ بەجوێیی کوردستانیان بە فەرهەنگ لەبەر دەست دا بێ و کە بیانەوێ وشەیەکی زەق و رەق و نەگونجاوی رەزاگرانی بێگانە وەدەرنێن و بە وشەیەکی کوردیی خۆماڵی جێی پڕوەکەن ، ئەشێ ئەو وشەی لە مانای ئاوەکیەکەوە نزیکە و بە جوانتر دێتە بەر چاو و رەوانتر دێتە سەر زمان بیژێرن و لە شەڕەگەڕەك و منمن و ئێمە وای

نالێیین وای دەڵێین و هەر چونکە مــن نەمبیستوە کوردی نیـە !!
خــۆبویرن و دڵسۆزانە و زانایانە وەری گرن و ئەو کەلەبەرەی
پێ بگرن کە جێی دەرکراوەکەیە .

تا ئەو رۆژەش کە ئەم ئاواتە دێتە دی و تا دەتوانین بژارێکی
زۆر لەبار و تەیار بکەین و کردە پەشیمان دەرنەیەیــن ، با ئێمەش
وەك گەلانی دی دەگەڵ چەند وشــەی بێـگانە بساچێین و ئەگەر
یەکێك هاتو پرسی : بۆ فلان وشەی عەرەبی لە ناو کوردیەکەتان
دایە ؟ دەڵێین ئێمــە خۆ لە عەرەبان زیاتر نین ، ئەو عەرەبەی کە
خاوەنی ئەو زمانە بەر بەرین و هەراوەیە کە هەمو کەسێك لای وایە
هیـچ ئاتاجی بە زمانی بێـگانە نیە ، هەزاران وشــەی بێـگانەی
خواستۆتەوە و دەناو عـەرەبی ئاخنیوە و رەنـگ و روخســاری
گۆڕیوە و کارێـکی بەســەر هێناوە کە ئێستا خاوەنی پێشوی ئەو
وشــانە توشیشیان بێ نایانناسێ ... ئەگەر زانایانی عەرەب خۆیان
راستی ئەو ئاوەکیانەیان نەگوتبا و بە ئێمەیان نەفەرمو با : ئەو وشانە
لاوەکین و هاتونە ناو عەرەبیەوە ، نەك یەکێ وەك منی هەژار بگرە
پیـاوی دانا و زاناش بیری بەلادا نەدەچون و لای وانەبو عەرەبی
نین و غەوارەن و عەرەب لە زمانەکەی خۆیــدا پەنای داون و
دەرنەکراون . بۆ شایەتی ئەم راستی‌یە زۆر کتێب هەن کە زمانەوانانی
عەرەب یان عەرەبی‌زانی دیکە لەو بارەوە دایان ناون . بەلام مــن
هــەر سێ کتێبم بۆ روانیون و بۆ نمونەی لوێـچ لە تەغار چەند

سـەت وشێکم راگوێزتوون و لێرەدا دەیخەمە بەرچاو . هەرچەند خاوەن کتێبەکانی سـەرچاوە بڵێ ژ مامۆستا : ئەددای‌شێر کە جار و بار ناوی کوردیشی هێناوە هەر وشەیەکی رەگەزی بچێتەوە سـەر زمانە ئێرانیـەکان ناویان ناون : فارسی‌نەژاد ، بەلام من گومانم نیـە هەر کوردێکی زیت و وریا چاوێکیان پێدا بگێڕێ لە ناویاندا کۆنە وشـەی کەلەپوری کەونارای خۆی لە زۆر شوێنان دێنە بەر چاو کە ئەوانیش وەك ئێمە و باپیرەکانمان لە خزمەت بە برای عەرەبیـان بێ دریغ بوون و لەناو زمانی ئیسـلامدا شوێنی خۆیان کردۆتەوە . بەشەکەی هەرەزۆریشم لەو وشـانەی کە لەلاوە هاتوونە ناو عەرەبییەوە بۆ ئەو کەسانە هێشتەوە کە حەز دەکەن هەر راستەوخۆ کتێبەکان بخوێننەوە .

ئەو سێ کتێبەش کە دەڵێم وەك سـەرچاوە بۆم روانیون و بەشی خۆم لێ هەڵێنجاون ئەم سێیانەن :

١ـ (المعرب من الكلام الأعجمي على حروف المعجم) لأبي المنصور الجوالقي ٤٦٥ ـ ٥٤٠ هـ ، چاپی دوەم سالی ١٩٦٩ لە چاپخانەی دار الكتب لەسەر ئەرکی وەزارەتی ثەقافەی میصر چاپکراوە .

٢ـ (الألفاظ الفارسية المعربة ـ تأليف السيد ادي‌شير رئيس اساقفة سعرد الكلداني) ، سالی ١٩٠٨ لە چاپخانەی کاثۆلیکی ئاباء اليسوعيين لە بەیرووتی چاپ کراوە .

٣ـ المنجد في اللغة ـ چاپی بیستەم ـ بەیروت ـ لبنان .

ئەمەش ریزی وشەکانە :

| عـەرەبی | واتـای | رەگـەزی |
|---|---|---|
| آبنوس | دارێکە | یۆنـانی |
| آجر | خشت | فارسی |
| آخر | ئاخوڕ | فارسی = آخور |
| آهو | ئاسك | فارسی |
| أباشە | أوباش | فارسی |
| أبد | هەتا هەتا | فارسی |
| أبرشیە | کلیسا | یۆنانی |
| أبریز | زێڕی پاك | فارسی |
| أبریسم | ئاوریشم | فارسی = أبریشم |
| أبریق | مەسینە | فارسی = آبریز |
| أبزیم | ئاغزوَنە | فارسی |
| أبلیس | شەیتان | عەرەبی نیە |
| أبهە | جوانی | فارسی ـ آب بها |
| أثیر | مادەیەکە | یۆنانی |
| أرجوان | ئەرخەوان | فارسی |
| أرخبیل | جزیرەگەل | یۆنانی |
| أریکە | تەخت | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| أستاذ | مامۆستا | فارسی |
| أسرب | سورب | فارسی |
| أستبرق | پارچەی ئەستور | فارسی = ستبرك |
| أسطبل | تەویلە | لاتینی |
| أسطرلاب | ئەسترلاب | یۆنانی |
| أسطول | گەمی گەل | یۆنانی |
| أسفنج | هەولە | یۆنانی |
| أسمنت | چیمەنتۆ | لاتینی |
| أسوة | پێشەوا | فارسی ـ ئاسا |
| أشنان | ئەسپۆن | فارسی |
| اصطوانه | ستون | فارسی |
| أقلیم | بەشێك لە زەمین | یۆنانی |
| أقیانوس | دەریا | یۆنانی |
| ألکترۆن | کارەبا | یۆنانی |
| ألماس | گەوهەر | یۆنانی |
| أمد | زەمان | فارسی |
| أنبار | عەمبار | فارسی |
| أنبوب | لولە | ئارامی و فارسی |
| أنبیق | دڵۆپێنەر | فارسی |
| أنجر | لەنگەر | فارسی |
| أوج | بەرزی | فارسی = أوگ |

| | | |
|---|---|---|
| أيضاً | ئێدن | کوردی |
| أيقونه | کۆتەڵۆکە | یۆنانی |
| أيوان | هەیوان | فارسی |

## - ب -

| | | |
|---|---|---|
| باب | دەرگا | ئارامی |
| بابوج | کاڵە | فارسی = پاپوش |
| بابور | گەمیە | فەرانسی |
| بابونج | بابونە | فارسی |
| بادنجان | باینجان | فارسی |
| بارجه | گەمیە | فارسی = بارگاه |
| باز | بازی مەل | فارسی |
| باشق | باشق | فارسی |
| باطيه | بادیە | کوردی |
| باع | نێوان دەست و ئانیشك | فارسی = باز |
| بالون | باڵۆن | فرانسی |
| باله | تابار | ئیتالی |
| بانطلون | پاتۆڵ | ئیتالی |
| ببغاء | توتی | ئیتالی |

| | | |
|---|---|---|
| بختر | شایتی بەخۆ | فارستی = بختیار |
| بخس | کەم | فارستی = بخسیدن |
| بخشیش | بەخشش | فارستی |
| بذرقه | بەرێکەر | فارستی = پادراه |
| بربط | ئەمرازی موزیك | فارستی = بربط = سنکه ـ مراوی |
| برذون | بارگین | فارستی |
| برزخ | لەمپەر | فارستی |
| برغل | ساوار | فارستی ـ کوردتی = بەرکوڵ |
| برغی | پێچ | ترکتی |
| برکار | پرگار | فارستی |
| برکان | ئاگرپژێن | ئیتالتی |
| برنیطه | شەپکه | ئیتالتی |
| برواز | کەناره | فارستی |
| برهان | بەڵگه | فارستی = پروهان |
| بری | دادان | فارستی = برِیدن |
| برید | پۆسته | فارستی |
| بزر | تۆو | فارستی |
| بزل | بزن | کوردتی |
| بست | دەراو | فارستی |
| بستان | بێستان | فارستی |

| | | |
|---|---|---|
| بستقانی | بێستانچێتی | فارسی |
| بستوقه | کوپەڵە | فارسی = بستو |
| بسن | جوان | فارسی = پسند |
| بشغ | پشکەباران | فارسی |
| بط | مراوی | فارسی |
| بطریق | شایتی بەخۆ | فارسی = پتیاره |
| بغداد | خوادا | فارسی |
| بقساط | نانێکە | فارسی |
| بقلاوه | شیرنی | ترکی |
| بلاط | فەرشە | لاتینی |
| بلسم | هەتوان | یۆنانی |
| بلطه | تەور | ترکی |
| بلوط | بەڕۆ | فارسی |
| بلید | نازیرەك | فارسی = پلید |
| بم | ژێتاریستوور | فارسی |
| بند | بە هەموو مانا | فارسی |
| بندر | مینا | فارسی |
| بندق | بەرێکە ، گزموله | فارسی |
| بنفسج | وەنەوشە | فارسی |
| بوتقه | بۆته | فارسی |
| بورياء | حەسیر | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| بوسه | ماچ | فارسی |
| بوص | گەمیە | فارسی = بوژی |
| بهلول | گەپجاڕ | فارسی |
| بهو | هەیوان | فارسی |
| بیب | جێ ئاو | فارسی |
| بیدق | پیادە | فارسی |
| بیعه | کلیسا | عەجەمی |
| بیمارستان | خەستەخانە | فارسی |

## - ت -

| | | |
|---|---|---|
| تابل | بەهارات | فارسی |
| تأریخ | مێژوو | عەرەبی نیە |
| تب ـ تباب | هیلاك | فارسی = تباه |
| تبان | دەرپێ | فارسی = تنبان |
| تدرج | پۆڕ | فارسی = تزرو |
| ترانزیت | رێی تێپەڕین | لاتینی |
| ترسانه | سەنگەر | فارسی |
| ترعه | دەراو | فارسی = دەرگا |
| ترمس | ساردوگەرم | یۆنانی |
| ترمومتر | هەوا پێو | یۆنانی |

| | | |
|---|---|---|
| ترهات | پڕوپوچ | فارسی = تارِرهه |
| تست ـ طست | تەشت | فارسی |
| تفاح | سێو | فارسی کۆن = تۆپا |
| تفه ـ تافه | بێ نرخ | فارسی = تباه |
| تکتیك | پلان | یۆنانی |
| تکنیك | ماشێنی | یۆنانی |
| تلامیذ | شاگردان | عەرەبی نیە |
| تلسکوب | عاسمان بین | یۆنانی |
| تلغراف | تێلگرام | یۆنانی |
| تلفون | تەلەفۆن | یۆنانی |
| تلفزیون | تەلەفیزیۆن | یۆنانی |
| تنباك | تەماکۆ | عەرەبی نیە |
| تنبل | تەوەزەل | فارسی |
| تنجره | مەنجەڵ | ترکی |
| تنك | تەنەکە | فارسی |
| تنور | تەندوور | فارسی |
| تنوره | دامێن ، زرێ | فارسی |
| توت | تو | فارسی |
| تیر | کاریتە | فارسی |
| تیماء | بانو | فارسی |
| ثغر | جغزی دەم | فارسی = ژفره . |

## - ج -

| | | |
|---|---|---|
| جاده | شاڕێی | فارسی |
| جارف | راماڵ | فارسی : جاروب |
| جاریه | کەنیز | رۆمی |
| جاش | کوڵی | فارسی = جوش |
| جبس | گێچ | فارسی = جبسین |
| جربز | وریا | فارسی = گربز |
| جردبان | نانەوا | فارسی = گردەبان |
| جردق | کولێرە | فارسی = گردە |
| جزاف | وتەی سەربەخۆ | فارسی : گزاف |
| جزر | گێزەر | کوردی |
| جص | گێچ | فارسی : گچ |
| جغرافیا | جوغرافیا | یۆنانی |
| جفت | تفەنگی راو | فارسی |
| جل | گوڵ | فارسی |
| جلاب | گوڵاو | فارسی |
| جلاهق | گزموله | فارسی = گل آهك |
| جلخ | چەرخی چەقوان | فارسی = چرخ |
| جلسان | گوڵستان | فارسی |
| جلنار | گوڵهەنار | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| جمرك | بارانە | فارسی = گمرك |
| جمل | پوختەی حیساب | فارسی |
| جمناستیك | وەرزش | یۆنانی |
| جمهور | حەشامات | فارسی = گروهە |
| جناح | گوناه | فارسی |
| جنبد | خونچە | فارسی = گنبد |
| جنزار | ژەنـگ | فارسی = زنـگار |
| جنق ـ منجنیق | گڕهاوێژ | یۆنانی |
| جنی | بەرچنی | فارسی = چنیدن |
| جوالق | جەواڵ | فارسی |
| جۆبار | جۆبار | فارسی |
| جوذاب | گوێزاو | فارسی |
| جوخ | کریخوری | فارسی |
| جوخان | جۆخین | کوردی |
| جوخە | قوڵـکە | فارسی = گوچاه |
| جورب | گۆریە | فارسی |
| جورە | قوڵـکە | فارسی = گور |
| جوز | گوێز | فارسی |
| جوسق | کۆشك | فارسی |
| جوشن | زرێ | فارسی |
| جوهر | ماك ، گەوهەر | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| جهبز | پسپۆڕ | فارسی |
| جهنم | دۆزەخ | عەرەبی نیە |
| جهوری | بەرز | فارسی = جاهوار |
| جیرو | حەواڵە | ئیتالی |
| جیۆلۆجی | زەوی ناسی | یۆنانی |

## - ح -

| | | |
|---|---|---|
| حب | کوپە | فارسی = خم |
| حباری | چێرگ | فارسی = هوبرە |
| حدأة | کۆلارە | فارسی = خات |
| حسك | نێزە | فارسی = خسك |
| خاتون | خات | ترکی |
| خافت | نزمی دەنگ | فارسی = خفتن |
| خام | دەکارنەکراو | فارسی |
| خان | بە هەموو مانای | فارسی |
| خباء | خێوەت | عەرەبی نیە |
| خبل | شێتی | فارسی = خوبلە |
| ختل | فێڵ | فارسی = ختلی |
| خرج | توربێن | فارسی |
| خشاف | خۆشاو | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| خشتق | گزۆڵ | فارسی = خشتك |
| خشخاش | خاشخاش | فارسی |
| خط | خەت | فارسی کۆن = کتا |
| خف | کاڵە | فارسی = کفش |
| خلخال | خرخاڵ | فارسی |
| خنجر | خەنجەر | فارسی |
| خندق | خەندەك | فارسی = کندك |
| خوان | خوان | فارسی |
| خوذه | شەڕکلاو | فارسی |
| خیار | ئارو | فارسی |
| خیش | پارچەی گونیە | فارسی |

- د -

| | | |
|---|---|---|
| داشن | تازە ئیجاد | فارسی |
| دانق | دانگ | فارسی |
| داما | دامە | فارسی |
| دایە | مامان | فارسی |
| دأب | داب | فارسی |
| دبج ـ دیباج | نەخش ، نەخشاو | فارسی |
| دبوس | دەنبوس | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| دجی | تاریکی | فارسی |
| دراج | پۆڕ | فارسی |
| درب | رێ | فارسی |
| دربونه | کۆڵان | فارسی |
| دردی | تڵپ | فارسی |
| درزی | خەیات | فارسی |
| درهم | درەم | یۆنانی |
| درویش | دەروێش | فارسی |
| دسار | بزماری دۆ سەر | فارسی |
| دست | بە هەمۆ مانای | فارسی |
| دستور | بە هەمۆ مانای | فارسی |
| دسکره | گوند | فارسی |
| دغل | دەغەڵ | کوردی |
| دف | دەفە | فارسی |
| دفتر | دەفتەر | فارسی |
| دقدان | کوچك‌ئاور | فارسی = دیکدان |
| دکان | دوکان | فارسی |
| دکتاتور | لاسار | لاتینی |
| دلق | دەڵەك | کوردی |
| دلو | دوڵچە | فارسی |
| دمار | لە ناو چۆن | فارسی = دم‌آر |

| | | |
|---|---|---|
| دمل | کوان | فارسی |
| دمق | مۆشەدەمە | فارسی |
| دەمە | باو بۆران | فارسی |
| دهلیز | دالآن | فارسی |
| دهقان | گەورەی دێ | فارسی |
| دیان | حاکم | سریانی |
| دیوان | بە گش مانای | فارسی |
| دین | ئاین | سانسکریتی |
| دین | قەرز | یۆنانی |
| دینار | دینار | فارسی ، یۆنانی |
| دینامۆ | دینەمۆ | یۆنانی |
| رافد | چۆم | فارسی = رود |
| رذاذ | وردە باران | فارسی = ریزە |
| رزق | رۆزی | فارسی |
| رسن | گوریس | فارسی = ریس |
| رشتە | هەرشتە | فارسی |
| رصاص | مز | فارسی = أرزیز |
| رطل | نیو من | یۆنانی = لتر |
| رهبان | رەبەن | فارسی |
| رهوان | خۆشڕۆ | فارسی = رهوار |

## - ز -

| | | |
|---|---|---|
| زاج | زاخ | فارسی |
| زاغ | قاژو | » |
| زئبق | جیوه | » |
| زبانیه | دۆزەخەوان | » = زبانه : گڕ |
| زبر | فێر بو ، نوسی . | » = ازبر |
| زبون | کڕیار | ئارامی |
| زخرف | نەخشاندن | فارسی |
| زرابی | رایەخ | فارسی = زیرپا |
| زرد | زرێ | فارسی |
| زرق | جیقنه | سریانی |
| زرنیخ | زەرنیخ | یۆنانی |
| زری | کەنەفت | فارسی = زار |
| زفت | قیل | یۆنانی |
| زلابیه | زلوبیا | فارسی |
| زلال | ئاوی خۆش | » |
| زمهریر | زۆرسەرما | » |
| زنار | پشتێند | یۆنانی |
| زنبرك | باندۆڵ | فارسی = زنبورك |
| زنبق | گوڵێکه | » |

| | | |
|---|---|---|
| زنجار | رەنـگ | فارسی |
| زنجبیل | زەنجەفیل | « |
| زنجیر | زنجیر | « |
| زندیق | زەندپەرست | « |
| زنك | زنـگۆگرافی | ئەڵمانی |
| زیج | عاسمان نامه | فارسی = زیک |

- س -

| | | |
|---|---|---|
| ساده | ساکار | فارسی |
| ساذج | ساده | « |
| ساجور | سەمەندۆك | « = شک گیر |
| سبج | شەوه | « = شبه |
| سجنجل | ئاوێنه | یۆنانی |
| سجور | ئەحمەق | فارسی = سگوار |
| سجیل | گزمۆلەقوڕ | « = سنـگ گل |
| سجیه | خوو | « |
| سخط | رقی زۆر | « = سخت |
| سراب | تراویلـکه | « |
| سراج | چرا | « |
| سرادق | تاوڵی سەرماڵ | « |

| | | |
|---|---|---|
| سرج | زێن | فارسی = سرك |
| سرجین | سەرگێن | کوردی |
| سرداب | سارداو | فارسی |
| سردین | جۆرە ماسییەکە | فەرانسی |
| سرمد | هەرهە | فارسی |
| سرو | سەوڵ | » |
| سروال | دەرپێ | » |
| سطل | پەقرەج | » |
| سفسطه | وتەی بە هەڵە بەران | یۆنانی |
| سکر | شەکر | فارسی |
| سل | دیق | » |
| سلحفات | کیسەڵ | » = سولاخپا |
| سمندر | خەمەکرۆ | » |
| سنبك | سمەولاغ | » |
| سنجاب | سمۆرە | » |
| سەنجه | سەنگەتەرازوَ | » |
| سنجەق | لیوا | » |
| سندان | دەزگای ئاسنگەر | کوردی |
| سندروس | شتێکە وەك کارەبا | یۆنانی |
| سندس | پارچەی ئاوریشم | فارسی |
| سندل | کاڵەپۆش | یۆنانی |

| | | |
|---|---|---|
| سندیان | جۆرە داربەڕوێکە | یۆنانی |
| سنطور | ئەمرازی مۆسیقا | » |
| سنونو | پەڕەسێلکە | عەرەبی نیە |
| سهم | بەش | فارسی = سامە |
| سیخ | زەرگ | کوردی |
| سیرج ، شیرج | رۆن کونجی | فارسی = شیرە |

## - ش -

| | | |
|---|---|---|
| شاش | نەسفت : هەڵە | فارسی |
| شابندر | کونسول | » |
| شابلوط | شابەڕو | » |
| شاذروان | تاوڵی بەر ماڵ | » |
| شاقول | راستەی بەنتا | » |
| شأن | حاڵ | » = سان |
| شاهترج | شاتەڕە | » |
| شاهین | ــ ی تەرازوَ | » |
| سبت | شەمۆ | سریانی |
| شبت | شویت | فارسی |
| شبین ، أشبین | برازاوا | سریانی |
| شبکره | شەوکوێری | فارسی |

| شبوط | قاشەماسی | فارسی |
|---|---|---|
| شتم | جنێو | » = ستم |
| شخص | کەس | » |
| شرب | وەخوارن | » = سیراب |
| شرز | تورەیی | » = شرزه |
| شرس | شەڕانی | » = شرزه |
| شطرنج | شەترنج | عەرەبی نیه |
| شفع | جوت | فارسی = جفت |
| شلغم | شێلم | » |
| شم | بۆن | » = شمیدن |
| شناز | شورەیی | » |
| شوبك | تیرۆك | » |
| شواظ | گڕ | » سوز ـ کوردی = شەوات |
| شوكة | شکۆ | فارسی |
| شهيه | ئارەزو | » |
| شهلا | کاڵی چاو | » |
| شيء | شت | » = چیز |

## - ص -

| | | |
|---|---|---|
| صابون | سابوٚن | فارسی - کوردی = ئەسپون |
| صاروج - صهریج | حەوز | فارسی |
| صحن | سینتی پچوك | » |
| صدقه | خێر کردن | » = صدیکه |
| صراط | ڕێگه | یۆنانی |
| صر | سارد | فارسی = سرد |
| صرد | سارد | » |
| صرصر | سارد سارد | » |
| صرم | گەرم ، چەرم | » |
| صقر | مەلی راو | » = چرغ |
| صك | رەسێد | » |
| صلاطه | زەلاٚته | ئیتالی |
| صندوق | یەغدان | روسی |
| صنم | بت | فارسی - شمن |
| صهر | خزمی ژن | » = شوهر |
| صیدله | دەرمانفروش | » |
| صیف | هاوین | » |
| صیوان | تاوڵی زل | فارسی : سایەبان |

## ـ ض ـ

| | | |
|---|---|---|
| ضنك | تەنگانە | فارسی |

## ـ ط ـ

| | | |
|---|---|---|
| طابه | تۆپ | فارسی |
| طابوق | خشت | « |
| طارمه | بەرپەسار | عەرەبی نیه |
| طازج | تازە | فارسی |
| طاق | تاق | فارسی |
| طاوس | تاوس | عەجەمی‌یه |
| طبر | تەور | فارسی |
| طباشیر | تەباشیر | تورکی |
| طراز | تەرز | فارسی |
| طربوش | تەپلە | فارسی = سەرپوش |
| طرش | کەڕ | عەربی نیه |
| طغری | مۆری‌شا | فارسی |
| طلسم | تەلیسم | یۆنانی |
| طنبور | ئامرازی مۆسیقا | فارسی = دنبره |
| طنفس | رایەخ | « = تن‌پاس |
| طواشی | کویلەی خەساو | « |

| | | |
|---|---|---|
| طوایه | تـاوه | فارسی |
| طوبی | بەهەشت | هیندی |
| طود | کێو | فارسی = توده |
| طیلسان | جبــــه | فارسی = تالسان |

## - ع -

| | | |
|---|---|---|
| عبقری | هەڵکەوتە | فارسی = آبـکار |
| عسکر | لەشکر | » ، یۆنانی |
| عطش | تینگی | » ـ تشنه |

## - غ -

| | | |
|---|---|---|
| غثّ | گـز | فارسی = گـژ |
| غراره | خەرار | » |
| غرّه | سەرەمانگ ، چەرمگی توێڵ | » |
| غساق | کێم و زوخاو | ترکی |
| غطرفه | بایی بوون | فارسی = غتفر |
| غضاء | داری گەز | » |
| غمز | چاو داگرتن | » = گمژه |
| غوغاء | ئاپۆره | » |

## - ف -

| | | |
|---|---|---|
| فالوذەج | پاڵودە | فارسی |
| فانوس | چرادەست | عەرەبی نیە |
| فانیذ | هەلوایەکە | فارسی |
| فتراك | پاشکۆبەند | » |
| فجل | تور | عەرەبی نیە |
| فخ | تەڵە | فارسی |
| فدان | تەختەزەوی | سریانی |
| فردوس | بەهەشت | رۆمی |
| فرسخ | مەودازێ | فارسی = فرسنگ |
| فرشە | فرچە | فەرانسی |
| فرو | جلی کەوڵ | فارسی = پروە |
| فرن | تەندوَر | لاتینی |
| فستان | کراسیژن | فارسی |
| فستق | پستە | » |
| فسطاط | رەشماڵ | » |
| فلز | مەعدەن | » = پولاد |
| فلس | قۆشە | یۆنانی |
| فلش | بلاو | سریانی |
| فلق | قەلاشتن | » = پلکە |

| | | |
|---|---|---|
| فلّـين | تەپەدۆر | یۆناتی |
| فنجان | فینجان | فارسی = پنـگان |
| فنر | چرا | « |
| فنك | دەڵەك | « |
| فولاذ | پۆلا | « |
| فهرست | ناوەرۆك | « |
| فيروزج | پیرۆزە | « |
| فيشفاروج | پێشپارو | کوردی |
| فيلسوف | زۆرزان | یۆناتی |
| قالب | قاپێلك | فارسی = کالبد |
| قابوس | لاوچاك | « = کاوس |
| قبان | قەپان | « = کپان |
| قبـج | کەو | « = کبك |
| قبّـه | هەڵمساو | « |
| قربوس | قەڵپۆز | « |
| قرطاس | کاغەز | عەرەبی نیه |
| قرطبان | دەویت | فارسی = کلتبان |
| قسطاس | تەرازو | رومی |
| قصار | گازر | فارسی |
| قصری | کوێزر | کوردی |
| قطمير | کەمتر | فارسی |

| | | |
|---|---|---|
| قلّه | سەرو | » = کله |
| قره | جێخەو | ئیتالی = کەمارە |
| قطریر | تووش و تاریك | فارسی |
| قمجر | کەماندار | » = کمانگر |
| قن | کولانە | کوردی = کون |
| قنب | گیاشریت | یۆنانی |
| قند | شەکری کەللە | فارسی |
| قندیل | چرا | لاتینی |
| قنصل | کۆنسول | لاتینی |
| قیثاره | گیتار | فارسی = سەتار |
| قیروان | کاروان | » |

## - ك -

| | | |
|---|---|---|
| کأس | کاسە | فارسی |
| کاش | کۆشا | » |
| کاغز | کاغەز | » |
| کافور | کافور | » |
| کاهن | پێشکۆ | سریانی |
| کبریت | گۆگرد | عەرەبی نیە |
| کبس | رێك گوشین | سریانی |

| | | |
|---|---|---|
| كبسول | چەشنی | لاتینی |
| كتان | كەتان | فارسی |
| كثیراء | كەتیرە | » |
| كدی | گەدایی | » |
| كرباج | قامچی | » |
| كرفس | كەرەوز | سریانی |
| كسوف ، خسوف | گیرانی مانگورۆژ | فارسی = كشفتن |
| كشتبان | كلكەوانەی دورمان | » |
| كشده ، قشطه | سەرتوێ | » |
| كشمش | كشمیش | » |
| كمبیاله | وامنامە | ئیتالی |
| كمثری | هەرمێ | فارسی |
| كمنجه | كەمانچە | » |
| كمون | زیرە | عەرەبی نیە |
| كمیت | كوێت | فارسی = كمخت |
| كناری | زەردەزیڕە | ئەسپانی |
| كندوج | كەندوَ | فارسی |
| كنز | خەزنە | » |
| كنیسه | كڵێسا | ئارامی |
| كهرباء | كارەبا | فارسی |
| كهف | ئەشكەوت | كوردی = كێف |

| | | |
|---|---|---|
| كهل | پیر | كوردی = كال - فارسی = چهل |
| كیلۆ | نیوسیه | یۆنانی |
| كیمیاء | كیمیا | « |

## - ل -

| | | |
|---|---|---|
| لازورد | عابی | فارسی = لاجورد |
| لبلاب | لاولاو | » |
| لجام | لغاو | » = لگام |
| لوزینج | خوراكێكه | « |
| لیمون | لیمو | « |
| لینوفر | نیلوفەڕ | « |

## - م -

| | | |
|---|---|---|
| مائدة | خوانی خۆراك | فارسی |
| ماخور | كۆڕی مەستان | » = میخوره |
| ماخولیا | گێژ و وێژ | یۆنانی |
| مارستان | خەستەخانه | فارسی |
| ماس | ئەڵماس | یۆنانی |
| ماسوره | لوله | سریانی |

| | | |
|---|---|---|
| متراس | مەتەرێز | فارسی = ترسانە |
| مرت | زەوی قاقڕ | « = مردە |
| مرج | مێرگ | « |
| مرغ | شێنکە | « = مرغزار |
| مریم | پایەبەرز | سریانی |
| مزج | تێکڵاو | سریانی = مزك |
| مسك | بۆن | فارسی |
| مص | مژ | « = مك |
| مطران | مەلای فەلە | یۆنانی |
| مكوك | مەكوك | ئەرمەنی |
| ملكوت | فرشتاوا | سریانی |
| مليار | ژمارە | فرانسی |
| مليون | ژمارە | فرانسی |
| موسيقا | مۆزیك | یۆنانی |
| مومياء | مۆمیایی | فارسی |
| مهر | مۆر | « |
| مهرجان | جەژن | « |
| مهره | مۆرو | « |
| ميدان | گۆڕەپان | « |
| ميزاب | لوساو | « |
| ميل | كلچۆك | « |

| | | |
|---|---|---|
| مینا | شوشە | فارسی |
| میناء | بەندەر | یۆنانی |

## - ن -

| | | |
|---|---|---|
| نارنج | نارنج | فارسی |
| ناسوت | خەڵکاوا | سریانی |
| ناطور | پاسەوان | « |
| ناموس | رازدار | یۆنانی |
| نای | بلوێر | فارسی |
| نبراس | چرا | سریانی |
| نجل | رۆڵە | فارسی = نگل |
| نحریر | زیرەك | عەرەبی نیە |
| نرجس | نێرگس | فارسی |
| نرجیله | قلیان | « |
| نرد | نەردێن | « |
| نزیز | دەڵاو | « |
| نسترن | گوڵێکە | « |
| نشا | نیشاستە | « |
| نشوه | کەیفی مەستی | فارسی = نوش |
| نعناع | پنگ | فارسی = نانە |

| | | |
|---|---|---|
| نفير | شەیپوور | فارسی = نپور |
| نكس | نخوون | فارسی |
| نمرق | باڵگە | » = نرمك |
| نمره | نمره | ئیتالی |
| نمق | نووسی | فارسی = نامه |
| نموذج | نموونه | » |
| نوره | قسڵ | عەرەبی نیه |
| نيزك | ئەستێرەی خوشیو | فارسی |
| نيل | خم | » |
| نيلوفر | نیلوپەڕ | » |

## - و -

| | | |
|---|---|---|
| ورد | گول | عەرەبی نیه |
| ورديان | زینداناوان | ئیتالی |
| وصر | پەیمان | عەجەمی |
| وقت | وەخت | کوردی |

## - هـ -

| | | |
|---|---|---|
| هاله | خرمانه | فارسی |
| هاون | جوون | » |
| هرطقه | ئایین گۆڕین | یۆنانی |

| | | |
|---|---|---|
| هری | عەنبار | یۆنانی |
| هزار | بلبل | فارسی |
| هزبر | شێر | » = هژبر |
| همج | تەپۆ | » = چمك |
| هەمیان | هەمیانە | » |
| هندس ـ هنداز | ئەندازە | » |
| هندام | بالای رێك | » |
| هودج | کەژاوە | » |
| هیولی | ماکی یەکەم | یۆنانی |

- ی -

| | | |
|---|---|---|
| یأجوج ، مأجوج | عاجوج و باجوج | عەجەمی‌یە |
| یاسمین | یاسەمەنە | فارسی |
| یاقوت | گەوهەر | یۆنانی |
| یباب | وێران و چۆڵ | فارسی |
| یخت | گەمیە | هۆلاندی |
| یزك | سەرعەسکەر | فارسی |
| یشم | گەوهەر | » = یشب |
| یم | دەریا | ئارامی |

* * * * * *

# - ملخص المقال -

## الكرد ونقاء اللغة

العضو العامل : هــزار

تعاني اللغة الكردية من مشاكل عديدة تختلف من حيث حدتها وتتفق من حيث ان جميعها بحاجة الى درس عميق وتقص مضن وبحث أصيل .

وان واحدة من اهم تلك المشاكل التي تنتظر الحل الجذري العاجل تتعلق ، في رأيي ، بمسألة وجود الكلمات والمصطلحات الاجنبية في اللغة الكردية ومنها وعلى رأسها الكلمات العربية . وتلك ظاهرة عامة شاملة بالنسبة لجميع اللغات التي تتفاعل فيما بينها ، تأخذ من غيرها وتعطي لغيرها مما يعتبر عامل قوة لها يساعد على تطويرهما وتوسيع افقهما . ولكن مع ذلك دأب بعض المثقفين الأكراد وبحماس منقطع النظير على « تنظيف » لغتهم من الكلمات « الدخيلة » محاولين بذلك « إثبات » إستقلال كيان اللغة الكردية وهم يخلقون بعملهم هذا مشكلة جديدة وخطيرة بالنسبة لهذه اللغة لان معظمهم في أحسن الاحوال ليسوا أهلا لانجاز هذه المهمة الذي يتطلب اول ما يتطلب

معرفة واسعة بمختلف اللهجات الكردية واطلاعاً كافياً على تراثنا الادبي المدون وغير المدون وإدراكاً تاماً لتقدير ضرورة وكيفية التغيير والتبديل في الكلمات والمصطلحات الاجنبية التي في أحيان كثيرة تتحول بفعل عوامل وظروف معينة الى جزء متمم للغة المعنية وتكون في قوة الأصيل بالنسبة لها فلا يمكن والحالة هذه تغييرها بكلمات ومصطلحات مصطنعة تبدو هي في طابعها وصياغتها غريبة أو دخيلة مجردة من مقومات الحياة والبقاء ، وليست قليلة من أمثالها في العديد من المؤلفات الكردية بما فيها الكتب المدرسية وغيرها .

وهذا لا يعني بطبيعة الحال إنني لست من انصار احياء ونشر المصطلحات الكردية الأصيلة التي تستطيع أداء دورها الصحيح في التعبير الدقيق السلس عما يراد منها ، بل بالعكس ارى في ذلك ضرورة علمية سبقتها تجارب غنية لامم اخرى ، ولكن علينا ان نعهد انجاز مثل تلك المهمة الشاقة الى اناس من ذوي الكفاءات والخبرة ومؤسسات لها من الامكانات العلمية والمادية ما يؤهلها لاخذ تلك المهمة على عاتقها . ولكنني في كل الاحوال أرى من المهم التأكيد على ضرورة عدم التفريط بالكلمات والمصطلحات المقتبسة التي أصبحت جزءاً حيوياً متمماً لكيان لغتنا دون ان تؤثر على إصالتها وقوتها . وليست تلك حالة فريدة في واقعها بل امر شائع وحقيقة واقعة بالنسبة لجميع اللغات وحسبي ما انشره رفق مقالي من شواهد على الكلمات والمصطلحات « الدخيلة » في اللغة العربية التي لا يختلف إثنان على كونها واحدة من أقوى اللغات على وجه البسيطة ، واستعنت في تحديد تلك الأمثلة بـ « المعرب من الكلام الاعجمي على حروف المعجم » لأبي

منصور الجوالقي (٤٦٥ — ٥٤٠ هـ) [من منشورات وزارة الثقافة المصرية — الطبعة الثانية — ١٩٦٩ ] و « الالفاظ الفارسية المعربة » للسيد ادّى شير رئيس أساقفة سعرد الكلداني [ طبعة بيروت — ١٩٠٨ ] و « المنجد في اللغة » .

* * * * * *

# لە کوێوە دەست بکەین
## بە دەستوور سازی
## ڕێ زمانی کوردی

ئەندامی کارا : د. پاکیزە ڕەفیق حیلمی

## بەشی دووەم

ئەلف و بێ و دەنگ لە زمانی ئاڤێستادا :

وەك لە پێشدا وتمان و زانراوە ، ئێرانیەکان ئەلف و بێی (ئارامی)یان خواستووە و بەکار هێناوە بۆ نووسین ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم ئەلف و بێیە بۆ کۆمەڵە زمانێك دانراوە کە لە بنەڕەتدا جیاوازە لەلایەن هەڵکەوتی دەنگەوە لەگەڵ زمانە ئێرانیەکان ، هەمیشە پێویستی بە ئاڵوگۆڕ و دەست لێدان بووە ، چونکە سامیەکان کە ئەم ئەلف و بێیەیان داهێناوە زۆریان گوێ نەداوەتە دەنگە (بزوێنەکان ـ حروف العلة)[1] و بە لایانەوە شایانی نرخێکی

(١) اسرائیل ولفنسون ، تاریخ اللغات السامیة ، طبعه مصر ١٩٢٩ ، ص ١٤ .

وا نەبوون وێنەی تایبەتییان بۆ دابنێن بە هەمو پلەیەکی کورت و درێژیانەوە و هەر بە وێنەی ( ا ) و ( و ) و ( ی ) کە بۆ دەنگی ئاوازەی ئەم بابەتە دەنگە دانراون کاری خۆیان لە نوسیندا بردۆتە سەر هەتاوەکو بەرەنگاری فیکری ئاری بوون و هەستیان بەکەم و کورتی ئەم ئەلف و بێیە کردووە ئنجا حەرەکاتیان داهێناوە کە وەك سەربار خراونەتە یا سەر یا ژێر وێنەی دەنگە ئاوازەکانەوە . هۆی ئەم کەم تەرخەمییە بەرامبەر دەنگی بزوێن و بەتایبەتی کورت و کراوەیان لە زمانە سامیەکاندا ئەوەیە کە هەست بە شلۆکی و سروشتی خۆگۆڕینی ئەم دەنگانە کراوە و بە دەنگی یەك رۆ دانەنراون هەر لەبەر ئەوەشــــە ئەم دەنگانەیان نـاو ناوە دەنگی ( زەدە ـ علە ) و راستیەکەشی بە هەڵە نەچوون چونکە ئەم دەنگانە بەگوێرەی واتای وشە دەگۆڕدرێن بەڵکو گۆڕینیان دەبێت بە هۆی گۆڕینی واتای وشە و گۆڕینی کێشی .

لە سەدەی یەکەمدا سامیەکان و بەتایبەتی زمان شناسە عەرەبەکان بۆ ئاسان کردنی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز و تێ گەیشتنی لە لایەن هەمو نەتەوەکانی باوەڕیان بە ئیسلام کردووە ، دەستیان کرد بە دەستکاری ئەو ئەلف و بێ عەرەبییە کە ئەویش لە سـەرەتادا لەو سەرچاوەیە کەوتۆتەوە کە ئارامی لێ وەرگیراوە و بێ خاڵ و بزوێنە ، لە ئەنجامدا ئەم خاڵ و بزوێنانە دانران[2] کە ئیستە دەبینرێن لە

(۲) هەمان سەرچاوە ، ل ۱۲ .

ئەلف و بێی عەرەبیدا و یەشتا هەر کەمی و ناتەواویان ماوە .

بەشی یەکەم : بەراوردی دەنگی ئاوازە :

ئەلف و بێی ئارامی لە سەرەتادا لە ( ٢٢ ) وێنەی دەنگە ساغ « صحیح »ەکان کێشراوە ، مەبەس لە دەنگی ساغ کە لە زمانە سامیەکاندا باس دەکرێت ئەو دەنگانەیە کە وێنەیەکی وەستاو و نەگۆڕدراویان هەیە و لە هەمو کاتێکدا و لە هەر شوێنێکدا هەڵکەوێت هەر یەك دەنگیان هەیە ، ئەم دەنگانە بەرامبەر « Consonant »ن لە زمانە ئەوروپاییەکاندا و لە زانستی زماندا . لە راستیدا ئەم دەنگانە بە دوو بەڵگە دەناسرێن ، یەکەم ئەوەیە کە یەك دەنگیان هەیە و لە هەمو کاتێکدا بە ماوەیەکی مەعلوم و لە شوێنێکی تایبەتیەوە دەردەبڕدرین و شێوەیەکی یەك ڕو و ساغیان هەیە و دوەهەم هەر دەنگە سازگەیەکی ئاشکرای هەیە لە دەمدا و بە گیرێکی تایبەتی دێتە دەردوە لە زار و گوێ پێ دەکرێت .

ئەم ( ٢٢ ) دەنگە لە ئەلف و بێی ئارامی و عەرەبیدا بەم جۆرە ریز دەکرێن : ا ب ج د . هـ و ز . ح ط ی . ك ل م ن . س ع ف ص . ق ر ش ت .

ئەگەر ورد ببینەوە دەبینین کە دەنگی بزوێن لەم ئەلف و بێیەدا نییە[٣] لە هەردوو زمانە سامیەکەدا چە عەرەبی و چە ئارامی

---

(٣) دکتور کمال محمد بشر ، دراسات في علم اللغة ، مصر ١٩٦٩ ، ل ٤٢٠ .

هه‌روه‌ها له عبرانیــدا .. بۆ ده‌نـگی بزوێن له دواییدا وێنه دانراون[٤] و نه‌خراونه‌ته ناو ئه‌لف و بێ . ئه‌ویش له و كاته‌دا كه به پێویست زانراوه وه‌ك وتمان بۆ ئاسان كردنی خوێندنه‌وه‌ی قورئان[٥] و له دواییدا بۆ لێك‌دانه‌وه‌ی ده‌ستووری زمان به تایبه‌تی له‌كاتێكدا كه به‌ره‌نـگاری (ئیشتقاق ـ دارشتن)ی وشه بوون و (ئیعلال ـ و ئیبدال) سه‌رنجی راكێشـاون له (ته‌صریف ـ گه‌ردان)ی كار و دارشتنی ناوی دارێژرا و له (كار ـ فعل) .

به راستی له مه‌یدانی لێك‌دانه‌وه‌ی ده‌نـگ و زانستی ده‌نـگ‌سازی زمان شناسه عه‌ره‌به‌كان و به‌ڵـكو هه‌موو نه‌ته‌وه سامیه‌كان سوودێـكی زۆریان له فیـكری ئاری[٦] وه‌رگرتووه[٧]، دوور نییه به‌رهه‌مه‌كانی زمان شناسه هندیه‌كانیان به‌رچاو كه‌وتبێت و به تایبـه‌تی به‌رهه‌مه نایابه‌كه‌ی (پانینی) هندی كه یه‌كه‌م زانای زمانه له دونیادا و له سه‌ده‌ی چواره‌می

---

(٤) Rev. Thomas Arayathinal . M . o . 1 , Aramaic Grammar PP . 1 , 2 .

(٥) یه‌كه‌م كه‌س ابو الاسود الدؤلی بووه كه به‌ئه‌مری علي كوڕی ابي طالب (د. خ.) خالی داناوه بۆ پیته‌خاڵداره‌كان وحه‌ره‌كانی داهێناوه و به‌مه خوێندنه‌وه‌ی قورئان و زمانی عه‌ره‌بی پاراستووه له هه‌ڵه .

(٦) الدكتور كمال محمد بشر ، دراسات في علم اللغة ، دار المعارف بمصر ، ١٩٦٩ ، ص ، ٣٦ ، ٥٨ .

(٧) الدكتور احمد مختار عمر ، البحث اللغوى عند الهنود واثره على اللغويين العرب ، بيروت ١٩٧٢ ، ص ١٢٩٠ .

ب . ز ژیاوە بەتایبەتی لە (زانستی دەنگ) و لێکدانەوەی دەنگی زمانی سانسکریتی[٨] .

لە پێشدا دیارە هەر دەنگی (ساغ)یان بە دەنگی راست زانیوە چونکە بە وێنەیەکی ئاشکرا و رەوان توانیویانە (سازگە ـ مخرج)ی هەست پێ بکەن و دەس بخەنە سەری و (گیری) بدۆزنەوە لە کوێوە دێتە دەرێ و (گۆ)ی پێ دەکرێ . بۆیەك کە دەستیان کردووە بە دەستوور دانانی رێزمان ئەلف و بێیان هەر لە و دەنگە ساغانە رێك خستووە کە سازگەی ئاشکرایان هەیە و کە هاتونەتە سەر وشەسازی و سەرنجیان لە دروست بونی وشە داوە هەر دەنگە سازگەدارە ساغەکانیان بە دەنگی راست و ساغ ژماردووە و بنای وشەیان بەگوێردی ئەو دەنگانە هەڵبەستووە . هەروەها کە (کیش – قیاس)یان داناوە بۆ وشە ، تەنها دەنگە ساغە سازگەدارەکانیان ژماردووە ، و دەنگی بزوێن کە سازگە و گیری نییە گوێی نەدراوەتێ[٩] ، بۆیەك کە و توویانە بنای وشە لە سەر سێ دەنگی ساغ هەڵدەبەسترێت (فعل) لە عەرەبیدا و لە هەمو زمانە سامیەکانی تر ، مەبەستیان تەنها لە (ف) (ع) (ل) کە بووە و دەنگی (ــِـ) ژێر لە کێشی ناودا (فِعل) و (ــَـ) سەری (ف) و (ع) (ل) لە کێشی کار (فَعَلَ)یان نەژماردووە .

---

T . Burrow , The Sanskrit Language , P . 49 (٨)

Rev . Thomas Araythinal , Aramaic Grammar, PP . 1 , 7 . (٩)

ئەم کەم و ناتەواوتی ئەلف و بێی سامیە رێـگەی لە ئێرانیەکان نەگرتووە لە خواستنی بۆ نوسـینی زمانەکانی خۆیان بەڵـکو زۆر بە وردی هەوڵیان داوە و توانیویانە پڕی کەنەوە و تەواوی بکەن و لە ئەنجامدا ئەلف وبێیەکی وای لێ دروست بکەن کە بە تەواوی وێنەی هەمو دەنگێکی ئاری تێدا بکێشرێت . بێ گومان لە سەرەتادا دەنگە ساغەکانیان بەراورد کردووە لەگەڵ دەنگی ( ساغ[10] Consonant ) لە زمانەکانی خۆیاندا و ئەم چەند وێنەیەیان خستۆتە سەر .

وێنەی تایبەتی بۆ ( ك )ی وەك کێو و ( گ )ی وەك گیا ، بۆ ( چ ) و ( ژ ) ، بۆ ( ذ ) وەك وشـــەی ( یەذ ) ( صەذ ) ، بۆ دەنگی ( پ ) و ( ڤ ) بـــۆ نونی ( گەنگ )[11] کە لە بنی مەلاشۆوە دەست پێ دەکات وەك هەنگ ، بۆ نونی ( نەرم ) کە لە پێشی مەلاشو دەست پێ دەکات وەك پەند و هەر لە ســـەرەتاوە دەنگی ( ص ) و ( ح ) یان بە دەنگێکی خۆماڵی زانیوە و هێشتویانە لە ئەلف و بێکەدا . بەم جۆرە دەنگی ئاواز — سـاغ Consonant لە ئەلف و بێـی ئافێستادا گەیشتۆتە ( ٣٤ ) دەنگ و ( ٢٤ ) وێنـەیان

---

(١٠) ساغ ـ Consonant : لێرەدا ساغ لە باتی ئاوازە ـ ئاوازدار کە « Consonant » نەنها لەبەر ئەوە بەکار دەهێنم کە بەرامبەر ناوە عەرەبیەکە بێت وسەرنجی خوێندەواری لێ دوور نەخاتەوە .

(١١) ئەو نونەیە کە لە ناو لوتەوە دەردەبڕدرێت بە بڵی لە بنی مەلاشووەوە دەست پێ دەکات .

بۆ کێشراوە بەم جۆرەی خوارەوە[12] و بە گوێرەی سازگەکانیان .

١– دەنگی سازگەی قورگ GUTTURAL

| ئەڤێستا | | لاتینی | | کوردی | | نموونە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| 𐬐 | = | k | = | ك | وەك | کورد |
| 𐬑 | = | K' | = | ك، | وەك | ،کێو |
| 𐬔 | = | g | = | گ | وەك | گورگ |
| 𐬖 | = | g' | = | گ، | وەك | ،گێل . |

٢– دەنگی سازگەی مەلاشوو PALATAL

| ئەڤێستا | | لاتینی | | کوردی | | نموونە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| 𐬗 | = | Ç-CH | = | چ | وەك | چاو |
| 𐬘 | = | J dj | = | ج | وەك | جۆ . |

٣– دەنگی سازگەی دان DENTAL

| ئەڤێستا | | لاتینی | | کوردی | | نموونە |
| --- | --- | --- | --- | --- | --- | --- |
| 𐬙 | = | T | = | ت | وەك | تور |
| 𐬝 𐬚 | = | T١ | = | ط | وەك | طوری |
| 𐬛 | = | D | = | د | وەك | دەم |
| 𐬜 | = | D' | = | ذ | وەك | بەذ |
| 𐬚 | = | T | = | ث | وەك | فەرث[13] |

(١٢) Par C. De Harzel, Manuel de la langue de Avesta, PP. 4 - 5.

(١٣) فەرث ناوی پەرتەکانە .

٤ــ دەنگی سازگەی لێو KABIAL

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ك | = | P | = | پ | وەك | پەڕ |
| ك | = | F | = | ف | وەك | فاڵ |
| ر | = | B | = | ب | وەك | بەر[١٤] |
| كل | = | W | = | (و)ی سەرەتا وەك وەرد | | |

٥ــ دەنگی سازگەی لوت ـ NASAL

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ٦ | = | N | = | ن | وەك | ناو |
| ٤ | = | n̄ ـ ṅ ـ ن | | دوای بزوێن وەك دانرا | | |
| كد | = | ṅ | = | ن | وەك | پێشوَ لە سەرەتادا |

دوایی ئەم نوَنە بووە بە (ی) وەك

DANHV ئەبێ بە DAHYV

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ش | = | n̄ | = | ن | دەنگێكی قورگی ولوَ تی |

و دانییە و زور بە گران (گوَ) دەكرێ

وەك (ن) لە وشەی[١٥] سەندار . دوانزە[١٦]

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 6 | = | M | = | م | وەك | مەڕ . دەم |

---

(١٤) C. De Harzel, Op. cit., PP. 4 - 5

(١٥) Ibid, P. 13

(١٦) T. Burrow, Op. cit., P. 29

دەنگی (گرۆ ـ Ocloster)لە زمانی کـوردیی ئێستەدا زۆرە وەك لەم وشانەدا دەردەکەوێت : زمان ـ رم ـ پرس ـ رس . ترس ـ رس . جوان ـ جڤان ـ جڤ و گەلێکیتر ، بەڵام لەراستیدا مـن ئەمـە بە گرۆ دانانیم چونکە لە و باوەڕەدام کە هیـچ دەنگێـکی سـاغ ـ ئاوازە Consonant بە بێ دەنگی بزوێن (گرۆ) ناکرێت و بزوێنێـکی زۆر کورت کە لە زمانە سامیە رۆژئاواییەکاندا ـ ئارامی ـ عبرانی وێنـــە وناوی هەیـــە ، دەکەوێتـە بەینی هەمو دەنـگە (ئاوازە)کانەوە و بە پێی ئەو بزوێنە ناگونجێ دەربڕدرێـن و گرۆ بکرێن .

بەم ئەلف و بێیەدا کە وا خرایە پێش چاوتان دەردەکەوێت کە ئـەلف وبێی ئارامی یەکسەر بەکار نەهاتووە بـۆ نوسـینی زمانە ئێرانیەکان و بەتایبەتی بۆ ئاڤستا و لە ژێر تیژی فـکری ئاریـــدا گۆڕینێـکی تەواوی بە سەر هاتووە هەتا سازکراوە بە وێنەیەکی ورد بگونجێ لەگەڵ دەنـگەکانی زمانە ئێرانیەکان . لێردا ئـــەوی کە مەبەسی منە ، خوێندەوار ورد ببێنەوە لە نزیکیی ئـەو دەنگانەی ئاڤستا لە دەنـگی زمانی کوردیی ئێستە .

ئاشکرایە کە زمانی کوردی ئەمڕۆ گەلێك دەنگی سەربەخۆ و تایبەتی وای تێدایە کە بە تەواوی لە زمانی فارسیی جودا دەکاتەوە ، ئەم دەنگانە بە ئاسانی رێچکەیان لە ئاڤستادا دیارە و زۆر بە رەوانی پەیوەندیی زمانی ئاڤستا و کوردی ساغ دەکەنەوە . پێویسـت نییە

دوبارەی بکەمەوە کە (دەنگ) و هەڵ کەوتی دەنگ لە زمانـــدا بەڵگەیەکی زۆر گرنگە بۆ ئاشکرا کردنی پەیوەندتی یا لە یـــەك دورخستنەوەی دوو زمان[18] بەڵکو لە یـەك چـــونی دوو زمان لە هەڵ کەوتی دەنگدا دەبێ بە هۆی هەڵبەستنەوەی رێچکەیەکی رون ومێژویتی بۆ ئەو زمانە دایکە مردووەی هـەردو زمانەکەی خستۆتـەوە هەر دەنگ سازی یەکەم هەنگاوی خزمایەتی زمانانی هـەڵهیناوە و لێکدانەوەی زمانی کردووە بە زانست .

هەتا ئێستە وا زانراوە کە زمانی فارسی ئەمڕۆ وێنەیەکی نوێی زمانی ئاڤستای کۆنە و فارسەکان بەبێ سـلەمینەوە لەگەڵ هـەندێ لە زاناکانی زمان ئەم باوەڕەیان بڵاو کردۆتەوە ، چونکە کەس گوێی نەداوەتە لێکۆڵینەوەیەکی زانایانە لە رێچکە و مێژوی زمانی کوردی و بـــە بـــیریدا نەهاتووە بەراوردێـکی ورد بکات لە بەینی زمانی ئاڤستا وکوردیدا .

بە راستی خولیای ساغ کردنەوەی مێژوی زمانی کوردی و ئاشکرا کردنی جـــوداوازتی کوردی و فارسی منی دەمێکە خستۆتە ئەندیشە وپشکنین و لە ئەنجامدا هێنامیە سەر ئەو بڕیارە کە ئەم ئەرکە گرنگ و بەر پانـە بخەمە سـەر شانم و رەنجی دوایـیم ببەخشم بە کورد .

بە وردبونەوەیەکی کەم لە دەنگە (ساغ ـ ئاوازە Consonant) ەکانی

---

(18) T. Burrow, Op. Cit, P.67.

لە بەر دەستدایە دەبینرێت کە لە زمانی ئاڤێستای کۆندا دوو دەنگی جوداوازی (ك) ـ بڕوانە ژمارە یەك سازگەی قورگ ـ هەن و هەردووکیان وێنەی تایبەتی خۆیان هەیە ، یەکەمیان بۆ دەنگی (ك)ی وەك وشەی ( کورد )ە ، دووەمیان بۆ دەنگی (ك)ی وەك وشەی ( کێو )ە .

ئەم دوو دەنگە وەك دیارە لە کوردی ئێستەدا پارێزراون و لە فارسیدا نابینرێن !. هەروەها دوو دەنگی جوداوازی ( گ ) هەن و هەردووکیان وێنەی تایبەتی خۆیان هەیە ، یەکەمیان بۆ دەنگی (گ)ی وەك وشەی ( گورگ )ە و دووەمیان بۆ دەنگی (گ)ی وەك وشەی ( گێل )ە . لە هەردوو دەنگەکەدا ، واتە (ك) و ( گ ) دوو شێوە هەیە : یەکەمیان وشك و راستە و دووەمیان نەرم و داشکاوە ، یەکەمیان لە بنی قورگەوە گۆ دەکرێت ، دووەمیان زمان نزیك مەلاشوو دەخاتەوە . ئەم دوو دەنگە فارسی و کوردی لە یەك دوور دەخەنەوە و فارسی و ئاڤستایش لە یەك دوور دەخەنەوە و کوردی و ئاڤستا لە یەك نزیك دەخەنەوە . راستە ئەم « ظاهرە » دەنگییە بە بێ هۆ نییە ، بەڵام هیچ « ظاهرە » یەکی تر لە زماندا بێ هۆ روو نادا و هەر ئەو « ظاهرانەن » دەبن بە هۆی دوور و نزیکی دوو زمان لە یەك .

پەیدا بوونی ئەم دوو دەنگە تایبەتیەش وەك ئاشکرا دەبێ بەم جۆرەیە :

١ــ لە کاتێکدا کە دەنگی بزۆینی (ێ) کراوەیان بە دوادا دیت وەك کێو ، کێم ، کێچ ، کێل بۆ (ك) و وەك گێژ ، گێرە ، گێل ، بۆ (گ) .

٢ــ لە کاتێکدا کە دەنگی بزوێنی (ی)ی درێژیان بە دوادا دێت وەك :

کین ، کیسە ، کیتەڵە ــ بۆ (ك)

گیپە ، گیك ، گیزە ــ بۆ (گ)

٣ــ لە کاتێکدا کە دەنگی (وێ)ی لێك دراویان بە دوادا دێت وەك :

کوێ ، کوێر ، کوێخا ــ بۆ (ك)

گوێ ، گوێز ، گوێرەکە ــ بۆ (گ)

بەڵام وەك وتم ئەم (ظاهرە - ڕوداو) یەکی دەنگییە و ئاشکرایە و سارگەی دەنگەکەی تێدا دەگۆڕێت و لە زمانی فارسیشدا ئەم دوَ دەنگە بەم جۆرە بەرەنگاری بزوێن دێن ، بەڵام بە شێوەیەکی تر دەگۆڕدرێن .

لە دەنگی سارگەی مەڵاشوودا دەبینن‌کە وێنەی تایبەتی بۆ (چ) لە وێنەی (ج) سازکراوە بۆ ئاڤستا هەر وەك (چ)ی عەرەبی کە ئێستە لە (ج) سازکراوە .

لە دەنگی سارگەی دان دیسان بەرەنگاری دوَ دەنگی تایبەتی

دێین کە یەکەمیان لە دەنگی (ت) کەوتۆتەوە، بەڵام ئەم وەك (ط)ی عەرەبی وایە، بە وێنە و سازگە جودا دەکرێتەوە لە ئەلف وبێی ئاڤستادا. یەکەمیان کە (ت) یە وشکە و سوك وەك (ت)ی (تۆز). (تەون) و لە بەینی سەری زمان وبن دانی سەرەوە (گۆ) دەکرێت، ئەویتریان بڵەە و لە کاتێکدا کە سەری زمان بە بن زمانەوە دەنوسێت لە دواوە بڵاو دەبێتەوە و (گۆ) دەکرێت وەك (طوری)[19] لە شێوەی کوردیی سەرۆدا.

دۆهەمیان لە دەنگی (د) دەکەوێتەوە و بە وێنە و دەنگەوە لە ئەلف وبێی ئاڤستادا ئاشکرا دەکرێت، یەکەمیان هەر وەك (د)ی عەرەبی وایە وەك لە وشەی (دەم) و (دان)ی کوردیی. دۆهەمیان دەکەوێتە دوای کەرت یا وشە و بە نەرمی دە توێتەوە لە بەینی هەردۆ پیتکدا وەك لە وشەی (صەذ) و (بەذ) کە دیسان شێوەی لە (د) بۆ سازکراوە، وەك (ذ)ی عەرەبیی لە (د). ئەم دۆ دەنگەش زۆر ئاشکران لە کوردیدا، (ط) لە شێوەی کوردیی سەرۆ بە زۆری و (ذ) لە شێوەی هەورامیی بە زۆریی و هەروەها هەن لە کوردیی ناوەڕاستدا بەگشتیی.

هەر لەم سازگەیەدا دەنگێکی تریی ئاڤستایی لە کوردیدا پارێزراوە کە لە فارسیی کۆندا هەبووە و نەماوە وئێستە لە شێوەی

(١٩) طوری ـ ڕێوی.

هەورامیدا[٢٠] زۆر بە ئاشـــکرایی و زۆری دیارە ئەویش دەنگی (ث) یەکە وەك دەنـگە عەرەبییەکەیە و شێوەی خـۆی لە ئەلف وبێتی ئاڤـستادا بۆ سـازکراوە وەك لە وشـــەی ( پەرت ) کە ناوی پارثیـەکانە .

لە ســـازگەی دەنگی لێـــودا ، لە وێنەی دەنگی (ب) وێنەی تایبەتی بۆ دەنگی (پ) ساز کراوە و بەم جـــۆرە هەموو دەنگە لێویەکان لە ئەلف و بێتی ئڤستادا وێنەیان هەیە وەك کوردی ئێستە .

لە سازگەی دەنـگی لووت چوار دەنـگی جودا بە وێنـــەی ســەربەخۆوە لەم ئەلف و بێیەدا هەن بۆ (نون) . یەکەم وەك نونی کوردی ئێستەیە لە هەموو شوێنێـکی وشەدا . دوەهەم دەکەوێتە دوای ئەلف و (هـ)ی بە دوادا دێت وەك لە وشەی ( A'nhat. ) کە نزیکە لە دەنـگی (نـگ) لە وشەی (هەنـگ) لە کوردیدا .

نونی سێهەم لە هەموو شوێنێـکی وشـەدا دێت کە بزوێنێـکی بە دوادا دێت دەنـگێـکی تایبەتی دەداتێیاخۆ لە دوای دەنـگێـکی ئاوازەوە . نونی چوارهەم نونێـکی زۆر تایبەتییە زۆر لە (نـگ)ی کوردی دەچێت ، ئەم نونەش هەمیشە بە دوای بزوێنێـکدا دێت وئاوازەیەکی لە دواوە دێت وەك لە وشەی (هەنگا و . مانـگ)دا .

بەمەدا دەردەکەوێت کە کوردی ئێستە زۆر لەسەر دەستووری

(٢٠) D. N. Mackenzie, The Dialect of Awraman, P. 8.

زمانی ئاڤستا ماوەتەوە لە بارەی دەنگە لێوییەکانەوە و ئێستەش ئەو (ئونانە)ی ئاڤستا هەر وەك خۆیان لە کوردیدا پارێزراون لە کاتێکدا کە فارسی هەر یەك شێوەی ئەم دەنگەی هەیە[21] و هەر لە فارسی کۆنیشدا یەك دەنگ بووە کە بەڵگەیە بۆ ئەوەی فارسی لە ئاڤستا نەکەوتۆتەوە و پاشماوەی زمانی ئاڤستا نییە[22]. دەنگی (م) لەم سازگەیەدا وەك دەنگی (م)ی ئێستەیە ، یەك شێوە و یەك دەنگە .

دەنگی Sifflantes - Fricative « الصوامت الاحتکاکیة » :

ئەم دەنگانە سازگەی تایبەتی سەربەخۆیان نییە چونکە لە کاتێکدا پەیدا دەبن کە بۆریەی هەوا لە هەناسەداندا دێتەوە یەك و لە و شۆینەی تەواو تەسك دەبێتەوە یەکێك لەم دەنگانە گۆ دەکرێت[23] . لەم دەنگانە ئەلف و بێی ئاڤستا پێنج دەنگی بە وێنەوە تێدایە (س) کە هەر وەك کوردی ئێستەیە ، هەروەها (ش) . بەڵام ئەوی جێی سەرنجە کە (ص)ی عەرەبی تێدایە وەك لە وشەی (صەگ) (صەد)دایە کە تا ئێستە لە کوردیدا هەرچەند زۆر ئاشکرایە دانی پێدا

---

(٢١) د . محمد جواد مشکور ، دستورنامه در صرف ونحو زبان پارسی ، ل . ٤

(٢٢) Ronald Kent, old Persian . P, 18

(٢٣) د . محمود السعران ، علم اللغة ، ل ١٨٨ .

نەنراوە و نەهەڵێنراوە. بۆنی ئەم دەنگە لە ئاڤستادا دیسان بەڵگەیەکە بۆ دەرخستنی پەیوەندی ئاڤستا لەگەڵ کوردی لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە بۆ چەسپاندنی دەنگی (ص) لە فۆنەتیکی کوردیدا[٢٤]. دەنگی (ز) وەك دەنگی (ز)ی کوردییە هەروەها وێنەی تایبەتی لێ سازکراوە بۆ دەنگی (ژ) کە دیسان لە زمانی کوردیدا ماوە.

دەنگی Aspirate - Aspiree «انفجاری مهموس»: ئەم دەنگانە لەکاتێکدا پەیدا دەبن کە هەوا لە گەروودا گیر بێت و لەپڕ بەربێت وەك دەنگی هەمزە لە عەرەبیدا کە گەروو دەگیرێت و لەپڕ، لەبنی قوڕگەوە بەر دەبێت و دەنگی (هـ) کە تۆزێك لە خوارووترەوە بەر دەبێت. لە ئاڤستادا دیارە وەك کوردی ئێستە دەنگی (هەمزە) هەر وەك ئەلفی سەرەتا درێژ یا کورت بووە، و هەر لە سەرەتای وشەدا بیستراوە، لەبەر ئەوە وێنەی تایبەتی نەبووە، وەك دەنگێکی ئاوازە هەر بزوێنەکە کە پێش وشە کەوتووە دەنگی وەك (هەمزە) گۆ کراوە وەك کوردی ئێستە بەڵام لە ئەلف و بێی کوردی ئێستە کە لە عەرەبییەوە وەگیراوە وێنەی هەمزەش بەکار هاتووە بە شێوەیەکی سازکراو و خراوەتە سەر کورسییەك چونکە بە پیتی ترەوە نانوسێنرێت و بە تەنهاش دەشێ بکەوێت یا لە وشەکە دوور کەوێتەوە لەبەر ئەوە وا بە باش زانراوە بخرێتە سەر کورسی و

(٢٤) De Harzel, La Langue De L'avesta P. 5.

بە پیتەکەی دوایییەوە بنووسێنرێت .

لە ئەلف و بێی ئاڤستادا لەم دەنگانە تەنها ( هـ ) وێنەی هەیە سەربەخۆ .

## دەنگی نیو بزوێن Semi Vowel :

ئەم دەنگانە لە زمانە هندو ئەوروپاییەکانی ئێستەدا بەم ناوەوە ناسراون بەڵام بە گوێرەی زمانەکە ژمارەیان پتر یا کەمتر دەبێت . لە ئەلف و بێی ئاڤستادا چوار دەنگی نیو بزوێن هەن کە دوانیان ئێستە لە هەموو زمانە ئەوروپاییەکاندا ناونراون ، (ی ـ y) و (و ـ w) و لە کوردیشدا هەر هەن ، دوانەکەی تر کە (ف ـ v) و (ر ـ r) لە هەندێك لە زمانە هندو ئەوروپاییەکاندا بە نیو بزوێن دادەنرێن و لە هەندێکدا هەر بە ئاوازەی ساغ . لە ڕاستیدا ئەم دوو دەنگە بە ئاسانی بەکار دێن بێ ئەوەی پێویستیان بە بزوێن هەبێ بۆ یارمەتی لە گۆکردندا و سروشتی دەنگی بزوێن دەردەخەن لەم لایەنەوە وەك لەم وشانەدا ئاشکرایە : بڕکە ، دڕ ، رزگار ، رست ، رم ، ڤنگە ، تاڤگە ، سڤك . کەوابوو دەتوانین بڵێین کە ئەم دوو دەنگە هەر وەك لە ئاڤستادا بە نیو بزوێن دانراون وەك نیو بزوێن بەکار هاتوون ئێستە لە کوردیدا هەر ئەو سروشتەیان هەیە و هەر بە نیو بزوێن دادەنرێن ، ئەمەش بەڵگەیەکی ترە کە زمانی کوردی لە زمانی ئاڤستا نزیك دەخاتەوە .

هەندێ ( گرۆ )ی دەنگی هەن لە زماندا ، واتە چەند دەنگێکی ( ئاوازە ـ Consonant ) کە بە یەکەوە گۆ دەکرێن بێ ئەوەی بزوێنێکی ئاشکرا بکەوێتە ناویان ، ئەم جۆرە رووداوە دەنگیە پێی دەڵێن گرۆ ( Cluster ) لە ئاڤستادا ئەمە زۆر ئاشکرایە بە تایبەتی لەم دەنگانەدا ( چڤ ـ cv ) و ( زڤ ـ sv ) و ( زب ـ sb ) .
لەکوردیشدا ئەمە بەدی دەکرێت وەك لەم دەنگانەدا : ( ست ـ st ) وەك لە وشەی مەست ، پەست . هەست . و ( شك - SH ) وەك وشك ، مشك ، پشك ، کەشك . هەروەها لە ( سك ـ sk ) وەك بروسك ، نیسك ، گیسك و گەلێکی تر .

بە بەراورد کردنی ئەم دەنگە ( ئاواز ـ Consonant ) نەدا ئاشکرایە کە زمانی کوردی تەواو نزیك دەبێتەوە لە زمانی ئاڤستا و مێژوو و تەتەوراتی زمان وا ئاشکرا دەکا کە ئەم زمانە کوردییەی ئەمڕۆ پاشماوە و نەوەی زمانی ئاڤستایە .

بەشی دوهم . بەراوردی بزوێنەکان

بەشی دوهەم بەراوردی دەنگە بزوێنەکان :

چوارده دەنگی بزوێن لە ئاڤستادا ئاشکرا کراون و وێنەیان بۆ سازکراوە لە ئەلف وبێدا . ئەم بزوێنانەش کراون بەسێ بەشەوە : ١ ـ شەشی کورت ، ٢ ـ پێنجی درێژ ، ٣ ـ سیانی

كراوه بەم جۆرەی لە ژێرەوه دەیان خەینە پێش‌چاو .

١ــ دەنگی بزوێنی كورت SHORT VOWELS .

لد = a = ـَـ = ـه وەك مەڕ ، دەم ، سەر ، ڕبە .

د = i = ـِـ = ی وەك نیسك ، تیسك ، پزیشك .

ر = u = و = و وەك كورد ، گورگ ، قوڕ .

٤ = e = ـِـ = ئەم دەنگە بزوێنە لە كوردیدا وێنەی

نییه هەروەها لە عەرەبیدا ، هەرچەند لە زمانە سامیەكاندا ، عبرانی وئارامی هەیـه لە شێوەی خاڵێـكدا كە دەخـرێنە ژێر تیپەكە بـۆ ئەوەی بزانرێت كە دەنگەكە دەنگێـكی زۆر كورتی ژێـره . دیارە لە ئاڤـستادا زۆر هەستی پێ كراوه وزۆ وێنەی بۆ سازكراوه . ئەم دەنگە مەیلەو ژێرە كورتە لە كوردی ئێستەش زۆر هەسـتی پـێ دەكرێ ، بە تایبەتی لە وشەی یەك بڕگە[٢٥] و پێویستی بە وێنە هەیە یا لە وێنەی ( e ) یا ( i ) دەبێ وێنەی بۆ سازكریت ، بـەلام تائێـستە بـۆی نەكراوه لە ئەلف وبێی عەرەبی سازكراودا . لە لاتینندا لە ( i ) بۆی كراوه بێ خاڵ .

(٢٥) وەك دڵ ، مـل ، پـل ، گڵ ، زل ، تـف ، مس ، دڕ ، كڕ .

DI˘L . MIL . PIL . GI˘L . ZIL . KIL
TIF . MIs . DIR . KIR .

ێ = ئـــەم دەنگە دەنگی (ێ) کراوەی = é = ێ = درێژ نییەکە لە ئەلف وبێی ئێستەی کوردیدا وێنەی هەیە، بەڵکو دەنگێکی لەو کورتترە، بەڵام هـــەر لەو ئاوازەیە وەك دەبینرێت لەم وشـانەدا : پێسـت، پێش، ئێش، گێل کە کورتترە دیارە لە دەنگی (ێ) کراوە لەم وشانەدا : پێرێ، شێر، تێر، شـێت،

ۆ = O = وەك لە (ۆ) ی کراوە کورتترە بەڵام هەر لەو ئاوازەیە وەك لەم وشانەدا دەردەکەوێت : کۆڵ، دۆڵ، گۆشت کە ئاشکرایە لە دەنگی (ۆ) کراوە کورتترە لەم وشانەدا : دۆ، رۆن، شۆراو، خۆڵاو .

ئەم سێ دەنگەی دوایی کە باسمـان کردن وێنەیان لە ئەلف وبێی سازکراوی ئێستەی کوردیدا نییە، بەڵام وەك دەرکەوت دەنگیان ئاشکرایە . هەرچەند پێویست نییە وێنەیان بۆ ســـازکریت تازە . بەڵام پێویستە نیشان کرێن بۆ مەبەستی بەراورد کردنی دەنـگ لەگەڵ دەنگی زمانی ئاڤستا چونکە وا دیارە کە کوردی هیچ لای نەداوە لە دەستوری دەنگدا لە ئاڤستا و هەموو دەنگە بزوێنـە کورتەکانی پاراستووە تەنها هەندێکیان وێنەیان بۆ سازنەکراوە .

٢— دەنـگی بزوێنی درێژ Long - Vowels .

ئاا = â = آ = ا = وەك دار، یار، ساوا .

ێی = i = ي = بێ — وەك بیر . شیر . میر

= û = ۆ = وَ = وەك تور . پور . شوتی

= ê = ي = ێ = وەك شێت . تێر .. كێج .

= = ۆ — ۆ = وەك . شۆراو . دۆشاو .

٣— دەنگى بزوێنى (كراوه) كه به تەواوى له ئاڤستادا ئاشكران

= á = وەك ئەلفێكى نوشتاوه كه له فارسيدا له وشەى مَن — من دا له دەم فارسێكەوه دياره له هەندێ شێوەى كورديدا به دى دەكرێ .

= è = وەك (ێ) كوردى وايه و زۆر نزيكه له دەنگى ê له بزوێنى درێژدا باسمان كرد .

= = ۆ = وەك (ۆ) كراوەى درێژى پێشووه بەلام دەكەوێته دواى وشه[٢٦] به زۆرى وەك خالۆ ، هەلۆ ، زارۆ كه هەندێك درێژتره له (ۆ)ى كراوەى ناو وشه .

ئەم سى دەنگەش له كورديدا هەرچەند دياره دەبيسترێن ، بەلام وێنەى سەربەخۆيان بۆ ساز نەكراوه ، چونكه به بزوێنى درێژ شوێنيان پڕ كراوەتەوه .

(٢٦) Da Harzel, La Langue De L'avesta, P. 5

## دەنگی بزوێنی لیك دراو DIPHTHONGS

ئەم دەنگانە لە دوو دەنگی بزوێن پێك دێت بە مەرجێك بە دوای یەکدا گۆ بکرێن بێ پشوو . لە ئاڤستادا حەوت دەنگی بزوێنی لێك دراو هەن کە هەندێکیان هەر وەك خۆیان ماون لە کوردیدا و هەندێکیان گۆڕدراوە ، یاخود نییە و بزوێنی تری وا هەیە لە کوردیدا کە لەئاڤستادا بەدی نەکراوە .

بزوێنە لێك دراوەکانی ئاڤستا .

[Avestan] = âi = ای وەك پایز . Pâiz . بایز Bâiz

[Avestan] = ói = وی وەك لە وشەی نوێی خوێی کوردی
Nói Xôi

[Avestan] = aé = وەك لە کوردیدا لە باتی هەیە بڵێی هەیێ .
Haê

[Avestan] = âu = وەك لە وشەی چاوگە لە کوردیدا .
Çàuga

[Avestan] = ao = وەك وشەی حەوت . H.aot

[Avestan] = êu = وەك لە وشەی خێوی Xêuê

[Avestan] = êê = وەك لە وشەی کێێ Kêê دێێ Dêê[٢٧]

DE. HARZEL,
LA LANGUE DE L' AVESTA, P. 7. (٢٧)

لە کوردیدا دەنگێکی تری لێك دراو هەیە کە (ai)ە وەك لە وشەی (کەین)، (هەبن) دا، لە ئاڤستادا باس نەکراوە هەر وەها دەنگی (oê) وەك لە وشە گوێ ـ Goê و خوێ ـ Xoê کە زۆر لە کوردیدا هەڵ دەکەوێت.

لە راستیدا هەمو دەنگە بزوینە لێك دراوەکانی ئاڤستا لە کوردیدا هەن، ئەشێ هەموان پێکەوە لە یەك شێوەدا نەمابن بەڵام هەر شێوەیە چەند دەنگێکی تێدا ماوەتەوە و هەندێکیش گۆڕدراوە بە هۆی تێکەڵ بونی زمانەکە لەگەل زمانانی تر، و ماوەی زەمان، چونکە دەنگی بزوێن وەك وتمان شلوك و بێ سازگەیە و کورت کردنەوەی یا درێژ کردنەوەی یا خاو کردنی ... زۆر ئاسانە و روَ دەدا. لەبەر ئەوە دەنگی بزوێن لە هەمو زمانێکدا دەگۆڕدریت بێ ئەوە کار لە تایبەتیەتی زمانەکە بکات بەڵکو تەنها بە روَداویکی ناوچەیی شێوە دادەنرێت.

بەم بەراورد کردنی دەنگەدا لە بەینی ئەلف و بێی ئاڤستا و کوردی کە وێنەی دەنگە، بۆمان ئاشکرا دەبێ کە زمانی کوردی رێچکەی رەسەنی لە روَی زمانەوە بێ کۆسپ دەچێتەوە سەر زمانی ئاڤستا کە ئەمەش دەبێت بە هۆی راست کردنەوەی مێژوَ و ساغ کردنەوەی رەسەنی زمانی کوردی کە دەبێت بە بەڵگە بۆ ئەوەی کە زمانی کوردی پێش زمانی فارسی بە نمونەی نوسراوەوە هاتۆتە مێژۆوە و لکێکی زمانی فارسی نییە و لە و نەکەوتۆتەوە بەڵکو

زمانێکی تایبەتی و سەربەخۆیە و مێژوَی بێ بچری لە ئاڤستاوە کە ٦٠٠ ب ز تا ئەمڕۆ روَن و رەوانە و زمانێکی ئێرانی رۆژ ئاوایی سەروَ و نەك خوارو، وەك فارسی .

شوێنی زمانی کوردی لە ناو خێزانی گەورەی

زمانە هندو ئەوروپاییەکان .

خێزانی گەورەی زمانە هندو ئەوروپاییەکان دەکرێت بە دوَ شابەشەوە .

أ ـ بەشی رۆژ هەڵات . یا ( هندو ئیرانی ـ آری ) کە مێژوَی نەتەوەکانی گۆیان پی کردوَن لە ٢٠٠٠ ساڵەوە دەست پێ دەکات تائەمڕۆ ئەم بەشەش لە ناو خۆیدا دەکرێت بە دوَ بەشی ترەوە .

١ ـ هندی کە بە نموَنەی نوَسراوەوە هاتۆتە مێژوَ وە وە لە سەدەی چوار دەهەمی پێش‌زاینەوە تا ئێستە پاش ماوەی زندوَی ماوە کۆنترین نوَسراوی ئەم زمانانە سانسکریتی کۆنە کە لە کۆمەڵێك کتێبی ئاینیدا پارێزراوە ئەم کتێبانە ناویان Vedas ە ولە شێوەی بیروباوەڕ و مادە دا لەگەڵ ( ئاڤستا ) زۆر لەیەك دەچن تا رادەیەك کە بەشێك لە میان بخرێتە سەر ئەوی تریان هەستی بە زانا نەبێت پێی ناکرێت . ئەم کومەڵە کتێبە چوار بەشە کۆنترین بەش کە Rig - veda یە لە ١٤٠٠ پ ز نوَسراوە .

بە ماوەی زەمان ئەم زمانە کۆن بووە و لە بیر چۆتەوە شێوەی

ناوچە ییی هاتۆتە ئارا و سانسکریتی کۆن هەر لە کتێبە ئاینیەکاندا ماوەتەوە . بەلام بۆ پاراستنی ئاینەکە زانا هندیەکان بڕیاریان داوە دەستوری ڕێ زمانی ئەو نوسینانە کۆ بکەنەوە وبینوسنەوە و لە ئەنجامدا ( پانینی ) کە ناو بانگی بە ( باوکی زانتی زمان ) دەرکردووە ئێستە لە ناو زانایانی زمانی ئەوروپادا لە سەدەی چوارەمی بێش زایندا کتێبێکی بە ناو ( Ashtadhyayi ) داناوە بۆ ڕوَن کردنەوەی سانسکریتی کۆن ودانانی دەستوری ڕێ زمانەکەی وبەم هۆیەوە شێوەیەکی تازە و زندوکراوەی سانسکریتی پەیدا بو کە ناونرا سانسکریتی کلاسیکی(۲۷) .

سانسکریتی کلاسیکی بو بە زمانی ئەدەب ونوسینی بەرزی هندستان هەتا وەکو سالی ۱۸۳۵ ، دوای ئەوە گەلیك شیوەی ناوچەیی هاتنە کار

وزمانی ئنگلیزی بو بە زمانی ئەدەب وزانست وخوێندنی گشتی بەلام سانسکریتی هندی هەر مایەوە لە شێوەی زاری ناوچەییی وئایندا ، لەم زارانەدا ۱ـ هندستانی کە دوَ شێوەی هەیە هندی و ئوردوَ . ۲ـ پالی . ۳ـ بەنغالی . ٤ـ ماراثی . ٥ـ پەنجابی ٦ـ کوجەراتی .(۲۸)

---

د. احمد مختار عمر

(۲۷) البحث اللغوی عند الهنود . ل ۳٤

(۲۸) W. B. Lookwood , Indo - European Philology P . 35 .

٢ ـ بەشی ئێرانی یا ئاری . ئەم کومەڵە نەتەوەیە لە ژێر ناوی ئاریــــدا یەکەم جار لە مێژوودا لە دەوری ١٨٠٠ — ١٥٠٠ ب ز . دا ناسراون ، کونترین پاشماوەی زمانەکانیان ئەو نەقشە میخیانەیە کە لە میتانیەکان بەجێ ماوە وەمێژووی ١٥٠ ب ز ئــەم میتانیانەش لە سەرووی ولاتی میزوپوتامیا ژیاون کە کوردستانی ئێستە یە[٢٨]

لە دوای میتانیەکان ، میدیەکان لە ٨٠٠ ب ز ەوە لە ناوچەی کوردستانی ئێستە دا ناسراون ، دیسان پاشماوەی نوسراویان نییە چەند ناویك نەبیت کە ئەویش ناوی شاکانەو بە خەتی مێخی نوسراوە و رێچکەی ئێرانی ونزیك لە کوردی پیشان دەدات ، بەڵام هەر لە کاتی میدیەکاندا واتە لە ٦٠٠ ب ز دا ئاڤستای پیرۆز و ئاینی زەردەشــتی پەیدا بووە و ( ئاڤــتا ) کە ئاشکرایە بە زمانیکی ئیرانی روژ ئاواییە ســەرەتاکەی . بریتیە لە سرودەکانی زەردەشت خۆی و لە ناوچەی میدیادا پەیدا بووە دیارە ئەو زمانەش زمانی میدیە کە پێی نوسراوە چونــکە عەقل پەســەندی ناکات بە زمانێکی تری غەیری میـــدی

(٢٨) بەو لیستەیەی کە ناوی شــاکانی میتانیەکانی تێدایە و بە خەتی مێخی نوسـراوە دیارە کە زمانی میتــانی زمانێکی ئاری و نزیك زمانی کوردی بووە بۆ نمونە ئەم ناوانە دەخەمە پیش چاو .

براستار = پارێزدار سفارداتا = سەر داد = خودا داد

ساتڤان = پاشگرەکەی ئاشکرایە وەك کوردی و فارسیە و سات ـ بەهێز و ( آن ) کە پاشگرە بۆ پیشە بەکار دێ وەك پاسەوان . شوان . ناوان .

نوسرابێت لەکاتێکدا کە ئاینەکەی و پەیامبەری ئاینەکەی لە میدیا پەیدا بوبیت .

کەوابو ، وەك دیارە ئەم نەتەوە (ئاریانە) کە لە ئاڤێستادا بەم ناوەوە ناسراون وولاتەکەیان بە (ناوی ئاریاوبجا) نـاو براوە لە سەدەی شەشەمی پیش زاینەوە بە نمونەی نوسراوەوە ە وەك زمانێکی سەربەخۆ هاتونە میژووەوە و لە زمانی مادەکاندا کە لەنامەی پیروزی ئاڤستادا ماوەتەوە پاریزراوە تا ئێستە .

ئاڤستا وەك دوای بە وردی لیی دەدوێین دو بەشـە بەشیکی کۆن کە ناوی (گاتەها)یە و سرودەکانی زەردەشتە بێ گومان روژ ئاواییەکە کوردیی وەك بۆمان ئاشکرا دەبی باشماوەی نوێیەتی . بەشی دوهەمی کە بە تازەتر واتە لە دوای بەشی یەکەمەوە نوسراوە بە شیوەیەکی روژ هەلاتی دەزانریت کە دەشی لە ئەنجامەدا بەشێکی فاری لێ کەوتبیتەوە .

لە دوای ئاڤستاوە زمانە (ئیراتیەکان - ئاری) ئیتر دەبن بە سێ بەش ۱ - بەشی روژ هەلات کە دیسـان سێ شیوەی لێ ناسراوە ۱ - سغدی ۲ - اوسێتی ۳ - خوتانیسی[29] .

۲- بەشی خوارۆی روژ ئاوا کە ئەمیش لە سەدەی پینج هەمی پیش زاینەوە بە خەتی مێخی نمۆنەی نوسراوی لە نەخشـەکانی هاخامەنشـیەکاندا پاریزراوە و بە کۆنترین باشماوەی فارسیی ئێستە

(۲۹) W. B. Lookueood, Indo - European, P. 36

دەزانرێت . فارسی کۆن فارسی ناوەندی کە بە پەهلەوی ساسانی ناسراوە لێ پەیدا بووە و پەهلەوی ساسانی فارسی ئێستەی لێ پەیدا بووە . ٢ ـ بەشی سەرەی رۆژ ئاوا کە لە شێوەی ئەشکانیدا بە ( ساسانی ئەشکانی ) ناسراوە و مێژوی لە سەدەی سێهەمی پێش زاینەوە ناسراوە ، کوردی ئێستە و پشتو باشماوەی نوێی ئەمرۆی ئەم بەشەن .

ئەمە لە بارەی زمانەکانی بەشی رۆژ هەڵاتی خێزانی هندو ئەوروپی . بەشی رۆژ ئاوای زمانەکانی ئەم خێزانە بەم شێوەیەی خوارەوە ناسراون .

١ـ زمانی تەراکی و فریجی Traco - Phrygian ، نەتەوەکانی ئەم کۆمەڵە زمانە لە رۆژ هەڵاتی بەڵقاندا ژیاون ، و سێ زمانی سەربەخۆیان پەیدا کردووە ١ ـ تەراکی ٢ ـ فریجی . ٣ ـ ئەرمەنی . تەنها زمانی ئەرمەنی ئێستە زندووە و لە ٦٠٠ پ زاینەوە ناسراوە تا ئێستە .

٢ـ ئیلیری Illyrian زمانی نەتەوەکانی رۆژ ئاوای بەڵقانە کە لە ٧٠٠ ب زاینەوە ناسراون بەم ناوەوە ، تا ١٠٠ ب ز . ئنجا زمانە لاتینیەکان هاتونەتە شوێنیان و تەنها لە شێوەی ئەلبانیدا ئێستە نمونەیان ماوە .

٣ـ ڤینسی ـ Venetic ئەم زمانە سەربەخۆیە زمانی ناوچەی ڤینیسیا بووە لە ئیتالیا و لە ٦٠٠ ب ز هەتا ١٠٠ ب ز ناسراوە وزندو

بووە ، دوای ئەو میژووە ئیتر زمانی ئیتالی شوێنی گرتووە .

٤ـ تۆخاری Tocharian ئەم زمانە مردووە بەڵام لەم چەند ساڵەی دواییەدا هەندێك پاشماوەی نووسراوی دۆزرایەوە لە تورکستانی چینی کە دەرکەوت زمانێکی هندو ئەوروپییە و فەوتاوە ، ئێستە تورکمانی ـ ویغور شوێنی گرتووە .

٥ـ ئانادوڵی ـ Anatolian ئەم زمانە هەتا سەرەتای سەدەی بیستەم نە دۆزرابۆوە ، لە ساڵی ١٩٠٦ دا نزیکەی ١٠،٠٠٠ لەوحەی مێخی لە ( بوغازی کۆی ) لە تورکیا دۆزرایەوە کە بە تەواوی پاش خوێندنەوەیان دەرکەوت زمانێکی هندو ئەوروپییە و زمانی حیتییەکانە کە هاو میژو بوون لەگەڵ میتانیەکانی سەروی ولاتی میزوپۆتامیا و هاو رەسەن بوون .

٦ـ هێلێنی ـ Hellenic زمانی ئەغریقیەکانی یۆنانی کۆنە ، ئێستە یۆنانی بە هەموو شێوەکانیەوە پاشماوەیەتی . زمانی هیلینی سەردەمێك لە هەموو ناوچەی رۆژ هەڵاتی ناوەراستدا زمانی دەوڵەت و زانستی بوو هەر وەها ئاینی مەسیحي ، لە سەدەکانی ناوەراستدا ناوی هیلینی نەما و زمانەکە ناو نرا یونانی بیزەنتی . یونانی تازە لە سەدەی دەیەمەوە ناسراوە . ئەم زمانە لە کۆندا خاوەندي سامانێکی ئەدەبی بەرز بوو و لە سەدەی هەشتەمی پ ز بە شعرەکانی هومیروسەوە هاتۆتە مەیدانی ئەدەبی بەرز . هەروەها خاوەندی میژوویەکی بێ بچرە

لە و ڕۆژەوە و نرخێکی زۆر گرنـگی هەیە لەلایەن زانستی زمانەوە چونـکە مێژوَی بە سەرهاتی ڕوَنە .

٧ـ ئیتالی ـ Italic کە زمانی دانیشتوانی وڵاتی ئیتالیا یە لە پێشـــدا لە دوَ شێوەی ناســـراو پەیدا دەبوَ : ١ـ لاتینی Latin ٢ـ فالیسکی Faliscan کە هەردوَکیان بە یەکەوە بە ناوی ئیتالی ناو دەبران . لە دواییدا ( لاتینی ) پەرەی ســەند و لە دەوری داهاتنی ئاینی مەسیحی بوَ بە زمانی دنیای ئەو ڕۆژە هەتــا لە ســـەدەکانی ناوەراســـتدا ( القرون الوسطی ) بوَ بە زمانی گشت زانست وزانستگاکانی ئەوروپا . نەوەی نوێـی لاتینی ئەمڕۆ چەند زمانێـکی سەربەخۆ وتایبەتیین : ١ـ ئیتالی کە لە سەدەی دەیەمی زاینەوە بووە بە زمانێکی بەرزی ئەدەبێکی دەوڵەمەند وبە نرخ . ٢ـ ئســـپانی لە سەدرەی یانزە هەمەوە بە نوَسراوی ئەددبیەوە ناسراوە . ٣ـ فەرەنسزی لە سەدەی نۆهەمەوە ٤ـ ڕوَمانی لە سەدەی شانزە هەمەوە . وهەندی زمانی تری بچوك .

٨ ـ کەلتی Celtic ، ئەم کۆمەڵە زمانە هنـــدو ئەوروپییە لە ســەدەی پێنجەمی پێش زاینەوە لە ناوەراستی ئەورپادا ناسراوە . بەڵام هیچ پاشماوەیەکی ئەوتۆی نوَسراویان بە دەســـتەوە نییە . کۆنترین نوَسراوی ئەم کۆمەڵە هی زمانی ( Gaul ـ غالیە ) کانە کە وەك وتمان هی ســەدەی پینجەمە ، بەو نوَسراوانەدا دەر دەکەوێت کە ئەم زمانە زۆر نزیك بوَوە لە زمانی بەریتانیەکانی دانشتوانی بەریتـانیـای

ئەوسا ، پاشماوەی زمانی بەریتانی ئێســتە لە زمانی ویلشی ناوچەی ویلزدا ماوە ، زمانێکی تری کەلتی ئێستە لە ئیرلندە زندووە ، هەر وەها زمانی سکوتلندەییەکان زمانێکی کەلتیە . کۆمەڵی زمانی کەلتی هەر چەند ئێســتە وەك زمانی زندوَ ئەو نرخەیان نەماوە ، بەلام لە لایەن دراساتی زمان و بەراورد کردنی زمانانان زۆر بە نرخـن چونکە لە سنوریکی تەسکی کۆندا ماونەتەوە وگەلێك رەگ ورێشــەی زمانە هندو ئەوروپاییە کانیان پاراستووَە کە ئێستە لە زمانە زندووَە بێـش کەوتو و گۆڕدراوە کاندا نەماون و دوَر و نزیکیان لە گەڵ یەکتری ئاشکرا نابێت بە شیوَە یەکی زانستی ئەگەر ئەو رەگ وریشەیە ساغ نەبنەوە ونە دۆزرێنەوە .

٩ـ جەرمانی ـ Germanic .نە ژادی جەرمانی لە مێژوَدا باش ناسراون ، بەڵام زمانە جەرمانیەکان تا ســەدەکانی ناوەراست تەواو نەناسرابوَن . تەنها زمانی Gothic نەبی کە بەشیکی تەوراتی پی نوَسرابــۆوە . ئەم گوثانە دیارە لە ســەدەی یەکەمی زاینیەوە لە ئەسکندناڤیاوە بەرەوخوار بوَنەوە ولە ناوەراستی ئەوروپادا جێ نشین بوَن ، زمانەکانی ئێستەی ئەسکندناڤیا پاشماوەی ( گۆثین ) کە لە خیزانی زمانی هندو ئەوروپی بە جەرمانی سەروَ ناوَ دەبرین . ئەم ناوە لە سەدەی نۆهەمەوە نراوە لەم خێزانە . لە خواروَی بـەحری بەڵتیکدا بەشێکی تری ئەم کومەڵە زمانە هەیە کە زمانی ئەڵمانی ئێستە یەکێکیانە ، زمانی ئەڵمانی بە نموَنەی نوَســراوەوە لە ســەدەی

هەشتەمەوە لە ئارادایە . هەر وەها زمانی ئنگلیزی ئێستە بە زمانێکی جەرمانی دا دەنرێت ولەبەشی رۆژ ئاوای زمانە جەرمانیەکانە . ئـەم زمانە لە ســەدەی پینجەمەوە کەوتۆتە بەریتانیا ولە گەڵ زمانەکانی ناوچەیی پیکەوە لە سەدەی حەوتەمەوە بە ناوی (ئەنگلو ـ ساکسون Anglo ـ Saxon ) لە مێژوَدا ناسراون ونمونەی بەرزی ئەدەبیان لێ بەجی ماوە وتا ئێستە ئەم زمانە لە بەرزی وپەرە سەندندایە بێ کۆسپ وهەرچی زانستی ئنسان هەیە پیی نوسراوە و دەنوسرێت .

١٠ــ سلاڤی ـ بەلتیـکی Slavo - Baltie ئـەم کۆمەڵەش دوَ بەشە ، بەشی ( بەڵتیـکی ) کە لە سێ زمان پەیدا دەبێت : ١ ـ پروَسی کۆن ٢ ـ لیتوانی ٣ ـ لاتیڤی ، یەکەمیان لە ١٧٠٠ م فەوتاوە دوَهەم وسێهەمیان لە ١٦٠٠ ز یەوە تائێستە بە ئەدەبێکی نوسراوەوە ناسراوە ئەم کۆمەڵە زمانە زۆر بە کۆنی ماوەتەوە وهیــچ گیانیکی تازەی نەپۆشیوە . گەلێك لە بەر ئەوە بەنرخە بۆ لێ کۆڵینەوەی زمان . بەشی دوَهەمی ئەم کۆمەڵە (سلاڤی )یە وکۆنترین نـوسراوی ئەم کۆمـەڵە هی زمانی (بەلغاری) یە کە لەسەدەی نۆیەمەوەیە . خۆی کۆمەڵی سلاڤی لە ناو خوێدا دەبێ بە سێ بەش ١ ـ رۆژهەڵاتی کە روسـی وئوکراینی گرنگتر زمانین ٢ ـ رۆژ ئاوای کە پۆلەنــدی و چیکی وسلوڤاکی . ٣ ـ خواروَ کە ســرب و کەرەواتی وبەلغاری زمانە ناسراوە کانیەتی .

بەم جۆرە ئاشکرا بو کە زمانی کوردي بە مێژوَ ئەگەر ساغ بکرێتەوە

میتانی و حیثی لە بنە رەتدا نزیکیترن لە کوردی لە ناو زمانەکانی تری
رۆژ هەڵاتدا ئــەبێ بە کۆنترین زمانی هندو ئەوروبی دابنرێت بە
نموونەی نوسراوەوە . چونکە نەخشە میخیەکانی حیثیەکان و میتانیەکان
کۆنترین نوسراوی هندو ئەوروپیین ، ناوچەی ژیانی ئەم دوو نەتەوەیە
کوردستانی ئێستەیە بەلگەی زمان وادەردەخات کە ناوەکانی میتانی و
حیثی لە کۆمەڵەی ئیرانی رۆژئاوان .. میژووی لە مەو دوا زۆر تاریکی
رۆن دەکاتەوە لە میژووی نەتەوەی کوردا تکا لە میژوناسەکان دەکەین ئەم
بیرو و باوەرەی دەخەمە پیش چاویان ولەلایەن زمانەوە خۆم دەی گرمە
شان لایەنی میژووی بەوان دەسپیرم دریغی نەکەن، وکاریکی گرنك و
زۆر بەنرخە ئەگەر بتوانن لەم مەیدانەدا یارمەتی بدەن و ئەو شەوە
زەنگەی بەسەر میژووی کۆن و زمانی کوردیدا کێشراوە رۆنی بکەنەوە
بە بیری تیژ و چالاکی کردەوەیان .

ماویەتی

# من اين نبدأ بوضع دستور لقواعد اللغة الكردية

العضو العامل : د. باكيزه رفيق حلمي

قلنا سابقا ان الالفباء التي كتبت بها الاڤستا كانت قد استنبطت من الالفباء الارامية ، ولكن الايرانيين لم يستعملوها كما هى بل اجروا عليها الكثير من التغيير ، لان الفكر السامي يختلف من حيث نظره الى طبيعة الاصوات عن الفكر الايراني . فالساميون الاولون اهملوا اصوات الحركة في ابجدياتهم واهتموا فقط بالاصوات الصحيحة ذات المخارج الواضحة والقيم الثابتة . اما اصوات اللين والحركة فقد رأوا في تغيرها ولينها وعدم ثبات قيمها ووضوح مخارجها ما لا يمكن ان يعطيها صورا ثابتة تدرج من اجلها في الابجدية ، ولذلك اكتفوا اول الامر بالسليقة في القراءة والكتابة ولم يضعوا لها ما يمثلها في الكتابة من رموز ثم لما انتشر الاسلام واصبح على الاعجمي ان يقرأ القرآن ويحفظه ويتعلم العربية ادرك الناس حاجة الابجدية العربية الى وضع

علامات او رموز لاصـوات اللين والحركة القصيرة والمد والتشـــديد والتسكين لايضاح القراءة وتسهيلها وهكذا امر الامام علي بن ابي طالب ابا الاسود الدؤلي بتنقيط الحروف اولا ثم وضعت الحركات وتم ذلك في حوالي القرن الاول للهجرة وسهلت بذلك قراءة القرآن على الشعوب غير العربية وحذا الساميون جميعا حذو العربية فاضـافوا الى ابجدياتهم الحركات مما يدل على ان هذا النقص الذي استدرك كان واضحاً بالنسبة للفكر الاري ، وضـــوحا بينا بالنظر لطبيعة لغاتهم التي تختلف في طبيعتها عن اللغات السامية اذا ان بناء الكلمة في اللغات الهنـدواوروبية يعتمد على المقاطع التي تتكون عادة من صـوت وحركة ولا تنفصـل الاصوات لاخراجها في ذهن الارى عن الحركات التي تمدها و تســهل اخراجها .. حتى ان الابجدية الهندية و الافســتائية وضعت على اساس ان الحروف تختلف في صورها باختـلاف حـركاتها فالباء المفتوحة تكتب ومعها حركة الفتح والمـكسورة ومعها حركه الـكسر والمضمومة ومعها حركة الضم وهكذا في جميع الحروف .

وعندما استعار الاريـون الابجـدية الاراميه في القـرن الثالث ق . م[1] اضافوا اليها اولا رمـــوز الاصوات الصحيحة التى تنقصها من اصواتهم مثل ( پ ) ( چ ) و ( ژ ) و ( ڤ ) و ( گ ) وثـلاث صور للنون مختلفه . ثم عمدوا الى اصـوات اللين والحـركة الطويلة المقفله والمفتوحه فاضافوا اليها ماهم بحاجة اليها ثم اوجدوا صورا لاصوات الحركة القصيرة المقفلة والمفتوحة ثم صورا لاصـوات اللين المركبة

---

(١) R. Kent, Old Persian, P. 6.

وهكذا حتى اصبحت رموز اصوات الحركة في ابجدية الافستا اربع عشرة صورة لاصوات الحركة واربعة صور لانصاف اللين وسبعة صور لاصوات اللين المركبة حتى اصبحت اصوات اللين مقاربة للاصوات الصحيحة في العدد. وبذلك تم ايجاد ابجدية سميت بابجدية الافستا كتبت بها الافستا بوضوح.

وباجراء دراسة مقارنة بين هذه الابجدية والاصوات الموجودة الان في اللغة الكردية رأينا ان اللغة الكردية قد احتفظت على الرغم من مرور الاجيال وتعرضها لكثير من التطور والتغير بكل تلك الاصوات، في حين ان اللغة الفارسية ينقصها الكثير منها مما يدل على ان اللغه الفارسية ليست من مجموعة اللغات الايرانية الشمالية التى تنتمى اليها لغة الافستا وان اللغة الكردية تمثل التطور التاريخى للغة الافستا[٢].

وقد تبين لنا حتى الآن من هذه المقارنات بين الاصوات في لغة الافستا والاصوات في اللغة الكردية ان لغة الافستا تنتمي الى المجموعة الشمالية الغربية باصواتها كاللغة الكردية. واذا ثبت بعد الانتهاء من دراسة اللغتين من حيث الاشتقاق والتصريف والنحو انهما تنحوان النحو ذاته في جميع قواعد اللغة تأكد لدينا ان اللغة الكردية اقدم من اللغة الفارسية تدوينا واقرب الى لغة الافستا دستوراً وان تاريخ الكتابة والتدوين باللغة التي تنتمي اليها اللغة

---

(٢) راجع المقارنات بين الاصوات الافستيه والكردية في اصل البحث اذ لا يمكن اعادة ذكرها لصعوبة الطبع.

الكردية اقدم من تاريخ التدوين باللغة التي تنتمي اليها الفارسية بنحو ثلاثة قرون على الاقل .

ولتحديد الموقع اللغوي للغة الكردية بين اللغات الهندواروبية والزمن التاريخي لوجود اقرب لغة هندواوروبيه الى اللغة الكردية الحديثة رأينا اضافة ملحق تفصيلي للغات التي تنتمي الى الاسرة الهندواوروبية ولا بأس من اعادة مجمله هنا . فالاسرة الهندواوروبية تتألف من مجموعتين من اللغات احداهما هي المجموعة الشرقية وتتألف بدورها من قسمين ١ـ اللغات الهندية واقدم تاريخ مدون لها ١٤٠٠ ق.م ٢ـ اللغات الارية واقدم اثر للشعوب الارية في التاريخ هو اثار الشعوب الميتانية والحيثية التي وجدت في المنطقة الواقعة في الشمال والشمال الغربي من بلاد (ميزوپوتاميا ـ العراق الحالي) في المنطقة المعروفة حاليا بكردستان واقدم تاريخها يقع بين ١٨٠٠ ق . م ١٥٠٠ ق . م . ومن الالواح المسمارية التي وجدت بهاتين اللغتين تبين ان اسماء الملوك المذكورة فيها اسماء تشبه الى حد كبير الاسماء الارية من حيث الصياغة والتركيب كما مثلنا لذلك في اصل البحث واذا ثبت ان لغة هذه الاقوام التي سكنت كردستان هي لغة ارية شمالية غربيه وهي بلا شك كذلك لسكناها في تلك المنطقة تأكد ان الاصول التاريخية للغة الكردية تعد اقدم اصول للغة ارية عرفت في تاريخ مجموعة اللغات الهندواوروبية . اي ان اللغة الارية الشمالية الغربية التي تنتمي اليها اللغة الكردية الحالية تعود الى ١٨٠٠ ـ ٢٠٠٠ ق . م من حيث استقلالها لغة لها اصول وقواعد وكتابة وتدوين .

اما المجموعة الغربية من اللغات الهندواوروبية فهي ١ـ التراكية ٢ـ الايليرية ٣ـ الفينيسية ٤ـ التوخارية ٥ـ الانادولية ٦ـ الهيلينة ٧ـ الايتالية ٨ـ الكلتية ٩ـ الجرمانية ١٠ـ السلافية والبلطيقية واقدمها الاناضولية وهي اقربها الى المجموعة الشرقية. واعرقها واسلمها تاريخيا اليونانية والايتالية . واكثرها احتفاضا بالخصائص الاندواوروبية القديمة الكلتية والبلتيقية. واوسعها انتشارا الجرمانية.

واني ادعو علماء التاريخ الى التعاون مع المتخصصين في اللغات لاستنباط المزيد من الحقائق فالكشف اللغوى والتاريخي سيحققان ما ذهبنا اليه من رأي يغير الكثير من معالم تاريخ الشعوب الأرية وخصائصها اللغوية بلا شك .

* * * * * *

# کۆچەری و ترانسهیومانس " TRANSHUMANCE "

## لەپارێزگەی سولەیمانی و هەولێر (١)

ئەندامی کارا : ناجی عەباس ئەحمەد

### ناو چیاکانی پشتوێنە « نطاق » فێنکەکان Temperate Zones (٢)

لە هەرێمە شـاخاویەکانی پشتوێنە فێنـکەکان هەرچەنـدە

---

(١) لە مانـگی تەموز و ئابی سـالی ١٩٧٢ گەشتێکم کرد لە پارێزگەی سولەیمانی و هەولێر ، وە لەلایەن ژیانی کۆچەرەکان ( رەوەندەکان ) و بلەی جێ‌نشینیان و باری ئێستایان هەنـدێ زانیاریم کۆکردەوە کە لەگەڵ ئەی کۆلینەوەی شتێ نوسراو لێکدان و شیکردنەوە . ئەی کۆلینەوەکە تەواو نیە چونـکە زۆری رەوەندەکان لە کوێستانەکانی سـەر سنوری ئێران بون ، وە نەم توانی بیانبینم . جارێـکی‌تر دەبێ لە زستان یان بەهار گەشتێـکی‌تر بکەم تاکو هەم باشتر باری ژیانیان تێ بگەم ، وە هەمیش بتوانم لە بابەت کۆچەرەکانی بادینانەوە هەندێ زانیاری کۆبکەمەوە . بەگەرمی سـوپاسی فەرمانـگەی پارێزگـاری سـولەیمانی و هەولێر دەکەم لەبەر کۆمەکیەکانیان و پێشـاندانی دۆسیەکانی کاروباری خێلات . بەتایبەتی سوپاسی کاك جەمال عەبدوڵلا دەکەم لە پارێزگەی سولەیمانی ، و کاك شێخ سلێمان مەجیـد لە پارێزگەی هەولێر .

(٢) مەبەست لە پشتوێن وشەی « Zone » ی ئینگلیزیە کە بریتیە لە هەرێمێکی=

سەرکەوینە سەر چیاکان و لەروَی زەریا « بحر » دوَرکەوینەوە ئەوەندە ژیان ناخۆشتر دەبێ . چونکە ئەو شاخە بەرزانە زستانان ئەوەندە ساردن کە مرۆڤ ناتوانێ تێدا بژی . لە پاشا لەو شوێنە بەرزانە ئاخ (خۆڵ) کەمە و تەنکە و خراپە و توشی وەرین و لاچون « Erosion » بوە و دەبێ ، ئیتر زەویەکە بەکەڵکی رەوەك رواندن نایێ . لە پاشا ناخۆشی رێگای هاتوچۆ وەکورتی کژی پێگەیشتن « موسم النمو » لەو شوێنە بەرزانە دەبنە کۆسپ بۆ پێگەیاندنی دانەوێڵە .

بەڵام لەو شوێنە بەرزانە لە خوارەوە دارستان و لە سەرەوە لەوەڕ دەڕوێن ، لەبەر ئەوە بەکەڵکی داربڕین دێن و لە کژی هاوینا بۆ مەڕومالات بەخێوکردن باشن . کوردەکان بەو لەوەڕە بەرزە فێنکانە کوێستان یان زۆزان دەبێژن . لە چیاکانی ئەلپی سویسرە

═ پان کە بۆ ماوەیێکی ( مسافەیێکی ) درێژ دەکشێ . جوغرافیەزانەکان روی زەمین بە هەموایێ دابەش دەکەن بە شەش پشتونی پان : سێی لە باشوور و سێی لە باکوری خەتی ئیستیوادایە :

(١) دوو پشتونی ولاتە زۆر ساردەکان کە لەخەتی پانی ( خط العرض ) ( ٥ر٦٦ )ەوە دەکشێن هەتا هەر دوو تەوقەسەر « قطب » لە باکوور و باشوور .

(٢) دوو پشتونی فێنك کە لە بەینی خەتی پانی ٥ر٦٦ و ٥ر٢٣ ن .

(٣) دوو پشتونی ولاتە گەرمەکان کە لە بەینی خەتی پانی ٥ر٢٣ هەتا خەتی ئیستیوا دەکشێن .

- بۆ وێنە - زۆر گوند هەن کە جاران لە پاڵ شاخە بەرزەکان گەنمیان دەچاند کە بە ١٣ مانگ دەهاتە بەرهەم : لە مانگی تەمموز دەیان چاند و لە ساڵی دووەم لە مانگی ئەیلولدا کۆیان دەکردەوە و ئەو دەمە ناچار بوون ئەو جۆرە کارە ناخۆشە بکەن لەبەر ناخۆشی رێگای هاتوچۆ . ئێستا لەو گوندانە بە دەگمەن دانەوێڵە دەچێنرێ ، ئەو دانەوێڵەیە کە لە دەشتەکانی خوارەوە بە ئاسانی و نرخێکی هەرزان پێیان دەگا . لەبەر ئەوە زەویەکانیان بێ جوت بەجێ دەهێڵن یان سێ پەڕەی ( یۆنجەی ) تیا دەڕوێنن بۆ ئەوە کە ببنە لەوەڕ بۆ بەخێو کردنی گا و مانگا[٣] .

## دوو جۆر لەوەڕ

لە ناو شاخەکانی وڵاتە فێنکەکان کە دەکەونە میانی خەتی پانی ٣٠ و ٤٨ دوو جۆرە لەوەڕ هەن :

١- لەوەڕی نێزک گوندەکان ؛

٢- لەوەڕی پاڵ شاخە بەرزەکان .

١- لەوەڕی نێزک گوندەکان لە ناو دۆڵەکان ، لە دامێنی نزمی چیاکان دەڕوێن ، ئەو دامێنانە کە بەفر بە دەگمەن ، یان ماوەیێکی کورت دایاندەپۆشێ . ئاژاڵ بەخێوکەرەکانی ئەوروپا گیا

(٣) A.V. Perpillou , Human Geogrphy , Longmans , London , 1966 , PP. 192 - 193,

باشەکانی ئەم لەوەڕانە بە داسی تایبەتی درێژ درەو دەکەن ، وە لەبەر ناخۆشی گواستنەوەیان بۆ ناو گوند ، هەر لە جێگای خۆی کۆی دەکەنەوە و لە کۆلیتێکا دەیپارێزن . لە حاجی هۆمەران وەکو دیومە وە لە دەشتی لاجان لەودیوی گەروی زنوی شێخ لە ئێران - وەکو زانیومە - ئەوگیایە بە بێ کۆلیت لە سەر زەوی وەك گومەزێکی نزم کۆی دەکەنەوە و پێی دەڵێن دێ یان دێو . کە دنیا نەختێ ناخۆش بوو ئەم گیا وشکە وەك ئالیکێکی باش و نەرم بە ئاژاڵ دەدرێ[٤] .

(٢) جۆری دووەمی لەوەڕ لە سەروی پشتونی دارستانە لەسەر یان دامێنی شاخە بەرزەکان . لە جوغرافیەدا بەم لەوەڕانە ئەلپ « Alp » یان چیا دەوترێ کە بە تەواوەتی واتای کوێستان یان زۆزانی کوردی دەگەیەنێت . ئەم جۆرە لەوەڕانە لە چیاکانی ئەلپی سویسرە و فرانسە و لە چیاکانی « Pyrenees » و قەفقاس زۆرن . لەم لەوەڕگانەدا گیای کورت دەڕوێ لەگەڵ گوڵی کێوی کە دەبنە هۆی بەلەزەت کردنی تامی شیری مەڕومالات . لە سویسرە و فرانسە لە ناوەڕاستی حوزەیران گا و مانگا دەبەنە ئەم چەشنە لەوەڕە بەرزانە وە تەشرینی یەکەم دەیان هێننە خوارەوە[٥] .

---

(٤) Ibid, PP. 193 - 194 .

(٥) Ibid., PP. 194 - 195

## موڵکایەتی لەوەڕ

زۆری لەوەڕە بەرزەکان لەســەر چیاکانی ئەلپ و پرانیس ـ وەك لای ئێمە لە کوردستانی عیراق ـ موڵـکی هەموایتی خاوەنی ئاژاڵن ، ئــەم جۆرە موڵـکە هەمواییـە لە ناوچەکانی رۆژئاوای پرانیس دەگاتە ٣/٤ی پێوانەی ( مەساحەی ) لەوەڕەکان[٦] .

## ترانسهیومانس و نیوە کۆچەری[٧] :

مرۆڤ بە ســێ جۆر لەوەڕی ناو چیاکان بەکار دێنێ بۆ بەخێوکردنی مــەڕومالات : ترانسهیومانــسی گــەورە ، ترانسهیومانسی بچوك و کۆچەری .

« Transhumance » وشـەیێکی فرانسـزیە لە هەمو دنیا وەك زاراوەیێکی جوغرافیە بەکار دەهێنرێ . ئەم وشەیە لە « Trans » ەوە هاتوە کە واتا « بەسەر » و « humance » کە لە « humus » ەوە هاتوە و واتای « زەوی » دەگەیەنێ .

---

(٦) Ibid., P. 196

(٧) بۆ تۆژینەوەی ئەم باسە تەماشای ئەم دو سەر چاوەیەم کردوە :

- Ahmad, Naji Abbas; Die Ländlichen Lebensformen und Agrarentwicklung in Tripolitanien, Heidelberg 1969 P.P. 119 - 122
- James, Preston, A Geagraphy of Man, Boston 1959, PP. 440 - 441.

« Transhumance » واتا بزوتنی شـوان و مێگەلەکانیان لە کۆی خۆیدا لە میانی جێگا نزمەکان و داێن یان سەری چیاکاندا . ئامانجی ئەم بزوتنە سود وەرگرتنە لە لەوەڕەکانی پاڵ و سەر شاخە بەرزەکان . لەم بزوتنە تەنیا شوان یان گاوان لەگەڵ مێگەلا دەڕوا ، چەند کەسێکی تریش دوایان دەکەون بۆ دۆشینی مالاّت وە دروست کردنی پەنیر و کەرە . خاوو خێزان لەگەڵ مێگەلا کۆچ ناکەن بەڵکو لە گوندەکەیان لە خوارەوە دەمێننەوە و خەریکی کشـتوکاڵ یان کارێکی تری خۆیان دەبن . ئەم جۆرە ترانس هیومانسـە لە نیزامی کۆچەرێ پێشکەوتوترە لە ژیانی کۆمەلایەتی و ئابورێ لە دنیادا و وا وردە وردە دەردەکەوێ ، بە تایبەتی لە پژدەر وەکو لە پاشان باس دەکرێ .

بێتو ئەم بزوتنە لە بەینی دەشتایێك و چیایێکی بەرز بێ کە لە یەك نێزك نەبن بەوە ترانس هیومانسی گەورە دەبێژرێ وەکو هەندێ لە جافەکان خۆیان لە شارەزوور یان قـەزای کفری و کەلار دەژین و مێگەلەکانیان تەسـلیم بە شوانێك دەکەن تاکو بیانبەن بۆ کوێستانەکانی لای پێنجوین . ئەم جۆرە ترانس هیومانسـە ئێستا باوە لە بەینی باکوری ئیتالیا و چیاکانی ئەلپ ، لە سـویسرە و ئەلپەکانی فرانسە ، لە ئیسپانیا وە لە تاجیکستان بۆ سـەر شاخە بەرزەکانی پامیر کە لە باکوری ـ رۆژهەلاتی ئەفغانستانە .

بەلاّم بێتو ئـەم بزوتنـە لە بەینی گوندێکەوە بێ لە ناو

چیاکان بۆ دامێن شاخەکانی نێزگی کە ماوەی لە ١٠ ـ ١٥ کیلۆمەتر کەمتر بێ بەوە ترانس‌هیومانسی بچوك دەوترێ ، وەك هەندێ لە شـوانەکانی رایەت و دەربەندی رایەت کە مێـگەلی مەڕوبزن دەبەنە دامێن ئەو شـاخە کە دەکەوێتە باکوریان تاکو لەوێ بیانلەوەڕێنن .

کۆچەری :

بریتیـــە لە بزوتنی ئـــاژاڵ بەخێـــوکەرەکان بـــە خاوو خێزانەوە لە بەینی دوو هەوار : لە ناو شاخەکان زستانە هـــەوار لەگەرمیان و دەشتەکانە ، هاوینە هەوار لە ( زۆزان ) ە لە دامێنی یان سەر شـاخەکان . لە ولاتە وشکەکان ـ وەك جزیرەی عەرەبستان ، بادیەی‌شام ، لیبیە و جەزائیر ـ هاوینەهەوار نێزگ ئاودانی و بیر و رۆبارە ، زستانەهەوار لەناو دەشتە بێ ئاوەکانە ، لەوێ ئاژاڵ ئاوی باران و گۆماو دەخۆنەوە . بۆ وێنە خێڵی عەنەزە کە لە بەینی عیراق و سوریە و ئوردن و عەرەبسـتانی سعودی دەگەڕێن و کۆچەری تـەواون ، وا ورده ورده لە هـــەرێمی فـــوراتی ناوەڕاســت و باشور نیشتەجێ دەبن . نێـزگ نیـوەی جافەکان جاران هەتا ١٩٢٢ کۆچەری تەواو بون .

سێ جیاوازی هەیە لە بەینی ترانس هیومانس و کۆچەری :

١ـ لە ترانس هیومانس تەنیـا شوانەکان و چەنـد کەسێـکی‌تر هاتوچۆ دەکەن . ئەوانی‌تری لەگوندەکانیـــان دەمێنن و خەریـکی

کشتوکاڵ دەبن .

٢ـ لە ترانس‌هیومانس نیزامی خێڵ و هۆز و تیرە و عێـل نامێنی و نیە . شــوانێك دەتوانێ مێـگەلێ مەڕ لەگـەڵ خۆی بۆ زۆزان ببا کە هێ چەند کەسێك بێ و هەر یەکە لە هۆزێك بێ .

٣ـ کۆچەر لە زۆر جێـگا لە دنیـا و زۆر جار خانوی نیە ، زستان و هاوین لە ژێر خێوەتا دەژی وەك بۆلێ و بابۆلێ ـ وەکو لە پاشـان باسیان دەکرێ ـ کە زستان لە قەزای رانیە و هاوین لە گـەروَی زنوی شێخ رەشماڵەکانیـان هەڵدەدەن . بەڵام لە ترانس هیومانس خاوەن مێـگەل و شوان سێ کڕی ساڵ لە خانودا دەژین . هاوینان لە هەندێ جێـگا وەك کوردستان لە ژێر رەشماڵا دەژین . بەڵام لە چیاکانی ئەلپی ناوەڕاستی ئەوروپا و لە تاجیکستان لە زۆزان شوانەکان هاوینان لە خانوی پچوکدا دەژین کە بەدار و بەرد قایم دروست کراوە و بەرگەی بەفر و بارانی زستان دەگرێ .

لە پاشا زاناکانی جوغرافیە و سوسیۆلۆجی کۆچەرەکان دەکەنە دوَ بەشەوە : کۆچەری تەواو و نیوەکۆچەر .

کۆچەری تـەواو ، کە بە زمانی ئەڵمانی « Vollnomade » و بە زمانی ئینگلیزی « Nomad » ی پێ دەبێژرێ ، زستان و هاوین جێـگای چەسپاوی نیــە ، هەوارگەی وای نیە لە ساڵێـکەوە بۆ ساڵێـکی تری نەی گۆڕێ وە خەریکی کشتوکاڵ نابێ .

نیوەکۆچەر ، کە بە ئینگلیزی « Seminomad » ی پێ دەڵێن ، جێگای تایبەتی خۆی هەیە لە زستانەهەوار و هاوینەهەوار ئایا خانو بێ یان خێوەت ، وە لەگەڵ ئاژاڵ بەخێو کردنا خەریکی کشتوکاڵیش دەبێ .

لە کوردستانی عیراق کۆچەری تەواو زۆر کەمە ، مەگەر تەنها هەندێ خاوەن مەڕی هەژار هەبن کە لە ژێر رەشماڵا دەژین و جێگای خۆیان دەگۆڕن . دوو تیرەی بچوکی بۆڵێ و بابۆڵێ – کە لە پاشان باسیان دەکرێ – لە کۆچەریەوە نێزکترن . ئەمە چەند ساڵێکە هاوینەهەواریان ناگۆڕن ، بەڵام زستانان لەبەر کەمێ لەوەڕ ناچار دەبن هەواری خۆیان بگۆڕن . زۆری هەرکیەکانی پارێزگەی هەولێر ئێستا لە کۆچەری تەواویەوە نێزکترن نەك نیوەکۆچەر ، زستانان لە رۆژهەڵاتی باکوری هەولێر لە ژێر رەشماڵا دەژین ، هاوینەهەواریشیان لە ئێرانە نێزك سنوری عیراق و تورکیە . بەڵام زستانەهەواریان تەنگە و دەیگۆڕن وە – وەکو لە پاشا باسیان دەکرێ – تەنیا ژمارەیەکی کەمیان خەریکی کشتوکاڵ دەبن .

ترانس هیومانس لە دنیادا – بێجگە لە ژاپۆن – لە هەرێمەکانی نێزك چیای خەتی پانی ناوەڕاست « Middle Latitude » لە بەینی خەتی پانی ۳۰ و ٤۸ دایە کە هەمو کوردستان دەگرێتەوە ، لە ئەوروپا لە چیاکانی ئەلپ ، لە بەلقان ، لە چیاکانی قەفقاس ، لە تاجیکستان ، لە چیاکانی ئەندیز لە بەینی شیلی و ئەرجەنتین خاوەن ماڵات سود لە

لەوەڕ و مێرگە تازە جوانەکانی سەرشاخـــەکان وەردەگرن کە ئێمە کوێستان و زۆزانیان پێدەبێژین ، هاوینان دەچنە ناو ئەو لەوەڕ و مێرگانە ، وە کە پایز داهات دەگەڕێنەوە بۆ ناو لەوەڕەکانی دەشت و دۆڵەکانی خوارەوە .

لەگەڵ ئەوەشدا کە خەتە پانەکانی ناوەڕاست ژاپۆنیش دەگرێتەوە ، بەڵام ژاپۆن ترانس هیومانسی نیە ، چونکە لە لەوەڕە بەرزەکانی سەر دامێن شاخەکان لە سەرەوەی دارستانەکان مێرگ و گیای باشی لـێ ناروێ کە بە کەڵـکی ئاژاڵ بەخێو کردن بـێ . زۆری ئـەو گیایانە رەقن و لەقامیش دەکەن و ئاژاڵ حەزی لێ ناکا . لەپاشا ژاپۆنەکان لە ئاژاڵ بەخێوکردن پتر خەریکی کشتوکاڵن ، کشتوکاڵێـکی پـــڕ و بەخزمەت « Intensive » . فەلاحێکی ژاپۆن پەڵە زەوییێـکی بچووکی هەبێ باش خزمەتی دەکا و پەینی بە سەرا بڵاو دەکاتەوە تاکوو بگاتە بەرهەمێکی زۆر باش[8] . بەم جـــۆرە کشتوکاڵە لە جـوغرافیە و ئابووریدا « Intensive agriculture » دەبێژرێ کە واتای کشتوکاڵی پڕە ، پڕ لە رەوەك و خزمەت و بەرهەم[9] .

---

(٨) James, Ibid., Perpillou, P. 195 - 196

(٩) بێچەوانەی ئەمە ( Extensive agriculture )ە کە بـە کوردی دەبێتە کشتوکاڵی بڵاو . لەم جۆرە کشتوکاڵە جوتیار کەمتر خزمەتی پەڵە زەویەکەی دەکا ، گوڵەگەنمەکان ــ بۆ وێنە ــ کەمن و بڵاو دەڕوێن و بەرهەمی جوتیار کەمە .

## کۆچەرەکانی پارێزگەی سولەیمانی .

کۆچەرەکانی ئەم پارێزگەیە دوو کۆمەڵن :ـ

یەکەم ـ ئەو کۆچەرانە کە لە بەینی قەزای کفری و شارەزوور و پێنجویندا هاتوچۆ دەکەن کە بریتین لە هەندێ تیرە و هۆزەکانی خێڵی گەورەی جاف .

دووەم ـ ئەو کۆچەرانە کە لە بەینی قەزای رانیە و سنووری ئێراندا لە هەرێمی قەندیل هاتوچۆ دەکەن .

### یەکەم ـ خێڵی جاف(١٠) و کۆچەرەکانی

( أ ) مێژوویێکی کورتی ئەم خێڵە هەتا ساڵی ١٩٢٠ :

جافەکان لە سەدەی ١٧مین لە هەرێمی جوانڕۆ دەژیان کە دەکەوێتە بەینی هەڵەبجە و کرماشان لە ئێران . ئەو دەمە هێشتا

(١٠) لەلایەن خێڵی جافەوە سێ سەرچاوەم بەدەس کەوت کە ئەمانەن :

1- C. J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs,London, 1957.

2- E. B. Soane, To Mesapotamia and Kurdistan in disguise, London , 1912.

٣ـ عباس العزاوی ، عشائر العراق ، الجزء الثانی ( العشائر الکردیة ) ، بغداد ١٩٤٧ .

بەڵام کتێبەکەی ئەدمۆنس لە هەموان باشترە ، چونکە خۆی لەبەینی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٥دا پەیوەندی لەگەڵ جافەکان هەبوو وە زانیاریەکانی لە پسپۆرە ناسیاوەکانی خۆی کۆکردووەتەوە .

ساغ نەبوبۆوە ئایا ئەم جافانە سەر بە ئێرانن یان عوسمانی[11]. لە پاش سەرکەوتنی سوڵتان موراد بەسەر صفی الدین یەکەمی شـــای ئێرانا پەیمانی زەهاب ( زەهاو ) لە ساڵی ١٦٣٩ ( ١٤ ی محرمی ١٠٤٩ ی کۆچی )دا بەسترا . لە نوسخەی فارسیی ئەم پەیمانەدا ناوی تیرەی ( زین الدین و هارۆن ) هاتوە کە جافن و سەر بە ئێرانن . ئێستا تیرەیێك نەماوە بە ناوی ( زین الدین )ەوە بەڵام هارۆنیی ئێستا یەکێکە لە تیرە هەرە گەورەکانی جاف .

ئێستا جاف دەبێتە سێ بەشی گەورەوە :

١ـ گەورەترین بەشی لـە عیراقن ـ لە پارێزگەی کەرکوك و ســـولەیمانی ـ کە جافی مورادییان پێ دەبێژرێ ، وا دیارە لەبەر پەیوەندیی گەورەی ئەم جافانە لەگەڵ سـولتان موراد‌ی عوسمانیی ، بەم ناوە ناوبانگیان دەرچوە .

٢ـ بەشی دووەم جافەکانی دانیشتوی هەرێمی جوانرۆن .

٣ـ بەشی سێیەم لە هەرێمی کرماشـانن کە بریتیە لە حەوت تیرەی بچوك کە وا دیارە لە ناوەڕاستیی سـەدەی نۆزدەمین لە بەشی دووەم جیابونەتەوە و چونەتە ناو خێڵاتی یەك گرتوی گۆران[12]، بەمانە جافی گۆران دەبێژرێ . مێجەر سـۆن ناوی ئەو تیرانەی ســـاڵی

---

(11) C . J . Edmonds , Op . Cit . , P . 141

(12) C . J . Edmonds , Op . Cit . , p . 141

۱۹۰۷ – ۱۹۰۹ (؟) لە هەڵەبجە لە جافەکان وەرگرتوە کە ئەمانەن :
(۱) قادر مێروەیسی (۲) تایشی (۳) قەڵخانی (٤) یوسف یارئەحمەدی
(٥) کوییك (٦) نرجی (۷) گورگ کایش[۱۳] .

( ب ) جافی مورادی :

مێژوی هاتنی جافی مورادی لە هەرێمی جوانرۆوە بو عیراق دەگەڕێتەوە سەرەتای سەدەی هەژدەمین کە ۱۰ – ۱۲ تیرەی کۆچەر لە خۆیانەوە یان لە پاش کێشە و شەڕ هاتونەتە عیراق و لە دەشتی شارەزور دامەزراون . ئەم تیرانە گەلاڵی ، شێخ ئیسماعیلی ، بێسەری و چوچانی بون . ئەمانە بە جاف دادەندرێن . لەگەڵ ئەمان یان لە پێش خۆیاندا چەند تیرەیێکی تری کوردی کۆچەریش لە ئێرانەوە هاتبون وە لە شارەزور دامەزرابون کە ئەمانەن : قەویلەیی ، ئیسماعیل عوزێری ، شنکی ، کافرۆشی ، بلباس ، کەڵهوڕ ، تیلەکۆ ، کەڵباخی و مەندومی . بەشی شوان و شوانکارەی ئەم تیرانە زستانیان لە رۆژئاوای قەرەداغ لە سەنگاو رادەبوارد ، هاوینانەش دەچونە کوێستانەکانی بەینی سنە و سەقز[١٤] .

لە پاشا لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدەمین ، واگومان دەکرێ ، ساڵی ۱۷۷۲ ( زاهیر بەگ ) ناوێکی بەگزادە لەگەڵ نێزگەی سەد ماڵ

---

(۱۳) E . B . Soane , Op . Cit. , P . 380

(١٤) C. J . Edmonds , OP . Cit. , PP . 142 - 3

لە جوانڕۆوە هاتنە عیراق و لە هەرێمی بانیخێڵان دامەزران کە دەکەوێتە باکوری رۆژهەڵاتی (دەربەندیخان) . بەم جۆرە خێزانی بەگزادە دامەزرا و دەسیان کردە حوکم کردن بە سەر هەمو جافی مورادیا . ئەم بەگزادانە دۆستایەتیان لەگەڵ ئەحمەد پاشای بابان پەیدا کرد ، ئیتر وردە وردە جافەکان لە ئێرانەوە هاتنە ناو خزمەکانی عیراقیان هەتا ژماردیان گەیشتە نەزیکەی ١٠ر٠٠٠ ماڵ[١٥] ، ئەگەر بە تێکڕایی هەر ماڵێك بە شەش کەس دانێین وا گومان دەکرێ کە ژمارەیان لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمین گەیشتوەتە ٦٠ر٠٠٠ کەس . ئەمانە وا گومان دەکرێ سێ یەکیان لە دەشتی شارەزور خەریکی کشتوکاڵ بون ، بەڵام زۆرترینیان ، ئێزگەی دوَ بەشیان ، مەڕومالاتیان بەخێو دەکرد و کۆچەر بون . زستانان دەچونە بانیخێڵان و قەزای کفری و کەلار ، هاوینان بەرەو رۆژهەڵات ملیان دەنا هەتا دەگەیشتنە کوێستانەکانی بەینی سنە و سەقز ، وە لەوێ هەتا مانگی ئەیلول دەمانەوە .

کە ژمارەی جافەکان زۆر بو و هەوارەکانی زستانیان پێ تەنگ بو ناچار بون لە قەزای کفری زەوی و دێهات بکڕن تاکو لەوێ دامەزرێن . جافەکان دەگێڕنەوە کە قادر بەگی کوڕەزازای زاهیر بەگ لە سەدەی نۆزدەمین ناچار بو بە شەڕ خێڵە کۆنەکانی سەر قەلا و شیروانەی رۆژهەڵاتی کفری ـ کە (گێژ و رۆژبەیانی و زەند)

(١٥) Ibid , P . 142

بۆن ـ دەرپەڕێنێ تاکو ماڵەکانی لێ دامەزرێن[١٦] .

ساڵی ١٩١٨ زوربەی جافەکان کۆچەر بۆن ، بەڵام بەشێکیان وازیان لە کۆچەرێ هێنا و بۆنە فەلاح و خەریکی کشتوکاڵ بۆن[١٧] . وا دیارە ئەمانە بە دوَ پایە دامەزران . لە پایەی یەکەم نیوەیان هاوینان لە گەرمیان و نیوەی دووەم چۆنە زۆزان وەك کۆچەر ، نیوەکۆچەر یان شوانی ترانسهیومانسکەر . کە مەڕوماڵاتیان لەبەر کەم بارانی و نەخۆشی کەم دەبۆ ، یان لە شەڕوشۆڕ لەکیس دەچۆ ناچار دەبۆن بەتەواوی واز لە ژیانی کۆچەرێ بێنن . کە حکومەتی ئێران ساڵی ١٩٣١ هاتوچۆی ناو زۆزانەکانی ئێرانی لێ قەدەغەکردن ئەو ماڵە جافانە ناچار بۆن لە عیراق لەسەر لەوەڕگاکانی شارباژێڕ و پێنجوین بمێنن . کە ئەمە بەشی هەمۆیانی نەکرد زۆریان لە شارەزوَر مان . زۆر ماڵات و منداڵیان لێ مرد و ئیتر وازیان لە ژیانی کۆچەرێ هێنا[١٨] ، بەم جۆرە هاوگرێ ( نیسبەتی ) کۆچەرەکان ساڵی ١٩٢٢ لە ٣/٢ ( دوَ

(١٦) Ibid, P. 145 گێژ ئێستا لە رۆژهەلاتی باشوَرێ کفرێ نێزگە سیروان و لە رۆژئاوای ئاوی (نارین) لە باکوَرێ رۆژئاوای ( قەرەتەپە ) دەزین . ( زەنـد ) چوَنە ناو زەنگنەی خوار قادرکەرەم و باکوَرێ رۆژهەلاتی ( قەرەتەپە ) نێزگە ئاوی سیروان . رۆژبەیانیش دێهێکی گەورەیان هەیە لە ناحیەی قەرەحەسەن لە باشوَری کەرکوَك .

(١٧) C. J. Edmonds, Op. Cit., P. 146

(١٨) Ibid, P. 146

بەش لە سێ بەشەوە ) لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمین ـ وەکو لە سەرەوە بێژرا ـ بۆ نیو هاتە خوارەوە ، وە ژمارەی هەموایتی سالی ۱۹۲۲یان بە نێزگەی ۱۰٫۰۰۰ ماڵ خەمڵ دەکرێ[(۱۹)] . شایانی باسە ئەمە هەمان ژمارەیانە لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمین ، ئەمەش شتێکی سەیر و سەمەرە نیە چونکە لەو حەفتا ساڵەدا هەندێ لە جافەکان بڵاوبونەوە و چونە ناو خێڵاتی ترەوە ، یان بونە شارستانی ، ئەمە لە لایێکەوە ، لە لایێکی ترەوە ژمارەی مردن ، بە تایبەتی مردنی کۆرپە و ساوا لەو دەمە لە هەموو عیراقدا زۆر بەرزبو لەبەر زۆری نەخۆشی ساری کە تەشەنەی دەکرد و نەبونی پزیشك و دەرمان . لەبەر ئەوە هاوکری فرەبونی ژمارەی مرۆف ـ کە بە عەرەبی ( نسبة نمو السكان )ی پێ دەبێژرێ ، زۆر نزم بو[(۲۰)] .

---

(۱۹) Ibid, P. 146

(۲۰) لە پاش پەرەسەندنی نەخۆشخانە و زۆر بونی پزیشك وە تیمارکردنی نەخۆش ، ژمارەی مرۆف لە کوردستان وردە وردە بەرز بووەوە . لە ساڵی ۱۹۷۰ ـ ۱۹۷۲ هاوکری فرەبونی ژمارەی دانیشتوان گەیشتە نێزگەی ۲٥ لە هەزار ، واتا هەر هەزار کەسێك ساڵی ۲٥ کەس زیاد دەکا . لەم بابەتەوە ئەم خەبەرە سەیرە دەگێڕمەوە : جارێك ساڵی ۱۹۷۲ لە بەگزادەیێکی جافم پرسی ئایا لە شارەزوور بەراز ماوە ؟ لەوەڵامدا گوتی : « پیاو بەڵێ بەرازی چی ! بەخوا خەڵك ئەوەندە فرە بون ، کوچەکانی ( واتا کۆڵانە تەسکەکانی ) هەڵەبجە پڕن لە منداڵی ساوا و هەرزەکار . منداڵی ساوای پێنج ساڵانم دیوە برا حەوت ساڵانەکەی بە کۆڵ هەڵگرتوە !! بەخوا خەڵك وا زیاد بکەن ، نەك بەراز ، لە کوردستان حەیوان بێ نامێنێ !! . »

ژمارەی کۆچەرەکان هەروەکو زانرا لە ساڵی ١٩٢٢ دا بە ٥٠٠٠ ماڵ خەمڵ دەکرا . ئەم ژمارەیە بە پێی سەرژمێری ساڵی ١٩٤٧ هاتە خوارەوە بۆ ٦٠٠ ماڵ ، ژمارەی ئەم کۆچەرانە ساڵی ١٩٧٢ ـ هەر وەکو لە مەحموود ئاغای سان ئەحمەدم بیست لە دەربەندیخان ـ لە ٥٠٠ ماڵ زیاترنین ، ئەمانەش بەشێکیان خاوەن مەڕ نین ، بەڵکو شوانی ترانسهیومانسکەرن .

(ج) باری تیرەکانی جاف لە ساڵی ١٩٢٠ەوە هەتا ئێستا[٢١]

١ـ گەلاڵی :

لەگەڵ ئەوەشدا لە بنەڕەتدا جافی مورادی نین ، بەڵام تیرەیێکی زۆر گرنگە . بەگزادەکان ڕێزی سەرۆکەکانیان دەگرن و ئاغایان پێ دەڵێن ، ژمارەی کۆچەرەکانیان ساڵی ١٩٢٢ هەزار ماڵ بووە . زستانان لە ناحیەی وارماوە و تانجەرۆ لە شارەزوور وە لە قەزای کەلاری ڕۆژهەلاتی کفری دەژین . ئێستا تەنیا ٧٠ ـ ٨٠ ماڵێکیان هاتوچۆی کویستان دەکەن و هاوینان دەچنە دەشتی شلێر کە ئاودارە و لەوەڕگەی

(٢١) ئەم توێژینەوەیە چوار سەرچاوەی هەیە :

١ـ ئەدمۆنس : لاپەڕە ١٠٢ و ١٤٣ ـ ١٤٨ .

٢ـ ئەرچیفی پارێزگەی سولەیمانی .

٣ـ مەحموود ئاغای سان ئەحمەد لە دەربەندیخان .

٤ـ مەجید خانی کوڕی حەمە ڕەشید خان لە پێنجوین کە باوکی ئێستا لە دەشتی شلێر لە باکووری پێنجوین لە دێی دارۆخان دەژی .

باشی هەیە . ئەم دەشتە ١٥ ـ ٢٠ کیلۆمەتر درێژ دەبێ ، بەڵام پانی ١٠ ـ ١٢ کیلۆمەترە و وەك پواز دەچێتە نـاو ئێرانەوە .

٢ــ میکائیلی :

ساڵی ١٩٢٢ هەزار و صەد ماڵێکیان کۆچەر بوون ، ئێستا هەموو نیشتەجێن بە تایبەتی لە ناوچەی سەنـگاو لە ئاوی باسەرەوە هەتا ئاوەسپی لە رۆژئاوای ئاجداغ ، لە قەرەداغ و شارەزوور .

٣ــ شـاتری :

ســـاڵی ١٩٢٢ هەزار ماڵێـکیان کۆچەر بوون ، ئێستا هەموو نیشتەجێن . چوار تیرەی هەیە : برایمی ، وردەشاتری ، یوسوجانـی و میروەیسـی . برایمی لە قەزای شـــیروانە دامەزراون و لەوێ ٢٠ گوندیان هەیە ، وردەشـــاتری لە ناحیەی سەیدصادق و قەزای کەلار دەژین و دوو تیرەکەی تری لە ناحیەی سەیدصادق دامەزراون .

٤ــ تەرخانی :

ساڵی ١٩٢٢ نزیك ٥٠٠ ماڵێك کۆچەر بوون و زستان لەقەزای کەلار بوون . ژمارەی کۆچەرەکانیان وردە وردە هاتە خوارەوە هەتا گەیشتە ســـەد ماڵێك کە هاوین دەچنە دەشتی شـلێر و دەگەنە سنووری ئێران . لە کوێستان لەوەڕ خۆیان نیە لەبەر ئەوە پووشانـە دەدەن . ئەو دوایان لە ١٢ دێ لە سەرقەڵای (قەزای کەلار) و لە شارەزوور دامەزراون .

٥ — **رۆغـزایی :**

ساڵی ١٩٢٢ ژمارەی کۆچەرەکانیان نێزگەی ٧٥٠ ماڵ بۆ. ئەمانە هەمۆ وردە وردە هەتا ساڵی ١٩٦٨ بۆنە نیشتەجێ، زۆربەیان لە ١٢ دێ دەژین لە هەرێمە سەختە ناخۆشەکەی باشۆری ـ رۆژهەڵاتی گاوەسپی نێزیک ئاوی ماران. ئەو دوایان لە شارەزوَر و قەرەداغ دامەزراون.

٦ — **هاروَنی :**

ساڵی ١٩٢٢ نێزگەی ٤٠٠ ماڵیان کۆچەر بۆن، زستان لە سەر سیروان بۆن لە رۆژئاوای پێواز. ئێستا وا گومان دەکرێ کە هەمۆ لە شـەش دێ لە ناحیەی خورماڵ و (٤) دێ لە ناحیەی وارماوە دامەزرابن.

٧ — **کەماڵەیی :**

ساڵی ١٩٢٢ نێزگەی ( ٢٠٠ ) ماڵیان کۆچەر بۆ، ئێستا هەمۆ لە ناحیەی خورماڵ و تانجەرۆ نیشتەجێن.

٨ — **سـەدانی :**

ساڵی ١٩٢٢ نێزگەی ( ١٥٠ ) ماڵیان کۆچەر بۆ، ئێستا هەمۆ لە ناحیەی خورماڵ دامەزراون.

٩ — **بەداخی :**

سـاڵی ١٩٢٢ نێزگەی هەشتا ماڵێکیان هاتوچۆی کوێستانی

دەکرد ، ئێستا هەمو نیشتەجێن و ناویان لە بەین کۆچەرەکان نەماوە .

۱۰— یاروەیستی :

سالّی ۱۹۲۲ نێزگەی هەفتا مالّیان کۆچەر بون و هاتوچۆی کوێستانیان دەکرد ، ئێستا ناویان لە بەین کۆچەرەکان نەماوە .

۱۱— شێخ ئیسماعیلی :

ئەمانە جاران هاتوچۆی کوێستانیان دەکرد[۲۲] ، بەلاّم ئێستا لە شەش دێ لە بەشی باکوری شارەزوَر دامەزراون . ئەم دێیانە دەکەونە بەینی ( موان ) و کەولۆس لە بەشی باکوری ناحیەی خورمالّ .

( د ) لە بارەی ئەو تیرانەوە کە لە بنەڕەتدا جاف نین و ئێستا زۆربەیان نیشتەجێن :

۱— ئیسماعیل عوزێری :

دەبنە سێ تیرەوە : میرالاّیی ، گۆمەیی و قەرەوەیسی . ژمارەی مالّەکانیان لە ناحیەی سوورداش سالّی ۱۹۳۷ — ۱۹۳۹ نێزیک ۲۰۰ مالّ دەبو . بە زستان لەو ناحیەیە هەندێکیان لە خانو و ئەوانی تریان لە ژێر رەشمالّدا دەژیان . هاوینان هەتا سالّی ( ۱۹۵۰ ؟ )

---

(۲۲) C . J . Edmonds , OP . Cit., P . 143

دەچونە ئێران و قەزای شارباژێڕ و پێنجوین . ئێستا زوربەیان لە ناحیەی سورداش و سەرچنار نیشتەجێن . تەنیا چەند ماڵێك زستانان بە نیوەکۆچەری دەچنە ناحیەی سەرچنار بۆ لەوەڕاندنی مێگەلەکانیان .

۲و۳— شنکێ و کافرۆشێ :

لە پێشدا لە شارەزوور بون ، لە پاشا چونە بازیان و بونە ژێر دەستی هەمەوەندەکان . شنکێ هەمو نیشتەجێن . کافرۆشێ کە ساڵی ۱۹٤۹ نێزگەی سەد ماڵ دەبون بەشێکی زۆر کەمیان کۆچەر بو ، ئێستا ئەوانیش دامەزراون و خەریکی کشتوکاڵن .

٤— بلباس :

ئەمانە لە قەرەتەپەوە هەتا قاینەیجەی باکوری خورماڵ بە دیهاتا بڵاو بون و هەمو نیشتەجێن . ئەم بلباسانە بە بنچینە (سن و رەمەك)ن کە ئێستا لە دەشتی بتوێن دەژین وە سەلیم پاشای بابان (۱۷۳۷ ـ ۱۷٤۷) لەوێ دەری کردن[۲۳] .

٥— کەڵهوڕ :

وا دیارە هەندێکیان گەڕانەوە ئێران بۆ ناو خزمەکانیان کە لە باشوری ڕێگای بەینی خانەقین و کرماشان دەژین . بەلام ۳۰۰ ماڵێکیان چونە ناو تەرخانیەکان و تێکەڵیان بون .

---

(۲۳) Ibid , P. 145 ( پەراوێزی یەکەم ) .

٦- تیلەکۆ :

هەندێکیان گەڕانەوە ئێران و لە خوڕخوڕەی باشووری ڕۆژهەڵاتی سەقز دامەزران . ئەو دوایان تێکەڵ میکائیلیتی و ڕۆغزایتی بون .

٧- گەڵباختی :

گەڕانەوە وڵاتی خۆیان لە ڕۆژئاوای سنە .

٨- مەندومتی ( مەنمتی ) :

زۆریان گەڕانەوە ئێران بۆ وڵاتی سنە و سەقز ، بەڵام هەندێکیان لە عیراق مانەوە و لە دێهاتی سورداش و بازیان بڵاو بونەوە(٢٤) .

٩- غەوارە(٢٥) :

ناوێکە جافەکان خستویانەتە سەر پێنج هۆزی بچوکی هەژار . مەبەستیان لەم ناوە تێکەڵ و پێکەڵە ، گوایا ئەم هۆزانە تێکەڵ بون لەگەڵ خەڵکی تر کە جاف نین . ئەمانە لە پێشدا لە شارەزوور

---

Ibid, pp. 143 - 5 (٢٤)

(٢٥) بەشێك لەم زانیاریەم لە کتێبەکەی ئەدمۆنس ( لاپەڕە ١٠٢ ) وەرگرتووە ، بەڵام بە یارمەتی زانیاری تازە کە لە سولەیمانی و پێنجوین دەسم‌کەوت باسەکەم تەواوکرد .

بوون ، کە جافی مورادیی هاتن دەریان کردن تاکو جێگایان بگرن[٢٦]
لەبەر ئەوە لەوێوە بەرەو باکوور کشانە دۆڵی گەلاڵ کە خۆیان
( دۆڵەگەلاڵ )ی پێ دەڵێن .

ئەم دۆڵە دەکەوێتە باشووری - رۆژهەڵاتی شارباژێڕ ، لە ناحیەی
سروچك ، وە لە شـانەدەردوە درێژ دەبێت هەتا دەشتایی پشتی
مۆریاس و چەند دێیێکی تێدایە وەك پەرخ کە لەبەر بێ ئاوی
بێری لێ هەڵکەندراوە ، چوالە کە ٢٠ماڵە ، بیوك کە ٢٥ ماڵە .

وا لە خوارەوە بە کورتی باسی ئەم هۆزە پچووکانە دەکرێ .

( أ ) بێسەری :

حەوت دێیان هەیە ، زۆریان نیشتەجێن ، بەشی دووەمیان کە
پەنجا ماڵ دەبن هاوینان دەچنە کوێستانەکانی قەزای پێنجوین .
بەشێکی تری ئەم هۆزە کە ٣٠ ماڵێك دەبن زستانان لە ناحیەی
تانجەرۆن لە دێی چەناخچیان ، سیداوا و باریکە دەژین ، هاوینانیش
دەچنە قەزای پێنجوین .

( ب ) چوچانتی :

لە چوار دێ دەژین و ساڵی ١٩٣٩ نزیکەی ١٢٠ ماڵ دەبوون .
بیست ماڵێکیان هاوینان کۆچ دەکەنە قەزای پێنجوین ، هەر لە
کانی سپیکەوە هەتا پێنجوین لە پاڵ شاخەکاندا رەشماڵەکانیان هەڵدەدەن .

(٢٦) C. J. Edmonds, Op. Cit., P. 102

(ج) هۆزی هەسەنی :

دوَ دێیان هەیە هەشتا ماڵ دەبن . هاوینان لەگەڵ چوچانیەکان دەچنە قەزای پێنجوین .

(د) پەرخێ :

یەك دێیان هەیە کە ناوی پەرخە . ساڵی ۱۹۳۹ نێزك پەنجا ماڵ دەبوَن ، ئێستا تەنیا ٦ ـ ۷ ماڵێکیان دەچنە کوێستانەکانی پێنجوین .

(ھ) قەوێلەیێ :

جاران زۆربوَن ، لە کاتی گرانییەکەی ساڵی ۱۹۱۸دا ناچار بوَن بڵاوبن تاکو لە برسا نەمرن . ساڵی ۱۹۲۰ ـ ۱۹۲۲ نێزك سەد ماڵ دەبوَن ، بەڵام ساڵی ۱۹۳۹ ئەم ژمارەیە هاتە خوارەوە بۆ ۲۵ ماڵ . زستانان هەندێکیان لە ئەشکەوتا دەژین ، هاوینان دە ماڵێکیان کۆچ دەکەن بۆ پشتی پێنجوین .

۱۰ـ جافە ڕەشکە :

نێزك دەماڵ دەبن . زستان لە دێی سورقاوشان لە ناحیەی سورداش دەژین و هاوین دەچنە (مێرگەپان) بۆ لەوەڕاندنی مێگەلەکانیان .

١١– جافەتی :

بەشێکن لە جافە رەشەکە کە لە ناحیەی سورداش تەواو نیشتەجێن . ژمارەیان بە ٤٠٠ هەتا ٦٠٠ ماڵ خەمڵ دەکرێ . تەنیا بەشێکی بچوکیان هاوینان دەچنە شێخ باغ کە موڵکی خۆیانە .

دووەم – کۆچەرەکانی قەزای رانیە(٢٧)

لە قەزای رانیە ، بێجگە لە ئەهالی کۆنی هەندێ لەگوندەکان ، خێلاتی یەک گرتوی « Confedaration » بلباس و ئاکۆ دەژین . ئەم خێلانە لە بنەڕەتدا لە ئێرانەوە هاتون ، وە ئێستاش بەشی گەورەی مەنگوڕ ، مامش و پیران لە هەرێمی لاوێن دەژین کە دەکەوێتە رۆژئاوای مەهاباد لە ئێران ، وە رۆژهەلاتی قەزای باڵەک و ناحیەی ناودەشتی عیراق لە هەرێمی لاوێن ، ئاوی لاوێن — کە سەرچاوەکانی هەرە سەرەودی زێی بچوك کۆ دەکاتەوە — لە باکورەوە بۆ باشور دەکشێت ، وە لە پاش تێکەڵ بونی لەگەڵ روباری بانە لە هەرێمی ئالان دەبێتە ( زێی بچوك ) .

---

(٢٧) سەرچاوەکانی ئەم باسە :

أ ـ ئەدمۆنس : هەمان کتێب بە ئینگلیزی ، لاپەڕە ٢٢٠ ـ ٢٢٣ ؛

ب ـ حاجی سەعید ئاغای سەرۆکی بۆلی کە لە مانگی ئابی ١٩٧٢ لە حاجی ئۆمەران چاوم پێ کەوت و باسی بۆلی و باۆلتی بۆ کردم :

ج ـ عەلی بەلی قادر بەگی بابان لە رانیە .

بڵباس بریتیــە لە پێنج خێـڵ : مەنـگوڕ ، مامش ، پیران ، سن و ڕەمك .

## مەنـگوڕ :

بەشی گەورەیان لە ئێرانن ، گوندەکانیان لە هەردوَ لای ئاوی لاوێن بڵاو بوَن . لە عیراق مەنگوڕەکان دەبنـە دوَ بەشـــەوە : مەنگوڕی بنچینەیێ و مەنگوڕە ڕوَتە . مەنـگوڕی بنچینەیێ لە بەیـنی روباری ژاراوە و گازفـێن لە ٢٦ گوندا دەژین ، ژاراوە لە باکوَری قەڵادزە لە ڕۆژهەڵاتەوە دەکشـێ بۆ روژئاوا و دەڕژێتە زێی پچوَك . روباری گازفێن لە باکوَرەوە دەکشێ بۆ باشوَر و لە ( دەربەند ) دەڕژێتە زێ . مەنـگوڕە ڕوَتە لە چوار گوند دەژین کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی روباری ژاراوە لە پێش تێـکەڵ بوَنی لەگەڵ زێ .

ئەم مەنـگوڕانە خزمایەتی و پەیوەندی‌یان زۆرە لەگەڵ مەنگوڕی ئـــەودیو لە ئێـران . بەشـــێك لەم مەنگوڕانـە ، بەتـایبەتـێ شوانـکاردکانیان ، ئێستا هاوینان بـــە ترانس‌هیومانس دەچنـــە کوێستانەکانیان کە دەکەونە ڕۆژهەڵاتی شاخـی گەڵاڵە و مامەڕوَت و ســـەری ســـاوە لە باشوَری قەندیل . لەوێ لەگەڵ خزمەکانی ئەودیویان هەندێ جار یەك دەگرن .

## مامش :

وەکوَ مەنـگوڕ دەبێتە دوَ بەشەوە . بەشی گەورەی لە ئێرانـە

لە ڕۆژهەڵاتی ئاوی لاوێن ، لە باکوری مەنگوڕەکان وە ڕۆژئاوای مەهاباد . پەسوە گەورەترین دێیانە . بەشێکی پچوکیان لە عیراقن مامشە ڕەشکەیان پێ دەڵێن . ئەمانە لەچوار دێ دەژین کە دەکەونە لای باشوری ئاوی زاراوە ، لە سەرەوەی مەنگوڕە ڕوتە . وا دیارە ئەمانە ـ وەك جافە ڕەشکە ـ ناوی ڕەشکەیان خراوەتـە دوا لەبەر دورکەوتنیان لە خێڵە بنچینەییەکە . هەندێ لەم مامشانەش هاوینان دەبنە شوان و شوانکارە و بۆ لەوەڕاندنی مێگەلەکان دەچنـە کوێستانەکانی سەر سنوری ئێران .

پیران .

ئەم خێڵەش دو بەشە : بەشێکی لە ئێرانە لە ڕۆژئاوای ئـاوی لاوێن لە باکوری مەنگوڕ و نێزك خانەی ڕۆژهەڵاتی گەڕوی زنوی شێخ کە سنوری عیراق و ئێرانی پیادەکشێ و دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی قەزای باڵەك . پیاو کە بەیانییێکی خۆش لەم گەروە لە سەر سنوری عیراق و ئێران ـ کە ئاوەڕێژە ـ ڕاوەستا چاوی بە ئاوی لاوێن دەکەوێ کە وەکو زیو دەبریقێتەوە و بەرەو باشـور دەڕژێت . لەملاو لەولای ڕوبارەکە چاوی بە دوکەڵی گوندەکان دەکەوێ .

بەشی دووەمی پیران لە دوانزە گوند دەژین ، یەکێکیان سەرخومەیە ، لە دەشتی بتوێن و تابعی ناحیەی چوار قوڕنەن . ئەم پیرانانەی گەرمیان ـ بێجگە لە سەد ماڵێك ـ هەمـو نیشتەجێن و فەلاحەت دەکەن . ئەو سـەد ماڵە هەندێکیان نیوەکۆچەر و

هەندێکی تریان شوان و مێگەلەکانیان لەگەڵ خۆیان بو کوێستان دەبەن . کەوابێ لە کۆچەر پتر ترانس‌هیومانسکەرن .

ئاکۆ :

بریتیە لە کۆمەڵە تیرەیێك کە پەیوەندی‌یێکی لاواز بەیەکەوە دەیان بەستێ ، و لە ناحیەی ناودەشت ، دۆڵی شاور ، و ناحیەی رانیە لە رۆژئاوای کێوەڕەش بڵاودەبنەوە . یەکێ لە دێیەکانیان لەم هەرێمە سەرکەپکانە ، نێزگەی سەدماڵێکیان هاوینان بە شوانی و شوانکارەیی یان کۆچەری دەچنە کوێستانەکانی قەندیل .

مەندەمەڕە :

یەکێکە لە تیرەکانی ئاکۆ کە لە نۆ گوند دەژین لە بەینی چیای زێرناکو و کێوەڕەش لە رۆژئاوای ئاوی گازفێن . لەبەر بێ ئاوی ئەو دەشتە کە تێیدا دەژین خۆیان زۆر بە کشتوکاڵەوە خەریك ناکەن لەبەر ئەوە نێزگەی ٢٥٠ ماڵێکیان لە بەهاردا دەبزوێن بۆ کوێستانەکانی قەندیل . زۆربەی ئەم ماڵانە کۆچەری تەواون .

شارۆشی :

تیرەیێکی تری ئاکۆیە . هەشت گوندیان هەیە لە دامێنی رۆژئاوای قەندیل ، لەوێ بە کشتوکاڵ و ماڵات بەخێوکردنەوە خەریکن . پەنجا ماڵێکیان هاوینان دەچنە ناو لەوەڕەکانی قەندیل کە لە گوندەکانیانەوە نێزگە . ئەمانە وا دیارە لە کۆچەر زیاتر

ترانسهیومانسکەری پچوکن .

بۆلی و بابۆلی :

دوَ تیرەی پچوکی ئاکۆن . بۆلی دوَ سەد ماڵ ، بابۆلی سەد ماڵ دەبن . چل ماڵیان بوَنەتە نیوە کۆچەر ، لە گوندەکانی دەشتی بتوێن دەژین لە رۆژئاوای رانیە کە لە پاشـان ناویان دێنین . ئەم نیوە کۆچەرانە دوَ ماڵەکی دەکەن ـ وەکو سەرۆکەکەیان باسی بـۆ کردم ـ ، ماڵێك لە گەرمیان دەمێنن و تەنیا بەکشتو کاڵەوە خەریکن ، ماڵێکیش بۆ کوێسـتان دەچن لە گەڵ مێـگەل . ئـەو دوایان ـ بێجگە لە چەند ماڵێکی بۆلی کە کەمێ فەلاحەتی دەکەن ـ کۆچەری تەواون ، خانویان نیە ، زستان و هاوین لە ژێر خێوەتا دەژیـن . گرنگترین پیشەیان مەڕ و بزن بەخێوکردنە ، بەلام لە هـەوارەکانی زستان و هاوین کەمێ گەنمو جۆش دەچێنن . بەهاران لە کوێستان گەنمە بەهارە دەچێنن کە پایز دەیدروَنەوە و لەگەڵ خۆیان بو گەرمیان دەیبەن .

بۆلی پێش پەنجا ساڵ زستانان دەچوَنە دەشتی هەولێر ، ئێستا زستانەهەواریان لە دەشتی بتوێنە لە رۆژئاوای رانیە ودك دێی سکتان ، سـەروچاوە ، گەرمکەندال ، ئەسرێلە ، گردگۆران . لە سکتان و گردگۆران پوَشانە ددەن ، بەلام لە سێ دێیەکەی تری لەوەڕی خۆیان هەیە و پوَشـانە نادەن . بۆ لەوەڕێـکی باش سەد دینار ، بۆ لەوەڕێـکی خراپ تەنیا ٣٠ دینار پوَشانە دەدەن .

بابۆڵی زستانەهەواریان لە ناحیـــەی چنارانە وەك دێیەکانی خدران ، باسەڕە ، باداوان و بێستانە کە نێزك قەسرۆکە لە ڕۆژهەڵاتی شـــاخی هەیبەت سوڵتان . ئەمان هەمو کۆچەری تەواون ، کەسیان نیشتەجێ نین و لەوەڕی خۆیان نیە . لەبەر ئەوە لەمەوپێش پۆشانەیان دەدا ، ئێستا نایانەوێ بیدەن .

ئەم دوَ تیرە پچوکە پێکەوە مانگی مایس لە بتوێنەوە بەرەو باکوور دەبزوَن ، دەگەنە دۆڵی ئاکۆ لە بەینی کێوەڕەش و شاخی مەکۆك ، لەوێ لە ڕۆژئاوای گوندی سەرکەپکانەوە تێپەڕ دەبن هەتا دەگەنە زنوی ( گەروَی ) سیتروکان ، لەوێوە دەگەنە دەشتی ماوان کە دێی قەسری تێدایە ، لە پاشـــا دەگەنە ( وەلاش ) لە قەزای باڵەك ، ئینجا بە سەر پردی ( باسان ) دا تێپەڕ دەبن کە لە سەر روباری سەکری سەکرانە . لەوێوە بە تەنیشت گوندی خوشکاندا دەڕۆن هەتا دەگەنە هاوینەهەوارەکانیان ، لە گەروَی زنوی شێخ . هەوارە هاوینەکانی بۆڵتی ( سەرسوَل ، کەڵکەش و مێرگە ) ن ، کە لە باشوری گەروَی زنوی شێخ و بەرامبەر حاجی ئۆمەرانن . بابۆڵتی لە پێشـــا دەچنە شیوەڕەش کە لە باشوری گەروَی زنوی شێخە ، لەوێوە دەچنە ( هەوار بڵندە ) و ( مێرگە درێژان ) کە دەکەونە لای باکوری ئەو گەرووە . جاران بابۆڵتی دەچونە ئەو دیوی زنوی شێخ بۆ سەر چەند هەوارێك لە دیوی ئێران ، بەڵام ئەمە ٦٠ ـ ٧٠ ساڵە وازیان لەو هەوارانە هێناوە وە لە سنوری عیراق دەمێنن . لەوەڕی کویستانیان هەمو هی خۆیانە و پۆشانە بە کەس نادەن .

بۆڵتی و بابۆڵتی زۆر دەوڵەمەند نین ، بەشی زۆری ماڵاتیـان مەڕە ، لە پاشا بزن . ئینجا گا و مانگا وهێـتر . ٣٠ ماڵێك هەر یەکە نێزگەی سەد ســەر حەیوانی هەیە ، سێ چوار ماڵێـکیش یەکی چوارسەد سەر حەیوانی هەیە .

گرنـگترین بەرهەمیان رۆن و پەنیرە . بەڵام ئەمە چەند ساڵە لە پاش پەیدابونی رۆنی نەباتی کەمتر رۆن و زۆرتر پەنیری ژاژی دروست دەکەن . کۆچەرێك لە مەڕێـکی دۆشەنی دەتوانێ نیوکیلۆ پەنیر دروستکات .

گرنـگترین کێشە و ناخۆشی ئەم کۆچەرانە پۆشانە دانە لە گەرمیان و مردنی ئاژاڵەکانیانە . پێویستە میری زیاتر غەمی دەرد و نەخۆشی ئاژاڵەکانیان بخوا و بەیتاریان بۆ بنێرێ بۆ لەناوبردنی ئەو دەرد و نەخۆشیانەکە دەبنە هۆی فەوتانی حەیوانەکانیان .

سن « Sin » و رەمك :

جاران سواری باشی نادر شـاه (١٧٣٢ـ١٧٤٧) بون . ئێستا دوَ تیرەی پچوکن لە بتوێن دەژین . زۆربەیان نیشتەجێن و بەشێـکی پچوکیان بە شوانی و شوانـکارەیی هاتو چۆی کوێستان دەکەن .

ترانسهیومانس لە قەزای پژدەر :

لە سەرەتای ســەدەی بیستەم بەشێـکی پچوك لە پژدەریەکان نیوەکۆچەر بون ، زســتان لەگوندەکانیان بەکشتوکاڵەوە خەریك

بوون ، هاوینیش لەگەڵ مەڕومالاَت دەچوون بۆ کوێستانەکانیان کە دەکەونە ڕۆژهەلاَتی پژدەر و ڕۆژئاوای سەردەشت لە ئێران . وە لەو هەرێمە چەند گوندێکیان هەبوو وەك بەردەسپیان و کێلی . ئەو نیوەکۆچەرانە لە مانگی مایس دێیەکانیان بەجێ دەهێشت و لەگەڵ مەڕومالاَت ڕوایان دەکردە ڕۆژهەلاَت و لە چەند گەرویێکەوە بۆ سەر هاوینەهەوارەکانیان لە دیوی ئێران تێپەڕ دەبوون وە لە مانگی ئەیلول دەگەڕانەوە پژدەر . گرنگترین گەرووەکان دوانن :

١ــ گەروی مالیموس لە ڕۆژهەلاَتی گوندی هەڵشۆ .

٢ــ گەروی کانی ڕەش کە لە دۆڵی کانی ڕەشەکە یەکێ لە ئاوەکانی ڕوباری درونی لێ دەڕژێ . ئەم گەرووە دەکەوێتە بەینی دوو شاخی بەرزەوە : بولفەت کە ٢٣٧٨ مەتر بەرزە ، وە جالمرکە ٢٠٨٥ مەتر بەرزە . زوربەی کۆچەر و شوانەکان بەم گەرووەدا تێپەڕ دەبن چونکە دەگاتە ناوەڕاستی هەوارەکانی پژدەر لە ئێران[٢٨] ، ئەم گەرووە ڕاست لە ڕۆژهەلاَتی قەلاَدزەیە ، ١٨ کیلۆمەتری لێوە دوورە و دەکەوێتە ڕۆژئاوای باکوری سەردەشت کە نێزگەی ١٢ کیلۆمەتری لێوە دوورە . گرنگترین هاوینەهەواری پژدەریەکان دەکەونە هەرێمی کێلی ، باژێڕ ، سەردۆڵ و بەردەسپیان .

لە پاشا لە ساڵی ١٩٢٦دا شەڕێك پەیدابوو لە بەینی

(٢٨) فؤاد حەمە خورشيد ، قضاء پشدر ؛ دراسة في الجغرافية البشرية ، كانون الثاني ١٩٧٣ ، رسالة ماجستير مخطوطة ، ص ١٤٣ و ١٤٦ .

پژدەریەکان و حکومەتی ئێران ، وە ئەم حکومەتە دەستی کردە تەگەرە دانان لەبەر هاتوچۆی کۆچەر و شوانەکان . . باڵیۆزخانەی ئێران لە بەغدا رۆژی ۲۵ی حوزەیرانی ساڵی ۱۹۰۵ نامەیەکی نارد بۆ وەزارەتی ناوخۆی عیراق کە تێیدا ئەمە نوسرابو : « خێڵەکانی پژدەر مافی ئەوەیان نیــە بچنە ناو لەوەڕەکانی ئێرانەوە . بەڵام حکومەتی ئێران لەبەر پەیوەندی دراوسیەتی باش ( علاقات حسن الجوار ) ئەو ساڵە رێگا دەدا ئەو خێڵاتە بۆ سەر لەوەڕەکانی ئێران بچن ، بە و مەرجە لە نیزامی لەوەڕی ئێران دەرنەچن »[۲۹] .

بەڵام حکومەتی عیراق ئەم قسەیەی قەبوڵ نەکرد ، و ئەم مافی لەوەڕاندنە بە مافێکی « مکتسب » واتا کۆن و دەسکەوتو دادەنێ نەك مافێك وە ستابێتە ســەر دراوســیەتی باش وەك لەم نامەیەی خوارەوە دەردەکەوێ کە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی عیراق رۆژی ۲۰ / ۵ / ۱۹۷۰ ناردویەتی و وەك خۆی بە عەرەبی لاوی دەکەینەوە :

« ان حق تمتع العشائر العراقيـة التي اعتادت رعى مواشيها في المراعي الايرانيـة يستند إلى قاعدة الحق المكتسب التي أشير اليها في بروتوكول الآستانة الموقع عليه في الرابع من تشرين الثاني عام ١٩١٣ ومحاضر جلســات قومسيون تحديد الحدود العثمانية الايرانية لسنة ١٩١٣ ـ ١٩١٤ . فقد جاء في بروتوكول الآستانة المذكور اعلاه ما يلي :

(۲۹) فوئاد حەمە خورشید، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ۱۹۷ . نوسەری ئــەو سەرچاوەیەش لە « مديرية الحدود » ی وەزارەتی ناوخــۆی عــیراقی وەرگرتوە .

« ومن المفهوم بان العشائر التركية التي من عادتها قضاء فصل الصيف في الوديان المذكورة عند ينابيع كادر [ گادەر ] و [ لاوينه ] ستستمر على التمتع بمراعيها وفق نفس الشروط المعمول بها في الماضي » .....
ينتج مما تقدم ان حق تمتع العشائر العراقية في رعي مواشيها في المراعي الايرانية يستند إلى قاعدة الحق المكتسب وليس إلى قاعدة حسن الجوار كما تدعي السفارة الايرانية »[٣٠] .

له پاشا حکومەتی ئێران باجی خستە سەر ئەو ئاژاڵە کە بۆ ئێران دەچن ، وە ساڵ بە ساڵ ئەم باجەیان بەرزتر ئەکردەوە وەك لەم خشتەیەی خوارەوە دەردەکەوێ :

| ئاژاڵ (سەرێك) | باجی ساڵی ١٩٤٨ | باجی ساڵی ١٩٦٣ |
|---|---|---|
| مەڕ | ١٠ ریاڵ = ٥٠ فلس | ٥٠ ریاڵ = ٢٥٠ فلس |
| بزن | ٧٫٥ ریاڵ = ٣٧ فلس | ٦٠ ریاڵ = ٣٠٠ فلس |
| هێستر و ئەسپ | ٦٠ ریاڵ = ٣٠٠ فلس | ١٥٠ ریاڵ = ٧٥٠ فلس |
| کەر | ١٠ ریاڵ = ٥٠ فلس | ١٥٠ ریاڵ = ٧٥٠ فلس |
| گاومانگا | ٥٠ ریاڵ = ٢٦٠ فلس | ١٥٠ ریاڵ = ٧٥٠ فلس[٣١] |

ئەمە باجێکی زۆر بەرزە ، لەبەر ئەوە هەندێ لە شوان و خاوەن مێگەلەکان ئیتر وازیان لە هاتوچۆی کوێستانەکانی ئێران هێنا .

---

(٣٠) ( أرچيف محافظة السليمانية ـ شعبة الحدود . كلمة ( گادەر ) لكاتب هذا المقال )

(٣١) فوئاد حەمە خورشید ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ٢٠٠ .

نەخشەی پارێزگەی سلێمانی کە هەندێک لە خێڵ و تیرە کۆچەرەکان پیشان دەدا

ئەم خشـتەیەی خوارەوە ژمارەی ئـەو نیوەکۆچەرانەمان پێشان دەدا کە هاوینی ١٩٥٣ بۆ ئێران دەچوون :

| ناوی هۆز | ژمارەی ماڵ | هەرێمی هاوینەهەوار |
| --- | --- | --- |
| هۆزی بابەکری سەلیم ئاغا | ٦٠ | کێلی |
| هۆزی مەحمودی حاجی ئاغا | ٥٠ | بازێر |
| هۆزی حسەینی جوامێر ئاغا | ٧ | بازێر و سەردۆڵ |
| هۆزی ئەحمەدی حاجی باپیر ئاغا | ١٥ | کێلی و بەردەسپیان |
| هەموو | ١٣٢ | |

ئەمە کەمێ ژمارەی ئەو نیوەکۆچەر و شوانانەمان پێشان دەدا کە لەو سـاڵەدا هاتوچۆیان دەکرد ، ئەو دوایان هەموو لە گوندەکان نیشتەجێ بوون .

لە پاش سـاڵی ١٩٦٨ ئەمەش گۆڕا و بوە ترانسهیومانس Transhumance یێکی تەواو وەکو لە ناو چیـاکانی ئەلپی ئەوروپا باوە . خاوەن مێـگەلەکان ئیتر وازیان لە هـاتوچۆکردن هێنـا ، مێگەلەکانیان دایە دەس شـوان ، کە هـەر یەکە مێـگەلی چەند کەسێکی لەگەڵ خۆیدا بۆ لەوەڕاندن لە کوێستانەکانی ئێران دەبرد ، لە مانگی ئەیلولدا دەگەڕانەوە سەر لەوەڕەکانی نێزیک گوندەکان[٣٢] .

---

(٣٢) فوئاد حەمە خورشید ، سەرچاوەی ناوبراو ، ل ١٩٤ ـ ٢٠٢ .

## کۆچەرەکانی پارێزگەی هەولێر

خێڵە کۆچەرەکانی پارێزگەی هەولێر بەستراون بە قەزای شەقلاوە و رەواندزەوە و بریتین لەمانەی خوارەوە :

هەرکی ، سورچی ، خێلانی و باڵەکی ؛ وا یەکە یەکە باسیان دەکەین :

### هەرکی :

خێڵێکی گەورەی کۆچەرە ، بەڵکو ئێستا گەورەترین خێڵی کۆچەرە لە کوردستانی عیراق . ئەمانە وا گومان دەکرێ لە بنەڕەتدا خەڵکی هەرێمی شەمدینان لە تورکیا و مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕی رۆژئاوای باکوری ( رەزائیە ) بن لە ئێران . لە شەمدینان چەند گوندێکیان هەیە نێزیک سنوری عیراق لە باکوری قەزای زێبار . لە هەرێمی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ ژمارەی گوندیان زۆرترە .

هەرکیەکان هەتا ١٩٢٥ کۆچەری تەواو بون . بێجگە لەوانە کە لە ئێران و تورکیا و « هەرکی بنەجێ » لە ناحیەی مزوری باڵا کە نیشتەجێن ، ئەوانی تری هەمو زستان و هاوین رەشماڵنشین بون ، خانویان نەبو و خەریکی مەڕومالات بەخێوکردن بون . لەپاش ١٩٢٥ کە تورکیا قەدەغەی هاتوچۆیانی کرد بۆ سەر زۆزانەکانیان کە کەوتونە قوژبنی باشوری رۆژهەلاتی تورکیاوە ، لەوبەری روباری حاجی بەگ کە دەبێتە سنور لە نێوان عیراق ( ناحیەی برادۆستی قەزای

رەواندز ) و تورکیا ( ناحیەی شەمدینانی قەزای دیزەگەوەری ویلایەتی حەکاری ) ، ناچار بون تەنیا بۆ ئێران بچن بۆ ئـەو هەوارانە کە دەکەونە سەر سنوری عیراق و ئێران لە رۆژئاوای شنۆ وە بۆ سەر هـەوارەکانی مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ . کە حکومەتی ئێرانیش پاش ١٩٣٠ دەستی کردە زۆر کردنی باج ـ وەکو لەمەوپێش بێـژرا ـ وە تەگەرە دانان لەبەر دەمی هاتوچۆیان و گرتنی سنور ، هەندێکی تریان لە ئێران لای خزمەکانیان مانەوە . ئێستا تیرە و باری هەرکیەکان بەم جۆرەی خوارەوەیە :

١ــ هەرکی بنەجێ :

ئەمانە جـێ نشینن لە ناحیەی مزوری بالا لە بەشی باکوری قەزای زێبار و لە باشوری هەرکیە جێ نشینەکانی تورکیـا . لەوێ لە باکوری ( ئەرگوش ) چوار گوندیان هەیە : بێـداو ، دری ، ستونێ و کیێ . بێداو نیوەی لە عیراقە و نیوەی لە تورکیا ، گوندەکانی تری لە عیراقن خەڵکی ئەم گوندانە لە تیرەی سیدانین . ژمارەی ئەم هەرکیانە بەپێی سـەرژمێری ١٩٥٧ ، ٧٥ کەسـە کە ژمارەیێکی زۆر نزمە .

٢ــ هەرکی سەرهاتی :

ژمارەی نێزکەی ٢٠٠٠ ــ ٢٥٠٠ کەس دەبێ ، زسـتانان ئێزگە ئاوی بە ستۆرە ( لە ناحیەی صەلاحەددین ) و لە باکوری رۆژهەلاتی

هەولێر دەبن . هەمتو لە ژێر رەشماڵدا دەژین بێجگە لە چەندماڵێك کە ئەمە چەند ساڵێکە لە دوَ گوندی نێزك بە ستۆرەکە (میراخور) و (رەشوانی ئەسعەدئاغا) ن لە خانوودا دەژین . ئەم دوَ گوندە لە ناحیەی صەلاحەددینە ، ژمارەی دانیشتوانیان نێزکەی ١٥٠ کەسێکە کە تێکەڵاون لە هەرکی و زراری . لێرە هەرکیەکان هەندێ فەلاحەت دەکەن ، بەڵام زۆری رەنجبەرەکان هەرکی نین . هەندێکی تری لەم هەرکیانە لە ئێران لە مەرگەوەڕ و تەرگەوەڕ نیشتەجێن و خەریکی فەلاحەتن . کۆچەرەکان ژمارەیێکی زۆر مەڕ و کەمتر بزنیان هەیە لەگەڵ هێستر بۆ گواستنەوەی ژن و منداڵ و بار و رەشماڵ . مەخابن ژمارەی وام بە دەس نەکەوت لە بابەت ئەم ئاژاڵەوە کە بڕوای پێ بکرێ . کۆچەرەکان لە مانگی مایس بەرەو رۆژهەڵات دەبزوَن ، بە گەلی عەلتی بەگدا تێپەڕ دەبن هەتا دەگەنە دەشتی دیانە ، لەوێوە بە سەر گەردن حوشتر و سەری بەردێدا مل دەنێن هەتا دەگەنە سیدەکان (مەرکەزی ناحیەی برادۆست) ، لەوێشەوە بە سەر مێرگەمیر و روباری لولانا دەگەنە (گادەر) کە کەوتۆتە خوار شوێنی یەکبوَنی سنوری عیراق و تورکیا و ئێرانەوە . لە گەروَی ملەزەردە کە لە باکوری گادەرە هەر یەکە لەو سێ حکومەتانە مەرکەزێکی پۆلیسی سنوری هەیە . لە گادەرەوە هەرکیەکان دەچنە ناو ئێران و دەگەنە هەرێمی گەلاز (لە رۆژهەڵاتی گادەر) و دامێنەکانی رۆژهەڵاتی چیای چارچەلی هەرکتی ، لەوێ چەند هەوارێکیان هەیە وەك بەردەسپیان و چەلی داران .

٣- هەرکتی سیدان :

١٥٠٠ کەس دەبن ، زستان لە ناحیەی حەریر رەشماڵیان هەڵدەدەن ، مانگی مایس بەرەو رۆژهەڵات دەبزوَن وە لە مانگی حوزەیران بە هەمان ریگای هەرکتی سەرهاتا دەگەنە برادۆست ، لەوێوە بە سەر (دالانپەر)دا تێپەڕ دەبن و دەگەنە سەر هەوارەکانیان لە (بن‌بەرق شێخان) کە لە هەرێمی زێوەیە لە ئێران . بە پێی سەرژمێرێ ١٩٥٧ هەرکیەکانی پارێزگەی هەولێر ٧١٣٦ کەسن .

٤- هەرکتی مەندان :

ئەمان زستانان لە ناحیەی سورچێ قەزای عەقرە لە ژێر رەشماڵا دەژین . مانگی مایس دەبزوَن بۆ زۆزان ، هەندێکیان لە (دۆڵەترشێن) لە باکوری ئاوی خواکورك لە ناحیەی برادۆست دەمێننەوە ، ئەو دوایان دەچنە ئێران . یەکێ لە هەوارەکانیان (شەهیدان)ە لە رۆژئاوای دالانپەر . بە پێی سەرژمێری ١٩٥٧ ژمارەی ئەم هەرکیانە ٣٠٩١ کەسە .

سۆرچێ :

زۆریان جێ‌نشینن لە ناحیەی حەریر و (سۆرچێ) لەمبەر و ئەوبەری زێی بادینان (زێی گەورە) . بە سۆرچیەکانی دەشتی حەریر کە سەر بە قەزای شەقلاوەن (سۆرچێ سۆران) بەوانی ناحیەی

سورچی قەزای عەقرە ( سورچی بادینان ) دەبێون . شێوەی ( لەهجەی ) سورچیەکانی سۆران لە هی خۆشناو ، بەڵام شێوەی سورچیەکانی بادینان لە هی عەقرەوە نێزکە .

ئیستا بەشێکی پچوک لە سورچی سۆران کە لە دەشتی حەریر دەژین هاتوچۆی زۆزان دەکەن . ژمارەیان بە ۲۰۰۰ تا ۳۰۰۰ کەس خەمڵ دەکرێ . ئەمانە یان نیوە کۆچەرن یان شوانی ترانس هیومانسکەرن . ئەم سورچیە رەوەندانە بە رێگای گەلی عەلی بەگدا ، بە سەر دیانە و مێرگەمیرا دەڕۆن هەتا دەگەنە ( کێلەشین ) لە سەر سنوری عیراق و ئیران و لە رۆژئاوای شاری پچوکی ( شنۆ ) لە ئیران . لەوێوە دەچنە سەر هەوارەکانی مێرگەکاروان ، هەوارکۆن ، هەواری سامێ کە هەمو لە ناو سنوری ئیراندان .

خەیلانی :

خێلێکی پچوکی کۆچەر و نیوە کۆچەرە . لە سەرژمێری ۱۹۵۷دا ژمارەیان بە ٤۲۰ کەس دانراوە . زستانان لە دەشتی حەریرن لە رۆژئاوای باتاس ، لە حوزەیران دا لە ناحیەی برادۆستەوە تێپەڕ دەبن هەتا دەگەنە نێزک کێلەشین ، لەوێوە دەچنە باکوری هەڵگورد ، باشوری کێلەشین و شاخی سپیریز کە لە ئیرانە . گرنگترین هەواریان لە سپیریز ئەمانەن : هەوار بلندۆك ، هەوار سوڵتان ، دۆڵەمەیدان و قەنتەرە .

**باڵـەکێ :**

بە پێی سەرژمێری ١٩٥٧ ( ١١٠٠ ) کەسن . زستان لە گوندی باڵەکیان دەژین لە باکوری رۆژئاوای رەواندز وە لە رۆژهەڵاتی گەلێ عەلی بەگ . زۆریان نیوەکۆچەرن ، هاوینان باڵەکیـان بەجێ دەهێڵن ، بە سەر برادۆستا دەگەنە گەروێ بارزین ( بەربەزین ) لە رۆژهەڵاتی سیدەکان لە سەر سنوری عیراق و ئێران . بەشێکیان دەچنـە ( کانێ سەربەسێر ) کە لە ئێرانە . بەشی دووەمی لە عیراق دەمێنێ لە هەوارەکانی ( هورنێ ) و ( برەشکین ) کە لە بەینی ناحیەی باڵەك و برادۆستدایە .

## کێشە و ناخۆشێ کۆچەرەکان و چارەکردنیان

١ـ گرنگترین کێشەی کۆچەرەکان قەدەغەی حکومەتی ئێران و تەگەرە خستنیەتی لە بەر دەمی هاتوچۆیاندا . دەبێ حوکومەتی عیراق بکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ئێران بۆ لابردنی ئـەم جـۆرە ناخۆشیانە بۆ ئەوە کە خاوەن مالآتی عـیراق بتوانن لە لەوەڕەکانی ئێران هاوینان سود وەرگرن . بەرامبەر ئەوە دەبێ عیراق رێگا بدا بە شوانەکانی ئێران بۆ ئەوە کە زستانان مێگەلەکانیان ـ بۆ وێنـە لە هەرێمی مەندەلی ـ بۆ سـەر لە وەڕەکانی عیراق بهێنن . ئـەم بابەتە دەستەوایە باوە لە ناوەڕاستی ئەوروپادا لە بەینی ئیتالیا ، ئەوستریا ، ئەڵمانیا و سویسرەدا . بۆ لێرەش دوو دراوسێی موسڵمان سود لە یەك وەرنەگرن !! لەپاشا دەبـێ هەردولا باج هەڵگرن لەسـەر ئـەو

مێگەلانە کە سنور تێپەڕ دەکەن .

٢ــ چاككردنی ڕێگای هاتوچۆ لە هەرێمەکانی نێزك سنور بۆ ئەوە کە مالات بە ئاسانی ، هەندێ جار بە (ئوتوموبێل ، لە گەرمیانەوە بگوێزرێنەوە بۆ کوێستان . هەندێ لە سەرۆکەکانی هەرکی ـ بۆ وێنە ـ ئێستا مانگی حوزەیران لە دەشتی حەریرەوە بە ئوتوموبێل دەچن بۆ حاجی ئۆمەران ، لەوێوە ئاوای ئەودیو دەبن بۆ ئێران و دەچنە سەر هاوینەهەوارەکانیان . بێتو ڕێگای دەشتی حەریر ـ گەلی عەلی بەگ ـ حاجی ئۆمەران چاك بکرێ ، بەشێك لە هەرکی و سورچی و خەیلانی دەتوانن بە ئوتوموبێل مالاتەکەنیان بگەیەننە دەشتی دیانە و رایەت کە نێزکن لە هاوینەهەوارەکانیان .

لە پاشا ڕێگای سەری بەردی ـ سیدەکان ـ لولان ڕێگای هەموایی هەرکی ، سورچی و خەیلانیە . لەبەر ئەوە چاك کردنی ئەم ڕێگایە هەم دەبێتە هۆی ئاسان کردنی هاتوچۆ و گواستنەوەی مێگەلەکان ، هەمیش دەبێتە هۆی بوژانەوەی ناحیەی برادۆست کە لەبەر بێ ڕێگایی لاتەریك ماوە و دانیشتوانی هەژار و نەخۆشن ، نە لە خزمەتی میری سود وەردەگرن ، وە نە دەتوانن بەرهەمی خۆیان وەك ڕۆن ، پەنیر ، هەنگوین ، خوری ، داری سپیدار ، میوەی تەڕ و وشك بەئاسانی بگەیێننە (دیانە) تاکو لەوێوە بیگەیێننە هەولێر و بەغدا .

٣ــ هەلکەندنی بیری ئیرتیوازی لەو لەوەڕانەدا کە لە ئاوەوە

دوَرن تاکو سوّدیان لێوەرگیرێ وەك هەرێمی رۆژهەلاتی باکوری هەولێر .

٤— پەرەپێدان بەخــــزمەتی بەیتار بۆ نەهێشتنی نەخۆشی و دەردی ئاژاڵ .

٥— چاك کردنی رەسەنی ئاژاڵ بە هێنانی بەران و تەگـەی باش کە خوری و مویان زۆرترە و باشترە ، شیریان زۆرترە یان بـە کێشان قورسترن لە هی خۆیان .

٦ـ باش کردنی لەوەڕەکانی گەرمیـان بە تەرخان کردنی هەرێمە بەردەلانیەکان بۆ لەوەڕ ، چاك کردنی ئەو لەوەڕانە بە دابەش کردنیان بە چەند بەشێکەوە وە قەدەغە کردنی هەر بەشێك بۆ ساڵێك بۆ ئەوە کە رەوەکە باشەکانی تێیدا بروێنەوە و بەرزببنەوە ، وەکو ئێســـتا فەرمانگەی کشـــتوکاڵ خەریکیەتی لەو هەرێمە کە ١٥ کیلۆمەتر لە رۆژهەلاتی شاری هەولێرەوە دوَرە .

رۆژنامەی ( التآخی ) رۆژی ١٣/١/١٩٧٣ ئەم باســـەی بلاو کردەوە : « قرر المجلس الزراعی لمحافظة أربیل تشکیل لجنة لتحدید الأراضي غیر الصـالحة للزراعة و تخصیصها کمرعی لمواشي العشــائر المرکیة وذلك دعماً للثروة الحیوانیة . » . ئەمە باسێکی خۆشە وە غەم خواردنی ئەنجومەنی کشتوکاڵی هەولێرمان پیشان دەدا ، هیوامان وایە جێبەجێ بکرێ وە ئەو سامانە باشـــە کە خێڵی هەرکی هەیەتی لە کیسەمان نەچێ .

٧ـ خێڵەکانی هەرکی و بۆڵی و بابۆڵی لە زۆزان چەشنە پەنیرێکی نایاب دروست دەکەن کە ناوی پەنیری ژاژی یان پەنیری وشاریە . ئەم پەنیرە باشە تام خۆشە زۆر لە پەنیری رۆکفۆردی (Rockford) ئەوروپا و (Blue Cheese)ی ئەمەریکا دەچێ . دەبێ فەرمانگەی کشتوکاڵ پسپۆری تایبەتی بنێرێ تاکو دروست کردنی ئەم پەنیرە لە زۆزان باشتر بکرێ و کۆچەرەکان بتوانن پایەی بەر هەمی ئەم پەنیرە بەرز کەنەوە . لە عیراق ئێستا خواستێکی زۆر هەیە بۆ ئەم پەنیرە ، لەبەر ئەوە دەبێ بەرهەمەکە فرەوانتر بکرێ تاکو پێویستی بازاڕی عیراقی پێ پڕبکرێتەوە .

عیراق ئێستا پێویستی‌یەکی گەورەی بە زۆرکردنی ئاژاڵی ماڵی هەیە لەبەر زۆربونی ژمارەی دانیشتوان ، بەرزبونەوەی پلەی ژیان و پەرەسەندنی گۆشت خواردن . لەبەر ئەوە دەبێ هەموو لایێ ( وەزارەتی کشتوکاڵ ، پارێزگەکان و ئەنجومەنەکانی کشتوکاڵ ) خەریکی چاك کردنی باری مەڕومالات و لەوەڕ و شوانەکانمان بن .

* * * * * *

ـ ملخص المقال ـ

# الانتقال الفصلى والبداوة فى محافظتى السليمانية واربيل

العضو العامل : د. ناجي عباس أحمد

يقوم عدد قليل من مربي الاغنام في شمالي العراق بالتنقل مع حيواناتهم بين المراعي الشتوية في السهول والمراعي الصيفية على سفوح الجبال العالية الواقعة على الحدود العراقية ـ التركية والحدود العراقية ـ الايرانية والمناطق القريبة منها . ويجري هذا التنقل من الوجهة الاجتماعية في ثلاثة أشكال : البداوة الكاملة ، شبه البداوة والانتقال الفصلي .

نعني بالبداوة الكاملة تنقل جماعة رحالة من مربي الحيوانات بين المشاتي والمصايف على شكل مجموعات تنتمي إلى قبائل وأفخاذ معينة ولا تمارس هذه الجماعة الزراعة الا نادراً .

ونعني بشبه البداوة ممارسة تلك الجماعات الرحالة الزراعة بجانب تربية الحيوان .

ونعني بالانتقال الفصلي Transhumance قيام جماعة من مربي الحيوانات ـ الذين لاينتمون الى قبائل وافخاذ معينة ـ بالتنقل بين المشاتي الواقعة في السهول والمصايف الواقعة في سفوح الجبال العالية . ويسود هذا االنمط من التنقل الفصلي في المناطق الجبلية الواقعة في العروض الوسطى في العالم بين خط عرض ٣٠° و ٤٨° شمالا وجنوباً وذلك للافادة من المراعي النضرة الخضراء الواقعة على سفوح الجبال العالية فوق نطاق الغابات في موسم الصيف .

ولا يوجد الآن في شمالي العراق الا عدد قليل من الجماعات البدوية الكاملة مثل قبيلة هركي ، بولي و بابولي . اما الجماعات المتنقلة الاخرى فمعظمهم من نوع اشباه البدو لجمعهم بين التنقل والزراعة . وقد تطور هذا النظام الاجتماعي أخيراً ـ في منطقة بشدر مثلا ـ الى نظام واضح للانتقال الفصلي بعد استقرار أصحاب المواشي في القرى ومزاولتهم الزراعة وترك القطعان تحت رعاية رعاة يقومون بسوقها في شهر مايس إلى المصايف الواقعة على الحدود العراقية ـ الايرانية وقيامهم هناك برعي الحيوان وجمع الدهن والجبن ثم العودة بها في شهر ايلول الى القرى الواقعة في السهول .

القبائل والجماعات المتنقلة في محافظة السليمانية :

نجد في هذه المحافظة مجموعتين من القبائل الرحالة :

١ــ عشيرة جاف التي تقع مشاتيها في قضاء كفري وكلار وسهل شهرزور وتقع مصايفها في قضاء پينجوين .

٢ــ بعض القبائل في قضاء رانية التي تنتقل بين هذا القضاء والجبال الواقعة على الحدود العراقية ـ الايرانية .

لقد هاجرت عشيرةجاف فى القرن السابع عشر من منطقة جوانرو الايرانية الواقعة بين حلبجة وكرمانشاه الى سهل شهرزور ومنه الى سهول قضاء كفري . وكانت تنتقل بين هــذه المشاتي والمصايف الواقعة بين سقز و سنه في شرق محافظة السليمانية في ايران ويقدر عددهم في اوائل القرن العشرين بحوالي ١٠٫٠٠٠ عائلة استقر ثلثهم في مشاتيهم وكان ينتقل ثلثاهم بصورة بدوية أو شبه بدوية بين المشاتي والمصايف . وبعد ان وضعت الحكومة الايرانية العراقيل امام تنقل هذه الجماعات ولاسيما في سنة ١٩٣١ وما بعدها اضطر عـدد كبير من القبائل الرحالة الى الاستقرار في المشاتي . فانخفضت نسبة الرحالة منهم سنة ١٩٢٢ من الثلثين الى الثلث ثم انخفض عدد المتنقلين منهم سنة ١٩٤٧ الى ٥٠٠٠ وفي سـنة ١٩٧٢ الى اقل من ٣٠٠٠ . وكان المنع من الدخول الى المراعي الايرانية العامل الرئيس لاستقرارهم وصيرورتهم فلاحين مستقرين يزاولون الزراعة وتربية الحيوان .

وتسكن في قضاء رانية في فصل الشتاء عدد من القبائل الرحالة اهمهـا قبائل بلباس المتحدة المتكونة من منكور ، مامش وپيران ومجموعة قبائل آكو المتكونة من آكو الاصلي ، مَنْدَمَرَ ، شاروشي ، بولي وبابولي . معظم عائلات هــذه القبائل مستقرة في الوقت الحالي ولا يتنقل منهم الا عدد محدود من عائلات منكور ، مامش ، پيران ، آكو وشاروشي على شكل اشباه البدو . وتترك نسـبة كبيرة من عائلات مَنْدَمَرَ وكل عائلات بولي وبابولي مشاتيها متوجهة الى المصايف .

وتقع مصايف هذه الجماعات ـ ما عدا بولي وبابولي ـ في جبال قنديل الواقعة على الحدود العراقيـــة ـ الايرانية . اما قبيـلة بولي وبابولي الصغيرة ـ البالغ عـدد عائلاتها حوالي ٣٠٠ فتقع مصايفها في منطقة (زنوي شيخ) الواقعة في الحدود العراقيـــة ـ الايرانية شرق قضـاء رواندز . العائلات الرحالة لقبيلة مَنْدَمَرَ وقبيلتا بولي وبابولي لاتمارس الزراعة الا قليلا لذلك تعتبر جماعات بدوية كاملة .

## القبائل والجماعات المتنقلة في محافظة أربيل :

تمارس قبائل هركي ، سورچي ، خيلاني وبالـكي في هـــذه المحافظة التنقل بين المشاتي الواقعة في سهل حرير وشمال شرق أربيـل وسهل ديانة والمصايف الواقعة على الحدود العراقية ـ الايرانية في شمـال شرق رواندز . وتعتبر عشيرة هركي اهم هذه العشائر ويمارس مـعظم عائـلاتها البـداوة الـكاملة . وتقـع مراعيها الصيفية في تركيا ، شمال قضاء رواندز وفي سهل مَـرْكَـَوَر وتَـرْگـَوَر الواقعتين بالقرب من بحيرة الرضائية في اذربايجان الايرانية . وقد منعت الجمهورية التركية منذ ١٩٢٥ استفادة هذه القبائل من مراعيها في تركية ، لذلك لا يصطافون في الوقت الحالي الا في المراعى الواقعة على الحدود العراقية ـ الايرانية القريبة من الحدود و الواقعة في منطقة رضائية .

ان معظم عائـــلات قبيلة سورچي مستقرة في سهل حـرير في محافظة أربيل وسهل عقره في محافظة نينوى . ولا ينتقل الاعدد قليل من عائلاتهم على شـــكل اشباه البدو ورعاة متنقلين انتقالا فصلياً الى

مصايفهم الواقعة بالقرب من الحدود العراقية الايرانية في شرق ناحية برادوست .

والخَيْلاني قبيلة صغيرة يبلغ عدد افرادها حوالى ٥٠٠ شخصاً ، يمارس قسم منهم الزراعة بجانب تربية الحيوان وتنتقل الجماعات الرحالة منهم من مشاتيها الواقعة في سهل حرير الى جبل سپيريز الواقع في ايران بالقرب من الحدود العراقية .

وان قبيلة بالكي الصغيرة تسكن قرية بالَكِيان وبلغ عدد افرادها ١١٠٠ حسب تعداد ١٩٥٧ . تقع هذه القرية في شمال غرب رواندز بالقرب من مضيق كلي علي بك ويتنقل معظم العائلات صيفاً الى مصايف هورني وبَرشكين الواقعتين بين ناحية برادوست وبالك في شمال شرق رواندز .

## اهم مشاكل الجماعات الرحالة :

١ــ منعهم من الدخول الى المراعي التركية والايرانية . فعلى الحكومة العراقية الدخول في مفاوضات مع حكومة ايران لتذليل العقبات امام دخولهم الي المرعى الواقعة بالقرب من الحدود .

٢ــ تحسين طرق المواصلات بين المشاتي والمصايف ولاسيما طريق أربيل ـ ديانه ـ سيدَكان ـ الحدود الايرانية ليتمكن بعض العائلات الغنية نقل مواشيها بواسطة الشاحنات .

٣ــ حفر ابار ارتوازية في المشاتي للافادة من المراعي التي تتوفر فيها مياه سطحية مثل منطقة شمالي شرقي أربيل .

٤— تحسين أجناس الحيوانات باستيراد اجناس ممتازه من الخارج وتوزيعها على الجماعات الرحالة .

٥— تحسين حالة المـــراعي والعناية بها بتقسيمها الى أقســام وتسييجها ومنع دخول المواشي الى القطع المسيجة ( المحرمة ) لمدة معينة لتنعش منها الاعشاب ، وتنمو وتزدهر .

٦— تدريب الجماعات الرحالة لرفع انتاج الانواع الجيدة من الجبن ولاسيما جبن هوشارى الذى يضاهي أحسن انواع الجبن الاوربى .

ان عدد سكان العـــراق في ازدياد مستمر ممايؤدى الى ارتفـاع الحاجة إلى اللحوم ومنتجات الألبان لذلك يجب على الدوائر المختلفـة في وزارة الزراعة و مجالس الزراعة في المحافظات الاهتمام بأمر مربى الحيوانات وايجاد مراعى جديـدة والعناية بالمراعى الحالية ليتمكن هؤلاء من رفع كمية الانتاج من اللحم والجبن وغيره .

* * * * * *

# کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا[1]

د. جەمال نەبەز[*]

## کە «کۆڕی زانیاری کورد»[2] ڕوی ئەوەی لێنام وتارێك

(١) کە ئەڵێم «ئەڵمانیا» مەبەستم تەنیا ئەو دوو چوارچێوە سیاسی‌یە نیە کە ئەمڕۆ بە ناوی «کۆماری یەکگرتوی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا» و «کۆماری دیمۆکراتی ئەڵمان» واتا ـ ئەڵمانیای ڕۆژهەلات ـ ەوە ناونراون . بەڵکو مەبەستم لەو ولاتانەی تریشە کە گەلەکانیان بە زمانی ئەڵمانی قسە ئەکەن . واتا لێرەدا باسێکی کوردناسی لە نەمسە و تا ئەندازەیەکیش لە بەشی ئەڵمانیای سویسرەدا ئەکەم .

(*) مامۆستا جەمال نەبەز یەکێکە لە نوسەرە کوردە ناسراوەکان و خاوەنی چەند بەرهەمێکی زانستی و ئەدەبی و کۆمەلایەتییە و ئێستا لە (زانکۆی ئازاد) لە بەرلین مامۆستای ئێتنۆلۆژی گەلانی ئێران و کولتوری کوردە . مامۆستا نەبەز لە سەر داوای کۆڕ ئەم وتارەی بۆ ژمارە دوی گۆڤارەکەمان ئامادە کرد .

(٢) کاشکی ئەم ناوە «کۆڕی زانست» بوایە لە جیاتی «کۆڕی زانیاری» . چونکە بە ڕاستی وشەی «زانیاری» ( Wissenschaft ) نیە ، بەڵکو «معرفة»یە ( Kenntnis ) . بێجگە لەوەش ئەبو لە نێوانی وشەی «زانیاری» و «کورد»دا نیشانەی خستنە پاڵ ( اداة الاضافة ) کە =

**بۆ گۆڤارەکەی لە بارەی کوردناسی‌یەوە لە ئەڵمانیادا بنووسم ، هەڵبژاردنی وشەی « کوردناسی » Kurdenkunde م لە جیاتی « کوردەوانی »[3] Kurdologic بە هەڵبژاردنێکی بەجێ هاتە**

= ( ی )یە دابنرایە . ئەو حەلە « کۆڕی زانست » یا « کۆڕی زانیاری » بە یەك وتەی دوو وشەیی دانراو ئەخرایە پاڵ وشەی « کورد » . واتا « ئەم کۆڕی زانستە هی کوردە » یا « سەر بە کوردە » . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە نیشانەی خستنە پاڵ ( ی أ یا لا ـ کە لە لاتینی‌دا یەکەمیان پاش پیتی بێدەنگ دووەمیان پاش پیتی دەنگدار بەکار ئەهێنرێ ) لە ( هی hi )یەوە هاتووە . واتا کە ئەڵێت : « کتێبی من » ئەمە لە بنەڕەتەوە : « کتێب هی من » بووە ، ئەوجا ( ه ) کەی لەسەر زمان بە پێی ( دەستووری چوونی دەنگ بەرەو سووك بوون و سووان ) کە دەستوورێکی زمانەوانی‌یە ، لاچووە .

[کۆڕی زانیاری کورد دەمێکە بیری خۆی لەم بارەوە بلاوکردۆتەوە (بڕوانە : «زانیاری» زمارە ٤ ، ساڵی ١٩٧١ ، ل ٥٧ ـ ٧١) ـ لیژنەی گۆڤار ـ]

(٣) وشەی « کوردەوانی »م لەسەر کێشی « زمانەوانی » و « ئاشەوانی » و « مەلەوانی » داڕشت . هیوام وایە ئەو مەبەستە بگرێتەوە کە لە وشەی « کوردەلەجی » Kurdology ئینگلیزی و « کوردۆلۆگی » Kurdologie ئەڵمانی‌دا دەست ئەکەوێ . ئەو دەمە وشەی « کوردناسی »مان بۆ ئەمێنێتەوە و ئەتوانین لە جیاتی « التعریف بالاکراد » یا «فن معرفة الاكراد » کە ئەڵمانەکان Kurdenkundeی بۆ ئەڵێن بەکار بهێنین . چونکە پێم وایە « کوردناسی » ناسینی کورد ئەگرێتەوە نەك « زانستی لێکۆڵینەوە لە کورد و بەتایبەتی زمانەکەی » کە بە ئینگلیزی « کوردەلەجی»ی بۆ ئەڵێن و منیش ناوم ناوە « کوردەوانی» هەروەها « زمانناسی » ناسینی زمان ، واتا Sprachkunde ئەڕێتەوە ، =

بەرچاو . چونــکە « کوردناسێ » وتەیەکە مانایەکی فراوانی هــەیە و هەمێ ئەو هەوڵ و تێکۆشان و چالاکێ و کاروبارانە ئەگرێتەوە کە

= نەك « زانسێ لێکۆڵینەوە لە زمان » کە بە کوردی « زمانەوانی »یە و بە ئەڵمانی Linguistik ی پێ ئەڵێن . هەر لێرەدا ئەمەوێ بڵێم کە « زانسێ زمان »یش بەرامبــەر وشــەی « علم اللغة »ی عەرەبێ و Sprachwissenschaftی ئەڵمانی بەکار ئەهێنم کە جاروبار Philologieیشێ پێ ئەڵێن ئەمجا بە پێویسێ ئەزانم ئەوەش بڵێم کە ئەو وشانەی دائەڕێژرێن ئەبێ پڕ بە پێی ئەو مانایانە بن کە بۆیان دانراوە بۆیــە ئەوانەی وشە دائەڕێژن پێویستە زمانەوان بن نەك تەنیا کوردی زان . هەر لەبەر ئەوەشە کە ئەبینین هەنــدێ لە کوردی زانەکانمان جاروبار ئەکەونە هــەڵەی زۆر سەختەوە . بــۆ وێنــە : جارێــکیان لە گۆڤارێــکی کوردی‌دا وشەی « کوردشوناسێ » و « زمانشوناسێ » و ... هتدم بەرچاو کەوت کە لەجیاتێ « کوردناسێ » و « زمان ناسێ » و ... هتد بەکار هێنرابوون . بێــگومان ئەمانەی ئەم وشانەیان داڕشتووە ، شارەزای زمانی فارسی و ئێرانەوانی نەبوون ، ئەگەنا هەستیان بەوە ئەکرد کە « شوناسێ » ، ـ کە بە فارسێ شناسی ئەنوسرێ ـ پاشکۆیەکە لە کار ( فعل )ی « شناختن »ی فارسی‌یەوە هاتووە کە بە مانای « نــاسین »ی کوردی دێ لەبەر ئەوە « شــناســی » ( شــناس ) ـکوردی نیــە ، بەڵــکو فارسی‌یــەکی یەکجار پەتی‌یە . هەر لەبەر ئەمەیە ئەگەر ویستمان وشەی « هویــة »ی عەرەبی بکەینە کوردی ، نابــێ بە « شوناســنامە » وەری بگێڕین ، بەڵــکو بە « ناسنامە » . هەندێ جار هەیە کوردی زانەکانمان وشەیەکی کوردێ زۆر رەسەن بە عەرەبێ ئەدەنە قەڵەم . بۆ وێنە : کاك محەمەدی مــەلاکەریم جارێــکیان نوســیبووی : وشــەی « قسـە »ی کــوردێ لە لە « قصه »ی عەرەبی‌یەوە هاتووە . ئەمە راست نیە . « قسە »ی کوردە=

بۆ ناساندنی کورد به ئه‌ڵمان دراون . سا ئیتر له ڕووی زمانه‌وانی و ئه‌ده‌بیاته‌وه بووبێ ، یا له باره‌ی مێژوو و سیاسه‌ته‌وه بووبێ ، یا له لایه‌ن

---

= له وشه‌یه‌کی ئێرانی کۆنه‌وه وه‌رگیراوه و په‌یوه‌ندی « قسه » به « قصه »ه‌وه ئه‌وه‌نده‌ی په‌یوه‌ندی « شێکسپیر »ه به « شێخ زوبێر »ه‌وه یا « فه‌له‌ستین » به « فه‌له‌ستێن »وه . فه‌له‌ستین بۆیه وای پێ ئه‌ڵێن چونکه گه‌لێك به‌ناوێکی نزیك له‌م ناوه‌وه چه‌ند سه‌ده‌یه‌ك پێش هاتنه جیهانی مه‌سیح له به‌ینی سووریا و یافادا ئه‌ژیا ، نه‌ك له‌به‌ر ئه‌وه‌ی فه‌له « گاور » له‌ده‌ست موسوڵمانیان سه‌ندووه‌ته‌وه .

هه‌روه‌ها له جۆیه‌کی‌تردا ده‌مه‌ته‌قێیه‌کی دوورودرێژم به‌رچاو که‌وت له‌سه‌ر وشه‌ی « نیپ » و « پیت » . ئایا کامیان ڕاستره ! ئه‌وانه‌ی لایه‌نگیری « نیپ » بوون ئه‌یان وت : « پیت » ڕاستره ، چونکه « نیپ » له « نیپۆس » ی یۆنانی‌یه‌وه نزیکه . هه‌رچی ئه‌وانی تریش بوون ، ئه‌یان وت ئه‌مه وانیه ، چونکه کورد نالێ : « نیپێکی نه‌خوێندووه » به‌ڵکو ئه‌ڵێ : « پیتێکی نه‌خوێندووه » . ڕاستی‌یه‌که‌ی ئه‌وه‌یه « نیپ » و « پیت » هه‌ردوکیان ڕاستن و هه‌ردوو لاش ڕاست ئه‌که‌ن . « نیپ » وشه‌یه‌کی کرمانجی سه‌رووه و « پیت »یش وشه‌یه‌کی کرمانجی خوارووه ( واتا سۆرانی‌یه ) . کامیان کۆنتره له باری ئێتیمۆلۆژی‌یه‌وه ئه‌وه باسێکی‌تره . به‌ڵام ئه‌وه هه‌یه ئه‌م وشه‌یه « جێ گۆڕکێی ده‌نگ »ی به سه‌ردا هاتووه ، که ئه‌مه‌ش ڕووداوێکه له هه‌موو زمانێکدا هه‌یه و له « زمانه‌وانی »دا « مێتاتێز »ی پێ ئه‌ڵێن[1] ( که له بنه‌ڕه‌ته‌وه وشه‌یه‌کی یۆنانی‌یه ) ، وێنه‌ی ئه‌مه‌ش له هه‌ردوو شێوه گه‌وره‌که‌ی زمانی کوردی‌دا هه‌یه . بۆ وێنه : سۆرانی‌یه‌کان ئه‌ڵێن : « له‌کن من Le kin min » که‌چی کرمانجه‌کان ئه‌ڵێن : « لنك من Linik min » واتا « نك Nik »و =

هونەر و کۆمەڵایەتی‌یەوە بتوبێ ، یا تەنانەت وتاری پڕ لە دەنگوباسی ، درۆ یا راستی ، ناو رۆژنامە بتوبێ . لە کاتێکدا کە وشەی « کوردەوانی » ، بە زۆری ، بەشێکی تایبەتی ئەو کارە ئەگرێتەوە ، کە ئەوەش « زمانەوانی » یە ، واتا Linguistik[٤] .

وا من لەم وتارەدا سەرنجێکی یەکجار سەرپێیی لە کوردناسی ئەڵمانیا ئەکرم و پێشکەش خوێنەرەوەکانی ئەم گۆڤارەی ئەکەم :

---

= « کن Kin » هەر یەك شتن ، بەلام دەنگەکان جێگۆڕکێیان پێ کراوە . هەروەها وشەی « خیز Xîz »ی کرمانجی و « زیخ Zîx »ی سۆرانی . یا وشەی « دوایی Duwayî » سۆرانی و « داوی Dawî » کرمانجی . لەمەش بترازێ هەر لە سۆرانی خۆیدا ئەم جێگۆڕکێی دەنگە هەیە وەك « دەروێش » لە کوردی سلەیمانی و « دەورێش » لە کوردی سنەدا . ئەوجا « تەنیا »ی سلەیمانی و « تەینا »ی گەرمیانی . هەروەها وشەی « سەڵوەت ئاوا » ـ کە گوندێکە لە نزیك سنەوە ـ لە « صولت آباد »وە هاتووە ، وەك چۆن وشەی « دەولەت » و « دەڵوەت » لە جیاتی یەکتری بەکار ئەهێنرێن . داخەکەم ئەم شوێنە شوێنی ئەوەنیە کە لەم باسانە بدوێم . ئەگەر هاتو رۆژێك دەستم پەرژا و باسێکم بەتایبەتی لەسەر « زمانەوانی » نوسی ، ئەوا دیارە لەلێ باسی لەم بابەتانە روون ئەکەمەوە .

(٤) هەر لە زمانی ئەڵمانیدا بۆ وشەی « Linguistik » واتا « زمانەوانی » وشەیەکی تریش بەکار ئەهێنرێ کە ئەوەش « Vergleichende Sprachenwissenschaft »ە ؛ واتا « زانستی بەراوردکاری زمانان » کە بە عەرەبی « علم اللغات المقارن » وە یا « فقه اللغات »ی بۆ ئەڵێن .

هەرچەندە ناوی کورد لە ناو ئەڵمانەکاندا بە زۆری لەم دە ساڵی دووایییەدا و بەهۆی گۆڕانی باری سیاستی کوردستانەوە کەوتووەتە سەر زمانی خەڵکی و چووەتە ناو گۆڤار و ڕۆژنامەکانیانەوە ؛ بەڵام هەوڵدان بۆ ناساندنی کورد بە ئەڵمان مێژوویەکی کۆنی هەیە لەم وڵاتەدا . دوور نیە ئەو « گەشتنامە Reisebuch » یەی کە لە ساڵی ١٤٧٣دا لە لایەن زێڕینگەری(٥) باڤارییەوە Johann Schiltberger (١٣٩٤ — ١٤٢٧) بڵاوکراوەتەوە ، کۆنترین سەرچاوەیەکی ئەڵمانی بێ کە ناوی کوردی تێدا هێنراوە .

هەروەها یەکێك لە سەرچاوە هەرە کۆنەکانی ئەڵمانیا و ئەورووپا کە لە بارەی کورد و وڵاتەکەیەوە ئەدوێن ، ڕاپۆرتێکە بە بۆنەی یەکێك لە جەنگەکانی دەوڵەتی عوسمانییەوە لە ژمارە (٣٨)ی گۆڤاری « Tùrchis-Estats - und Kriegs - Bericht » دا لەلایەن Thomas von Wiering ناوێکەوە لە هەمبورگ ، لە مانگی شوباتی ١٦٨٤ دا بڵاوکراوەتەوە .

لە سەدەی هەژدەهەمی فەڕەنگیدا چەند سەرچاوەیەکی ئەڵمانیمان بەرچاو ئەکەوێ کە لە بارەی کوردەوە ئەدوێن . یەکێك لەمانە باسی

(٥) وشەی « زێڕینگەر » کە خەڵکی موکریان بەکاری ئەهێنن ، بە لای منەوە ڕاسترە لە وشەی « زەرەنگەر » کە خەڵکی سلەیمانی بەکاری ئەهێنن چونکە وشەی « زێڕ » کوردییە ، نەك « زەڕ » . زەڕ ( زر ) وشەیەکی فارسییە بەرامبەر « زێڕ »ی کوردی .

گەشتێکە کە نیبۆر Niebuhr ناوێك کردوێەتی بۆ وڵاتی عەرەب و ئەو وڵاتانەی دەرودراوسێی وڵاتی عەرەبن. لە بەشی دووەمی ئەو گەشتنامەیەدا کە لە ١٧٦٦ دا دەرچووە ، نوسەر باسێکی لەسەر کوردیش نوسیوە[٦]. بێرگ Bergh ناوێکیش گەشتێکی کردووە بە کوردستان و ئەرمەنستان و گورجستان و ئەنەدۆڵ و عێراقدا و نامێلکەیەکی لەو بارەیەوە نوسیوەتەوە و لە ١٧٩٩دا بڵاوی کردۆتەوە . ئەم کتێبە گەلێ نیگاری جوانی تێدایە و دوو نەخشەشی لەگەڵە[٧] .

لە سەدەی نۆزدەهەمی فەرەنگیدا ژمارەیەکی زۆر سەرچاوەی بە زمانی ئەڵمانی نوسراومان لەسەر کورد و کوردستان دەست ئەکەوێ . راستیەکەی لەم سەدەیەدا نەك هەر ژمارەیەکی زۆر لە زانا ئەڵمانەکان لە بارەی زمان و ئەدەبیات و مێژوی کوردەوە خەریکی لێکۆڵینەوە بون و بەس ، بەڵکو گەلێك لەو ئەڵمانانەی رێیان کەوتووەتە کوردستان ، سا ئیتر بە ئیشوکاری تایبەتی خۆیان بوبێ ، یا بۆ پشکنینی زانستانە بوبێ ، یا بۆ گەشتوگێڵ بوبێ ، یا بۆ ئیشوکاری نهێنی و سیاسەتبازی دەوڵەتەکانیان بوبێ ، لەسەر کورد و وڵاتەکەی ،

(٦) Niebuhr : Reisebeschreibung nach Arabien und anderen umliegenden Laender, Teil II ( Die Kurden ), 1766 .

(٧) Bergh, J. : Anatoljen, Georgien, Armenien, Kurdistan, Irak und Al. Dschesira, 1799 .

کەمو زۆر ، چاك یا خراپ ، نوسینیان بۆ بەجێ هێشتووین .

ئەوەشمان نابێ لە بیربچێتەوە کە چیرۆك نوسی ئەڵمان کارل مای (١٨٤٢ — ١٩١٢) بە بڵاوکردنەوەی چیرۆکەکەی « بەناو کوردستانی کیۆیی » دا[٨] ناوی کورد و کوردستانی نەك هەر لە ناو ئەڵمانەکاندا ، بەڵکو لە هەمو ئەوروپادا و لە سنورێکی یەکجار فراواندا بڵاوکردەوە . ئێستەش کە بەهەر ئەڵمانێك بڵێیت « کوردم » و نەزانێ کورد چی‌یە و لە بارەی کوردەوە هیچی نەبیستبێ ، ئەگەر هاتو پێت وت : « ئەی کتێبەکەی کارل مایت نەخوێندۆتەوە ؟ » دەستبەجێ ناوی کوردستانی ئەکەوێتەوە بیر و دەست ئەکا بە پێکەنین .

ئەوی راستی بێ ئەم چیرۆکە هەرچەندە لە چیرۆکێکی ئەفسانەوی و باسی دێو و درنج ئەچێ ، چونکە نوسەرەکەی تەواوی ژیانی خۆی بۆ نوسینی ئەم جۆرە چیرۆکانە تەرخان کردووە ، بێجگە لەوەش خۆی نە لە ناو کورددا ژیاوە و نە کوردستانیشی بە چاو دیوە ، بەڵکو دەنگوباسەکانی تەنیا بە دەمی لە داستان گێڕەوەکانی ئەو سەردەمە بیستووە . لەبەر ئەوە هەندێ لە قسەکانی زیاتر لە قسەی هەڵەقومەڵەق ئەچن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گەلێ لایەنی باشی رەوشتوخو و جۆری بیرکردنەوەی کوردی پێشان داوە ، وەك

(٨) ناوی کتێبەکە بە ئەڵمانی « Durchs Wilde Kurdistan »ە . بەلام وشەی « wild » ی ئەڵمانی لێرەدا مانای « دڕندەو جانەوەر » نیە ، بەڵکو زیاتر « کێوی و رەمەکی » ئەگرێتەوە . واتا ولاتێکی خواکرد کە دەستی شارستانێتی نەیگەیشتووەتێ .

میوانداریێتی و هاوڕێیەتی و ئازایەتی و وەفاداریێتی . ئەگەرچی سـلی لەوەش نەکردۆتەوە کە کورد تێکزا بە جەردە و ڕێگر بداتە قەڵەم . هەر لەم چیرۆکەدا زۆرداری و نالەباری سـوڵتانەکانی عوسمانلیشی پیشان داوە و دەری خستووە کە کورد زۆ هەڵ ئەخەڵەتێن و بە قسـەی خۆش و زمانی لوس تەفرە ئەدرێن . جا ئەوەی ئەم چیرۆکەی زیاتر لە جاران خستە ناو ناوانەوە، ئەوەبو کە شەش حەوت ساڵێك لەمەوبەر کرا بەفلیم و لە سـینەماکانی ئەڵمانیا و ئەورووپا دا پێشان درا . خاوەن سینەماکانی کوردستانیش ئەتوانن ئەم فلیمە بکڕن و لە سینەماکانیاندا پێشانی بدەن . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە فلیمەکە پڕ بە پڕی ئەو چیرۆکە نیە کە لێوەی وەرگیراوە .

هەر لەم سـەدەیەدا فۆن هەمـەر Von Hammer مێژوونـوسی نەمسایی بەناوبانـگ و یەکێك لە نوسـەرانی مـێژوی دەوڵەتی عوسمـانلی ، زنجیرەیەك کتێبی لـە بارەی مێـژوی ئیمپراتۆرێتی عوسمانلییەوە دەرکرد . هەمەر لە دو تولێی ئەوباسـانەدا و لەبەر ڕۆشـنایی ئەو زانیارییانەی کە لە بەرگی سێیەمی گەشـتنامەی گەشتوەری تورك ئەولیا چەلەبی[9]دا هەیە ، لەساڵی ١٨١٤ دا باسێکی

(٩) مەبەست لە کتێبی « اولیا چلبی سیاحتنامەسـی »یە . ئەم کتێبـە لە ئەستەمۆڵ لە ساڵی ١٣١٤ـ١٣١٨ھ واتا لە ١٨٩٦ـ١٩٠٠ی فەڕەنگی ، لە « دە » بەرگدا چاپکراوە .

لەسەر زمانی کوردی و شێوە جۆر جۆرەکانی نوسیوە[10] . جا ئەم باسە ئەگەر لە باری زانستییەوە ئەوەندە گرنگ نەبێ ، ئەوا بێگومان لە باری مێژوویییەوە نرخێکی زۆری هەیە .

نەمسایییەکی کە ناوی Von Klaproth بووە ، هاتووە ژمارەیەکی زۆر وشەی کوردی کۆکردۆتەوە و لەگەڵ وشەی فارسی و زمانە نزیکەکانی تردا بەراوردی کردوون و لەسەر ئەوە وتارێکی لە ١٨٨٨ دا بڵاوکردۆتەوە[11] .

لە سەدەی رابوردوودا پەیوەندی سیاسی و بازرگانی دەوڵەتی عوسمانلی بە دەوڵەتی پروسیای ئەڵمانەوە زۆر بەهێز بو . هەر لەبەر ئەوە گەلێك ئەفسەری ئەڵمان لەم دەورەدا لە سوپای عوسمانلیدا خزمەتیان کردووە . یەکێك لەوانە هێلموت فۆن مۆلتکە Hellmuth Von Moltke بووە کە لە دواییدا بووە بە فیلد مارشاڵی سوپای ئەڵمان . مۆڵتکە بە هۆی ئەوەوە کە لە لەشکری عوسمانلیدا ئەفسەر بووە ، ناچار بووە دژی شۆرشگێرە کوردەکانی ئەو دەمە

(١٠) Von Hammer, Joseph, Freiherr : Über die kurdische Sprache und ihre Mundarten aus dem III. Bande der Reisebeschreibungen Evlia's in "Fundgruben des Orients," Band IV, S. 246 - 247, Wien, 1814.

(١١) Von Klaproth, Julius - Heinrich, Kurdisches Woerterverzeichnis mit dem persischen und anderen verwandten Sprachen verglichen, in Fundgruben des Orients Wien 1818, t. VI, S. 349 - 358.

بجەنگێ ، لەو نامانەدا کە مۆڵتکە لە بارەی وەزعی تورکیاوە لە ١٨٣٦ — ١٨٣٩ بۆ ژنەکەی نووسیون[١٢] ، ئەوەی لە بیر نەچووەتەوە کە باسی ئازایەتی و دلێری و سوارچاکێتی و جەنگاوەریێ کورد بکا . ئەو باسەی کە لەسەر کورد و وڵاتەکەی نووسیویەتی[١٣] بە تەواوی دەری ئەخا کە فیلد مارشاڵ مۆڵتکە تا چ ئەندازەیەك شارەزای رەوشتوخوێ و جۆری بیرکردنەوەی کورد بووە و تا چ رادەیەك دڵێ بە گەلی کورددا چووە . مۆڵتکە لە یەکێك لە نامەکانیدا کە لە تورکیاوە نووسیونی لێوەکرۆژێی لەوە کردووە کە کوردەکان یەك ناگرن و کەسیان پشتی ئەوی تریان ناگرێ . خۆ ئەگەر بێتو یەك بگرن و لە هەرکەس بۆخۆیی دوَر بکەونەوە ، ئەوا دوژمن لە بەریاندا خۆی ناگرێ . مۆڵتکە ئەڵێ :

« هەر یەکێ لەم ( سەرۆك هۆزانە ) تەنیا لەسەر هۆزەکەی خۆی ئەکردەوە . بێهێزێ ئەم گەلە ئا لەمە دایە . خۆ ئەگەر یەکیان بگرتایە ژێر نەئەکەوتن . بەڵام کەسیان نەهاتنە سەر ئەوەی لەسەر ئەوی تریان بکەنەوە . لە کاتێکدا کە رەشید پاشا و حافز پاشا

(١٢) Von Moltke, Hellmuth K. B. , Graf Feldmarschall : Briefe über Zustaende und Begebenheiten in der türkei aus den Jahren 1836 - 1839, Berlin, 1841

(١٣) Von Moltke, Hellmuth K.B., Graf Feldmarschall: Das Land und Volk der Kurden, in vermischte Schriften zur orientalischen Frage, Berlin, 1892, Band II, S. 288 - 298.

ناوچەیەکیان لرف ئەدا ، ئەوانی تر بەوە دڵی خۆیان خۆش ئەکرد کە ئاگرە سوورە لە خۆیان دوورە . تا سەرە ئەهاتە سەر ئەوانیش »[١٤] .

لە سەدەی رابوردوودا ژمارەیەکی زۆر لە گەشتوەرانی ئەوروپایی و ئەمریکایی و لە ناو ئەوانەدا ژمارەیەکی زۆر ئەڵمان روویان کردە کوردستان . ئەم گەشتوەرانە زۆر یا کەم ، چاك یا خراپ ، لە بارەی گەشتەکانی خۆیانەوە شتیان نووسیوە . بۆ وێنە :

Sandrecfhi ناوێك لە نیوەی دووەمی سەدەی رابوردوودا چووتە موسڵ و بە کوردستاندا گەڕاوە هەتا گەیشتووەتە ورمێ و پاش گەڕانەوەی باسێکی ئەم گەشتەی خۆی نووسیوە[١٥] .

گەشتوەرێکی ئەڵمانی کە ناوی Blau ە لە نیوەی دووەمی سەدەی رابوردوودا گەشتێکی بە کوردستانی ئێران و تورکیادا کردووە و لە (١٨٥٨ ـ ١٨٦٢) چەند بەرهەمێکی خۆی بڵاوکردۆتەوە . بلاو نامیلکەیەکی لە بارەی هۆزە کوردەکانی ژوورووی رۆژهەڵاتی کوردستانەوە نووسیوە[١٦] . هەروەها لە « گۆڤاری کۆمەڵەی

(١٤) Von Moltke, Hellmuth K. B., Graf Feldmarschall, Briefe... etc, Ibid, Bd. II, S 295.

(١٥) Sandreczki : Reise nach Mosul und durch Kurdistan nach Urumia, Stuttgart, 1857.

(١٦) Blan, O. : Die Stämme des nordöstlichen Kurdistan, Leipzig, 1858 - 1862.

رۆژهەلاتناسەکانی ئەلمان « Zdmg » دا دوَ وتاری لە بارەی گەشتێکی خۆیەوە نوسیوە کە لە زەریاچـەی ورمێ وە تا زەریاچەی وان کردوَیەتی (١٧) . دیسان لە بارەی ئەو گەشـتانەوە کە بە رۆژهەلاتدا کردوَنی وتارێکی لە « گۆڤـاری جوگرافیـای گشـتی » دا بلاوکردۆتەوە (١٨) .

Strecker ناوێك چووە بـۆ ناوچەی زێی گەورە و لەویانەوە تـاکوتور بە گەشت گەڕاوە و لەو بارەیەوە کتێبێکی نوسیوە کە بە زۆری باسی ولاتی کورد و رەوشـتوخوَی گەلی کوردە (١٩) .

ڤامبـەری Vambery ناوێکیش چووە بۆ ئێرانـ و لە بارەی ئەم گەشـتەوە لە ١٨٦٧دا کتێبێکی دەرکردووە کە باسی کوردیشی کرتووەتەوە (٢٠) .

بێـکەر Becher ناوێك دوَ وتاری لە بارەی ئـەو گەشتانەی

(١٧) Blan, O. : Vom Urmia - See nach dem Wan - See, in ZDMG, 1858, XII und 1862, XVII.

(١٨) Blan, O. : Reisen in Orient, in Zeitschrift für allgemeine Erdkunde, Neue Folge, vol. 10, Berlin, 1861.

(١٩) Strecker : Notizen Über das Obere - Zab - Ala Gebiet und Routiers von wan nach Kotur, Petermanns Mitteilungen, 1863.

(٢٠) Vambery, H. : Meine Wanderungen und Erlebnisse in Persien, Dest, 1867.

خۆیەوە نووسیوە کە لە بەسرەوە تا مێزۆپۆتامیا و موسڵ و لە موسڵەوە تا حەلەب بە کاروان بە ناو کوردەکاندا کردوویەتی . بیر و سەرنجی خۆی بەرامبەر ژیانی ئەوسای کورد نیشان داوە(٢١) .

Pachstein ناوێك سەفەرێکی کردووە بە کوردستاندا و لەسەر ئەوە کتێبێکی لە ساڵی ١٨٨٣ دا لە بەرلین بڵاوکردۆتەوە(٢٢) .

ڤونش Wunsch ناوێکی نەمسەیی گەشتێکی بە کوردستان و ئەرمەنستاندا کردووە و سەرنجی خۆی لە بارەی ئەم دوو وڵات و دوو گەلەوە لە دوو کتێبدا بڵاوکردۆتەوە : یەکێکیان بەتایبەتی لەسەر کوردستانە و لە ١٨٨٢ دا دەرچووە(٢٣) و ئەوی تریان لەسەر کوردستان و ئەرمەنستانە و ساڵێك دوای یەکەم دەرچووە(٢٤) .

لە دەمە دەمی کۆتایی سەدەی رابوردوودا Belck ناوێك بۆ لێکۆڵینەوە چووەتە کوردستان و چەند وڵاتێکی تری وەك

(٢١) Becke r,L. : Reise von Basra durch Mesopotamien nach Mosul, in Globus, XVII, S. 121 - 126, Braunschweig, 1870. Becker, L. Eine Karavanreise von Mosul nach Alepo, in Globus, XXIII, S. 172 - 184, Braunschweig, 1873.

(٢٢) Pachstcein : Reise in Kurdistan, Berlin, 1883.

(٢٣) Wunsch : Reise in Kurdistan, Wien, 1883

(٢٤) Wunsch : Meine Reise in Armenicn und Kurdistan, Wien, 1884.

قەفقاس و ئەرمەنستان . پاش گەڕانەوەی دوَ وتاری لەســەر ئەو گەشت و لێکۆڵینەوەیەی خۆی نوَسیوە[٢٥] .

بورخارد ناوێك چووە بۆ کوردســتان و شتێــکی لەو بارەیەوە بڵاوکردۆتەوە . پرۆفیسۆری ئیسلامەوانی ئەدوارد سەخاو لە بارەی ئەم گەشتەی بورخاردەوە کۆمەنتارێکی نوَسیوە کە لە بەرلین لە ١٨٩٦ دا بڵاوکراوەتەوە[٢٦] .

لە ناو ئەم گەشتنامانەدا کە گەشتوەرە ئەلمانەکان لە سەدەی رابوردوَدا نوَسیویانە ـ هـــەروەك گەشتنامەی هەندێ گەشتوەری ئەوروَپایی‌ی تر ـ چەند نامیلکەیەك ئەبینێن کە خاوەنەکانیان بە گیانێکی دوژمنــانەوە بڵاویان‌کردۆتەوە . ئەوانە پێش ئەوەی بچنە کوردستان هەندێ باسی خراپیان لە بارەی کوردەوە بیستووە و کە چوَنەتە ئەوێ تەنیا بۆ شتی خراپ گەڕاون . خۆ ئەگەر سەد باشە و میوانداریێتی و روَی خۆش و دڵپاکی‌یان دیبێ ،کاری تێ‌نەکردوَن و بەســەر ئـەو هەموَ چاکی‌یەدا بازدیان داوە و بە دوای تەنیا خراپەیەکدا گەڕاون . ئەمجا گوێ‌یان نەداوەتە ئەوەی ئەگەر لە کوردســتاندا جاروبار جەردەیەتی و رێ‌گرتی و پیــاوخراپی‌یەك بوَبێ ، ئەوە گوناهی کورد

---

(٢٥) Belck , M. : Untersuchungen und Reisen in Transkaukasien, Hoch - Armenien und Kurdistan, in Globus, LXII und LXIV., Braunschweig, 1893.

(٢٦) Sachau , Eduard : Über die Reise von Herrn Burchardt nach Kurdistan, Berlin , 1896 .

نیە ، بەڵکو گوناهی شێوەی ناقۆلایی بەڕێوەبردنی کاروبارە لە لایەن عوسمـــانلی و قاجارییەکانەوە کە ئاغای کوردســـتان بوون . ئەوەی شـایانی باسە ئەوەیە کوشتنی پرۆفیسۆرێـکی ئەڵمان کە ناوی Schultz بووە لە ١٨٣٠دا و گوایە لەکاتی خۆیدا بۆ پشکنینی زانستانە چووە بۆ کوردستان ، هەروەها لە ناوبردنی جۆلەکەیەکی زێڕ فرۆش بە دەستی کابرایەکی دەرەبەگی کورد کە کاربەدەستی عوسمانلی بووە[٢٧] یەکجار بیری هەندێ لەو گەشتوەرە ئەوروپاییانەی تێکداوە کە بەدوای بنچینەی کاردا نەگەڕاون ، بەڵـکو هـــەر لە خۆیانەوە و بە هـــەوەس فەرمانیان داوە بەســـەر کورددا و کوردیان بە پیاوکوژ و جەردە و ڕێگر و خوێن ڕێژ داوەتە قەڵەم . لێرەدا پێویستە ناوی چەند دانەیەك کتێبی لەم بابەتە ببەین :

فاولەر Fowler ناوێك کە گوایە سێ ساڵێك لە ناوچـــەی فارسدا ژیاوە و گەشتێـکی کوردستانیشی کردووە ، دوو بەرگ کتێبی لەسەر ئەم گەشتەی دەرکردووە[٢٨] . بێ سڵ کردنەوە و دڵ لە دڵدان کوردی بە پیاوکوژ و دڵڕەق و خوێـن ڕێژ داوەتە قەڵەم . موریتز

(٢٧) Millingen, Major Frederich : the wild life among the Koords, London, 1870, p. 234 vgl. anch Fraser, J. Baillie, ESQ : Travels in Koordistan, Mesopotamien ... etc. vol. 1, London 1840 p. 62

(٢٨) Fowler, s. : Drei Jahre in Persien Reiseabenteuer in Kurdistan, 2 Baende, Aachen, 1842.

ڤاگنـەر Moritz Wagner ناوێك گەشتێـكی بە كوردستان و ئەرمەنستان و ولاتی فارســـدا كردووە و پاش گەڕانەوەی دوو كتێبی دەركردووە ، یەكێـكیان لە بارەی ناوچەی ئارارات و ئەرمەنستانی ژوروووەوەیە[29] و ئەوی تریشیان لە بارەی ناوچەی فارس و ولاتی كوردەوەیە[30] . ڤاگنـەر لە نوسینەكانی‌دا بەتایبـــەتی لە بەرگی دووەمدا لەگەلی لاوە ، بێ‌پەروا ، كوردی بە جەردە و خوێن ڕێژ و پیاوكوژ داوەتە قەلەم . ســـەرچاوەیەكی تری لەم بابەتە كتێبێـكە لە لایەن بارۆن فۆن نۆلدە Von Nolde ناوێـكەوە نوسراوە[31] . بەلام لام وایە ئەم نۆلدەیە كوردســتانی یا بە باشی نەدیوە و تەنیا لامسەرلایی پێیدا تێپەڕیوە ، یا ئەوەتە شتەكانی لە خەلـكی تر بیستووە و كوردستانی بە چاوی خۆی نەدیوە . ئەمیش گەلێك ناو و ناتۆرەی خراپی بە كوردەوە ناوە . وێنەی ئەم كتێبانە بە زمانە ئەوروپاییەكانی تریش هەن[32] . ڕاستی‌یەكەی ئەوەیە چونـكە كورد ئەو دەمە كەسی

---

(29) Wagner, Dr. Moritz : Reise nach dem Ararat und hoch - Armenien, Stuttgart und Tuebingen, 1848.

(30) Wagner, Dr. Moritz : Reise nach Persien und dem Lande der Kurden, Leipzig, 1852.

(31) Von Nolde, Baron Eduard : Reise nach Innerarabien, Kurdistan und Armenien, Braunschweig, 1895.

(32) ـ بۆ وێنە تەماشای ئەم سەرچاوانەی خوارەوە بكە :ـ

= Millingen, Major Frederich : the wild life among

وای نەبووە بەربەرەکانێی ئەو درۆ و دەلەسانە بکاو تەنیا لایەك کە کوردستانی پێشکەش ئەوروپایی‌یەکان کردبێ هەر عوسمانلی و قاجاری‌یەکان خۆیان بوون ، دیارە ئەو داگیرکەرانەی کوردستانیش دەستێکی درێژیان بووە لە چەسپاندنی ئەو تۆمەت و بۆختانانەدا بەسەر گەلی کورددا . بێگومان هەمو ئەوروپایی‌یەکی تێگەشتو ئەزانێ ،کە لە هەمو ولاتێکی ئەم سەر زەمینەدا ، دزی و جەردەیی و پیاوکوژی بووە و ئەبێ ، سا ئیتر زۆر یا کەم . تەنانەت لەم ئەڵمانیایەدا لە ساڵی ۱۹۷۲ دا رۆژ نیە چەند کەسێك نەکوژرێ ، یا بانقێك نەبڕرێ یا پەلاماری یەکێك نەدرێ ، یا ... ، یا ... هتد . هیچ نەتەوەیەکیش بەوە نابێتە جەردە و پیاوکوژ . ئێمەی کوردیش زۆر چاك ئەزانین ، هەر کاتێ داوای فشە مافێکی خۆمانمان کردبێ ، هەزار ناو و ناتۆرەی سەیر سەیرمان لێ نراوە . لەبەر ئەوە ئەوەندە خۆشە بوین ، کە ئەم جۆرە قسانە کارمان تێ نەکەن . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ بێ‌وچان خەریك بین و بیروڕای گشتی جیهان بەرامبەر خۆمان و مەسەلەکەمان بە جارێ رۆشن بکەینەوە . ئەبێ ئەوەشمان لە بیر نەچێ ئەو ئەڵمان و ئەوروپایی‌یانەی کە بەزۆری ئەم بەیتو بالۆرانەیان خستۆتە دوای کورد ، یا ناحۆری دەوڵەتی عوسمانلی ، واتا کاربەدەستی دەوڵەتی تورك بون . یا کە هاتونەتە کوردستان لە لایەن تورکەکان و قاجاری‌یەکانەوە گوێیان بە خراپی کورد

---

the Koords, London 1870. Percy, Earl, M. P. : = Highlands of Asiatic Turkey, London 1901

ئاخنراوە. بۆ وێنە : فۆن هەممەر — وەك لەمەوپێش ناومان برد — مێژوونووسێکی نەمسایی بووە[٣٣] و یەکێك بووە لە وانەی کە زۆر لە وڵاتی عوسمانلیدا ژیاوە و بۆ تورك کاری کردووە. ئەم هەممەرە زنجیرەیەك کتێبی چەنـد هەزار لاپەڕەیی لە بارەی مێژووی دەوڵەتی عوسمـانلییەوە دەرکردووە . لە نووسینەکانیدا گەلێ حوکمی ناڕەوای داوە بەسـەر کورددا . چونـکە سەرچاوەی زانیارییەکانی (هەممەر) ئەدەبیاتی تورك و سیاسەتی حکوومەتی عوسمانلی بووە[٣٤] . هەروەها فردریك میلینـگنی ئینـگلیز Frederich Millingen کە کورد بـە «خوێنخۆر» ئەداتە قەڵەم[٣٥] کاربەدەستێکی دەوڵەتی عوسمانلی بووە .

زانای ڕووس خالفین Халфин لەم بارەیەوە ئەڵێ :

« ژمارەیەکی زۆر لە سـەرچاوە ڕۆژئاواییەکان کە لە بارەی کوردستانی سـەدەی نۆزدەیەمەوە نووسراونەتەوە ، کورد بە « دزو جەردە » ناو ئەبەن . ئەم جۆرە ناو ناتۆرانە وە نەبێ لە هەمو کاتێکدا لە ڕاستییەوە نزیك بن[٣٦] » .

(٣٣) ـ تەماشای ژمارە (١٠)ی ئەم پەراوێزە بکە .

(٣٤) von Hammer, Joseph, Freiherr : Geschichte des Osmanischen Reiches .

(٣٥) Millingen, Frederich : Wild life among the Koords, London, 1870

(٣٦) Халфин Н.А.:"Борьба за Курдистан", Москва, 1963, стр.22.

ئەوەی شایانی باس و دڵخۆشیانە ئەوەیە ئەم باسە نازانستانە و دەستکرد و درۆ و دەلەسانە و ئەم دەنگوباس و هەواڵانەی کە بۆ کورد هەڵبەسترابوون لە لایەن هەندێ گەشتوەر و خۆ بە زانا زانەوە، کاری لە زانا راستەقینەکانی ئەڵمانیا نەکرد و هەر لە سەدەی رابوردوودا هەندێ لە زاناکانی ئەڵمان و ئەوروپا خۆیان زۆر بە زمان و ئەدەبیات و مێژووی کوردەوە خەریک کرد. بۆ وێنە :

فردریك فۆن بۆدن شتێت Friedlich Von Bodenstedt لە ساڵی ۱۸٤۹ دا باسێکی زانستانەی لەسەر گۆرانی و ئاوازی کوردی بڵاوکردەوە[۳۷] .

لە ساڵی ۱۸۵۷ — ۱۸۵۸ سێ بەرگ کتێبی زانای بەناوبانگی رووس Peter Lerch کرا بە ئەڵمانی . ئەمانە بریتی بوون لە لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی کورد و هۆزە کلدانیەکانی ئێرانەوە[۳۸] .

فردریك میوللەر F. Mueller ی نەمسایی سێ بەرهەمی لە بارەی زمانی کوردییەوە پێشکەش کرد . یەکێکیان باسێکە لەسەر

---

(۳۷) Von Bodenstedt, Friedrich Martin : Lieder aus Kurdistan, in Tausend und ein Tag im Orient, Berlin, 1849 - 1850

(۳۸) Lerch, Peter Ivanovitsch : Forschungen uebr die Kurden und Inanisehen Nordchaldaeu, 3 Bände, St. - Petersbonrg, 1857 - 1858 .

فەرهەنگۆکی کوردی و سریانی[٣٩] و ئەوی تریان باسێکە لەسەر شێوەی زازا[٤٠] و ئەوی تریشیان لەسەر شێوەی کرمانجی باکور[٤١] . باسی یەکەمیان لە ١٨٦٣ دا و هی دووەمیان لە ١٨٦٤ دا و هی سێیەمیان لە ١٨٩٤ دا و هەرسێکیان لە ڤیەننا بڵاوکرانەوە .

بارب Barbی نەمسایی ، ئەندامی ئەکادیمی زانستی لە ڤیەننا ، لە ماوەی ١٨٥٨ — ١٨٥٩ چەند راپۆرتێکی زانستانەی لە بارەی « شەرەفنامە »ی شەرەفخانی بتلیسی‌یەوە بڵاوکردەوە[٤٢] .

شلێفل Schieafel کە زانایەکی ئێتنۆلۆگ بووە باسێکی لەسەر کوردستان لە بارەی ئێتنۆگرافی‌یەوە نوسیوەتەوە[٤٣] .

---

(٣٩) Mueller, Friedrich : Kurdisches und Syrsches Woerterzeichniss, Wien, 1863.

(٤٠) Mueller, Friedrich : Zaza-Dialekt der Kurdensmache, Wien, 1864.

(٤١) Mueller, Friedrich : Kurmangi - dialect der Kurdensmache, Wien, 1894.

(٤٢) Barb, H. A. Berichte ueber die Kurdenchronik Tarich el-Akrad von Scheref Nameh, sitzungsbericht d. Wiener Akademie phil - list - kl., x, 1853; xii, 1856, xxviii, 1858; xxx, 1859; xxxii, 1859

(٤٣) Schläfel : Beiträge zur Ethnographie Kurdistans und Mesopotamiens, Petermanns Mitteilungen, 1863 .

پرۆفیسۆر فەردیناند یوستی F. Justi له ۲۹ لاپەڕەدا باسێکی لەسەر هەندێك لە دەنگەکانی زمانی کوردی نوسیوەتەوە[٤٤] . ئەم باسە کە لەبەر رۆشنایی بەراورد کردنێکی زمانەوانییانەی کوردی لەگەڵ زمانە ئێرانی و هیندۆ ئێرانییەکان هێنراوەتە بەرهەم ، نەك بۆ کاتی خۆی (واتا ساڵی ۱۸۷۳) ، بەڵکو تەنانەت بۆ ئەمڕۆش نرخێکی زانستانەی هەیە و هەڵ ئەگرێ وەربگێڕرێتە سەر زمانی کوردی . هەر ئەم زانایە لەسەر رێزمانی کوردی نامیلکەیەکی بەئەڵمانی نوسیوەتەوە و له ۱۸۸۰ دا له شاری پەتریسبۆرگ چاپی کردووە[٤٥] .

هۆتوم شیندلەر Hoetum - Schindler له بارەی گەنجینەی وشەی کوردییەوە ، ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی بە دوو بەرگ پێشکەش کردووە[٤٦] . ئەم زانایە وشەی گەلێ شێوەی کوردی ، بەتایبەتی موکری ، کۆکردۆتەوە . هۆتوم لەبەر رۆشنایی ئەو رێزمانەی کە Justi له ۱۸۸۰ دا بڵاوی کردۆتەوە[٤٧] هەندێ لایەنی

---

(٤٤) Justi, Ferdinand : ueber die kurdischen Spiranten, Marburg, 1873

(٤٥) Justi , Ferdinand : Kurdische Grammatik , Saint. Petersbourg, 1880 .

(٤٦) Houtum - Schindler : Beiträge zum kurdischen wortschatz, Leipzig, 1884 und 1888 in ZDMG, BD. 38, S. 43 - 116 und B D. 42, S. 73 - 79 .

(٤٧) ـ تەماشای ژمارە (٤٥) ی ئەم پەراوێزە بکە .

دەستوری زمانی کوردیی ڕۆشنترکردووەتەوە .

زانای سویسرەیی ئەلبەرت سـوۆسین ( ١٨٤٤ — ١٨٩٩ ) کە پرۆفیسوری بەشی ئیسـلامەوانی بووە لە زانستـگای لایپزیك ، بە هاوبەشتی Egen Perin دوو بەرگ کتێبی دەرکرد بە ناوی کەشکۆلی کوردییەوە[٤٨] . لێرەدا گەلێ چیرۆکی فۆلـکلۆری و داسـتانی کوردیی بە وەرگێڕانی ئەڵمانییەوە بڵاوکردەوە .

زانای ئەنترۆپۆلوجیسـت Von Luschan باسێـکی لەسـەر بەڕەیەکی لە مـوی قژی ئادەمیزاد دروسـت کراو لە ١٨٨٨ دا بڵاوکردەوە[٤٩] . هـەر ئەم زانایە لە ١٨٩٠ دا باسێـکی لەسەر گـەلی کورد بە وێنـەوە لە گۆڤاری Globus دا نووسیی[٥٠] ، هـەروەها لە بەرهەمێـکی تریدا کە لە بارەی زمان و رەگـەزەوە نووسیویەتی ، باسی کوردی کردووە[٥١] .

---

(٤٨) Albert Socin und Prym Eugen: Kurdische Sammlungen, 4 Bändc, St. - Petersbourg, 1887 - 1890

(٤٩) Luschan, F. von : Zwei mit Meuschenbaaren besetzte Teppiche, in Zeitschrift fuer Ethnologie, Berlin, 1888, Band LVII .

(٥٠) Luschan, F. von : Das Volk der Kurden mit Bildern, in Globus, LVII, Braunschweig, 1890 .

(٥١) Luschan, F. von : Voelker, kassen, sprachen, Berlin, 1922 .

Ceyp لە رۆژنامەی Allgemeiner Zeitung دا وتارێـکی لەسەر ئایینی یەزیدییەکان بڵاوکردۆتەوە[٥٢] .

هەروەها بوتیـکا Bntypa ناوێـکی ئەمسایی کتێبێکی لەسـەر ناوچەی دەرسیمی کوردستانی تورکیا بڵاوکردووەتەوە[٥٣] .

Von Steinin یش وتارێـکی لەسـەر کوردەکانی ناوچەی یەرێڤان نوسیوە[٥٤] . هەر لەم ماوەیەدا Roediger و Pott چەند وتارێـکیان لەسـەر « لێـکۆڵینـەوە لە کورد و زمانەکەی » لە گۆڤاری رۆژهەڵاتناسـەکانی ئەڵمانـدا بڵاوکردەوە[٥٥] . زانای زمانەوانی زۆر بەناوبانـگی ئەڵمـان و ئەورووپا پرۆفیسـۆر تیۆدۆر نوێلدەکە Theodor Noeldke ( ١٨٣٦ — ١٩٣٠ ) باسێـکی زۆر گرنـگی لەسەر پەیوەندیی وشەی کاردو Kardu بە کورد Kurd ەوە نوسـیوە لە کتێبێکدا کە پێشکەش بـە زانای ئەڵمانی کۆچکردو Kiepert

(٥٢) Ceyp, A. J. : Die Jezidies, in Allg. Zeitung, Beilage, 1890 .

(٥٣) Butyka, d. : Das ehemalige wilayet Delsim, wien, 1892.

(٥٤) Von Steinin, P. : Die Kurden des Gouvernements Eriwan, in Globus, Braunschweig, 1896, Band LXX, S. 221 - 226 .

(٥٥) Roediger und Pott : Kurdische Studien, in Zeitschrift fuer Kunde des Morgenlandes, 1. III bis V III

کراوە ، لە ١٨٩٨دا لە بەرلین بڵاوی کردووەتەوە[٥٦] . ئەفسەرێکی سوپای ئەڵمان لەسەر شاری سلەیمانی (کە سنجەقێکی عوسمانلی بووە) ، هەروەها وڵاتی ئێرانی دراوسێی سلەیمانی ، باسێکی جوگرافیایی و مێژوویی لە باری سەربازیی سوپاییەوە نوسیوەتەوە . ئەم باسە نەخشەیەکی لەگەڵە کە وەزعی شاری سلەیمانی بەتایبەتی لە دەورانی ئاشووری و بابلییەکاندا ئەخاتە بەرچاو[٥٧] . (شترێك Strech) ناوێك وتارێکی لە گۆڤاری «ئاشورەوانی»دا بڵاوکردووەتەوە و هەوڵی ئەوەی داوە وڵاتی کوردستان و ئەرمەنستان و ڕۆژئاوای ئێرانی زەمانی بابل و ئاشور ، لەبەر ڕۆشنایی ئەو سەرچاوە بابلی و ئاشوورییانەی کە بە خەتی بزماری نوسراون بخاتە بەرچاو[٥٨] .

---

(٥٦) Noeldke, Theodor : Kardù und Kurden, in Festschrift fuer H. Kiepert, s. 71 - 81, Berlin, 1898.

(٥٧) Billerbeck, A., Oberst A. D. : das Sandschak Suleimania und dessen. persische Nachbarlandschaften zur babylonischen und assyrischen Zeit, Leipzig, 1898.

(٥٨) Strech M. : Das Gebiet der. heutigen Landschaften Armenien, Kurdistan und Westpersien noch babylonisch - assyrischen Keilschriften, in Zeitschrift fuer assyriologie, XIII, XIV und XV, 1910.

لە ساڵانی دوایی سەدەی رابوردووەوە هەتا ئەگاتە جەنگی جیهانی یەکەم ، چەنـــد زانایەکی ناوداری ئەڵمان وەك پرۆفیسۆر ئۆسکارمان و پرۆفیسۆر فۆن لـکۆك و پرۆفیسۆر ئەدوارد سەخاو و پرۆفیسۆر ئاوگوست پێتەرمان و پرۆفیسۆر مارتین هارتمان روویان کردە کوردستان . ئەمانە پاش گەڕانەوەیان ، نەك هـەر تەنیا باسی زۆر زانستانە و بەکەڵکیان لەسەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی بڵاوکردەوە ، بەڵکو ژمارەیەك دەستنووسی کوردی و سەر بە کوردیشیان لە کوردستان و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کۆکردەوە و هێنایەوە بۆ ئەڵمانیا . هەندێ لەو دەستنووسانە ئێستا لە کوردستان نەماون ، کەچی لە نامەخانەکانی Belin, Tubingen, Marburgدا چنگ ئەکەون . لەم رووەوە ئەمانە خزمەتێـکی باشی کولتوری گەلی کوردیان کردووە . ئێســـتە لەم نامەخانانەدا ٨٩ دەستنووسی کوردی هەن ، کە بەشی زۆریان هۆنراوەی دڵداری و پاڵەوانێتی و ئایینین . تێـکستی ئەم نووسراوانە بە شێوەی گۆرانی و کرمانجی و سـلەیمانیین و تەنیا پێنج دانەیان نەبێ کە تێـکستەکە هەموی یا بەشێـکی بە خەتی ئاشوری نووسراونەتەوە ، ئەوانی کەی گشتی بە خەتی شکستەی فارسی نووسراونەتەوە[٥٩]. جا بۆ

(٥٩) دوکتۆر کەمال فوئاد کاتی خۆی ئـەم نووسراوانەی گرنە لای خۆی و کەوتە پشکنینیان و لە ئەنجامدا باسێکی بە زمانی ئەڵمانی لەســەر نووسـین بە ناوی « دەسـتنووسی کوردی Kurdische Hand Schliften » یەوە ، کە لە ساڵی ١٩٧٠دا لە شێوەی دوکتۆرنامەیەکدا پێشکەش بە زانستگای هۆمبۆڵتی بەرلینی رۆژهەڵاتی کرد . ئەم نووسراوەی دوکتۆر=

ئەوەی سەر لە خوێنەرەوە تێك نەچێ ، ئەمەوێ بڵێم زوربەی زۆری ئەم نوسراوانە یەکێ لە چەند لاپەڕەیەك تێپەڕ نابێ . هەندێکیشیان تەنیا یەك لاپەڕەن .

= کەمال فوئاد .بڕێتیە لە باسێکی کورتی ( ۹۲ ) دەستنوسی کوردی و سەرەتایەکی کورت لە بارەی زمان و ئەدەبیاتی کوردیەوە . هەروەها کورتە مێژوێەکی ژیانی زۆربەی نوسەر و هۆنەرە ناسراوەکانی کورد لە کۆنەوە هەتا ئێستا و لە هەموو ناوچەکانی کوردستاندا . ئەم کتێبە لە لایەن Franz Steiner Verlag ەوە لە شاری Wiesbaden لە ۱۹۷۰ دا لە چاپ دراوە .

ئەم بەرهەمەی کاك کەمال کەڵکێکی باشی هەیە بۆ ئەو بێگانانەی ئەیانەوێ ئاشنایەتی لەگەڵ زمان و ئەدەبیاتی کوردیدا پەیدا بکەن . بەلام یەکێك لەو رەخنانەی کە لەم بەرهەمە بگیرێ ، بەلای منەوە ئەوەیە کە نوسەرەکەی « لوڕ » ی بە کورد نەداوەتە قەڵەم . دیارە ئەم بیروڕایە لە سەرەتاوە لە ئۆسکارمانەوە داکەوتووە و هەر لەویشەوە گەلێك لە زمانەوان و مێژونوسەکانی ئەوروپا و تەنانەت رۆژهەلاتیش ، بێ لێکۆڵینەوە و زەحمەت دانە بەرخۆ ، هاتونەتە سەر ئەو باوەڕە کە ( لوڕ ) کورد نەبن . بەلای منەوە لوڕەکان کوردن و شێوەی لوڕی راستەقینە شێوەیەکی کوردیە . تەنیا ئەوە هەیە تەئسیری زمانی پەهلەوی ( واتا فارسی ناوەڕاست ) لەسەر زاراوەکانی شێوەی لوڕی زۆرترە وەك لە شێوەکانی تری کوردی ، کە ئەمەش چەند هۆیەکی مێژوییی و سیاسی هەیە و جوێ باسکردنی ئێرە نیە . بێجگە لەوەش ژمارەیەکی گەلێك زیاتر لەوانەی کە لوڕی راستەقینەن بە هەڵە بە ( لوڕ ) ئەدرێنە قەڵەم . واتا هەندێ هۆزی فارس زمانیش هەر بە لوڕ دائەنرێن . =

ئەدوارد ســـەخاویش یەکێك بووە لەو زانایانەی باسی زۆر گرنگی لەسەر هەندێ ناوچەی کوردستان نوسیوەتەوە ، بەتایبەتی لە بارەی ناوچەکانی دەجلە و فوراتەوە(٦٠) . هـەروەها لێدوانێکی لـــە بارەی گـــەشتی بۆرخارت ناوێکەوە بـــۆ کوردستان بڵاوکردۆتەوە(٦١) .

ئۆسکارمان کە لە ساڵانی ١٩٠١ ـ ١٩٠٣ و لە ١٩٠٦ ـ ١٩٠٧دا بۆ لێکۆڵینەوەی زمانەوانی چووە بۆ کوردستان و وڵاتی فارس و هەندێ شوێنی تر ، پاش گەڕانەوەی زنجیرەیەك نوسراوی بە ناوی لێکۆڵینـــەوەی کوردی ـ فارســـییەوە دەرکردووە(٦٢) . لەم

= ئەمەیە وای لە ئوسکارمان کردووە ، کە شارەزاییەکی تەواوی نەبووە لە شیوەکانی کوردیدا ، سەری لێشێوێ و لە ئەنجامدا ســەر لە خەڵکی تریش تێك بدا . کاتی خۆی لە بەرلین ئەم باسەم بە کورتی لەگەڵ هاوڕێی خۆشەویستم کاك کەمال فوئاد خۆیدا کرد . هیواشم وایە لە پاشەڕۆژدا ئەگەر دەستم پەرژا بتوانم ئەم باسە باشتر شی بکەمەوە ، چونکە ماوەیەك بە وردی خەریکی لێکۆڵینەوەی شێوەی لوڕی بوم و شـێوەی لوڕیم لەگەڵ چەند تێکستێکی پـارتی و پەهلەویدا بەراورد کردووە ـ جەمال

(٦٠) Sachau, Eduard : Am Euphrat und Tigris, Leipzig, 1900 .

(٦١) تەماشای ژمارە (٢٦) ی ئەم پەراوێزە بکە .

(٦٢) Mann, Oskar : Kurdisch - Persische Forschungen, Berlin, 1901 - 1907 .

زنجیرەیەدا ـ ئەوەندەی پەیوندی بە کوردناسییەوە هەبێ ـ هەوڵی داوە کە بەپێی زانستی زمانەوانی لە شێوەی موکری و زازا و لوڕی و کرماشانی و کەلهوڕی و کرمانجی رۆژهەڵات بکۆڵێتەوە . بۆ ئەم مەبەستەگەلێك چیرۆك و داستانی وەك مەموزین و ناسر و ماڵماڵ و زەمبیلفرۆش و بەیتی ئەوڕەحمان پاشای بەبە و... هتدی کۆکردووەتەوە و ئەم تێکستانەی بە تیپی عەرەبی و لاتینی و وەرگێڕانی ئەڵمانییەوە بڵاوکردۆتەوە . بێگومان ئەم کارە بۆ کاتی خۆی ، واتا هەفتا ساڵێك لەمەوبەر ـ کارێکی یەکجار بەنرخ و بەرز بووە ـ . تەنانەت بۆ ئەمڕۆش کەڵکێکی یەکجار گەورەی هەیە ، ئەگەرچی هەندێ لەو کارانە پێداچوونەوە و راستکردنەوەیان پێویستە . ئۆسکارمان هەندێ نوسراوی لەپاش بەجێماوە کە هێشتا چاپ نەکراون . ئەمانە وان لە نامەخانەی زانستگای هومبۆڵتدا لە بەرلینی رۆژهەڵات .

ئەلبەرت فۆن لکۆیکش هەر لە ساڵی ۱۹۰۱ دا لەگەڵ لیژنەیەکی لێکۆڵینەوە لە شوێنەوارە کۆنەکان Archiologie چووە بۆ ناوچەی زەنجیرلی لە کوردستانی تورکیا و لەوێ لەلای مامۆستایەکی کورد کە ناوی وێسفە فەندی بووە کوردی خوێندووە و هەر لە زەنجیرلی چەند چیرۆکێکی کوردی لەگەڵ ژمارەیەك پەندیپێشینان و قسەی نەستەقی ناوچەی کرمانج و زازا و بابان و هەروەها نۆباری ئەحمەدی خانی و مولد النبي (کە بەلای ئەوەوە هی مەلای باتێیە) کۆکردووەتەوە و لە دیمەشـق ئەم تێکستانەی بە هۆی چەنـد کوردی زانێکەوە

شتی کردووەتەوە . پاش گەڕانەوەی ئەمانەی بە سێ بەرگ و بە پیتی عەرەبی و لاتینی و تەرجەمەی ئەڵمانییەوە بڵاوکردووەتەوە . تەنانەت تێکستە زازاکانیشـــی بە شـــێوەی کرمانجی وەرگێڕاوە . بێجگە لەوەش فەرهەنگێکی بچووکی بۆ ئەو وشە کوردییانە دروست کردووە کە لە تێکستەکاندا ناویان هاتووە[٦٣] . مارتین هارتمان ( ١٨٥١ ـ ١٩١٨ )یش باسێکی مێژوویی تۆپۆگرافیی زۆر گرنگی لەسەر «بۆتان» نوسیوە[٦٤] و هەروەها دیوانی مەلای جزیری بۆ یەکەمین جار بە شێوەیەکی زۆر جوان و نایاب چاپ و بڵاوکردۆتەوە[٦٥] . بێجگە لەمـــەش باسێکی لەسەر ئەدەبیاتی کوردی لە ١٩٨٨دا[٦٦] و هەر لەسەر هەمان باس لە

---

(٦٣) Von Le Coeq, Albert : Kurdische Texte, Berlin, 1903.

(٦٤) Hartmann, Martin : Bohtan, eine topografhisch - historische Studie, in Mitteilungen der Vorderasiatischen Gesellschaft. Berlin, 1896, II, Heft 2, 1897, Heft I.

(٦٥) Hartmann, Martin : Der kurdische Divan des scheich Ahmed von geziret ibin Omar , genannt mela-i giziri , Berlin , 1904 .

(٦٦) Hartmann , Martin ; Zur kurdischen Literatur , in Wiener Zeitschrift fuer die Kunde des Morgenlandes, wien , 1898 Jahrg. 8 , S 102 - 112 .

١٩٠٥ و ١٩٠٦ و ١٩٠٧ دا[٦٧] نوسیوە لە ناو ئـەو راپۆرانەدا کە هارتمان لەسەر رۆژهەلاتی موسوڵمانی نوسیوە باسێکی زۆری کوردی کردووە[٦٨].

بەلام مارتین هارتمان هەر تەنیا خەریکی بلاوکردنەوەی کولتوری کورد نەبووە ، بەڵـکو دۆستێکی دڵسۆزی گەلی کوردیش بووە . بەجۆرێ لە گەلێ شـــوێندا خۆشەویستی خۆی بەرامبەر ئـــەم گەلە پێشان داوە . تەنانەت لە یەکێك لە نوسراوەکانیدا کە بە تایبەتکاریش لەسەر کورد نەنوسراوە ئەڵێ :

« ئەگەر من کورد وەك نەتەوەیەك بدەمە قەلەم کە بە ئاسانی کولتوری ئەوروپایی وەرئەگرێ ، دیارە لام روونە کە ئەو حەلە ئەم بیرووڕایە توشی هەندێ بەرهەڵست ئەبێ . بەلام لەبەر رۆشنایی ئەو دەنـگوباسانەی ئەوانە ئەیگێڕنەوە کە بەم ولاتەدا گەڕاون ، پیاو ئەتوانێ بڵێ ، لەژێر پێستی خاوی ئەم گەلەدا جیهانێـکی پڕ لە بیری قوڵ و هەستی نازك شاراوەتەوە . گەلێك بەڵگە هەیە کە ( ئـــەم کوردانە ) زیرەکییەکی خواکردی تێکەڵ بە زۆ لە شتگەیشـتن و بە

(٦٧) Harmann, Martin : zur kurdischen Literatur, in Wiener Zeitschrift fuer die Kunde des Morgenlandes , wien , 1905 Jahrg. 15, S. 322 - 330, auch 1906, Jahrg . 16, S. 35 - 46 . auch 1907, Jahrg . 17 S. 76 - 80 .

(٦٨) Hartmann, Martin : Der islamische Orient , Berichte und Forschungen, 3 Baende, Berlin , 1899 - 1910 .

ستراو بە خۆڕەوشتێکی رەپوڕاستی مەردانەیەیان هەیە »[٦٩].

( هوگۆمەکەس ) Hugo Makas دوو بـــەرهەمی زۆر نایابی پێشکەش بە خوێنـــەرەوەکانی زمانی ئەڵمانی کردووە. یەکێکیان لێکۆڵینەوەیەکی زانستانەیە لە بارەی زمانی کوردی‌یەوە لەبەر رۆشنایی شێوەی کوردی دیاربەکر و شێوەی یەزیدی‌یەکان . ئەم بەرهەمە لە ١٩٠٠دا لە شاری ( هایدلبەرگ ) چاپکراوە[٧٠]. ئەوی تریشیان چەند تێکستێکی کوردی‌یە کە بریتی‌یە لە چیرۆك و داســـتان و پەندی پێشینانی ناوچەی ماردین بە شـــێوەی کرمانجی. ئەمەیان لە لینینگراد لە ١٩٢٦دا چاپکراوە[٧١].

فۆلاند Vollaud ناوێك وتارێکی لەســـەر قســـەو باوەڕی پڕوپوچ لە کوردستان و ئەرمەنســـتاندا نوســـیوە و جۆری بیرکردنەوەی ئەم دوو گەلەی پێشان داوە[٧٢] . فـۆن‌هاندل ، تیزێتی وتارێکی لە بارەی گەشتێکی خۆیەوە بۆ کوردستان و مێزۆپۆتامیا

(٦٩) Hartmann, Martin : Fuenf Vorträge ueber den Islam, Leipig, 1912.

(٧٠) Makas, Hugo : kurdische Studien Heidelberg , 1900

(٧١) Makas, Hugo : kurdische Texte Im Kurmandji Dialekt aus der Gegend von Mardin, Leiningrad, 1926.

(٧٢) Volland : Aberglauben in Armenien und Kurdistan , in Globus, vol. 91 , 1907.

نوسـیوه[٧٣] . هەروەها وتارێکی تری لە بارەی جوگرافیـای کوردستانەوە نوسیوە[٧٤] .

(رودۆلف فرانك) ناوێك نامیلکەیەکی لە بارەی شێخ عادی ، سەرکەورەی یەزیدیەکانەوە نوسیوه[٧٥] .

ڤالتەر باخمان ناوێکیش نامیلکەیەکی لەسـەر مزگەوت و کڵیسەکانی کوردستان و ئەرمەنستان بلاوکردۆتەوە[٧٦] .

ماوەیەکی کەم پێش جەنگی جیهانی یەکەم چەند ئەڵمانێك وتاریان لەسەر کوردستان لە باری سەرنجی سوپایی و ستراتیجی‌یەوە نوسیوە . لەمانە گراف ڤێستارپ[٧٧] کە رێگەکانی کوردستان و ئەرمەنسـتانی

(٧٣) Von Handelmazetti, Heinrich Freiherr: Reisebilder aus Mesopotamien und Kurdistan, in Deutsche Rundschau fuer Georgs., wien, 1911, Band XXXIII, S. 401-409.

(٧٤) Von. Handelmazetti, Heinrich, Freiherr : zur Geographie von Kurdistan, in Petermanns Mitteilungen, 1912, Band LVIII, 2. Halbband, S. 133 - 137.

(٧٥) Frank, Rudolph : Scheich Adi, der grosse Heilige der Jezidis, Berlin, 1911.

(٧٦) Bachmann, Walter: Kirchen und Moscheen in Aremnien und Kurdistan, Leipzig, 1913.

(٧٧) Von Westarp, Graf E. J. : Routenaufnahmen in Armenien und Kurdistan, in Petermanns Mitteilungen, 1913, Band LIX, S 297 - 300.

باس کردووە . هەروەها ڤیلهلم باخمان راپۆرتێکی لەسەر ئەو رێگایانە نووسیوە کە ئەکەونە بەینی مووسل و وانەوە ، ئەمەش لەبەر رۆشنایی نەخشەیەك کە بەتایبەتی بۆ ئەو ناوچەیە کێشراوە (٧٨) . ئەم باسە بۆ شەڕی جیهانی یەکەم کەڵکێکی سوپایی زۆری بووە .

هەر لەم ماوەیەدا چەند باسێکی ستراتیجی لە بارەی هەندێ ناوچەی کوردستانی عێراقەوە لە لایەن ئێڤالد بانزەوە دەرچووە (٧٩) . هەر ئەم نووسەرە لە بارەی خەتی شەمەندەفەری بەغدادەوە نامیلکەیەکی دەرهێناوە (٨٠) و لە باری جوگرافیایی و ستراتیجی سوپایی‌یەوە باسێکی کوردستانی کردووە و باسێکی هەندێ لە هۆزە کوردەکانی بە خۆیان و جلوبەرگ و رەوشتوخوویانەوە کردووە . ئەوەشی لەبیر نەچووە ناوی هەندێ لە بزووتنەوە رزگاری خوازی‌یەکانی کورد بهێنێ . ئەم نامیلکەیە سیاسەتی ئەوسای دەوڵەتی عوسمانی بەرامبەر بە کورد و گەلە ژێردەستەکانی تری تورك ئەخاتە بەرچاو .

زانای زمانەوانی بەناوبانگی نەمساو ئەندامی کۆڕی زانستی

(٧٨) Bachmann, Wilhelm : Bericht zur Routenkarte von Mosul nach Wau Petermanns Mitteilungen, 1914.

(٧٩) Banse, Ewald : Durch norden Mesopotamiens, Petermanns Mitteilungen, LVII, I, S. 119 und 172, Gotha, I911 .

(٨٠) Banse, Ewald : Auf den Spuren den Bagdadbahn, Weimar, 1913,

شاهانە لە ڤیەننا ، پرۆفیسۆر ماکسیمیلیان بیتنەر M. Bittner لە ساڵی ١٩١٣دا هەر دوو کتێبە پیرۆزەکەی یەزیدی‌یەکانی بە کوردی و عەرەبی و وەرگێڕانی ئەڵمانی‌یەوە بڵاوکردۆتەوە و لێکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی‌یانەی یەکجار قووڵی لەســەر نووسیون . ئەم تێکستانە گوایە کاتی خۆی کوردێکی زیرەك و وریا کە بە درۆ خۆی کردووە بـــە یەزیدی ، لە یەزیدی‌یەکانی دزیوە و فرۆشـتوونی بە زمانەوانی عەرەب « ئـــەب ئەنستانس ماری ئەلکەرمەلی » . کەرمەلی ئەم تێـکستانەی بۆ یەکەمجار لە گـۆڤاری Anthropos دا[٨١] بڵاوکردبووەوە و بە لێدوانێکەوە بە زمانی فەرەنسی . بێتنەریش لە گۆڤاری Anthropos ەوە تێـکستەکانی وەرگرتووە و گۆڕیونی بە ئەڵمانی و جارێـکی تر بە لێـکۆڵینەوەیەکی زمانەوانی‌یەوە بڵاوی کردۆنەتەوە[٨٢] . بڵاوکردنەوەی کتێبە پیرۆزەکانی یەزیدی‌یەکان شەست ســـاڵێك لەمەوبەر بە زمانێکی کوردی رەوانی جوان ، خزمەتێکی گەورەیە بۆ کولتووری نەتەوەی کورد[٨٣] . هەر

---

(٨١) Anthropos گۆڤارێـکی جیهانیە بـۆ گەلانناسی و زمانناسی . وتارەکەی کەرمەلیش بەم جۆرەیە :

Anastase Marie, O. Carm : La de couverte recente des deux Lives sacras des yezidis, Anthropos, t . Vi, Nr.1, Januer - Fevruer 1911, P. 1. 39 .

(٨٢) Bittner Maximilian: Die heiligen Buecher der Jeziden oder Teufelsaufbeter (Kurdisch und Arabisch ) Wien, 1913 .

(٨٣) هیوام وایە لە هەلێکی تردا تەواوی تێکستی هەردوو کتێبە پیرۆزەکە بڵاوبکەمەوە بە لێکۆڵینەوەوە ( جەمال ) .

ئەم زانایە بیست ساڵێك لەوەپێش بەرهەمێکی تری خۆی لە بارەی شاری شنۆ و ورمێیەوە بڵاوکردۆتەوە[٨٤] .

ئەو بەرهەمانەی لە پێشەوە ناومان بردن رێگەیان خۆش کرد بۆ هەندێ زانای تری ئەڵمان ، کە پاش جەنگی جیهانی یەکەم ، بەرهەمی تر لە پێشانگای کوردەوانیدا بخەنە روو[٨٥] . یەکێك لەوانە کە زۆر شایستەی ناو بردنە کارل هەدانکە Karl Hadank . هەدانك کەڵکێکی زۆری لەو کەلەپورە وەرگرتوە کە ئۆسکارمان بەجێی هێشتووە . بێجگە لەوەش دۆستێکی نزیکی مێژوونوس و تێکۆشەری کۆڵنەدەری خوالێخۆشبوی کورد ، داماو حوزنی موکریانی بووە هەروەها هاوڕێی دوکتۆر کامەران بەدرخان بووە و لە کارەکانیدا کەڵکی لە هەردوکیان وەرگرتووە . لە بەرهەمەکانی هەدانك : پێداچونەوەیەکی

(٨٤) Bittner, Maximilian : die Kurdengan Uschnuye und die Stadt Uramiye, wien, 1892 .

(٨٥) کە ئەڵێم زانای تری ئەڵمان ، مەبەستم لەوە نیە بڵێم زاناکانی ئەوروپاو شوێنانی تری جیهان کەڵکیان لە بەرهەمی ئەڵمانەکان وەرنەگرتووە . ئەمەم وت چونکە باسەکەمان بەتایبەتی لەسەر ناوچەی ئەڵمانەکانە . تەنانەت زانای زمانەوانی بەناوبانگی روسی مار کەڵکی لە زانستی ئەڵمانەکان وەرگرتووەو خۆشی بە زمانی ئەڵمانی وتاری لەسەر بنەچە و رەچەڵەکی گەلانی قەفقاس نوسیوە بۆ ( وێنە Marr, N . J : Des Japhetische Kaukasus, Leipzig, 1923 . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە زمانەوانی روسی مار لەو باوەڕەدا بووە کە کوردەکان بنەڕەتێکی زافەتییان هەیە .

تەماشای : Nikitine Basil : Les Kurdes Etude socioloq gue : et historigue Paris, 1956, pp. 12 - 16 .

ئەو باسانەیە کە ئۆسکارمان لەسەر شـێوەی زازا نوسیونی [86] .
هەروەها باسێکی زانستانەی زۆر ورد لەسـەر شێوەی بۆتان و یەزیدی‌یەکان [87] . ئەمەی دوایی لەبەر رۆشنایی چەند تێکسـتێك کردووە کە بە یارمەتی بەدرخان نوسیو نیەتەوە. هەدانك باسێکی تریشی لەسەر شێوەی گۆران بلاوکردووەتەوە [88] .

لێکۆلینەوەی زاناکانی ئەلمان هـەر لە بارەی زمانەوانی‌یەوە نەبووە ، بەلـکو گەلێ لایەنی تریشی گرتووەتەوە . بۆ وێنە:

دوَ ئەلمان کە ناویان بەرلینـەر و بورخارد بووە چوَنەتە کوردستان و گەلێك کەوچك و چەقۆ و قەلەمبڕ و خشـلی ژنان و شـتی تری لە زیو دروست کراویان کۆکردۆتەوە و لەسـەر ئەم پیشەسازی‌یەی کوردستان کتێبێکیان دەرکردووە [89]. تیلـکە Tilke ناوێك بە بۆنەی لێدوان لە بارەی جلوبەرگی رۆژهەلاتی‌یەوە باسێـکی جلوبەرگی کوردیشی کردووە [90] .

---

(٨٦) Hadank, Karl : Mundarten Der zázá, Berlin, 1932

(٨٧) Hadank, Karl Bóti und Ezádi, Berlin, 1938 .

(٨٨) Hadank, Karl : Mundarten der Guran, Berlin, 1930 .

(٨٩) Berliner, R. und Borchardt, P. : Silberschmiedearbeiten aus Kurdistan, Berlin, 1922 .

(٩٠) Tilke, M. : Orientalische Kostueme in schnitt und Farbe Berlin, 1923 .

هێسسە Hesse ناوێکیش لە بارەی مەسـەلەی مووسـڵ و شـەڕەدەنووکی بەینی عێراق و تورك و ئینگلیز لەسەر خواروی کوردستان ، نامیلکەیەکی دەرکردووە و دۆز ( مەسەلە ) ی کوردی لەم بەشەی کوردستاندا خستۆتە بەرچاو(٩١) .

ئێرنست کلیپل Ernst Klippel گەشتێکی بەناو یەزیدییەکان و کوردەکانی تردا کردووە و سەرنجی خۆی لەم بارەیەوە بە نامیلکەیەك پیشان داوە(٩٢) .

زانایەکی ئەڵمان کە ناوی Koehler بووە هەوڵی داوە لەبەر رۆشـنایی ئەو گەشتنامەیەی کە گەشتوەری تورکی عوسمانلی ئەولیا چەلەبی لە سەدەی ١٧ ی فەرەنـگیدا کردویەتی ، باسێکی شـاری بتلیسی کورد بکا(٩٣) . کۆیلەر ئەم بەرهەمـەی خۆی لە شـێوەی دوکتۆرنامەیەکدا داوە بە زانستگای مۆنیخ .

زیك Sick ناوێك لە سـاڵی ١٩٢٩دا باسێکی بە بۆنـەی بزووتنەوەی کوردەوە لە کوردسـتانی تورکیادا بە ئەڵمانی نووسیوە و

---

(٩١) Hesse, F.: Die Mossulfrage, Berlin, 1925 .

(٩٢) Klippel, Ernst : Unter Druzen, Kurden und Teufelsambetern, Berlin, 1926 .

(٩٣) Koehler, W. : Die Kurdenstadt Bittis, nach dem tuerkischen Reisewerk des Ewlijá Tschelebi, Muenchen 1926.

داخوازی‌بەکانی کوردی خستۆتە رو[٩٤] . Pfitzen mayer ناوێك وتارێـکی لە گۆڤاری Erdball ی ئەڵمانی‌دا لەسـەر پەیوەنـدی و خەباتی کورد و ئەرمەنی نوسیوە[٩٥] .

کابرایـەك کە ناوی Artasches Abeghian بووە و رەنـگە ئەرمەنی بوبێ ، لە ساڵی ١٩٣٠دا وتارێـکی لە بارەی ژیانی فیکری کوردەوە بە ئەڵمانی نوسـیوە و لـە گۆڤاری « رۆژهـەڵات Der Olient » دا بڵاوی کردۆتەوە[٩٦] .

دوکتۆر فۆن ڤێزنـ دۆنك وتارێـکی بە ناوی « مەسـەلەی کورد » ەوە لە ( ١٩٣١ ) دا بڵاوکردۆتەوە[٩٧] .

« کۆمەڵەی زانست لە زانستـگای گۆێتینـگن » لە ئەڵمانیـای رۆژئاوای ئیمڕۆ کتێبێـکی لە ساڵی ١٩٣٩دا لە بارەی شێوەی زمانە ئێرانیەکانەوە دەرکرد لەبەر رۆشنایی ئەو کەلەپورە زانسـتانەیەی لە

---

(٩٤) Sick, J. H.: Karen Jeffe : Im Kampf um ein Volk in vot, Stuttgart, 1929.

(٩٥) Pfitzenmayer, E. W. : Armenier und Kurden in der Erdball, 1931 .

(٩٦) Abeghian, Artasches : aus dem Geistesleben der Kurden, in der Orient, 1930.

(٩٧) Von Wesendonck, Dr. Otto, Graf : Das Kurdische Problem in preussische Jahrbuecher, Berlin, 1931, Band ccxxiii, S. 117 - 130.

پڕۆفیسۆر F. C. Andreas بەجێیماوە[٩٨] . ئەم کتێبە کە بەسەرپەرشتی پڕۆفیسۆر Arthur Christensen و هاوکاری Kaj Barr و W. Henning دەرچووە ، باسێکی ٣٨٦ لاپەڕەیی زمانەوانییانەی لە بارەی شێوەی کوردی گەڕوس و سنەیی و کرماشانی و کێلون و ئەبدوێی تێدایە کە بە راستی هەموو کوردەوانێك پێویستە بیخوێنێتەوە و کەڵکی لێ وەربگرێ .

لە کاتی شەڕی جیهانی دووەمدا (١٩٤٣) نامیلکەیەکی (٩٦) لاپەڕەیی لە شاری پۆتسدام بە ناوی « لە کوردستانەوە بەرەوماڵەوە »[٩٩] . لە لایەن ئۆتۆڤێرنەر و فۆن هێنتێگەوە دەرچوو .

ئەوەی شایانی باسە ، ماوەیەکی کەم پێش شەڕی جیهانی دووەم و لە ماوەی شەڕدا ، ئەڵمانیا چاوی بڕیبووە نەوتەکەی کوردستان . بۆ ئەمە کەوتە پیلان دانان و لێکۆڵینەوە لە بارەی کورد و وڵاتەکەیانەوە ، بۆ ئەوەی کوردەکان بۆ خۆی راکێشێ و بیانکا بە گژ ئینگلیزەکاندا کە داگیرکەری نەوتەکەی کوردستان

---

(٩٨) Iramische Dialektaufzeichnungen aus dem Nachlass Von F. C. Andreas. zusammen mit Kaj Barr und w. Henning. Bearbeitet und lerausgegeben von Arthur Christensen. Kurdische Dialekte Bearbeitet von Kaj Barr, Berlin, 1939, S. 111 - 497.

(٩٩) von Hentig, Werner Otto : Heimritt, durch Kurdistan, Potsdam, 1943 ,

بوّن . بەجێهێنـــانی ئەم کارە و پەیوەندی بەســـتن بە کوردەوە سپێردرابوّ بە ئەفسەرێـکی ئەڵمان کە ناوی گوّتفرید یوّهانێس میوللەر بوّ . ئەم میوللەرە لە ســاڵی ۱۹۳۷دا نامیلـکەیەکی بە ئەڵمانێ بە ناوی « خوّ کوتانە ناو کوردستانی داخراو »ەوە دەرکرد[۱۰۰] .

لە ســـاڵی ۱۹۵۹یشدا کتێبێـکی بە ناوی « لە روّژهەڵاتی گڕتێبەربـوّدا » بڵاوکردەوە[۱۰۱] . میـوللەر لـەم توســـراوەی دووەمێـدا بە دوورودرێژێ باسی ئەوە ئەگێڕێتەوە کە چوّن چەند ئەفسەرێـکی ئەڵمان لەگەڵ کوردێـکی هەولێرێ کە ناوی « رەمزی » بووە ، بە ســەروّکایەتێ ئەو ، بە فڕوّکەیەکی سوپای ئەڵمان چوّنەتە کوردستان و خەریك بوّن بە دزییەوە هوّزە کوردەکان رێك بخەن و هانیان بدەن دژی ئینـگلیزەکان . ئەوەش باس ئەکا کە چوّن هەموّیان لە کوردستانی عێراق گیراون و فڕێ دراونەتە زینـــدانەوە . ئەم کابرایە لە کتێبی دووەمیـــدا بەم جوّرەی خـوارەوە باسی کورد ئەکات :

« هەر کەسێ لەگەڵ کوردێك ، بەڵام کوردێـکی رەسەن ، هەڵسـوکەوت بکا ، ئەو کەسـە کوردی خـوّش ئەوێ و وڵاتەکەیانی خوّش ئەوێ . واتا کوردستانی خوّش ئەوێ . کورد هەموّ مروّڤی

---

(۱۰۰) Mueller, Gottfried Johannes : Einbruch ins vurschlossene Kurdistan , Reutlingen, 1937 .

(۱۰۱) Mueller, Gottfried Johannes : im bremenden Orient, Stuttgart 1959 .

چـــاو گەش و وتووریان و هێـز و وزەیەکی شـــاراوەی بەکار نەهێنراویان هەیە »[١٠٢] .

جا کە ئێمە باسی ئەو زانایانە ئەکەین کە بەرهـــەمی زانستانەی بەکەڵـکیان هێناوەتە کایەوە ، نابێ ئەوەشمان لە بیر بچێ کە چەنـد کەسێـکی بە ناو زانای ئەڵمان و ئەوروپایی بوون و ( ئێستەش هـەر هەن ) کە شـتی زۆر کاڵوکرچ و ناڕاسـتیان لە بارەی کـورد و کوردسـتانەوە بـڵاو کردۆتەوە[١٠٣] . بۆ وێنـــە پرۆفیسۆرێـکی

(١٠٢) Ibid, S. 109 .

(١٠٣) ـ بۆ وێنە لە کاتێکدا کە داگیرکەرانی کوردسـتان خەریـکی ئەوەن کورد بە گەلێکی سەربەخۆ نەدەنە قەڵەم بەڵـکو بە چەند هۆزێکی بێ‌بنەچە و رەچەڵەك یا بە بەشێك لە گەلی « فارس ! »ی بدەنە قەڵەم ، هەندێ لە بەناو زاناکانی ئەوروپا ئەبینین سنگیان هێناوەتە پێشەوە و دەسـتیان کردووە بە نوسین و ئەیانەوێ لە سەرێکەوە خۆیان بە زانا بدەنە قەڵەم و لە سەرێکی تریشەوە خزمەتێـکی داگیرکەرانی کوردستان بکەن . یەکێك لە وانەی کە بە دەمودەست خەریـکە مێژووی کورد تێك بدا و گومان بە خەڵـکی پەیدا بکا لە بارەی بنچینە و بناوانی کـوردەوە ، کابرایەکی ئینگلیزە ناوی مەکەنزی‌یە . ئەم مەکەنزی‌یە لە وتارێـکدا کە گوایە بە ناوی « بنچینەی زمانی کوردی‌یەوە » «The oligins of Kurdish» لە سـاڵی ١٩٦١دا لـە گۆڤاری Tran Sactions of the Philological Societyدا for 1961 نوسـیویەتی ئـەڵێ : « کوردەکان سەریان لە مێژوو دەرناچێ ( واتا نەفامن ـ ج . ن ) . ئەبینن مادەکان بێ سەروشوێن ماونەتەوە ، ئەمانیش ئەچن خۆیان ئەبەستن=

ئەڵمان کە ناوی Hans F. K. Guenther بووە ، لە نوسـراوەکەیدا کە ناوی «رەگەزی باکور لە ناو هیندۆ جەرمەنەکانی ئاسیادا» یە[(١٠٤)]، زمانی کوردیی زۆر ناشی‌یانە بە « شێوەیەکی فارسی ! » داوەتە قەڵەم[(١٠٥)] . هەروەها دوکتۆر هێرتزفیلد ناوێك لە (١٩١٤) دا چووە بۆ ناوچەی زەردی ئاوا بۆ پشکنینی پاشماوەی ئەو خەتی پەهلەوی‌یەی

= بە مادەکانەوە و ئەڵێن کورد لە بەرەی مادن » . مەکەنزی هەرچەنـدە زمانی کوردیی زۆر کەموکورت و ناتەواو ئەزانێ کەچی سڵ لەوە ناکانەوە خۆی بخاتە باسێکی وا قوڵەوە کە بە هیچ جۆرێ سەری لێ دەرناچێ . هەرچەندە من وەرامی ئەم قسانەی مەکەنزیم لە کتێبەکەمدا « کوردستان و شۆڕشەکەی » کە بە ئەڵمانی دەرم کردووە داوەتەوە و پێویست بە دووبارەکردنەوە ناکا . بەلاّم هەر ئەوەندە ئەڵێم تەنیا ئێمەی کوردی « نەفام ! » نین کە ئەڵێین مادەکان باپیرە گەورەی ئێمە بوون . زانای زۆر گەورەی وەك مینۆرسکی و دارشتێتەر کوردیان بە نەتەوەی ماد زانیوە ، ئەمە لە لایەکەوە .لە لایەکی تریشەوە مەکەنزی‌یەك کە زمانی کوردیی تەنیا لامسەرلایی‌یەك ئەزانێ و تەنیا یەك بەڵـگەی بە دەستەوە نیە قسەی خۆی پێ ئیسپات بکات ، ئەبێ ئەوە بزانێ ئەم نوسینانەی ئەو لـە خزمەتکردنی داگیرکەرانی کوردستان بەولاوە هیچ سوودێکی تری نیە و لـەوە زیاتر کـە گەلی کـورد ئەکاتـە دوژمنی خۆی هیچی تری دەس ناکەوێ .

(١٠٤) Guenther, Prof. Hans F. K.: Die Nordische Rasse bei den Indogermanen Asiens, 1934 .

(١٠٥) Ibid, S. 142 .

ساسانی یەکان کە لە گوندی «پەیکوڵی»دا بەجێماوە[١٠٦]. ئەم کابرا سپڵەیە هەرچەندە باسی ئەوەش ئەکا کە کوردەکان خۆی و هاوڕێکانی وەك میوانێکی بەڕێز تەماشا کردووە، کەچی ئەڵێ «تەنانەت ئەم میوانداری یە گیان ئازاردانێکی تەواوبێ»، چونکە گوایە کوردەکان «دەستیان لە شتومەکەکانی داوە!» ئەمجا ئەڵێ ئەو پەندی پێشینانەی کە ئەڵێ: «ثلاثة في الدنيا من الفساد: الكردي والجريدي والجراد» هاتەدێ[١٠٧].

هەندێ قسەی بێ سەر و پێی تریشی کردووە، لە پاداشی میوانداری و چاکەدا. کورد[١٠٨] راستی وتووە: «بۆ بۆرە پیاو خۆت بدەی بە کوشت ئەڵێ بە دەردی خوا مرد». لە پاش

(١٠٦) Herzfeld, Dr, Ernst: die Aufnahme des Sasanidischen Denkmals von Paikueli Brelin, 1914.

(١٠٧) Ibid, S. 7.

(١٠٨) بەراستی ئێمە ئەبێ بزانین کێ دۆستمانە و کێ دوژمنمانە و رێ بەکێ ئەدەین بێتە ولاتەکەمانەوە و رێ لە کێ ئەبەستین. هەرکەسێ ناوێکی کوردی هێنا یا دوو وشەی لە بارەی کوردەوە نوسی بەوە نە ئەبێتە زانا و نە ئەشبێتە دۆستی کورد. ئەو ئەوروپایی یانەی خراپە لەگەڵ کورد ئەکەن لە نەزانینەوە پێویستە بیریان رۆشن بکرێتەوە و بخرێنە سەر رێی راست. بەڵام ئەوانەی کورد و مەسەلەی کورد باش ئەناسن و سەرەڕای ئەوە خراپەکاری لەگەڵ ئەکەن، پێویستە وەك دوژمن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکرێ و ئەو کوردانەی یارمەتیشیان ئەدەن بە ناپاك بدرێنە قەڵەم.

جەنگی جیهانیی دووەمەوە ، کوردەواتی ـ مەبەستم لە لێکۆڵینەوەی زمانەوانی یە ـ ئەستێرەی کوژایەوە و لەو ماوە دوورودرێژەدا و بگرە تا ئێستەش بە دەگمەن باسێکی کوردەواتی لە لایەن ئەڵمانەکانەوە بڵاوکراوەتەوە . بەڵام لە جیاتی ئەوە گەلێك باسی مێژوویی و سیاسی بە ئەڵمانی دەرچووە کە شایانی باسکردن و دڵخۆشین .
لێرەدا هەندێك لەو بەرهەمانە باس ئەکەین :

شتیك فیکاندەر کە پرۆفیسۆرێکی سوێدی یە باسێکی بە زمانی ئەڵمانی لە بارەی جەژنێکەوە نوسیوە کە لە کوردستان ئەکرێ و لە ئاڤێستای زەردەشتدا باس کراوە[١٠٩] . ڕۆژنامەنوسێکی ئیسلەندەیی کە ناوی ئەرلەندەر هەرادڵسەنە و لە ١٩٦٣ و ١٩٦٥دا چووە بۆ کوردستان و بە زمانی ئیسلەندی کتێبێکی لە بارەی کوردستانەوە دەرکردووە ، هەر ئەم کتێبە بە زمانی ئەڵمانیش لە هامبورگ لە ساڵی ١٩٦٦دا چاپکرا و بڵاوکرایەوە ، بەڵام ئەمجارە بە ناوی «کوردستان ... وڵاتێك لە شۆڕشدا »[١١٠]. هەر لە ساڵی ١٩٦٣دا Hans Henle کتێبێکی

(١٠٩) Wikander, Sitg : Ein Fest bei den Kurden und in Avesta, in orientalia Suecana, vol. ix ( 1960 ), uppsala, 1961, s. 7 - 10

(١١٠) Haraldsson, Erlendur. : Land im Aufstand...Kurdistan, Hamburg, 1966.

لەسـەر « ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی نوێ دەرکرد »[111] و لـە بارەی مەسەلەی کوردەوە بیرو راو سـەرنجی خۆی بە شێوەیەکی بابەتانە خستە بەرچاو[112] .

یەکێ لە زاناکانی ئەڵمـان کە خـۆی بە لێکۆڵینەوەی زانستانەوە لەسـەر کولتور و ژیانی کۆمەلایەتی کوردەوە خـەریك کردووە ، زانایەکی خەڵـکی بەرلینـە کە ناوی ڤۆلفـگانك رودۆلف ( Wolfgang Rudolph )ە .

رودۆلف پرۆفیسـۆری ئێتنۆلۆژی‌یە لە زانستـگای ئازاد لە بەرلین و بۆ ئەم مەبەسـتە سێ جار چووە بۆ کوردستان ، جاری یەکەم لە پایزی ١٩٥٨دا چووە بۆ کوردستانی تورکیا و ( ٤ ) مانگ لەوێ ماوەتەوە . جاری دووەم لە پـایزی ١٩٦٢دا چـووە بۆ کوردستانی ئێران و ( ٤ ) مانگ لەوێ ژیاوە و لە ١٩٦٤ — ١٩٦٥ جارێـکی تر بۆ ماوەی ساڵێك چووەتەوە کوردستانی ئێران .

رودۆلف لە ١٩٥٩دا و پاش گەڕانەوەی لە کوردستانی تورکیا دوَ وتاری بە ئەڵمانی نوسیوە ، یەکێـکیان لە گۆڤاری زانست و

(١١١) Henle, Hans : Der neue nahe Osten, suhrkamp tasehenbuch 24, 1972

(١١٢) هەرئەوێ

تەکنیکدا[113] و ئەوی تریان لـە گۆڤاری Soziologus دا[114] .
لە ساڵی ١٩٦٧دا دوو وتاری لە بارەی کوردستانەوە بڵاوکردۆتەوە ؛
یەکێکیان لە بارەی رێکخستنی کۆمەڵایەتی‌یەوە لە کوردستانی
ئێراندا لە گۆڤاری Sozioloqusدا[115] و ئەوی تریشیان وتارێکە
لەسەر هۆزی فەیزوڵلا بەگی بۆکان کە بە هاوکاری کوردێکی ئێرانی
کە ناوی حەسەن فەلاحە بڵاوی کردۆتەوە[116] . وتاری سێیەمیشیان
لـــە بارەی کوردەکانی کوردســـتانی ئێرانەوەیـە و لە گۆڤاری
« بوستان »دا کە لە نەمسا دەرئەچێ بڵاوی کردۆتەوە[117] .

---

(١١٣) Rudolph, Wolfgang : Kurdistan : Terra incognita in der Volkskunde, in der Zeitschrift die Umschan in Wissenschaft und Technik, nr. 20, Jahrg. 59, Frankfurt am Main, S 613 - 615

(١١٤) Rudolph, Wolfgang, Einige Hypotätische Ausfuehrungen zur Kultur der Kurden in soziologus, Jahrg - 9, Heft 2, Berlin, 1959, S. 150 - 162.

(١١٥) Rudolph, Wolfgang, Grundzuege sozialer Organisation bei den westiranischen Kurden, in Soziologus, Jahrg. 17, Heft 1, Berlin, 1967, s. 19 - 39.

(١١٦) Rudolph, Wolfgang, Die Feizulläbegi des Hochlandes von Bukán, in Baefflerl Archiv, Band 15, Heft 2, Berlin, 1967, S. 275 - 304.

(١١٧) Rudolph, Wolffang, Die Westiranischen Kurden in Bnstan, Oesterreichische Zeitschrift fuer Kultur, Politik und Wirtschaft der islamischen Länder, Wien, Heft 4, 1967. S. 33 - 40

Kaster لە کتێبەکەیدا « ئیسـلام بەبێ پەچە »[118] باسێـکی گەشـتەکەی خۆی ئەکا بۆ سلەیمانی و ناوچەکانی کەی کوردستان و گەلی کورد بە گەلێـکی روخۆش و میوانپەرست ئەداتە قەڵەم .

رۆژنامەنوسێـکی ئەڵمان کە نـاوی ( Karsten Dettmann )ە ، گەشتێـکی کردووە بۆ کوردستان و ماوەیەك لە ناو پێشمەرگەکاندا ژیاوە . پاش گەڕانەوەی کتێبێـکی بە ئەڵمانی بە ناوی « شـێر بە لەپتی خـۆت بگرە شێخ عادی نایـەتە هـاواری تۆ » وە[119] بڵاوکردۆتەوە . ئەم کتێبە کە لە ساڵی ١٩٦٦ دا دەرچووە[120] پڕە لە وێنەی جوانی کوردستان و پێشمەرگە دلێرەکانی .

پرۆفیسۆر فۆخلەر هاوکە ، زانای بەناوبانـگی ئەڵمان لە ساڵی ١٩٦٦دا نەخشـەیەکی کوردستانی لە یەکێك لە باشترین چاپخانەکانی ئەڵماندا کە ناوی Jro یە ، بـە ناوی « کوردەکان — گەلێـکی بێ دەوڵەت » ەوە لە چاپـدا[121] . نەخشەکە کورتە مێژوویەکی کورد و

---

(١١٨) Kaster Islam ohne Schleier, 1963 .

(١١٩) ئەمە پەندێـکی پێشینانە کە بە تایبەتی لە ناو کوردە یەزیدییەکاندا باوە . مەبەستی ئەم پەندە ئەوەیە « تۆ پشت بە خۆت ببەستە ، لەتەنگانەدا کەس ناکەوێتە فریات » .

(١٢٠) Dettmann, Karsten : Vertrane der Pranke..., Hamburg, 1966 .

(١٢١) Fochler - Hancke, Prof . G. die Kurden Volk ohne staat, in Die aktvelle JRO - Landkarte, Ausgabe B, Nr. 224, August 1966.

بزوتنەوەی رزگاریی خوازانەی کوردستانی لەگەڵە . ئەم زانایە زۆر زانستانە و بابەتانە لەسەر کورد ئەدوێ . جا هەرچەندە نوسینەکەی کورتە چونکە وەك خۆی ئەڵێ کەمێ سەرچاوە و زانیاری لە بارەی کوردەوە تەگەرەیەکی گەورەیە لە رێی ئەوانەدا کە ئەیانەوێ لەسەر کورد و وڵاتەکەی بنوسن . لەگەڵ ئەوەشدا ئەو نوسینە کورتە زانیارییەکی باش ئەدا بە خوێنەرەوەی وتارەکە . نوسەر لە بارەی خووڕەوشتی کوردەوە ئەڵێ : « سەرڕاستی و دڵپاکی و ئازایەتی لە سەربازیدا ، لەگەڵ بێفێزی و خۆبەزلنەگرتن ، گرنگترین سروشتی کوردن ، ئەو کوردەی کە هەرچەندە ئاینی ئیسلامی پەسند کردووە کەچی سەرەڕای ئەوەش ژن هەر لە کۆنەوە لەناو ئەم گەلەدا ئازادیی زیاتر بووە وەك لە گەلەکانی دەرو دراوسێی »[122] .

ئەوەمان نابێ لەبیر بچێ کە رۆژنامەکانی ئەڵمانیا و نەمسا و سویسرەش ( واتا ئەو وڵاتانەی گەلەکانیان بە ئەڵمانی قسە ئەکەن ) ، لەم پانزە ساڵی دواییەدا کەمو زۆر ، لەسەر کوردیان نوسیوە و تەلەفیزیۆن و رادیۆکانیان جاروبار لەسەر کورد و کوردستان فلیمیان پیشان داوە و وتاریان خوێندۆتەوە[123] . جا ئەگەر لە هەندێ

(١٢٢) هەر ئەوێ .

(١٢٣) تەنیا بۆ نمونە وتارێکی رادیۆی کۆلن لە بابەت « تێکۆشانی کورد بۆ ئازادی »یەوە :

von Juterczenka, Manfred : Der Freibeitskampf der=

ناتەواوی و کەموکوڕی بگەڕێین ، هەروەها هەندێ دەنگوباسی ناڕاست و دەستکرد و هەڵبەست بخەینە لاوە ، ئەوا ئەتوانین بڵێین زوربەی زۆری ئەم هەواڵ و دەنگوباس و نوسینانە راستی بوون و بەکاری کورد هاتوون .

لەو رۆژنامەنوسانەی ئەڵمان و نەمسایی و سویسرەیی کە لەم دەساڵی دوایی‌یەدا چونە کوردستان و پاش گەڕانەوەیان وتار یان کتێبیان لەسەر کورد دەرکردووە ناوی چەند کەسێك ئەبەم :

Richard Anderegs (١٢٤) ؛ Erich Helmensdorfer (١٢٥) ؛

Randolph Braumaunn (١٢٦) ؛ Horst Blunig (١٢٧) ؛

---

= Kurden, in Deutschlandfunk, Köln, 20-4. 1967 ( 20 Seiten ).

(١٢٤) Anderegg, Richard, chez les Rebelles Kurdes d. Crals, service de Documentation de Revue Preuves Paris, le 2. Octobre 1962.

(١٢٥) Helmensdorfer, Erich : an der seite der Aufständischen Kurden in Frankfurter Allgemeine Zeitung, 13. Juli 1963.

(١٢٦) Braumann, Randolph : an der Front im wilden Kurdistan, in, Rheinischer Merkur Köln, 14. 2. 1966 und Endloesung Kurdenfrage, im Rheinischer merkur, Nr. 21, 21 . 5 . 1965 .

(١٢٧) Brunig, Horst : Kurdistan ist nicht mehr wild; ein Volk ohne Staat wuenscht neue Ordnung, in=

Gordion Trocller و Claude Deffarge(١٢٨)؛
Arnold Roehen(١٢٩)؛ Peter Leuhefeld, Karl Breyer(١٣٠)

هەروەها ڕۆژنامەنوسی هۆڵەندی سێلڤیو ڤان ڕۆی، سەرۆك و دامەزرێنەری کۆمەڵەی جیهانی کوردستان (International Society Kurdistan) لە ئەمستردام، تا ئێستە بێجگە لە دەرکردنی گۆڤارێك بە زمانی ئینگلیزی بە ناوی (Kurdish Facts) وە، چەند وتارێکی

---

=Braunschweiger Presse, 20. Mai 1963. und Aufstand der Kurden, in Die politische Meinung, 8. Jahrg, Heft 89, 1963, S. 79 - 84.

(١٢٨) Troeller, Gordion, und Deffarge, Claude: Durchs blutige Kurdistan, in Stern, Hamburg, 19 und 26. Januar 1964, S. 18 - 29, 28 - 38.

(١٢٩) ئارنوڵد ڕۆیکن کوڕێکی ئەڵمانە و سەرکردەی کۆمەڵێکە بە ناوی لاوانی هەمبورگەوە. ئارنوڵد و هاوڕێکانی چەند جارێك چوون بۆ کوردستان و گەلێك وێنە و فلیمیان لەسەر کوردستان گرتووە و لێرە لە ئەڵمانیا بە یارمەتی «یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەورووپا» گەلێك وتاری سینەماییان لەسەر کورد خوێندۆتەوە و لە گەلێ شوێن و دەرفەتدا لەسەر مافەکانی گەلی کوردیان کردۆتەوە.

(١٣٠) Karl Breyer und Peter Leukefeld, Wieviel Minuten bis zum nächsten Krieg in Quick, Jahrg. 17, April 1965.

له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌ی کورد له ڕۆژنامه‌کانی ئه‌ڵمانیادا بڵاوکردۆته‌وه . (١٣١)

هه‌ندێ ڕۆژنامه‌نوسی تر هه‌ن که نه‌چونه‌ته کوردستان له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا گه‌لی وتاریان له‌ســه‌ر کورد و کوردستان بڵاوکردۆته‌وه . هه‌رچه‌نده ناوبردنی ئه‌مانه هه‌موویان له وتارێکی وا کورتــدا جێی نابێته‌وه ، به‌ڵام ئه‌وا ناوی چه‌ند که‌سێکیان هه‌ر بۆ نمونه ئه‌به‌ین :

(١٣٢) Eva Lorenz ؛ (١٣٣) Wolfgang Hoepker

---

(١٣١) Van Rooy Silvio, E. Kurdenforschung, : Eine Voraussetzung konstruktiver Nahostpolitik, in Zeitschrift fueer politik, Koeln - Zuerich - wien 1962, Heft 2, S 142 - 153 .

Van Rooy, Silvio. E. Europaeische Aspekte des kurdischen Emanzipationskamfes, in Europaeische Begegnung, west-Berlin, August - Septemer, 1962, S. 66-70 Van Rooy silvio, E. : Komunisten und Kurden nach dem Sieg Der Baath-Partei im Irak in Osteuropa, Stuttgar,t Juli August, 1963, S. 5o5 - 508 .

(١٣٢) Lorenz: Eva . Blutig erkaempfter Friede m wilden Kurdistan, in az brien, 22 - 3 1970 .

(١٣٣) Hoepker, Wolfgang : in Christ and Welt, wr. 13.23 Jahrg, stuttgart, 27 . 3.. 1970, S . 7 und in Der Monat, Maerz 1970 .

(١٣٤) Heinz Gastrein ، (١٣٥) Arnold Hottinger

(١٣٦) Franz von Gzulig ، (١٣٧) Rudolph Clinelli

(١٣٨) Harald Vocke ، (١٣٩) Zuergen Beier

(١٤٠) Roland Oertel ، (١٤١) Friedlich Wilhelm Fernan

---

(١٣٤) Gastrein, Heinz : Iraks Kurden sind wieder aktiv, in : Die Presse, Wien, 6. 12. 1971, S 3.

(١٣٥) Hottinger, Arnold, im neue Zuercher Zeitung, 23 und 8. 5. 1963, 3. 7. 1964, 20 - 10. 1964, 30 - 4. 1965, 21. 4. 1966 und nr. 224, fernausgabe nr. 250, 12. 9. 1971, s. 56.

(١٣٦) von Gau:ig, Franz: Kurden in Handelsblatt, Duesseldorf, 5. Mai 1965.

(١٣٧) Chimelli, Rudolph, in Sueddeutsche Zeitung, nr. 166, 13. 7. 1965, nr. 124, 25. 5. 1966 , 25/26. 6. 1966, 13. Juli 1966, S. 4. nr 22, 23. 1. 1968. nr. 174, 20/21. Juli 1968. ur. 24. 28. 1. 1970.

(١٣٨) Vocke, Harald: Islam und Demokratie, in FAZ, NR. 191. D. Abusgabe - 20. 8. 1971.

(١٣٩) Beier Juergen : Kopfjäger in Kurdistan, in Konkret, C 4289. D, Hamburg, 19. Mai 1969.

(١٤٠) Oertel, Roland: Die Flakstellungen sind vorläufig geräumt, in Frankfurter Rundsdan, NR. 178, 5 August 1970.

(١٤١) Fernau, Friedrich - Wilhelm, Die neuen kurdischen Sorgen Ankaras, in Deutsche Zeitung, NR. 162, 16. Juli 1962, S. 3. und Lösnng des kurdischen Knotens in Handelsblatt, NR. 143, 29/30, Juli 1966, S. 2.

Geong von Huebbent [١٤٢] ؛ Von Stock housen [١٤٣]

Giselher Wirsing [١٤٤] ... وه‌تد

جا ئێمه که ئه‌ڵێین رۆژنامه‌نوسه‌کانی ئه‌ڵمان له‌م ده ساڵه‌ی دوایی‌یه‌دا چه‌ندسه‌د وتارێـکیان له‌سه‌ر کورد بڵاوکردۆته‌وه، مانای وا نییه که گه‌لی ئه‌ڵمان له مه‌سه‌له‌ی کورد و کوردستان به ته‌واوی گه‌یشـتووه . نه‌خێر . زۆرکه‌س هه‌ن ئێسته‌ش کوردستان به هـۆی چیرۆکه‌که‌ی کارل مایه‌وه ئه‌ناسن . واتا هیچیان له باره‌ی بزوتنه‌وه‌ی رزگاری خوازانه‌ی کورده‌وه نه‌بیستووه . ئه‌مه‌ش سه‌باره‌ت به وه‌یه ئه‌و کوردانه‌ی لێره ئه‌ژین و ئه‌وانه‌ی دۆستی کوردن ، هه‌تا ئێسته نه‌یانتوانیوه مه‌سه‌له‌ی کورد له سنورێـکی فراواندا بخه‌نه به‌رچاو . هــه‌ر ئه‌م که‌مته‌رخه‌می‌یه‌یه رێـگه‌ی بۆ دوژمنـه‌کانی کورد خۆش کردووه ، ناوی کورد و مه‌سه‌له‌که‌ی به شێوه‌یه‌کی خراپ پێشـکه‌ش گه‌لی ئه‌ڵمـان و گه‌له ئه‌وروپایی‌یه‌کان بکه‌ن . چونـکه که دوژمن ترسی لێ‌پرسینه‌وه‌ی لێ‌نه‌نیشت هه‌رچی‌یه‌کی له ده‌ست بێ ، له رۆی

---

(١٤٢) von Huebbent, Georg, Burgfrieden mit Kurden steht auf dem Spiel in Die Welt, Hamburg, 27. September, 1966.

(١٤٣) von Stockhausen, Hans - Wilfriet, Oel und Mohammed, kurdische Probleme, in Politische Studien, München, Januar, 1960, Heft 117,, S. 44 - 48.

(١٤٤) Wirsing, Giselher : Kassem und die Kurden in Christ und Welt, Stuttgart, 18, 5. 1962.

خراپەکاری‌یەوە ئەیکا و سڵ ناکاتەوە . ئا لێرەدا چەند نموونەیەکی ئەو بوختان و خراپەکاری‌یانەی هەندێ لە ئەڵمانەکان ئەنووسم :

چەند پرۆفیسۆر و رۆژنامەنووس و کاربەدەستێکی ئەڵمان هەن کە ویژدانیان مردووە و لەبەر چەند هۆیەکی زۆر دوور لە زانستەوە بوختان و درۆ و دەلەسەی ناهەموار لە بارەی کوردەوە بڵاو ئەکەنەوە . بۆ وێنە پرۆفیسۆرێکی ئەنترۆپۆلۆژی کە ناوی (Von Bickstedt)ە ، کتێبێکی بە ناوی « تورك و کورد و ئێرانی لە کۆنەوە تا ئێستە » لە ١٩٦١دا دەرکردووە[١٤٥] . ئەم کابرایە لە هەر لایەکەوە و بەهەر بۆنەیەکەوە ناوی کوردی هێنابێ نووسیویەتی « کوردە جەردەکان » . ! ! !

کابرایەکی تر ، ڤۆگەل Vogel ناوێك کە لە کن خۆی دوکتۆری فیزیکە ، لەگەڵ چەند کەسێکی‌تر چووە بۆ کوردستانی تورکیا . هەرچەندە میوانداری کوردیش ئەگێڕێتەوە ، بەڵام دیسانەوە لە وتارەکەی‌دا کە لە بارەی ئەو گەشتەوە نووسیویەتی کورد بە جەردە ئەداتە قەڵەم[١٤٦] ، کە سکرتێری گشتی « یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا » نامەی بۆ نووسی و لێی پرسی ئایە بە ریشی ئەو رەوایە ئەو درۆیانە بۆ کورد

---

(١٤٥) Von Bickstedt, Egon, Freiherr : Tuerken, Kurden und Iranier seit dem Altertum, Probleme eine Anthroplogischen Reise, Stuttgart, 1961.

(١٤٦) Vogel : Sueddeutsche Zeitung.

هەڵبەستێ ؟ لە وەرامدا وتی : ببوورن من لـە تورکیا ئەمانەیان بۆ گێڕامەوە ، ئەگینا خۆ من کوردی نازانم . کاربەدەستانی حکومەت ئەم قسانەیان بۆ کردم . راستە ئـەم کابرایە کوردی نازانێ ، بەڵام ئایە دوکتۆرێـکی فیزیك ئەبێ ئەوەندە گەوج بێ بچێ بە قســەی ئەمو ئەو و لەبەر بوورە بکەوێتە هەڵەکە سەما ؟ [147] .

کابرایەکی تر کە ناوی Hans Thema یە لە وتارێـکدا نووسیویە :

« چوومە ناو کوردەکانەوە . کوردەکان جەردە و رێگرن و هەرچی کڵێســەی ئــەو ناوە هەیە رووخاندوویانە و ماڵی گاورەکانیان کاول کردووە » [148] . بەڵام پیــاو لە وتارەکەی نابێتەوە کە هۆی ئەم بوختانە تێ ئەگات . چونکە Thema هەر لـــەو وتارەدا مەحکێکی زۆری « میوانداری و نان بدەیی » ژاندرمەی تورك ئەگێڕێتەوە لە کوردستاندا . ئەوەی شایانی باسە لێرەدا ئەوەیە کە دوژمنانی کورد زۆر وەستان لە پڕوپاگەندە کردندا دژی گەلی کورد . بۆ وێنە لە جێیەکی وەك ئەورووپادا کە وڵاتی دیانە ، وا دیعایە ئـەکەن کە گوایە کورد موسوڵمانی تەنگەتیلکەن و ئەوە بۆ ماوەیەکی زۆر کوردیان بە

---

(١٤٧) وێنەی ئەو نامانــە وان لە ئارشیفی « یەکێتی نەتەوەیی خــوێندکارانی کورد لە ئەورووپــا » دا .

(١٤٨) Thema Hans : Wie Wild ist Kurdistan, in Publik, Nr. 5, Frankfurt, 30 - 1 1970, S. 27.

« ئەرمەنی کوژ » ئەدایــــە قەڵەم[149]. ئەمە بۆ ئەوەی بیر و رای

(١٤٩) کورد و ئەرمـەنی کە دوو گەلی دراوسـوێی یەکن ، بـە درێژایـی مێژوو ، برایانە لە تەنیشت یەکەوە و لە نـاو یەکتردا ژیاون . تەنانەت باوکی ئەدەبیاتی ئەرمەنی نوێ « ئەبۆ ڤیان » ئەڵێ : « کورد سوارچاکی رۆژهەلاتن بە هەموو مانای وشە » . بەلام سـیاسەتی داگیرکەرانە و ئیمپریالیستانەی دەوڵەتی عوسمانلی و دەوڵەتی رووسیای قەیسەری کارێکی وای کرد کە ئەم دوو گەلە برایە پێش جەنگی جیهانی یەکەم ، ناخۆشی بکەوێتە بەینیانەوە و بچن بەگـژ یەکتردا . بـەلام ئەم ناخۆشـی‌یە زۆر درێژەی نەکێشا ، هەرچـەندە بە زیانێکی زۆری هــەر دوو لا تەواو بوو ، ئەوە بوو پاش جەنگی جیهانی یـەکەم کورد و ئەرمــەنی دیسانەوە دەستیان کردەوە ملی یەك و دوژمنانی راستەقینەی خـۆیان ناسی‌یەوە و ، لەم ماوەیەدا گەلێك لە نووسەرانی ئەرمەنی وەك ئارشـاك شەفراستیان و بێجگە لە ئەرمەنی وەك لازاریفی رووس لە نووسـینەکانیانا ئەو راستی‌یەیان خستە بەرچـاو کە کورد لە کوشـتاری ئەرمەنی‌یەکانـدا گونـاهی نییـە و ئۆباڵی ئـەو خوێنڕێژی‌یە بـە گەردنـی تـورکە عوسمانلی‌یەکانـە .

لە هـاوینی سـاڵی ١٩٧١دا نووسەری ئـەم وتـارە لە لایـەن یانـەی ئەرمەنی‌یەکانەوە لە بەرلین بانـگ کرا بۆ ئەوەی وتارێك لەسەر کوردستان بخوێنێتەوە . ژمارەیەکی زۆر لە برا ئەرمەنی‌یەکانمان و لە ناو ئەوانـەدا هەندێکی خەڵـکی ئەرمەنستانی سـۆڤێتیش ئامادە بوون بێجگە لە ئەڵمان و خەڵـکی تر . وتارەکە کە لە لایەن :

« یەکێتی نەتەوەیـی خوێنـدکارانی کوردەوە لە ئەورووپـا » و « یانـەی ئەرمەنی » یەوە برا بەڕێوە ، لە ئەنجامدا بوو بە خۆپیشاندانێـکی گەورە =

گشتی ئەوروپا لە دژی کورد هان بدەن . چونکە هەر ئەوانە و هاوتای ئەوانەن کە لە ناو موسوڵمانەکاندا جۆرە دیعایەکی تر لە دژی کورد ئەکەن ، ئەوەش ئەوەیە گوایە کورد زەردەشتی و مەجوسی و دوژمنی ئاینی ئیسلامن . لە هەموی سەیرتر ئەوەیە نوسەر و بڵاوکەرەوەی ئەم بەیتو باڵۆرانە[١٥٠] ئەوەندە نەزان و نەفامن ؛ ئاینی زەردەشتی بە ئاینێکی ئاگر پەرست ئەدەنە قەڵەم و شۆڕشگێڕانی کەڵە پیاوی کوردی وەك ئەبو موسلیمی خوراسانی و بابەکی خوڕەمی[١٥١] بە ئاگرپەرست و فارس ئەدەنە قەڵەم .

ئەمجا ئەم پڕوپاگانەنە وەنەبێ هەر لە بارەی ئاینەوە بێ ، بەڵکو لە مەیدانی سیاسەتیشدا هەروایە . بۆ وێنە : لە جێگەیەکی وەك ئەڵمانیای رۆژئاوادا ، هەوڵ ئەدرێ کە بزوتنەوەی کوردایەتی بە درۆ و بوختان بە بزوتنەوەیەکی شیوعییانە بدرێتە قەڵەم . هەر لەم

---

= بۆ برایەتی کورد و ئەرمەنی .
هەموو کوردپەروەرێك پێویستە لەسەری ، رۆژ لە دوای رۆژ برایەتی و هاوکاری کورد و ئەرمەنی و ئاشوری بەهێزتر بکا . چونکە ئەم هاوکاری و برایەتییە بۆ چاکەی هەرسێ لایە . (جەمال) .

(١٥٠) بۆ وێنە تەماشای نامیلکەی « ماذا فی شمال العراق »ی ممن المجیلی و نامیلکەی « الشعوبیة عدو العرب الأول » ، بغداد ١٩٧٢ بکە .

(١٥١) لە دەرفەتێکدا وتارێکی گەورە لەسەر شۆڕشگێڕی سۆسیالیستی نەتەوە پەروەری کورد « بابەکی خوڕەمی » ئەنوسم ـ جەمال .

بارەیەوە لە دەورانی قاسمدا و لە کاتێکدا کە قاسم خۆی شۆڕشی کوردی بە دەسیسەی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا و ئەمریکا و ئینگلیز ئەدایە قەڵەم[152] ، ڕۆژنامەی Wehr - Politische Information ی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە لە شاری Koeln دەرئەچێ لە ۱۹٦۲/۱/۲٦دا نوستی بوی : « یەکێتی سۆڤیێت پشتگیری پێشمەرگەی کورد ئەکا و بە شەو فڕۆکەی سۆڤیێتی چەك و تفاقی جەنگی ئەبەن بۆ ناوچەی کوردستانی عێراق » . کەچی هەر لەو کاتەدا ڕۆژنامەی Neues Deutsehland زمانی حاڵی « حیزبی سوسیالیستی یەکگرتوی ئەڵمانیای ڕۆژهەڵات » لە ۱۹٦۲/٦/۷دا نوستی کە گوایە « حکومەتی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا مەشق بەو کوردە هەڵاتووانە ئەکا کە ڕایان کردووە بۆ ئەڵمانیا ، بۆ ئەوەی حکومەتی قاسم بڕوخێنن » . پاش بەستنی پەیمانی ۱۱ ی مارتی ۱۹۷۰ ڕۆژنامەنوسێکی ئەڵمانیای ڕۆژئاوا کە ناوی Rolf W. Schloss ە و لە ئیسرائیل ئەژی و لەوێوە پەیامنێری ڕادیۆی باڤاریایە ، زۆر بێشەرمانە لە وتارێکدا نوستی بوی کە گوایە « کوردەکان شیوعین و بزوتنەوەکەیان بە پەنجەی

---

(۱۵۲) تەماشای ڕۆژنامەی « العهد الجدید » زمارە ( ٤٦٤ ) ، ساڵی ۳ ، بەغدا ، ۲ تەموز ۱۹٦۲ بکە . هەرهەمان ڕۆژنامە ، ژمارە ( ٥۹۰ ) بەغدا ، ۲۷ ئاب ۱۹٦۲ . هەروەها ڕۆژنامەی « الثورة » ژمارە ، ۹۱۹ ، بەغدا ۱۹٦۲/۲/۱٤ . هەر هەمان ڕۆژنامە ، ژمارە ( ۱۰۱٤ ) بەغدا ۱۹٦۲/۱۰/۷ .

سـۆڤیێت ئەچێ بەڕێوە و بارزانیش نۆکەرێـکی سۆڤیێتە .»[١٥٣] و گەلێك بوختان و ناماقوڵی و درۆ و دەلەســەی تر کە بە توندو تیژی لە کاتی خۆیدا وەرامم داونەتەوە[١٥٤] .

چەند رۆژنامەنوسێـکی ئەڵمان هــەن بەیتو بالۆرەیەکی تر بۆ کورد لێ ئەدەن . ئەوەش ئەوەیە گوایە « ئیسرائیل و ئێران و کورد بونەتە یەك بەرە لە دژی گەلانی عەرەب » .

ئەم قسەیە بە زۆری لە لایەن کۆنە نازییەکانەوە ئەکرێ ، کە دۆستی شۆڤێنیستە عەرەبەکانن . ئەگەنا ئەمە لە خۆشەویستی گـەلی عەرەب نییە . چونـکە ئەو نازییانە دژی رەگەزی سامین ، سا ئیتر جولەکە بێ یا عەرەب ، ئەوە هــەریەکە بەلای ئەوانەوە . دوایی خۆشیان ئەزانن کە بزوتنــەوەی کوردایەتی تەنیــا لە دژی رەگەزپەرستی و زۆرداری چینایەتی و چەوساندنەوەی نەتەوەییە و لە دژی هیـچ گەلێـکی ئەم ســەرزەمینە نییە . یەکێك لەو کۆنە نازییانەی ئەم بوختان و درۆیانە بڵاوئەکاتەوە دوکتۆر مێسەر شمیتە کە خاوەنی « کۆمەڵەی رۆژهەلاتی نزیك » و گۆڤاری « رۆژهەلات

---

(١٥٣) Schloss, Rolf W. Ein Neuer Traum vom Kurdenstaat in Publik, Nr. 12, Frankfurt, 20. 3. 1970, s. 7.

(١٥٤) تەماشای کتێبی « کوردستان و شۆڕشەکەی » بکە . لاپەڕە : « ١٥ – ١٦ » کە بە ئەڵمانی لە لایەن جـەمال نەبـەزەوە نوسراوەتـەوە و لە ١٩٧٢دا لە چاپ دراوە .

Orient » ە لە هەمبورگ[155] . وەرامی ئەویشم هەر داوەتەوە[156] .

لەگەڵ ئەمەشـدا ئەتوانین بە هەمو دڵێـکەوە بڵێین کـە دوژمنـانی گەلی کورد لەناو گەلی ئەڵماندا ژمارەیەکی زۆر کەمن و زوربەی زۆری ئەو ئەڵمانانەی کورد ئەناسن و هەواڵ و باسی کوردیان بیستووە ، نیازیان باش و پاکە بەرامبەر کورد و کوردستان . ئێمەش ئەبێ ئەو هەستە باشە رۆژ بە رۆژ بەهێزتر بکەین .

جا کە لێرەدا ئێمە باسـی ئەو هەوڵ و تەقەلایەمان کرد کە زانا ئەڵمانەکان و رۆژنامەنوسـەکانیان داویانە بۆ ناساندنی کورد بە گەلی ئەڵمان زمان ، دیارە پێویستە باسێـکی کورتی ئەو تێـکۆشانەش بکەین کە کوردەکان خۆیان لەم ولاتانەدا داویانە لەم رووەوە :

لام وایـە میرزا محەممەد کە نـاوی بە « جەواد ئەلقازی » رۆیوە ، یەکەمین کوردێك بووە کە بە زمانی ئەڵمانی وتاری لەسەر کورد نوسیوە . من تا ئێستە بۆم ساغ نەبووەتەوە ئەم کوردە کێ بووە و خەڵـکی کوێ بووە ، بەلام ئەوەم بەلاوە ئاشکرایە کە لە پێش جەنـگی جیهـانی یەکەمدا لە ئەڵمانیا بووە و دوو وتاری لەسـەر کورد نوسیوە : یەکێـکیان لەسەر هۆزی مەنـگوڕە و لە

(١٥٥) تەماشای گۆڤاری orient ژمارە ( ٦ )ی ساڵی ١٩٦٧ بکە .

(١٥٦) تەماشای کتێبی « کوردستان و شۆڕشەکەی » لاپەڕە ( ١٩ ) بکە .

گۆڤاری Clobus دا بڵاوی کردۆته‌وه[۱۵۷] ، ئه‌وی تریشیان له‌سه‌ر « ده‌ستوور و یاسای کورده‌واری‌یه » و له گۆڤاری « زانستی به‌راوردکاری ماف » (علم الحقوق المقارن) به‌خشی کردووه[۱۵۸] .

پاش ئه‌و دوکتۆر کامه‌ران به‌درخان دێ که له پاش جه‌نگی جیهانی یه‌که‌م هاتووه‌ته ئه‌م وڵاته و له شاری Leipzig له ۱۹۲٦دا دوکتۆرای یاسای وه‌رگرتووه . به‌درخان له ۱۹۳۷دا له‌گه‌ڵ Herbert Oertel ناوێکی ئه‌ڵمان چیرۆکێکی کوردی به ناوی « ئه‌میری کوردستانه‌وه » به ئه‌ڵمانی بڵاوکردۆته‌وه[۱۵۹] .

تێکۆشانی کورده‌کان[۱٦۰] به گشتی له‌م ده ساڵی دوایی‌یه‌دا

(۱۵۷) Mohammed, Mirza (Djevat al-Kazi) : Der Kurdenstamm Mangur, in Clobus, xcvIII.

(۱۵۸) Mohammed, Mirza ( Djevat al - Kazi ) : Studien aus dem Rechtsleben in Kurdistan in der Zeitschrift fuer vergleichende Rechtswissenschaft, Band 22, 1909,

(۱۵۹) Bedir Kɪan, Prince Kamuran Aali und Oertel, Herbert : Der Adler von Kurdistan, Potsdamm, Ludwig Vosgenreiter Verlag, 1937.

(۱٦۰) که ئه‌ڵێم کورده‌کان ته‌نیا مه‌به‌ستم له‌وانه‌یه که ئیشیان کردووه بۆ کورد و به پێویستی سه‌رشانی خۆیانی ئه‌زانن و له کاتی دڵه‌وه بۆ فیداکاریتی له‌م پێناوه‌دا ئاماده‌ن . مه‌به‌ستم له‌وانه نییه که ئه‌گه‌ر بێتو فشه کوردایه‌تی‌یه‌ك بکه‌ن ته‌نیا له‌به‌ر ئه‌وه‌یه چونکه « شه‌ڕ له به‌تاڵی باشتره » . جه‌مال.

لەچاو جاراندا یەکجار زۆر بووە. یەکەم لەبەر ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لــەم ساڵانەی دوایی‌دا هاتنــە دەرەوە بۆ خوێندن لە ئەوروپا و بەتایبەتی لە ئەڵمانیا. دووەم: شۆڕشی کوردستان پاڵی بە گەلێك کوردەوە نا کە مەسـەلەی سیاسی گەلەکەیان لە بێگانە بگەیەنن. بەشێکی گەورەی ئەم کارە کەوتبووە سەر شانی ئـەو خوێندکارانەی هاتبوون بۆ ئەم وڵاتە بۆ خوێندن. ئەم خوێندکارانە ناو بە ناو، چاك یا خراپ، زۆر یا کەم، بەیاننامەیان لەسەر مەســەلەی کورد و وڵاتەکەی، لە ئەڵمانیا، وەك شوێنەکانی تری ئـەوروپا دەرکردووە و بەشێوانەتەوە. تەنانەت «کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا» دوو سێ ژمارەی لە گۆڤارەکەی کە ناوی «کوردستان» بوو بــە ئینگلیزی دەرئەچوو، بە ئەڵمانی دەرکرد. هەر لکی کۆمەڵە لــە ئەڵمانیای رۆژئاوا و لە شاری هایدلبەرگ گۆڤارێکی بە ئەڵمانی بە ناوی «شـۆڕشا کورد» ( Die Kurdiche Revuolution ) دەرکرد. یەکەمین ژمارەی لە ١٩٧١ و دووەمین ژمارەی لە ١٩٧٢دا دەرچوو. ئیتر دەرنەچوو. لکی کۆمەڵە لە نەمسا نامیلکەیەکی چەند لاپەڕەیی بەناوی «کورد — گەلێکی بێ دەوڵەت» لـە (٢٠) لاپەڕەیەکی بچووکدا و بە یارمەتی دوکتۆر Erich Koerner سکرتێری گشتی کۆمەڵەی مافی مرۆڤ لە نەمسە دەرکرد(١٦١).

---

(١٦١) Die Kurden, Volk ohne Staat, Publikation der Ksse in Oesterreich, 1972

تاکە تاکەی کوردیش لە نەمســـا و ئەڵمانیا و ســـویسرە ، پەیوەندییان لەگەڵ رۆژنامەنوسەکانی ئەم شـوێنانە پەیدا کردووە و باسی کوردیان تێگەیاندوَن . کوردێکی خەڵکی هەڵەبجە کە ناوی ( عەبدوڵلا قادر )ە و نزیکەی (٣٠) ساڵێك ئەبێ لە ئەڵمانیا ئەژێ ، بە هۆی ئەوەوە کە ئیشەکەی بە رەسمی وتار خوێندنەوەیە لە بارەی رۆژهەلاتەوە ، لەگەڵ ناوچەی ئەڵمانیا و نەمسا و ئەو ولاتانەی تردا کە بە ئەڵمانی ئەدوێن ، وتاری بە وێنەی سینەمایی‌یەوە لەسەر کورد خوێندۆتەوە هەندێ لە رۆژنامەکانی ئەو شوێنانە باسیان کردووە .

ئەم کوردە زیرەك و کوڵۆڵە ، ئێستە نەخۆشی‌یەکی زۆر قورسی گرتووە و لە شاری ( مۆنیخ ) بێ‌کەس و بێ‌دەر لێی کەوتووە .

لە ساڵی ١٩٦٣دا حیلمی عەباس کە کوردێکی خەڵکی ئەڵمانیایە و لە باوکێکی کورد و دایکێکی ئەڵمان لە ١٩٢٢دا هاتووەتە جیهانەوە ، کتێبێکی بە ناوی « کۆمەڵـــە هۆنراوەیەکی کوردی : دڵداری و پاڵەوانێتی»یەوە بە ئەڵمانی دەرکرد(١٦٢) . هەر ئەم کوردە ئەمساڵ چەند نیگارێکی لـــە بەرهەمی خۆی بە لێدوانێکەوە بـــە زمانی ئەڵمانی بلاوکردەوە . لەمەدا ئەڵێ ئەمانەم بە یادی کوردستانەوە بەرهەم هێناوە.

دوکتۆر کەمال فوئاد کاتی خۆی لـــە بەرلینی رۆژهەلات

(١٦٢) Abbas, Hilmi : Alt kurdische Kampf - und Liebeslieder, München, 1963.

ئەیخوێنند وتارێکی لەسەر ئەدەبی فولکلۆری کورد لە ساڵی ١٩٦٥دا لە گۆڤاری زانستگای هومبولتدا بڵاوکردەوە.(١٦٣)

کوردێکی خەڵکی کوردستانی تورکیا کە ناوی حەمە رەش رەشۆیە (حەمدی تورانلی)، چەند پارچە هۆنراوەیەکی خۆی کە بە کوردی و بەشێوەی کرمانجی ژوورو هەڵی بەستبون، کردنی بە ئەڵمانی و لە لایەن کۆمەڵەی جیهانی کوردستانەوە لە ئەمستردام لە ساڵی ١٩٦٧دا بە ناوی «باکور Norduind»ەوە لە شێوەی نامیلکەیەکدا بە ئەڵمانی و کوردی و لاتینی بڵاوکرایەوە(١٦٤) ئەمە بێجگە لەوەی ئەم کورە گۆڤارێکی بە کوردی کرمانجی باکور و تیپی لاتینی بە ناوی «چیا ـ Giya»وە لە بەرلین دەرکردووە.

هەروەها ٣ ژمارەی لە گۆڤارێکی تر بە ناوی Hêviya welêt لە مۆنیخ دەرکردووە.

ئەوەی شایانی باسە، لق و دامو دەزگای حیزبە سیاسییەکانی کوردستان لە ئەوروپا، هەریەکە بەپێی دەسەڵاتی خۆی لە ئەڵمانیا،

(١٦٣) Fuad, Kamal : Kurdische Folklore in literarischer Überlieferung, in Güng, die Wissenschaft Zeitschrift der Humboldt - Uni Brl. Ges - Sprachwiss. R-XIV., 1965, S. 615.

(١٦٤) Reso, Hemres : Bakur ( Nordwind ), International Society Kurdistan, Amsterdam, 1967.

وەك شوێنەکانی تری ئەوروپا ، بەیاننامەی بە ئەڵمانی و زمانەکانی تر بڵاوکردۆتەوە .

لە ۲۱ ی مارتی ۱۹٦٥دا « یەکێتی نەتەوەیی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا » لە لایەن نوسەری ئەم وتارەوە و بەپشتگیری و هاوکاری پێشمەرگەی جوانەمەرگ و شەهیدی کوردستان لەتیف عەلی و ئەندازیاری خاوەن دیپلۆم ب . ئیبراهیم لە شاری مۆنیخ دامەزرا[١٦٥] .

یەکێتی کە لە ئەوروپا ناوی بە Nukse ( نوکسە ) دەرکردووە ، هەر لە سەرەتاوە پێزەوێکی کارکردنی بۆ خۆی دەستنیشان کرد ، بۆ ئەوەی لەبەر رۆشنایی ئەوە ئامانجی کوردناسێنی خۆی ، چ لە بارەی زمان و ئەدەبیاتەوە و چ لە بارەی سیاسەتەوە ، بهێنێتە دی . نوکسە لەم رووەوە تا ئێستە ئەم خزمەتانەی خوارەوەی پێك هێناوە :

١ — وتار خوێندنەوە بە زمانی ئەڵمانی لەسەر کورد و کوردستان بە وێنەی سینەماییەوە و دەمەتەقێ کردن لەگەڵ گوێگرانی بێگانە لەسەر مەسەلەی کورد . تا ئێستە هەزاران وتاری لەم بابەتە لە هەمو شوێنێکی ئەڵمانیادا ، لە لایەن هاوبیرانی نوکسەوە خوێندراونەتەوە .

---

(١٦٥) ناوی یەکێتی بە ئینگلیزی :
•(National-Union of the kurdish students in Europe)
وکورتە ناوەکەی : NUKSE بە .

٢ــ دەرکردنی رۆژنامەیەك بە زمانی ئەڵمانی بە ناوی «دەنگو باسی کوردستان Kurdistun Iufolmation »ەوە ، بۆ بڵاوکردنەوەی دەنگوباسی راستەقینە لە بارەی مەسەلەی کوردەوە و بەرپەرچدانەوەی دوژمنانی گەلی کورد و ئەمجا بەشێنەوەی بەسەر پارتە سیاسی‌یەکان و زاناکان و رۆژنامەنوسەکان و نامەخانەکان و خەڵکی ناسراودا لە ئەڵمانیا و نەمسا و ئەو شوێنانەی تردا کە بە ئەڵمانی ئەدوێن ، ناو بە ناو بە خۆڕایی ئەم رۆژنامەیە دەورێکی گەورەی بووە و هەیە لە رۆنکردنەوەی روی گەش و روناکی بزوتنەوەی ئازادیخوازانەی گەلی کورددا .

٣ــ خۆ پێشکەش کردن بۆ دەرز وتنەوەی کوردی لە زانستگاکانی ئەڵمانیادا . نوسەری ئەم وتارە لە ساڵی ١٩٦٤ەوە تا ساڵی ١٩٧٠ لە سێ زانستگای گەورەی ئەڵمانیا : مۆنیخ و ڤیرتن بورك و هەمبورك ، زمانی کوردی وتوودتەوە و چەند پرۆفیسۆر و زانایەکی تری ئەڵمان ، لە خوێندنی ئەو دەرزانەدا بەشدار بون .

لە زستانی ساڵی ١٩٧١ەوە نوسەری ئەم وتارە لە زانستگای ئازاد لە بەرلین دامەزراوە بۆ دەرزوتنەوەی ئێتنۆلۆژی Ethnologie و سەرەڕای بەربەرەکانی ناحەزان و دوژمنانی کورد ، توانیویەتی زمان و ئەدەبیات و مەسەلەی سیاسی کوردستان بە شێوەیەکی رەسمی لە زانستگادا بڵێتەوە . ئێستەکە گەلێ خوێندکاری کورد و کوردستان ( وەك برا ئاشوری‌یەکانمان ) و ئەڵمان لەو سەمنیارانەدا بەشدارن و ئەخوێنن .

٤ــ بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك نامیلکە و کتێب بە زمانی ئەڵمانی لە بارەی زمان و ئەدەبیاتی کورد و مەسەلەی سیاسی کوردستانەوە . تەنیا ناوی چەند دانەیەك لەمانە ئەبەین :

١ــ «مەم و زین»(١٦٦) : گۆڕینی کورتەیەکی چیرۆکی «مەم و زین» ی ئەحمەدی خانییە لەگەڵ پێشەکییەکی پێویست لە بارەی جێگەی « مەم و زین » ەوە لە مێژووی ئەدەبیاتی کوردیدا .

٢ــ « پەندی پێشینان و قسەی نەستەق لە کوردستانەوە »(١٦٧) گۆڕینی ژمارەیەکی زۆر پەندی پێشینان و قسەی نەستەق بۆ ئەڵمانی ، لەگەڵ تێکستە کوردییەکانی ، بە پیتی لاتینی و بە پێشەکییەکی پێویستەوە لە بارەی گرنگی پەندی پێشینان بۆ ئەدەبی فولکلوری کورد .

٣ــ « کریستۆماتی کوردی »(١٦٨) : بڵاوکردنەوەی پێنج پارچە لە بەرهەمی پێنج نوسەر و هۆنەری کوردی وەك : جەمیل

(١٦٦) Nebez, Jemal : Mam und zuen, deutsche Übersetzung einer Liebesgeschichte von dem beruehmter kurdischen Dichter Ahmad Chani, Publikation der NUKSE, Muenchen, 1969.

(١٦٧) Nebez, Jemal : Sprichwörter und Redeusarten aus Kurdistan, Publikation der NUKSE, Muenchen, 1970.

(١٦٨) Nebez, Jemal : Kurdische Schriftsprache, chrestomathie moderner Texte, Helmut Buske verlag-Hamburg, 1969.

رۆژبەیاتی ، پاکیزەی رەفیق حیلمی ، ئەحمەد هەردی ، وینس دڵدار ، ئەورەحمان هـەژار ، بـە پیتی عـەرەبی و پیتی لاتینی و ترانسکریپسیۆنەوە . لەگەڵ سەرەتایەك لە بارەی گیروگرفتەکانی زمانی کوردی‌یەوە هەروەها فەرهەنـگۆکێـکی کوردی — ئەڵمانی بۆ ئەو وشانەی لە تێـکستەکاندا ناویان هاتووە . ئەم نامیلـکەیە بەکاری ئەو ئەڵمانانە دێ کە خەریکی زمانی کوردین .

٤ — « چیرۆکی لالۆ کەریم »(١٦٩) : گۆڕینی ئەڵمانی یەکێك لە چیرۆکەکانی نوسەری ئەم وتارەیە کە لە ساڵی ١٩٥٦دا لە کەرکوك نوسیویەتی . لەگەڵ سەرەتایەك لە بارەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کوردەوە ، بە گەلێك نەخشو نیـگاری جوانەوە .

٥ — لێـکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بە زمانی ئەڵمانی لە بارەی میری رەواندز ( پاشا کۆرە )دوە ، لەبەر رۆشنایی بەڵـگە و سـەرچاوە رۆژهـەڵاتی و رۆژئاوایی‌یەکان ئەم کتێبە نامەی دوکتۆرای یەکەمی نوسـەر بو کە لە کۆتایی سـاڵی ١٩٦٩ دا پێشکەش زانستگای هەمبورگ کرا . لە ١٨٠ لاپەڕەدا چاپ و بڵاوکراوەتەوە(١٧٠) .

---

(١٦٩) Nebez, Jemal, ( Mit Illustration von Doris Feyerabend ): Lalo Karim, Muenchen, Selbstverlag, 1968

(١٧٠) Nebez, Jemal : Der kurdlsche Fuerst mir Muhammad-i Rawandizi, genannt Mir - i kora, im Spiegel der morgenländischen und abendländischen Zeugnisse, Hamburg, 1970

٦– «ئەفسانە و چیرۆکی کوردی»[١٧١] : گۆڕینی (١٩) ئەفسانە و چیرۆکی دەمی «هیقایەت» لە کوردییەوە بۆ ئەڵمانی، لەگەڵ پێشەکییەکی (١٣) لاپەڕەیی لە بارەی دەوری ئەفسانە و چیرۆکی دەمییەوە لە ئەدەبیاتی کوردیدا . ئەم کتێبە پاشکۆیەکی لەگەڵە بریتییە لە لێکۆڵینەوەیەکی کورت لە بارەی ئەو بەرهەمانەوە کە تا ئێستە لە لایەن خۆ و بێگانەوە لەم مەیدانەدا پێشکەش کراون . هەروەها بەشێکی تەرخان کراوە بۆ شی کردنەوەی هەندێ وشەی کوردی کە ناویان لە ناو چیرۆکەکاندا هاتووە، بە پێی زانستی زمانەوانی . کتێبەکە هەمووی (١٥٢) لاپەڕەیە و (٨) نیگاری زۆر جوان و نایابی لەگەڵە و لە بەرگێکی رەنگاو رەنگی قەشەنگدا لە چاپدراوە .

٧– «کوردستان و شۆڕشەکەی»[١٧٢] : ئەمە زنجیرە وتارێکە نوسەر لە ساڵی ١٩٧١دا بە زمانی ئەڵمانی و بە چەند جارێك، لە بەرلینی رۆژئاوا بۆ کورد و هاورێکانی کوردستانی خوێندۆتەوە . ئەم کتێبە بریتییە لە باسێکی مێژوویی سیاسی گەلی کورد بە هەموو بزوتنەوە و کۆمەڵ و حیزبە سیاسییەکانییەوە و لە هەموو بەشەکانی

(١٧١) Nebez, Jemal (Mit Illustration von Doris Feyerabend): kurdische Märchen und Volkserzählungen, Publikation der Nukse, Bamberg, 1972.

(١٧٢) Nebez, Jemal : Kurdistan und seine Revolution, Publikation der NUKSE, 1972.

کوردستاندا ، هەر لە کۆنەوە تا ئێستە . لەگەڵ لێکۆڵینەوەیەکی باری سەرنجی رۆژنامەنوس و سیاسەتگێڕ و دەوڵەتەکانی رۆژهەڵات و رۆژئاوا بەرامبەر بە کورد .

بێجگە لەوەش پاشکۆیەکی (٣٨) لاپەڕەیی لەگەڵە بۆ زانیاریی زیاتر لە بارەی کورد و کوردستانەوە وەك : ئابوریی کوردستان و ژینی کۆمەڵایەتی و پایەی ژنان و ئاین و باسی ئەنترۆپۆلۆژی و ... هتد لەگەڵ بەندێك لەسەر سوپای پێشمەرگە و دەستوری نوکسە و گۆرانی مارشی نەتەوەیی کورد ( ئـەی رەقیب ) بۆ ئەڵمانی بـــە شیعر . هەروەها باسی نەورۆز و بەندێك لەسەر زمان و ئەدەبیاتی کوردی و گەلێ شتی تری وا کە بێگانە ئاشنا ئەکەن بە کورد و وڵاتەکەی . ئەم کتێبە هەموی لە (٣٣٠) لاپەڕەدا چاپکراوە و گەلێك وێنەی جوانی وڵات و نەخشەیەکی کوردستانی لەگەڵە .

٨ــ « حول المشكلة الكردية »[١٧٣] نامیلکەیەکە لە لایەن نوسەری ئەم وتارەوە بە عەرەبی لـە مۆنیخ لە سـاڵی (١٩٦٩)دا بڵاوکراوەتەوە . ئەم نامیلکەیە بە زۆری بیروڕای حیزبە سیاسیەکانی وڵاتی عەرەب و کوردستان و ئەو حکومەتانە نیشـــان ئەدا کە پەیوەندی‌یان بە کوردستانەوە هەیە . لەگەڵ مێژوویەکی کورتی گەلی کورد و تێکۆشانی لە پێناوی رزگاریدا هەر لە کۆنەوە تا ئێستە هەموی بە بەڵـگەوە .

---

(١٧٣) نبز ، جمال : حول المشكلة الكردية من منشورات « الاتحـاد القومي للطلبة الاكراد في اوروبا » ، ١٩٦٩ .

٩— « ڕوانگەیەکی کورد بۆ تەماشا کردنی مانگ لە دەوری نوێدا »(١٧٤) : ئەمە وتارێکی نووسەرە بە زمانی ئەڵمانی لە بارەی ژیان و بەسەرهات و کارەکانی زانای ئەستێرەوانی کورد « شێخ حەسەنی گڵەزەردە »ەوە . ئەم وتارە لە ژمارە (١٢٢)ی ZDMG واتا « گۆڤاری کۆمەڵەی ڕۆژهەڵاتییەوانەکانی ئەڵمان »دا بڵاوکراوەتەوە .

ئەمانە تەنیا بەشێك بوون لەو بەرهەمانەی نووسەر کە لەسەر کورد نووسراونەتەوە . ئەو وتارانەی لە بارەی کوردەوە نەبوون ، لێرەدا ناویان نەبرا . ئەم نووسراوانە ژمارە (٣) و (٩)ی لێدەرچوو ، ئەوانی تری هەموو لە لایەن « یەکێتیی نەتەوەیی خوێندکارانی کوردەوە لە ئەوروپا » بڵاوکراونەتەوە .

بێجگە لە مانەش ، نووسەر دوو بەرهەمی تری بە ئەڵمانی ئامادە کردووە کە هێشتا چاپ نەکراون . یەکێکیان : « فەرهەنگی ئەڵمانی ـ کوردی »یە کە نزیکەی (٣٠٠٠٠) وشەیەك ئەبێ ، کە مانا کوردییەکانیان بە پیتی عەرەبی و لاتینی و ترانسکریپسیۆن نووسراونەتەوە . جاروبار ماناکان بە چەند شێوەیەکی کوردی لێك دراونەتەوە .

(١٧٤) Nebez, Jemal und Schlosser, W. : Ein kurdisches Mondobservatorium...... etc, in ZDMG, 122.

دووەمیان : نامیلکەیەك بە ئەڵمانی بۆ فێربوونی زمانی کوردی ، بۆ ئەوەی لە زانستگاکاندا بەکار بهێنرێ .

هەروەها نووسەر کەلی کورتە چیرۆکی بە ئەڵمانی نووسیوە لەگەڵ بەسەرهاتی چەنـــد ساڵەی خۆی لەناو ئەم وڵاتانەدا ، کە ئەوانیشی هێشتا بڵاونەکراونەتەوە .

* * * * * *

## ـ ملخص المقال ـ

## لمحة

# عن تاريخ الدراسات حول الكرد في المانيا

د. جمال نبز

يتناول كاتب المقال تاريخ الدراسات حول الكرد في المانيا ، ويتوخى من هذه العبارة Kurden Kunde معنى واسعاً ، تشمل جميع الجهود والمساعي والنشاطات المبذولة لتعريف الكرد بالألمان ( او من يتكلمون الالمانية ) من جميع الوجوه اللغوية والادبية ومن النواحي السياسية والتأريخية والأجتماعية والفنية و حتى الاخبار المنشورة على صفحات الجرائد .

ويؤكد كاتب المقال على ان تطور الوضع السياسي في كردستان في الفترة الأخيرة قد أثرت وبشكل فعال على توسيع معلومات الألمان بالشعب الكردي واصبحت كلمة ( كردستان ) تردد على الشفاه وتكتب على صفحات الجرائد . كما ويستقرى كاتب المقال المحاولات البدائية لهذه المسألة ، ولا يستبعد الكاتب ان تكون الرسالة السياحية

للصائغ الباقاري Schiltbrger في ١٤٧٣ اول محاولة في هذا المجال ، ويعتبر هذه الرسالة اقدم مصدر ذكر فيها اسم الكرد . وكذلك التقرير الحربي المنشور في مجلة ( Tuerchis - Estata - und Kriep - Beliclat ) والمحرر من قبل ( توماس فون ) الصادرة في شهر شباط ١٦٨٤ في همبورك . وبعد ذلك وفي القرن الثامن عشر الميلادي توجد مصادر عدة تبحث عن الكرد ومنها رحلة قام بها ( نيبور ) للبلاد العربية وماجاورها ، وفي القسم الثاني من هذه الرسالة السياحية التي صدرت عام ١٧٦٦ بحث حول الكرد . كما قام ( بيرك ) رحلة الى كردستان وگرجستان واناضول والعراق وقد نشر كراساً حول رحلته ، فيه صور رائعة وخارطتان .

ويضيف الاستاذ نبز بانه ظهرت في القرن التاسع عشر مصادر كثيرة باللغة الالمانية حول الكرد وكردستان . والحقيقة انه قد كتب عن التاريخ واللغة والادب الكردي في هذا القرن كل الذين زاروا كردستان بالاضافة الى العلماء والمستشرقين .

ثم يشير الكاتب الى ان لنشر قصة القاص الالماني كارل ماي ( ١٨٤٢—١٩١٢ ) والصادرة بعنوان ( خلال كردستان الموحشة ) اثر كبير في نشر اسم الكرد ليس في المانيا وحسب بل وفي اوروبا باسرها . وبالرغم من ان هذه القصة ذات طابع اسطوري وفيها من الاجواء البعيدة عن الواقع الشيء الكثير ، الا ان فيها الكثير من الجوانب التي تسلط الضوء على خصائل الشعب الكردي وصفاته النبيلة .

والجدير بالذكر أن كاتب القصة أعتمد في صياغة قصته على أحاديث

رواة الملاحم في تلك الايام . كما ويستعرض أسماء المستشرقين والعلماء الذين كتبوا عن الكرد ؛ ومنهم المؤرخ النمساوي ( فون همر ) الذي كتب مؤلفات عديدة حول تأريخ الأمبراطورية العثمانية وكتب بحثاً عن اللغة الكردية ولهجاتها على ضوء الجزء الثالث لكتاب الرحالة التركي ( أولياچلبي ) في سنة ١٨١٤ . ثم يستطرد الكاتب قائلا :

كانت العلاقات السياسية والتجارية وثيقة بين الدولتين العثمانية والبروسية الألمانية في القرن الماضي ومن خلال هذا التعاون ساهم ضباط ألمان في الحرب ضد ثوار الكرد آنذاك ومنهم (هيلموت فون مولتكه ) ، ساهم هذا الضابط في الحرب والقمع ، وفي الرسائل التي كان يبعث بها ( مولتكه ) الى زوجته ، يتحدث فيها عن شجاعة وبأس الكرد . كما يشير الى الحزازات والخلافات بين الاكراد ، وإلى أن رؤوساء العشائر كانوا يدافعون عن افراد عشيرتهم فقط ، دون الاتحاد تحت راية قومية . ويأسف مولتكه لهذا ويقول لو أتحد الأكراد لأصبح الوقوف بوجهم أمراً غير ممكن . وفي المقال أسماء قسم من الرحالة الأوروبين والأمريكان الذين زاروا كردستان وكتبوا عن الكرد بحوثاً بعضها جيدة واخرى رديئة ؛ كالرحالة الألمانى ( بلاو ) الذي زار كردستان إيران وتركيا ونشر مجموعة من نتاجاته في ( ١٨٥٨ — ١٨٦٢ ) وله كراس حول قبائل شمال شرقي كردستان كما كتب في مجلة ( المستشرقين الألمان ZDMG ) مقالين حول رحلته إلى بحيرتي ( اورمية ) و ( وان ) .

ثم يذكر الدكتور نبز أسماء ڤامبرى و بيكر و ڤونش وهذا الأخير نمساوى زار كردستان وألف كتابين حول أرمنستان وكردستان .

ويذكر اسماء آخرين أمثـال بيلك وبورخارد و البروفيسور المتخصص في الدراسات الأسلامية ادوارد سخاو .

ويشير الـكاتب الى ان بعض الرحالة الألمان الذين زاروا كردستان في القرن الماضي كتبوا بحوثا ودراسـات بعيدة عن الواقع والمعادية للشعب الكردي . ان هؤلاء استندوا في ارائهم على اقوال اعـــداء الكرد من العثمانيين والقاجاريين ارضـاءاً لهم . ثم يدرج اسماء مؤلفين وكتاب من هذا النوع : منهم فاولر الذي يتهم الكرد بالقساوة وسفك الدماء في كتابه الذي يتناول رحلته وبقـاءه مدة ســـنتين في بلاد الفارس ، وموريتز ڤاكنر والبـــارون فون‌نولده الذي له آراء غير موضوعية تجاه الاكراد ايضاً .

ويقول الـكاتب : توجد كتب من هذا النوع باللغات الاخرى ايضاً . وهويفسر اسباب ذلك الى عدم وجود مدافعين عن شعبنا الـكردي للرد على هؤلاء ، ويقـول : اذا كان المقياس الذي يقاس به اي شعب هو مجموعة جرائم عادية فردية النوع ، فلاينجو اي شـعب او اية دولة من امثال هذه التهم .

ثم يذكر اسم المؤرخ ( فون‌همر ) الذي بنى أقواله وتهمه ضد الـكرد في مؤلفاته (حول تأريخ الأمبراطورية العثمانية ) حسب اهواء واراء الساسة من آل عثمان .

ويقتبس مقتطفات من أقوال العالم الروسي ( خالفين ) والذي يفند تلك الاراء . ويقول الـكاتب بأن البشائر تلوح في الأفق،وإن هذه التهم والافتراءات ما أثرت على سمعة الـكرد وكردستان ولم تمنع علماء

الألمان من مواصلة دراساتهم حول اللغة والأدب والتأريخ الكردي ومنهم :

فردريك فوّن بودن شتيت الذي نشر في سنة ١٨٤٩ بحثاً علمياً حول الأغاني والموسيقى الكردية .

كما تمت ترجمة ثلاثة أجزاء من مؤلفات العالم الروسي ( بيترليرج ) إلى الألمانية في سنة ١٨٥٧ — ١٨٥٨ وتضم هذه الأجزاء تحليلات وبحوث حول الكرد والطوائف الكلدانية الأيرانية . هذا وقدم فردريك ميولر النمساوي نتاجات ثلاث حول اللغة الكردية أحدها بحث حول معجم ( كردي — سرياني ) والآخر حول لهجة ( زازا ) والثالث حول اللهجة الشمالية ونشرت الأبحاث على التوالي في ١٨٦٣ ، ١٨٦٤ ، ١٨٩٤ في فينا .

ونشر ( بارب ) عضو الأكاديمية العلمية في فينا في ١٨٥٨ ـ ١٨٥٩ عدة تقارير علمية حول الشرفنامة ( لشرفخان البدليسى ) . .

ويتطرق الكاتب الى ذكر اسماء اخرى كشليفل و البروفيسور فرديانديوستي الذي كتب بحثاً حول ( أصوات اللغة الكردية ) والبحث هذا تم على ضوء مقارنة اللغات الهندو ايرانية ، ويذكر اسم هوتوم شيندلر و العالم السويسري البرت سوسين ( ١٨٤٤ — ١٨٩٩ ) وهو المتخصص في الدراسات الأسلامية في جامعة لايبزك والذي نشر بالأشتراك مع ( تنكن بيرن ) كتاباً بجزءين ، يتضمنان اقاصيص وحكايات وملاحم فولكلورية .

كما وكتب العالم واللغوي الألماني الشهير البروفيسور ( تيودور

نويلدكه ) في ( ١٨٣٦ ـ ١٩٣٠ ) بحثاً مهماً حول كلمة (الكاردو ) Kardu وعلاقتها بـ( كورد) ونشر هذا الكتاب في ١٨٩٨ في برلين .

وهناك ضابط الماني كتب تقريراً جغرافياً وتأريخياً من الناحية العسكرية حول مدينة السليمانية ( التي كانت سنجقاً عثمانيا آنذاك ) وحول إيران ، ومع هذا التقرير خارطة توضح موقع السليمانية في زمن الاشوريين والبابليين .

ثم يستطرد الدكتور نبز قائلا :

في اواخر القرن الماضي وإلى الحرب العالمية الاولى ، توجه علماء ألمان مشهورون كالپروفيسور أوسكارمان وفون لكوك وأدوارد سخاو ومارتين هارتمان إلى كردستان ونقلوا مخطوطات كردية كثيرة الى متاحف المانيا وقدموا بحوثاً ودراسات كثيرة حول تأريخ ولغة وأدب الكرد . ويوجد الكثير من هذه المخطوطات في مكتبات ومتاحف أوروبا .

زار أوسكارمان كردستان في ١٩٠١ ـ ١٩٠٣ وفي ١٩٠٦ ـ ١٩٠٧ وبلاد الفارس واماكن اخرى وبعد عودته قدم بحوثاً كثيرة ، منها بحث حول اللغة الكردية ـ والفارسية ، وفي البحوث التي تتعلق بالدراسات الكردية حاول تحليل اللهجات الكردية ، كاللهجة الموكرية ، والزازا ، واللورية والكرماشانية والكلهورية والكرمانجية الشرقية ولغرضه العلمي هذا جمع أقاصيص وملاحم كملحمة ( مموزين ) وناسرومال مال .... الخ كما وترك آثاراً غير منشورة في مكتبة جامعة هومبولت في برلين الشرقية .

زار فون لكوك سنة ١٩٠١ الأماكن الأثرية في منطقة (زنجيرلى) بكردستان تركيا وجمع كثيراً من الاقوال والامثال الكردية وجمع قاموس نوبار لاحمد الخاني والمولد النبوي الذي يراه من آثار (ملاى باطى) . ويأتي بعد هؤلاء مارتين هارتمان الذي قدم بحوثاً كثيرة منها التأريخ التوپوكرافي لـ (بوتان) في ١٨٥١ ـ ١٩١٨ ، كما ونشر ديوان الملا الجزيري في طبعة أنيقة ولاول مرة ، ويقول الكاتب بأن هارتان إضافة الى دراساته هذه كان صديقاً حميماً لشعبنا الكردي..

ثم يأتي اسم هوكومكس وفون هاندل ورودلف فرانك الذى ألف كراساً عن الشيخ (عادي) شيخ اليزيدية .

وقد كتب بعض من الألمان مقالات عسكرية واستراتيجية تخص كردستان ، منهم كراف ڤيستارپ الذي أشار في مقاله إلى الطرق الموجودة في كردستان و أرمنستان ، وفيلهلم باخمان الذي كتب تقريراً حول الطرق الكائنة بين الموصل و وان ، والمستقى من خارطة مرسومة خصيصاً لهذه المنطقة ، وكانت فائدة هذا التقرير من الناحية العسكرية كبيرة ، وخاصة في الحرب العالمية الأولى . ثم أورد الكاتب أسم إيڤالدبانز الذي حرر عدة مقالات حول الوضع الستراتيجي لكردستان العراق ، وأسم العالم اللغوي النمساوي وعضو المجمع العلمي الملكي في فينا البروفيسور ماكسيميليان بيتنر الذي نشر الكتابين المقدسين لليزيدين بالعربية والكردية مع الترجمة الألمانية .

ويضيف الأستاذ (نبز) قائلا :

إن هذه الدراسات قد مهدت الطريق وخاصة بعد العرب لبعض علماء

الألمان كي يقوموا بتقديم دراسات أخرى حول اللغة الكردية أمثال : كارل‌هدانك الذي إستفاد من التراث الذي خلفه أوسكارمان بالأضافة إلى أنه كان صديقاً حميماً للمؤرخ الكردي المرحوم حسين حزني المكرياني وللدكتور كامران بدرخان وأستفاد منهما كثيراً ، كما وكتب بحثاً حول اللهجات الكردية وقام بمراجعة البحث المدون من قبل أوسكارمان حول لهجة (الزازا) . لم تقتصر هذه الدراسات على البحوث اللغوية وحسب بل كتب برلينر وبورخارد أبحاثاً حول المصنوعات اليدوية الخفيفة في كردستان ، ثم يذكر الكاتب أسماء تيلكه وهيسه وأرنست كليبل وزيك والدكتور فون ڤيزن دونك الذي كتب مقالا بعنوان (المسألة الكردية) ونشره في سنة ١٩٣١ .

ويشير الكاتب إلى أنه في وضون الحرب العالمية الثانية نشر اوتوڤيرنر و فون هينتيگه كراساً في (٩٦) صفحة في مدينة پوتسدام تحت عنوان (من كردستان .... إلى الوطن) . ويوضح الكاتب كيف أن الألمان حاولوا كسب ود الكرد خلال الحرب العالمية الثانية وقبلها ، لدفعهم ضد الانكليز فأوكلت هذه المهمة إلى الضابط الألماني گوتفريد يوهانيس الذي الف كتاباً حول الموضوع ونشره في سنة ١٩٣٧ بعنوان « الولوج في كردستان المغلقة » وكتاب آخر في ١٩٥٩ باسم « في الشرق المشتعلة » وفي هذا الأخير يتطرق الضابط الى هذه المهمة والى خصال الشعب الكردي .

ثم ينتقد كاتب المقال موقف الذين كتبوا عن الكرد دون الأستناد إلى الدلائل العلمية ، ملفقين التهم الباطلة ويشير الى أسماء

كهانس . ف . ك . والذي يدعى في مؤلفه بأن اللغة الكردية لهجة فارسية ، وكهيرتزفيلد الذي زار منطقة زەردي‌ئاوا و بيكولى لكشف آثار الخطوط البهلوية للساسانين ، ويعتبر حسن ضيافة الاكراد ايذاء روحياً له .

ثم يشير الكاتب الى البروفيسور السويدي شتيك فيكاندر الذي كتب مقالا حول عيد يقام في كردستان وقد جاء ذكره في آفيستا زردشت . ويقول ان الصحفي الأيسلندي ( ارلندر ) الذي زار كردستان في ١٩٦٣ و ١٩٦٥ ألف كتاباً باللغة الأيسلندية والذي نشر بالألمانية أيضاً باسم « كردستان ... بلد في ثورة » . وكما نشر هانس هينله كتاب « الشرق الاوسط الحديث » وقد بين فيه وجهة نظره الموضوعية تجاه المسألة الكردية .

وكرس العالم الألماني فواڤگانك رودولف نفسه للدراسة حول الثقافة والحياة الأجتماعية في كردستان وهو أستاذ الأتنولوجيا بالجامعة الحرة في برلين . وقد زار لدراسته هذه كردستان مرات ثلاث ، الأولى في خريف ١٩٥٨ وكانت نكردستان تركيا ، والزيارتين الاخيرتين كانتا لكردستان ايران في عام ١٩٦٢ و ١٩٦٤ — ١٩٦٥ ، ونشر بعد عودته من كردستان تركيا في ١٩٥٩ مقالين احدهما في مجلة (العلم والتكنيك) والآخر في مجلة ( سوسيولوجى ) وكما كتب مقالات أخرى منها مقالا حول قبيلة فيض‌الله بگ بوكان ، بمساعدة كردي أسمه حسن فلاح .

قام الصحفي الألماني ( كارستين ديتمان ) بجولة في كردستان ومكث فترة فيها وعاش بين الپيشمەرگه وبعد عودته ألف كتاباً فيه

مناظر كردستان وصور الپيشمەرگە البواسل .

يقول الدكتور نبز أن الشعوب الألمانيـة والنمساوية والسويسرية سجلوا كثيراً حول القضية الكردية وخاصة في السنوات العشر الأخيرة ولم يكتفوا بذلك بل قاموا بعرض القضية من شـاشة التلفزيون ومن خلال الاذاعات وصفحات الجرائد .

ويرى الـكاتب أن وجود دراسـات كثيرة كهذه لا يعني ان الشعب الألماني جميعاً قد أستوعب القضية الكردية كما هي ، ذلك لأن الكثير منهم يعرف شعبنا من خلال قصة ( كارل‌ماى ) .

وينتقل الـكاتب بعد ذلك إلى جهود أبناء الـكرد أنفسـهم وفي رأيه أن ميرزا محمد المعروف بـ ( جواد القاضي ) هو أول كردي كتب باللغة الألمانية إذ أنه نشر مقالين أحدهما حول عشـــيرة ( مه‌نكور ) ونشره في مجلة Glous والآخر في مجلة ( عـلم الحقوق المقارن ) ، ويأتي بعده الدكتور كامران بدرخان الذي كان في المانيا بعد الحرب العالميـة الأولى وأستقرقى لايبزغ سنة ١٩٢٦ وحصل على شهادة الدكتوراه في القانون . لقد كتب الدكتور بدرخان مع هربرت الألماني قصة بعنوان ( أمير كردستان ) .

ويقول : خلاصة القول أن النشاطات حول المسألة الكردية كقضية وكشعب له تأريخ وماضي وتراث عريق توهجت في السنوات الاخيرة ويعود أسباب ذلك إلى وجود المنظمات السياسية والطلبة الأكراد الذين يتلقون دراستهم هناك ، إن هذه المنظمات ســـاهمت في هذا المجال ، حيث أصدرت جمعية الطلبة الأكراد في أوروبا مجلة ( كردستان ) التي تصدر باللغتين الأنكليزية والألمانية . كما قام فرع الجمعية في المانيا الغربية

بأصدار مجلة « الثورة الكردية » ونشر فرع نمسا كراساً بعنوان ( كرد ـ شعب بلا دولة ) وكان ذلك بمساعدة الدكتور إيرج كورنر السكرتير العام لجمعية حقوق الأنسان في نمسا .

ويتطرق الكاتب إلى ذكر كردي آخر من مدينة (حلبجة) وهو السيد (عبد الله) الذي يعيش في المانيا منذ ثلاثين سنة وقدم من خلال عمله ـ قراءة الأحاديث حـول الشـرق ـ أحاديث مصورة عن الشعب الكردي ، ثم يذكر حلمي عباس وهو كردي في المانيـا الذي ساهم بنشاطات عديدة في هـذا المجال . كما ويذكر الدكتور كمال فؤاد الذي قدم أطروحة دكتوراه حول المخطوطات الكردية ، ويقول بأن هذه الدراسة تفيد الألمان الذين يهتمون بالدراسات الكردية وكما يشير الى أن الدكتور فؤاد قد نشر مقالا حـول الفولـكلور الكردي في سنة ١٩٦٥ في مجلة جامعة همبولت .

كما ساهم كردي آخر من كردستان تركيا وهو حمه رش رشو بنشر قصائد عديدة حررهـا باللهجة الكرمانجية وترجمها الى الألمانيـة بالأضافة إلى قيامه بأصـــدار مجلة بعنوان ( چيا ـ الجبل ) بالحروف اللاتينية في برلين ، كما واصدر ثلاثة أعداد من مجلة « Héviy Welét ـ أمل الوطن » في مونيخ .

ويتحدث الـكاتب عن تأسيس « الأتحاد القومى للطلبة الاكراد في اوروپا » من قبله وعضوية الپيشمەرگه الشهيد « لطيف على » و المهندس ب. إبراهيم في مدينه مونيخ ، ويعرف هذا الأتحاد باسم ( نوكسه ـ Nukse ) ، وله منهج واضح لخدمة الكرد وكردستان من

الاوجه اللغوية والأدبية والسياسية . لقد قامت هذه المنظمة بنشاطات عديدة في القاء المحاضرات وعرض الأفلام السينمائية واصدار جريدة تحت عنوان « اخبار كردستان » التي كانت تعنى بنشر الأخبار الحقيقية والرد على التهم الملفقة ضد القضية الكردية ، وكانت هذه الجريدة توزع على المنظمات والأحزاب السياسية في المانيا ، .. وكلفت المنظمة أعضائها بتدريس اللغة الكردية في جامعات المانيا ، وقد قام كاتب المقال بصفته أحد أعضاء الجمعية بتدريس اللغة الكردية في جامعات مونيخ و فيرتزبورك وهمبورك من سنة ١٩٦٤ الى ١٩٧٠ ، إلى أن عين استاذاً في الجامعة الحرة ببرلين في شتاء ١٩٧١ لدراسة الأثنولوجيا . كما قامت منظمة (Nukse) بنشر سلسلة مقالات وكتب حول اللغة والأدب الكرديين وحول المسألة السياسية الكردية منها :ـ

١ـ (مم وزين) : ترجمة ملخص مم وزين الى الألمانية ، مع مقدمة لتوضيح مكانة هذه الملحمة في الأدب الكردي .

٢ـ أمثال وحكم من كردستان مع مقدمة .

٣ـ نشر نتاجات أدباء وشعراء الأكراد أمثال : جميل روژبياني ، پاكيزه رفيق حلمي ، هەردي ، دلدار ، هژار مع مقدمة لمشاكل اللغة الكردية ، وشرح الكلمات الكردية بالألمانية .

٤ـ ترجمة قصة لالوكريم إلى الألمانية وهي لكاتب المقال .

٥ـ دراسة تأريخية حول أميرواندوز المعروف بـ (پاشا كوره) وهي الأطروحة الأولى لكاتب المقال .

٦— كتاب ( كردستان وثورتها ) ؛ وهـذا الـكتاب يحتوي على مجموعة مقالات سياسية حول المسألة الـكردية والفئات السياسية من وجهة نظر الـكاتب . كما ونشرت منظمة ( Nukse ) أقاصيص وأساطير فولـكلورية كثيرة إضافة إلى كتاب آخر يحتوي على حيـــاة وآثار الفلـكي الـكردي (شيخ حسن گلزرده ) .. وهذه هي مجموعة من النشاطات التي تقوم بها المنظمات الـكردية في أوروبا ..

وفي الحقيقة أن أسلوب هذا المقال أقرب إلى البحث من حيث علميته ودقته وكثرة الأرقام والاسماء والأستشهادات ، ممـا يجعل أمر تلخيصه صعباً ،.. هذا وللمتمكن في اللغة الـكردية فائدة اكثر .

* * * * * *

# لە بارەی

# کوردناسییەوە لە رووسیا و یەکێتی سۆڤێت

د. ئەورەحمانی حاجی مارف

ئەم وتارە باسێکی کورتە لە بارەی هەندێ لەو کارە زانستیانەوە کە لە رووسیا و یەکێتی سۆڤێت لە بارەی کوردەوە نوسراون . شایانی باسە تا ئێستە ژمارەیەك وتار بە زمانی رووسی و ئازەری و ئەرمەنی لە بارەی کوردناسی رووس و سۆڤێتەوە نوسراوە ، وەك : « باری کوردناسی سۆڤێت و ئامانجەکانی »(۱) ، « لە بارەی پێشکەوتنی

(۱) Р.Гази, О состоянии и задачах советского курдоведения,-"Изв. АН Азерб.ССР", Баку, 1959, №2, стр.131-142.

کوردناسی سۆڤێتەوە »[٢] ، « کوردناسی »[٣] ، « مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی لە رووسیا و یەکێتی سۆڤێت »[٤] و چەند وتارێکی تر کە نووسەری ئەم وتارە کەڵکی لە هێندێکیان وەرگرتووە . هەر لە سەرەتاشەوە دەمەوێ دان بە وەدا بنێم کە وا کوردناسی رووس و سۆڤێت ئەوەندە دەوڵەمەندە[٥] کە لە قەوارەی وتارێکدا ناتوانرێ زیاتر لە چەند رووپەکی کەمی بە شێوەیەکی گشتی بخرێتە بەر چاو ، ئەگینا لە راستیدا پێویستە زنجیرەیەك وتاری درێژی

(٢) К.К.Курдоев, Развитие советского курдоведения,-"Ученые записки института востоковедения", Москва, 1960, т.XXУ, стр.57-67.

(٣) К.К.Курдоев, Курдоведение,-"Азиатский музей -ЛОИВАН АН СССР", Москва, 1972, стр.380-397.

(٤) Ч.Х.Бакаев, История изучения курдского языка в России и СССР,-"ОИИИЯ", Москва, 1962, стр.100-117.

(٥) لەبەر زۆری ئەو نووسراوانەی ناویان لەم وتارەدا هاتووە زۆر زەحمەت دەبێ بە رووسیش چاپیان بکەین ، بۆیەکا لەمە و دوا تەنها بە کوردی بلاویان دەکەینەوە .

جیا لە بارەی مێژوو و زمان و ئەدەب و ژیانی کۆمەڵایەتی کوردەوە لە کوردناسی ڕوس و سۆڤیێتدا بنوسرێ .

* * *

# کوردناسی لە ڕوسیا

کوردی پشت قەفقاس کە لە چوارچێوەی سیاسی و ئابوری ئیمپراتۆرییەتی ڕوسیادا بون وەك میللەتانی تری پشت قەفقاس سەرنجی گەلێك گەڕیدە و زانای ئەتنۆگرافیان ڕاکێشاوە . هەروەها شێوەی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی کورد ، وە زۆری ژمارەیان لە دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا سەرنجی زۆر دەوڵـەتی گەورەیان ڕاکێشـاوە و کارێـکی وەهایان کردووە ئەو دەوڵەتانە بایەخیان پێ بدەن .

ناسینی کورد و زمانەکەی بۆ یەکەم جار لە ڕوسیا دەگەڕێتـەوە بۆ نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەهەم ـ واتـە بۆ ئـەو دەمەی کە ئەکادیمیەی زانستی ڕوسی « فەرهەنگی بەراوردیـی هەمـو زمان و شێوەکان »ی لە چاپدا[٦] . ئـەم فەرهەنگە کە لە سـاڵی ١٧٨٧دا بڵاوکراوەتـەوە (٢٧٣) وشـەی بە (٢٠٠) زمان ، کـە کوردیش یەکێکیانە ، تیادا تۆمار کراوە .

---

(٦) پ. س. پالاس ، فەرهەنگی بەراوردیی هەمو زمان و شێوەکان ، پیترسبورگ ١٧٨٧ .

لە کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا هەندێ وتار و نامیلکە لە بارەی پەیدابوون و ژمارە و نەریت .... ی کوردەوە بلاوکرانەوە ، بە تایبەتی هەندێ زانیاری لە بابەت خێڵە کۆچەرەکانی کوردی پشت قەفقاسەوە کە لە هەندێ راپۆرتی سەرژمێری و چاپەمەنی فەرمانڕەوایی‌دا بەرچاو دەکەون[٧] . بێگومان ئەو وتار و نامیلکانە بە شێوەیەکی ساکار و کورت و کۆڵن . بەمجۆرە دەبینین کە تا کۆتایی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم لە رۆسیای قەیسەری لە بارەی زمان و مێژوو و ئەتنۆگرافیا ....ی کوردەوە هیچ نووسراوێکی وەها گرنگ و زانستی نەبووە .

لە رۆسیای قەیسەری سەرنجی زانستی سەباردت بە کورد دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی نیوەی یەکەم و سەرەتای نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەم . هەرچەندە بەشێك لەو نووسراوانەی ئەو دەورە پەیوەندییان بە شەڕی رۆس و تورك ، وە رۆس و فارسەوە

---

(٧) بڕوانە :

أ ــ ئا. ژۆبیرا ، کورد ، گۆڤاری « وەزارەتی ناوخۆ » ، ب ١٠ ، ژ ٢ ، ل ٢٥٥ ــ ٢٦٢ ، پیترسبورگ ١٨٣٥ ؛

ب ــ ئا. ژۆبیرا ، کوردستان ، ئارشیفی ژورو ، ب ٢٢ ، ل ١٧٢ ــ ١٨٥ ، پیترسبورگ ١٨٣٦ ؛

ج ــ ن. نیفبدێف ، کورد ، کتێبی « ناوچەی ئەرمەنستان » ، پیترسبورگ ١٨٣٩ ، ل ٤ ــ ١١ ؛ ... هتد .

هەیە[8] ، بەڵام هەندێ لێکۆڵینەوەی زانستیش لە بارەی کوردەوە لە لایەن زانایانی ڕوس و ڕوسیای قەیسەرییەوە ، وەك : ف. دیتێل ، خ . ئابۆڤیان ، ئی. بیریزین ، پ. لێرخ .... هتد بڵاوکرانەوە .

ف. دیتێل سێ ساڵێك بە کوردستاندا گەڕا و کەرەستەیەکی زۆری فۆلکلۆر و ئەتنۆگرافیـــای خڕکردەوە . زانای ناوبراو ، لە وتاری « سێ ســـاڵ گەڕان بە ڕۆژهەڵاتـدا »[9] لە بارەی ئەو کەرەستانەوە دواوە . لەم وتاردا سـەبارەت بە کوردستان و زمانی کوردێ و دیالێکتەکانی نوسیوێتی : « لە گەڕانەکەمـدا — واتە لە دیاربەکرەوە تا سنوری سـوریا — گەلێ مەســـەلەی جوگرافی و ئەتنۆگرافی سەرنجیان راکێشام . ڕێگا کەم بە ماردین و دیاربەکر و نەسـیبەین و ئورفەدا تێدەپەڕێ . ئەو ناوچانەی کە من پیایاندا دەگەڕام بەشێـکی کـوردستان بون کە زۆر کەم ناسراون ، لەبەر ئەوەی تاکو ئێســـتا هیچ کەرەستەیەکی ئەتنۆگرافی وەهامان نییـە

(8) بڕوانە :

أ ـ ن. ئی. ئوشاکۆڤ ، بەشداری کورد لە شەڕدا ، کتێبی « مێژوی ئەو شەڕانەی لە سالانی ١٨٢٨ ـ ١٨٢٩دا لە تورکیا قەوماوە » ، پیترسبورگ ١٨٣٦ ، ب ١ ، ل ١٢٠ ـ ١٢٩ ؛

ب ـ ر. ئی. ، دەربارەی کوردە چەکدارەکان ، ڕۆژنامەی « قەفقاس » ، تفلیس (٢٢)ی ئابی ١٨٥٣ ، ژ ٦٢ ... هتد .

(9) بڕوانە : گۆڤاری « وەزارەتی ڕۆشنبیری مـللی » ، بەشی ٤ ، پیترسبورگ ١٨٤٧ .

دەربارەی خێڵەکانی ئەم هەرێمەی ئاسیا ، بۆیە لە لێکۆڵینەوەی دیالێکتەکانیدا ، بە تایبەتی گرنگی بە وەزعی جوگرافی ناوچەکە دەدەم . لە کۆکردنەوەی ئەو کەرەستانەدا زۆر زەحمەتم کێشاوە . بە گوێرەی ئەو کەرەستەیەی لامە نزیکەی (٣٠٠) خێڵی کورد هەیە ، وە لەو باوەڕەدام کە لێکۆڵینەوەی تەواو لە کوردستانی ئەمڕۆ یارمەتی ئەوەمان دەدا کە باشتر لە باری زۆی ناوچەکە بگەین کە ئێستا بەشێکە لە تورکیا (مەبەستی دەولەتی عوسمانییە — ئەوڕەحمان) »[١٠] . دیتێل کە دێتە سەر باسی زمانی کوردی دەڵێ : من بۆم دەرکەوت کە زمانی کوردی بەسەر زۆر دیالێکتدا دابەش دەبێت ، وە لەم رووەوە هێشتا کەس هیچی نەنووسیوە . بەشێکی کوردستان لەژێر حوکمی تورکیا دایە ، لەبەر ئەوە ئاشکرایە کە زمانی تورکی کاری کردۆتە سەر زمانی کوردی ، هەر وەك چۆن لە بەشەکەی ئێرانیشدا تاسیری زمانی فارسی هەیە . نووسەر کاتێ کە دێتە سەر باسی ئەدەبی کوردی دەڵێ : من بە هیچ جۆرێك چاوەڕوانی ئەوە نەبووم و بە بیرما نەدەهات کە ئەو میللەتە لە بیر کراوە ، جگە لە ئەدەبی فۆلکلۆر ، خاوەنی ئەدەبێکی نووسراوی وەها زۆر و جوان بێت ...... هەرچی ئەدەبی فۆلکلۆریشە ئێجگار دەوڵەمەندە بە چیرۆك و داستان و گۆرانی .

پ. لێرخ نووسیوێتی : ف. دیتێل وای نیاز بوو کە هەندێ

(١٠) هەمان سەرچاوە ، ل ٩ .

لێکۆڵینـــەوەی تایبـــەتی دەربارەی مێژوی کورد و زمانی و دیالێکتەکانی بڵاوبکاتەوە ، بەڵام مەرگ لەو نیازە بێبەری کرد[11] .

لە ساڵی ١٨٤٧دا لەسـەر لاپەڕەکانی رۆژنامەی « قەفقاس » کە لە ( تفلیـس ) دەردەچو زنجیرەیەك وتاری خ. ئابۆڤیان لە ژێر ناوی « کورد »دا بڵاوکرایەوە[12] . لەم وتارانەدا گەلێ شـــتی بەکەڵك و نوێ لە بارەی ئەتنۆگرافیا و مێژوو و ژیانی کۆمەڵایەتی و رەوشت و نەریـــت و فۆلـکلۆر و زمانی میللەتی کورد بەرچاو دەکەوێ[13] .

هەرچەندە ئـەم زنجیرە وتارەی خ. ئابۆڤیـان دەوروبـەری (٣٠) لاپەڕەیەك دەبێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێـکی زانستی و وردە و بۆ یەکەم جارە لە مێژوی کوردناسی روســدا دەربارەی ئەتنۆگرافیای کورد بەو شێوە فراوانە کەرەستەی چ لەو نوسراو و دەستنوسـانەی هەبون و چ لە گەڕانی خۆیدا بە کوردستاندا بەکار هێنرابێ .

(١١) ب. لێرخ ، لێکۆڵینەوە لە بارەی کوردەکانی ئێرانەوە ، ب ١ ، پیترسبورگ ١٨٥٦ ، ل ٣٨ ـ ٣٩ .

(١٢) بڕوانـە : رۆژنامەی « قەفقاس » ، ژ ٤٦ ، ٤٧ ، ٥٠ ، ٥١ ، تفلیس ١٨٤٨ .

(١٣) بڕوانە : ق. کوردۆ ، خ. ئـابۆڤیان وەك کوردنـاس و تـوێژەر ( باحث ) ، لە کتێبی « مێژوی رۆژهەڵاتناسـی روس » ، ب ٢ ، مۆسکۆ ١٩٥٦ .

ئەم نوسراوەی خ. ئابۆڤیـان لە بارەی زمانەوانییەوە کارێکی کردە سەر بیر و رای زانایانی روس - پ. لێرخ ، ف. یوستی ، س. یەگیزارۆف .... لە سەلماندنی ئەوەی کە زمانی کوردی زمانێکی ئێرانییە و لە خێزانی هینـد و ئەوروپاییە . خ. ئابۆڤیان زمانی کوردی بەسەر کرمانجی و زازادا دابەش دەکات و داوا لە زانایانی جیهـان دەکات کە دەســت بدەنە « لێـکۆڵینەوە لە زمانی شیرینی کوردی و لە نەتەوەی کوردی شۆڕە سوار » .... هەروەها دەڵێ : « لەم رێـگایەوە دەتوانرێ کەڵـکێـکی ئێجگار زۆر بۆ رونکردنەوەی مێژوی ئادەمیزاد ، وە گەلێك مەسەلەی زمانەوانی وەربگیرێ »[14] .

نوسەر لە وتارەکەیدا گرنگییەکی زۆری بە فۆلـکلۆری کوردی داوە و بـــەم بۆنەیەوە نوسـیویەتی دەڵێ : « شـیعری خەڵکی هەنـگاوی گەورەی هـــاویشتووە و گەیشتۆتە رادەی پوختی و نایابی . لە هەر کوردێـکدا هەســـت و بەهرەی شـاعیری بە دی دەکرێت و زۆر بە ساز و ئاواز ، گۆرانی بەسـەر دۆڵ و چیا و تاڤـگە و روبار و گوڵ و چەك و ئەسپ و قارەمانێتی و جوانانیاندا دەڵێن .... »[15] .

( ی. بیریزین ) ی ئێرانناسی بەناوبانـگی روس کە پرۆفیسۆری

---

(١٤) خ. ئابۆڤیان ، کـورد ، رۆژنامــەی « قەفقـاس » ، ز ٤٧ ، تفلیس ١٨٤٧ .

(١٥) هەمان سـەرچاوە ، ز ٤٧ ، تفلیس ١٨٤٧ .

زانـکۆی (کازان) بوٙ له کاتی گەڕانیـدا به ڕۆژهەلاٙتی ناوەڕاستدا فێری شێوەی کوردیٙ خۆراسان و موسڵ بوٙ . شێوەی خۆراسان له تاران فێر بـوٙ ، ئەوێش له ڕێگای چەند کوردێـکەوه بـوٙ که له خۆراســانەوه بۆ تاران هاتبوٙن . شێوەی موسڵیش له موسڵ فێر بوٙ . له ئەنجامدا له ژێر ناوی « لێکۆڵینەوه له دیالێـکتەکانی فارسیٙ » کتێبێك بلاٙودەکاتەوه[١٦] .

بێگومان ئـەوەی ی. بیریزین له بارەی ئــەو دوٙ شێوەیەی کوردییەوه نوٙسیوێتی زۆر کەم و کـورته . به کورتیٙ له ناو و جێناو و کردار دواوه ، وه له پاشکۆی کتێبەکەیدا هەندێ وشه و ڕستەی ئەو دوٙ شێوەیەی کوردیٙ نوٙسیوه .

له ناو ئەو زانا ڕوٙسانەدا که بایەخیـان به کوردناسیٙ داوه ، ڕۆژهەلاٙتناسی بەناوبانـگ پیوٙتر لێرخ جێـگەیەکی تایبـەتی و دیاری هـەیه . لێرخ خاوەنی ســێ کتێبی گرنـگه له بارەی کـورد و کوردستانەوه[١٧] . که تا ئەمڕۆش له کتێبخانەی کوردناسیدا هاوتایان کەمه و به سەرچاوەیەکی ڕەسەن دەژمێررێن .

---

(١٦) E. Beresine, Recherches sur les dialectes persans, Casan, 1853.

(١٧) پ. لێرخ ، لێـکۆڵینەوه له بارەی کوردەکانی ئێرانەوه ، پیتەرسبورگ ١٨٥٦ ، ١٨٥٧ ، ١٨٥٨ .

پ. لێرخ لە رێگای ئەکادیمیەی زانستییەوە نێررا بۆ شاری (روسلاڤل) کە نزیکەی (٥٠) بەندي كوردي لێ بۆ ، وە بۆ ماوەی سێ مانگێك لە ناویاندا مایەوە و خۆی بە فێربۆنی زمانی کوردییەوە خەریك کرد . ئەم بەندانە خەڵکی ناوچەی جیاوازی کوردستان بۆن ، زوربەیان کرمانجی ژۆرۆ و بە شێکیشیان زازا بۆن و وا دیارە لێرخ کەڵکێکی زۆری لێ وەرگرتۆن .

پ. لێرخ لە سەر بنکەی رەخنە لەو کارانەی لە زۆردا دەربارەی کورد و زمانی کوردی نوسرابۆن ، وە لە رێگای لێکۆڵینەوەی تایبەتی و هەست کردنی خۆی توانی بە شێوەیەکی راست و رەوان و زانستی لە بابەت کورد و زمانەکەی ، ئەتنۆگرافیا و فولکلۆریەوە بنوسێ. ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەتە کە ئەم زانایە زمانی کوردی دابەش دەکات بە سەر پێنج دیالێکتدا : کرمانجی[18] ، لوڕی ، کەلهوڕی ، گۆرانی ، زازا . لەم دیالێکتانەدا لە کرمانجی ، ژۆرۆ و زازا کۆڵیوەتەوە ، وە لە کتێبی سێهەمیدا فەرهەنگێکی کوردی (کرمانجی ژۆرۆ) - رۆسی (ل ١ — ٨٤) ، کوردی (زازا) — رۆسی (ل ٨٥ — ١٠٨) بڵاوکردۆتەوە .

دەربارەی دیالێکتی کرمانجی ژۆرۆ نوسیویێتی : « هەمو کوردستانی رۆژئاوای داگیر کردوە ـ هەر لە موسڵەوە تا ئاسیای

(١٨) مەبەستی لە کرمانجی ژۆرووە .

پچوك و ســـلێمانی » .... ســـەبارەت بە زازاش دەڵێ : « لە بەراوردكردنی لەگەڵ كرمانجیدا وە یا لەگەڵ زمانە ئێرانیەكانی تردا ، گەلێك شتی تایبەتی چ لە دەنگ و چ لە شێوەدا بەرچاو دەكەوێت كە خەڵك دەهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی زمانێكی جیاواز بێت » .... هەر چەندە ئەو جیاوازییە دەبینرێ ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا « زازا بەچكەی كرمانجییە »[19] .[20]

بەلای منەوە یەكێك لە را زانیارییە هەرە گرنگەكانی لێرخ ئەوەتە كە لایەنگیری رای ئا. پۆت — زانای ئەڵمان دەكا لەوەی كە زمانی كوردی بە زمانێكی رەسەن و ســـەربەخۆ دادەنێ ، وە بە یەكێك لە زمانە ئێرانیەكانی دەژمێرێت . بـــەم بۆنەیەوە پ. لێرخ نوسیویەتی : « هیچ هۆیەك نییە بۆ من كە لە رای راست و چەسپاوی پرۆفیسۆر ئا. پۆت لاربم ، كە دەڵێ زمانی كوردی شوێنێكی ســـەربەخۆ و تایبـــەتی هـــەیە لە نێوان زمانە ئێرانیەكاندا »[21] .... « زمانی كوردی لە مەڵبەندی كوردستاندا ســـەربەخۆیی خۆی پاراست . هـەرچەندە لەگەڵ زمانی فارسیدا

(١٩) سەرچاوەی ناوبراو ، پ. لێرخ ، ب ٢ ، ل ٢٢ .

(٢٠) هەروەهـــا بڕوانە : ڤلادیمیر مینۆرسكی ، كورد نـەوەی میدیەكانن ، گۆڕین و لێـكۆڵینەوەی د . كمال مەزهەر ( بـە زمانی عەرەبی ) ، گۆڤاری « كۆڕی زانیاری كورد » ، ب ١ ، ١٩٧٣ ، ل ٥٦٠ .

(٢١) سەرچاوەی ناوبراو ، پ. لێرخ ، ب ٢ ، ل ٢٢ .

خزمایەتی و نزیکایەتییان هەیە، بەڵام لە شێوەی پێشکەوتندا لەگەڵ زمانی فارسیدا پەیوەندی نەبووە»[22] .

ئەو وشـە جوان و راست و رەوایانەی پ. لێرخ لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسیویەتی، لە کاتێکدا بووە کە هێشتا لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی زۆر کەم بووە، وە لە سەردەمێکدا وتراوە کە هەندێ زانا زمانی کوردییان بە دیالێکتێك لە زمانی فارسی دادەنا . بێشك «ئەم نوسـراوانەی پ. لێرخ سـودێکی زۆریان بە لێکۆڵینەوەی نوێ لە روسـیا و ئەوروپادا بەخشی»[23] ..... وە لە رێگای کارەکانی ئەم زانایەوە، لە سـەدەی نۆزدەدا کوردناسی بە شێوەیەکی سەربەخۆ کەوتە گەشە و پێشکەوتن .

ئا. ژابا کە قونسـوڵی ئیمپراتۆریەتی رۆس بۆ لە تورکیا (ئەرزرۆم) ـ سـاڵی ١٨٣٦ ـ ١٨٦٩ ـ لەسـەر داوای ئەکادێمی ب. ئا. دۆرن دەسـتی کرد بە فێربون و لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی و کۆکردنەوەی کەرەسـتە لە بارەی ئەدەب و فۆلکلۆر و زمان و ئەتنۆگرافیای کوردەوە بە گشتی، وە دەستنوسی کوردی بە تایبـەتی . لە بەجێ هێنـانی ئەم کارەدا مەلا مـەحمودی

(٢٢) هەمان سەرچاوە، ب١، ل ٢٣ .

(٢٣) ق. کوردۆ، کارەکانی پ. لێرخ لە بارەی کوردناسـییەوە، «لە بابەت مێژوی رۆژهەلاتناسی روسەوە»، مۆسکۆ ١٩٥٩، ب ٤، ل ٥١ .

بایەزیدی(٢٤) . یارمەتیەکی زۆری ئا. ژابای داوە و گەلێك بەرهەمی کوردی بۆ نوسیوەتەوە و زۆری لە فارسییەوە بۆ وەرگێڕاوەتە سەر کوردی .

لە ئەنجامدا ئا. ژابا کۆمەڵێك دەستنوسی بە نرخ و نایابی کۆکردەوە ، کە ئێستا لە کتێبخانەی گشتی و کتێبخانەی ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسی ئەکادیمیەی زانستی سۆڤێت لە لێنینگراد هەڵگیراون . ئەو کۆمەڵە دەستنوسـانەی ئا. ژابا نیشانیاندا کە کورد خاوەنی ئەدەبی کلاسیکی و شـاعیری مەزن و زانای بە توانای خۆیەتی و هەروەها گەنجینـەیەکی دەوڵەمەندن و بنچینەیەکی پتەون و سـەرچاوەیەکی بە نرخ و کەم هاوتان بۆ پێشکەوتنی کوردناسی ، نمونەش بۆ ئەمە گرنـگی دانە بە لە چاپدانیان ولێکۆڵینەوەیان ... تاکو ئێستا لە سەر بناغەی ئەو دەستنوسانە گەلێك کتێبی بەنرخ

(٢٤) ئا. ژابا پەنجەی بۆ ئەوە راکێشاوە کە مـەلا مەحمودی بایەزیدی لە کۆتایی سـەدەی هەژدەدا لە شاری بایەزید لە دایك بووە و لەوێ خوێندنی سەرەتایی تەواو کردووە . لە پاشانا چووە بۆ تەورێز و لەوێ شـارەزاییەکی باشـی لە زمانی فارسی و عەرەبی و ئەدەب و مێژو و فەلسەفەدا پەیدا کردووە . لە سالآنی پەنجای سەدەی نۆزدەدا هاتووە بۆ ئـەرزڕۆم و لەو کاتەوە بووە بـە یارمەتیدەری ئـا. ژابا لە کۆکردنەوەی دەستنوسی کوردیدا . بڕوانە :

A. Jaba, Pecueil des notices et rècits kourdes, servant á la connaissance de la litterature et des tribus du Kourdistan, Spb, 1860, P. VIII-X.

بڵاوکراونەتەوە ، وەك : ( مەم و زین )ی ئەحمەدی خانی[٢٥] ، ( شێخی سەنعان )ی فەقێی تەیران[٢٦] ، ( لەیل و مەجنون )ی حارسی بتلیسی[٢٧] ، ( عادات و رسومات نامەی اکرادیە )ی مەلا مەحمودی بایەزیدی[٢٨] ، ( دەستوری زمانی عەرەبی بە کوردی ) عەلی تەرەماخی[٢٩] .... هتد .

لە ساڵی ١٨٦٠ دا ئا. ژابا لە ژێر ناوی « جامع‌ی رسالیان و حکایتان بزمانی کورمانجی » بە زمانی کوردی و فەرەنسی هەندێ چیرۆکی کوردی لە چاپدا[٣٠] و هەندێ سەرنجی دەربارەی ئەدەبی کوردی نیشان داوە . لە لێکۆڵینەوەی مێژوو و ئەتنۆگرافیا و زمانی

(٢٥) م. ب. رودێنکۆ ، « مەم و زین »ی ئەحمەدی خانی ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

(٢٦) م. ب. رودێنکۆ ، « شێخی سەنعان »ی فەقێی تەیران ، مۆسکۆ ١٩٦٥ .

(٢٧) م. ب. رودێنکۆ ، « لەیل و مەجنون »ی حارسی بتلیسی ، مۆسکۆ ١٩٦٥ .

(٢٨) م. ب. رودێنکۆ ، « عادات و رسومات نامەی اکرادیە »ی مەلا مەحمودی بایەزیدی ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

(٢٩) د. مارف خەزنەدار : عەلی تەرەماخی ، « دەستوری زمانی عەرەبی بە کوردی » ، بەغدا ١٩٧١ .

(٣٠) ئا. ژابا ، جامع‌ی رسالیان و حکایتان بزمانی کورمانجی ، پیترسبورگ ١٨٦٠ .

کوردیدا بۆ کوردناسان ، ئەم کتێبە تاکو ئێستا هەر بە نرخ و بە سوودە[31] .

جگە لەوە ئەم زانایە کارێکی گەورە و خزمەتێکی بێشوماری کردووە لە نووسینی فەرهەنگی کوردیدا . خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ فەرەنسایییە کە لە پاش خۆی بە فەرمانی ئەکادیمیەی رووسی لە ساڵی ۱۸۷۹دا فێردیناند یوستی بڵاوی کردەوە[32] . ئەم فەرهەنگە بریتییە لە (٤٦٣) لاپەڕە و (۱٥) هەزار وشەی کوردی کە جگە لە لێکدانەوە و شـــەرح کردنیان لە داڕشتن و دروست بوون و پەیدابوونیان کۆڵیوەتەوە و هەروەها لەگەڵ وشـــەکانی فارسی و عەرەبی و تورکیدا بەراوردی کردوون .

زانـای لاو و بەناوبانـگی رووس ف. ف. ڤیلیـامینـۆف — زێرنۆف لە سـاڵی ۱۸٦۰ — ۱۸٦۲ دا تێکستی فارسی شەرەفنامە ، کە میر شـەرەف خانی بتلیسی بە زمانی فارسی سەبارەت بە مێژوی

(۳۱) بۆ وەرگرتنی زانیاری تەواو سـەبارەت بەم کتێبە ، بڕوانـە : ئـەو زنجیرە وتارەی کە کاك عەبدوڵا حەداد لە چەند ژمارەیەکی مانگی شوباتی ۱۹۷۳ ی رۆژنامەی « التاخی » دا لـە ژێر ناوی « درة ثمینة من التراث الثقافي الکردی » دا بڵاوی کردۆتەوە .

(۳۲) A. Jaba, Dictionniare kurde - francais St - Peter-bourg, 1879.

کورد لە سەدەکانی ناوەڕاستدا نوسیویێتی بڵاوکردوە[٣٣] و ئینجا ف. ب. شارموا وەریگێڕاوەتە سەر زمانی فەرەنسیی و لە ساڵی ١٨٦٨ — ١٨٧٥ دا لە چاپی داوە . ئەوەی شایانی باسە ، ئەم زانایە لە وەرگێڕانەکەیدا زۆر سەرکەوتووە و لەگەڵیك زانیاریی و بەڵگەی مێژوویی و جوگرافیی و ئەتنۆگرافیی داوە[٣٤] .

لە ساڵی ١٨٨٠دا ئێرانناسی بەناوبانگ فێردیناند یوستی کتێبێکی ڕێزمانی کوردیی بڵاوکردەوە[٣٥] و لەم کارەیدا کەڵکێکی زۆری لە بەرهەمەکانی : م. گارزۆنی ، ئا. خۆدسکۆ ، س. ری ، پ. لێرخ ، ئا. ژابا .... وەرگرتووە .

فەسڵی یەکەمی ئەم ڕێزمانە باسی فۆنێتیکە (ل ١ ـ ١٠١) . لە لێکۆڵینەوەی دەنگە دەنگدارەکاندا لە نێوان درێژیی و کورتیی تلفظ کردنی هەر یەك دەنگدا جیاوازیی کردووە و بە دەنگێکی جیاوازی داناوە ، وە ئەمە بووە بە هۆی ئەوەی دەنگە دەنگدارەکان لە نوسراوەکەی ئەودا ژمارەیان پتر بێت لەوەی کە لە واقعی زمانی کوردیدا هەیە .

لە بەشی وشە داڕشتندا لە بارەی پێشگر و پاشگر ، وشەی

---

(٣٣) بڕوانە شەرەف خانی بتلیسی ، شەرەفنامە ، (ی. ئی. فاسیلیڤا کردویە] بە ڕوسی) ، مۆسکۆ ١٩٦٧ ، ل ١٨ .

(٣٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٢ .

(٣٥) F. Justi , Kurdishe Grammatik , S. - Pb., 1880 .

(مرکب) ..... دواوە (ل ١٠٢ ـ ١٢٢) . فەسڵێکی تایبەتی دەربارەی مەرفۆلۆژیایە : ناو ، جێناو ، ئاوەڵناو .... (١٢٢ ـ ٢٤٥) . دوا فەسڵی لە بابەت سینتکسیسەوەیە (ل ٢٤٦ ـ ٢٥٦) .

ف. یوستی لە لێکۆڵینەوەکەیدا هەوڵی بەراوردکردنی زمانی کوردی لەگەڵ زمانە ئێرانیێکانی تردا داوە . هەر چەندە ئەمە کارێکی راستە ، بەڵام وەك ق. کوردۆ دەڵێ : « ناتەواوی ف. یوستی لەوەدایە کە تەنها چمکێکی بەراوردەکەی گرتووە »[36] — واتە تەنها بەراوردی لێك چوونی ئەو دوو زمانەی کردوە . لەبەرئەوە لەم لێکۆڵینەوەیەدا نوسەر نەیتوانیوە خاسیەتی ناوخۆی زمانی کوردی نیشان بدا . جا لە لێکۆڵینەوەی دەستوری زمانێکدا ، ئەگەر خاسیەتی تایبەتی ناوخۆی ئەو زمانە نیشان نەدرێ ئەوە ئەو لێکۆڵینەوەیە لە واقع دوور دەکەوێتەوە ..... هەروەها ناتەواوی ئەم کتێبە لەوەشدایە کە نوسەر لە هێنانەوەی نمونەدا وشەی لە زمانی کوردی خۆیەوە وەرنەگرتووە ، بەڵکو لە فارسی کۆن و زمانە ئێرانیێکانی ترەوەی دەرهێناوە . لەگەڵ ئەو هەموو کەم و کورتیانەشدا ئەم کتێبە یەکێکە لە کارە هەرە بەرزەکانی پێش سەدەی بیست لە بارەی زمانی کوردییەوە .

---

(٣٦) ق. کوردۆ ، بەراوردکردنی رێزمانی دیالێکتەکانی کوردی ، (نامەی دکتۆری) ، ل ١١ .

نزیك کۆتایی سەدەی نۆزدە رۆژهەلاتناس ئا. سۆتسین کتێبێکی لە بارەی رێزمانی کوردییەوە بلاوکردەوە[۳۷] کە بناغەکەی لەسەر ئەو کەرەستەیە دارێژراوە کە کاتی خۆی لەگەل ( ی. پرایم )دا بە جووتە کۆیان کردۆتەوە و چاپیان کردوە.[۳۸]

ئەم کتێبی رێزمانە (۱٦) لاپەڕەی دەربارەی فۆنێتیك و (۱٥) ی - مەرفۆلۆژیایە. لە بەشی مەرفۆلۆژیادا بە زۆری لە ناو و جێناو و کردار دواوە. لە هەندێ حالاتی گۆرینی وشەدا دەستووری زمانی فارسی بەسەر کوردیدا سەپاندووە و ئەمەش تووشی هەلەی کردوە.

سالی ۱۸۹۱ س. ئا. یەگیزاروف کتێبێکی لە بارەی ئەتنۆگرافیای کوردەوە بلاوکردەوە[۳۹]. ئەم زانایە سوودی لە نووسراوەکانی خ. ئابۆڤیان و پ لیرخ و هەروەها ئەو کەرەستە زۆرەی کە خۆی لە ماوەی دوانزە سالدا لە ئەنجامی ژیاندا لە ناو کوردەواریدا کۆی کردۆتەوە وەرگرتووە. نووسەر سەبارەت بە ژیانی کۆمەلایەتی

(۳۷) A. Socin, Die Sprache der Kurden, « Grundriss der iranischen Philologie » , Bd. I, 2 Abt.

(۳۸) Prym und A. Socin, Kurdische Sammlungen, Abt, I. II , S. pbg., 1887 - 1890.

(۳۹) س. ئا. یەگیزاروف ، مێژوویەکی ئەتنۆگرافی کورتی کوردی موحافەزەی یەریڤان ، « راپۆرتەکانی بەشی قەفقاسی کۆمەلی جوگرافی ئیمپراتۆریی رووسی » ، تفلیس ۱۸۹۱ .

وخۆ و ڕەوشت و شێن و شایی و ئاین و باوەڕ . . . . ی گەلی کورد دواوە . جگە لەوە لەم کتێبەدا بە هاوکاری ل. پ. زاگورێتسکی لە هەندێ مەسەلەی گرنگی ڕێزمانی زمانی کوردی کۆڵیوەتەوە و وەك پاشکۆش دوو فەرهەنگیان داناوە : یەك ـ کوردی ـ ڕووسی ( ل ١ ـ ٦٥ ) ؛ دوو ـ ڕووسی ـ کوردی ( ل ٦٦ ـ ١٢٢ ) . یەکەم دەوری سێ هەزار ، دووەم ـ چوار هەزار وشەیەکە .

وەك ئاشکرایە ماوەیەکی زۆر بەسەر نوسینی ئەم کتێبەدا تێپەڕیوە ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا تاکو ئێستا بە سەرچاوەیەکی ڕەسەن دەژمێررێت لە لێکۆڵینەوەی مێژووی کولتوری گەلی کورد بە گشتی و کوردی یەزیدی بە تایبەتی ، ئەویش هۆی بوونی کەرەستە و بەڵگەیەکی زۆرە سەبارەت بە ئاین و تێکستی کوردە یەزیدییەکان کە بۆ یەکەم جارە لە کوردناسیدا بەو شێوە زانستییە لەو مەسەلەیە کۆڵراوەتەوە .

نوسراوی هەرە ناسراوی ن. یا. مارر لە کوردناسیدا وتاری « دیسان دەربارەی وشەی چەلەبی » یە[٤٠] . ڕاستە نوسەر لەم وتارەدا گەلێك نمونەی جوانی سەبارەت بە دەوری کورد لە مێژووی کولتوری میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هێناوەتەوە و نیشانی داوە

(٤٠) ت. یا. مارر ، دیسان دەربارەی وشەی چەلەبی ، « دەستنوسەکانی بەشی ڕۆژهەلاتناسی کۆمەڵی ئارخیۆلۆگی » ، پیترسبورگ ١٩١٢ ، ب ٢٠ ، ل ٩٩ ـ ١٥١ .

کە چۆن کورد لە سەدەکانی ١٠ ـ ١٣دا دەورێکی گەورەی بینیوە لە پێگەیاندنی ئاسیای بچوك و لە ســازکردنی کولتورێکی بە نرخ لە مێژوی میللەتانی پشت قەفقاسدا . ئەوەی جێگای رەخنە و سەر ـ سوڕمانە ئەوەیە کە ن. یا. مارر تەماشای مێژوی میللەتی کورد دەکا و لێی دەکۆڵێتەوە نەك وەك لە مێژوی میللەتێکی جیاواز و ســەربەخۆ ، بەڵـکو وەك مێژوی یافیتی (جـۆرجی ، خالدی ، ئەرمەنی ) .

لە ئەنجامی لێـکۆڵینەوەی لە مانای وشــەی « چـەلەبی » و هەروەها وشەی « کورد » ـ کە یەکێـکە لە نەتەوە ئێرانێـکان و کە زمانەکەشی هەر لە بەشی زمانە ئێرانێـکانە ، ن. یا. مارر هاتۆتە سەر ئەو باوەڕە هەڵە و چەوت و چەوێڵەی کە ئەسڵی کورد و زمانی کوردی بە یافیتی دابنێ . ئــەم را ناڵەبارەی ن. یا. مارر تا رادەیەك ، بۆ ماوەیەك لێـکۆڵینەوە لە نەژادی کورد و لە زمانی کوردییان بەرەو رێـگایەکی لار و خوار برد و لەم روەوە هەندێ کۆسپ و تەگەرەیان هێنایە بەر لێـکۆڵینەوە لە کورد و زمانەکەی . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە هەر لە زویەکەوە کوردناسانی سۆڤێت ، بە تایبــەتی قەناتی کوردۆ[٤١] ئەو تیۆری و ناڕاستی و هەڵانەی

(٤١) ق. کوردۆ ، رەخنــە لە بیر و باوەڕی چەوت بەرامبەر بــە زمانی کوردی ، گۆڤاری « کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی » ، ١٩٥٥ ، ب ١٢ ، ل ٤٣ ـ ٦١ .

ن. یا. مارریان ڕاســـتکردەوە و ئەو تۆوە پڕ زیانەی چاندبوی هـەڵیان گێڕایەوە ، بەڵام بە داخەوە تازە وا د. مارف خەزنەدار ئەو وتارەی ن. یا. مارر لە مەسەلەی لێـکۆڵینەوەی نەژادی کورددا بە بەرهەمێـکی بەنرخ دەداتە قەلەم[٤٢] .

## کوردناسی لە یەکێتی سۆڤیێت

بایەخ دان بە کوردناسی دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر ئەوەندەی تر پەرەی ســەند و بونی کەمینەیەکی کورد لەم وڵاتەدا و ئەو گۆڕانە هەرە گەورەیەی بەسەر ژیانی نوێیدا هات بونە هۆیەکی گرنـگ و نوێی گەشــــە کردن و پێشکەوتنی کوردناسی سۆڤیێت و یەکێك لە ئەنجامە هـەرە گرنـگەکانی ئەوە بو کە پاش ماوەیەك ڕۆڵەکانی ئەم کەمینەیە خۆشـــیان چاکیان لێ کرد بە لادا و چـــالاکانە هاتنە کۆڕەوە ...... ئێستا چوار مەڵبەندی کوردناسی لە سۆڤیێتدا هەیە : لە یەریڤان و لێنینگراد و مۆسکۆ و باکۆ[٤٣] .

---

(٤٢) بڕوانە : گۆڤاری « ڕۆژی کوردستان » ، بەغدا ١٩٧٢ ، ژ ٧ ، ل ٤٣ .

(٤٣) کاروباری زانستی ئەم چوار مەڵبەندە بە تەواوی پێـکەوە بە ستراون و هەنـگاوی هــەر مەڵبەندێـکیان بە بەشداری و هـاوکاری ئەوانی تر دەنرێن .

## لە یەریڤان :

هەر لە دانانی ئەلف و بێی کوردی لە ساڵی ١٩٢٨دا و کردنەوەی قوتابخانەی کوردی بە تایبەتی لە ئەرمەنستانی سۆڤێت هەست بە پێشکەوتنی کاری کوردناسی دەکرێت . لە ساڵانی ٣٠ دا بۆ کۆکردنەوەی کەرەستەی زمانەوانی و ئەتنۆگرافی و فۆلکلۆری چەند لیژنەیەکیان بۆ دێهاتە کوردییەکان نارد . دوو زانای بەناوبانگ : ئەمینی عەڤدال و حاجی جندی لە کاروباری ئەو لیژنانەدا هاوبەشییان کردووە . هەروەها کۆنفرانسی کوردناسی کە لە ساڵی ١٩٣٤ لە یەریڤان بەسترا بایەخێکی ئێجگار گەورەی هەبوو لە پێشخستنی کوردناسی سۆڤێتدا[٤٤] .

ساڵی ١٩٣٣ فەرهەنگۆکێکی ئەرمەنی - کوردی[٤٥] ، وە ساڵی ١٩٣٥ فەرهەنگۆکی زاراوەی زانستی ئەرمەنی - کوردی[٤٦] بڵاوکرانەوە . ڕاستە لەم دوو فەرهەنگەدا چاومان بە هەندێ وشەی

(٤٤) لەم کۆنفرانسەدا لە گەلێك وتاری زانستی کۆڵیونەتەوە ، بەتایبەتی لە وتاری : حاجی جندی « ڕێگای پێشکەوتنی زمانی ئەدەبی کوردی سۆڤێت » ؛ ئەمینی عەڤدال « ڕێنوسی زمانی کوردی » ؛ قەنانی کوردۆ « بنچینەی ڕێزمانی زمانی کوردی » ؛ عەرەبی شەمۆ « کێشەی دەرەبەگایەتی لای کوردی پشت قەفقاس » ...... هتد .

(٤٥) خەبەرناما ز زمانە فلەژی ـ کورمانجی ، یەریڤان ١٩٣٣ .

(٤٦) خەبەرناما تێرمینۆلۆگیەیا فلەیی ـ کورمانجی ، یەریڤان ١٩٣٥ .

داتاشراوی وەها دەکەوێت کە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ دەستوری زمانی کوردیـدا ناگونجێن و هەروەها گەلێك کەم و کورتی لە ناویاندا هەن ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەوری خۆیان بینیوە و دەبینن .

لەساڵی ١٩٣٢دا ئا. خاچاتۆریان کتێبێکی رێزمانی کوردیی بە ئەرمەنی و کوردی لە چاپدا[٤٧] ناتەواوی گەورەی ئەم کتێبە ئەوەیە کە دەستوری زمانی ئەرمەنی بەسەر زمانی کوردیدا سەپاندووە . هەروەها نوسەر لەسەر بناغەی نوسراوەکانی ( جاردین و یوستی و بییدار. ) ئەم رێزمانەی نوسیوە ، بێ ئەوەی سود لە زمانی گفتوگۆی کوردی وەربگرێ ، ئەمەش بووە بە هۆی سەرنەکەوتنی کارەکەی .

لە ساڵی ١٩٣٥دا لە یەریڤان ئا. خاچاتۆریان و حاجی جندی بۆ قوتابخانە ناوەندییەکان کتێبێکی رێزمانی کوردییان دانا[٤٨] . ئەم کتێبە ، هەر وەك ئەوەی پێشو ناتەواوی ئێجگار زۆر بو ، وە زۆر لەو کەم و کورتیانەی لە کتێبی رێزمانی نوسەرانی زودا هەبون دوبارە کراونەتەوە . لەگەڵ هەمو ئەو کەم و کورتیانەشدا ، رێزمانەکەی ئا. خاچاتۆریان و حاجی جندی « دەورێکی گەورەی بینیوە لە

(٤٧) ئا. خاچاتۆریان ، زمانئامەی کرمانجی ، یەریڤان ١٩٣٢ ، ( بە زمانی کوردی و ئەرمەنی ) .

(٤٨) ئا. خاچاتۆریان و حاجی جندی ، زمانئامە ژا کرمانجی ، یەریڤان ١٩٣٥ ( بە زمانی کوردی ) .

پێشکەوتنی رۆشنبیری کوردی ئەرمەنستاندا »[٤٩] هەروەها نابێ ئەوەش لە بیر بکەین کە « دانەرانی ئەم رێزمانە لە چۆنێتی داڕشتنی بنچینەی رێزمانی زمانی کوردیدا بۆ قوتابخانە کوردییەکان هیچ رێزەوێکی پێشو لەبەر دەستیاندا نەبووە تا سودی لێ وەربگرن.[٥٠]

ئەمینی عەڤداڵ و حاجی جندی کتێبێکی گەورەی فۆلکلۆری کوردییان لە ساڵی ١٩٣٦دا بڵاوکردەوە[٥١] . لەم نوسراوەدا گەلێك گۆرانی و داستان و ئەفسانەی کوردی تۆمار کروان و هەروەها شێوەی جیاوازی « مەم و زین » و « شێخی سەنعان » و « لەیل و مەجنون » و « زەمبیل فرۆش » نیشان دراون .

ئەمینی عەڤدال لە ساڵی ١٩٤٨دا کتێبێکی ئەتنۆگرافی لە بارەی ئافرەتی کوردەوە لە چاپدا[٥٢] . لەم نوسراوەدا بە تایبەتی سەبارەت بە خو و رەوشت ، منداڵ بەخێوکردن و خزمەتی ناو ماڵ ، شوکردن و پایەی ئافرەتی کورد دواوە. ئەم کتێبە لەسەر بنکەی رەخنە لەو کارانەی زۆ دەربارەی کورد نوسراون و لەسەر بناغەی ئەو کەرەستە نوێیەی نوسەر دەستی کەوتووە و لەسەر

(٤٩) ئی. ئی. تسوکەرمان ، رێزمانی زمانی کوردی ، پێشەکی ، ل ١٥ ، مۆسکۆ ١٩٦٢ .

(٥٠) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥ .

(٥١) ئەمینی عەڤدال و حاجی جندی ، فۆلکلۆری کوردی ، یەریڤان ١٩٣٦ .

(٥٢) ئەمینی عەڤدال ، ئافرەتی کورد ، یەریڤان ١٩٤٨ .

بنچینەی لێکۆڵینەوەی تایبەتی خۆی داڕێژراوە . لە بەراوردکردنی پایە و دەور و رەوشتی ئافرەتی کوردی پشت قەفقاس بەر لە شۆڕش و پاش شۆڕشدا گەلێك نمونەی جوانی هێناوەتەوە ....

نوسەری ناوبراو لە ساڵی ١٩٥٢دا لە ژێر ناوی « ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆری کوردی و لێکۆڵینەوە لێیان » دا کتێبێکی بڵاوکردەوە(٥٣) . لەم بەرهەمەدا بە شێوەیەکی زانستی لە ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆری کوردی و ئەو زانایانەی ( بە تایبەتی حاجی جندی ) لە کۆکردنەوەی فۆلکلۆری کوردیدا دەوریان بینیوە کۆڵیوەتەوە و دواوە . لە ساڵی ١٩٥٧یشدا بە ناوی « نەریتی کوردی پشت قەفقاس » ەوە کتێبێکی گەورەی لە چاپدا(٥٤) . ئەم نوسراوە لە دوو بەش پێك هاتووە : بەشی یەکەم (ل ١١ ـ ١١٠ ) دەربارەی ژیانی کوردەوارییە بەر لە شۆڕشی ئۆکتۆبەر . لەم بەشەدا بە دوور و درێژی لە پیشە و ژیانی کۆمەڵایەتی و خو و رەوشت و شین و شایی و دەرمان و نەخۆشی و گەورە و بچوك ..... لای کورد دواوە . بەشی دووەم (ل ١٠٨ ـ ١٩٣ ) لە بارەی ژیانی کوردەوارییەوەیە لە پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەرەوە . لێرەدا باسی : پەیوەندی لە نێوان ئەندامانی خێزاندا ، ئیش و کار ، چۆنێتی ژیان ،

---

(٥٣) ئەمینی عەڤداڵ ، ئەتنۆگرافیا و فۆلکلۆری کوردی و لێکۆڵینەوە لێیان ، یەریڤان ١٩٥٢ .

(٥٤) ئەمینی عەڤداڵ ، نەریتی کوردی پشت قەفقاس ، یەریڤان ١٩٥٧ .

بەرهەم ، قوتابتی و قوتابخانە ، زبانی رۆشنبیری ..... کردوە .

هـەر ئەمینی عەڤدالّ لە سـالّی ۱۹٦۰دا لە گۆڤـاری « رۆژهەلاتناستی »دا لە ژێر ناوی « کولتوری کوردی ئەرمەنستانی سۆڤیێت »دا[٥٥] . بە زمانی روسی وتاریێکی بلاوکردەوە . لەم وتاردا باسی ئەو گۆرانەی کردوە کە پاش شـۆرشی ئۆکتۆبەر لە ژیانی کۆمەلایەتی کورددا روی داوە . ئەم زانایە لە سالّی ۱۹٦٥ یشدا بە زمانی کوردی لیکۆلینەوەیەکی نوێی بـە ناوی « پەیوەندی خێزانتی لە ناو کورددا » بلاوکردەوە[٥٦] و ئەمـەش هەنگاوێکی گەورەیە کە نوسەر بە زمانی زگماکی خۆی ئەم بەرهەمە رازاوەیەی پێشکەش کردوە .

ئەوەی شـایانی باسە ئەوەتە کە ئەمینی عەڤدالّ بە لیکۆلینەوە زانستیکانی کە بە زمانی ئەرمەنی و روسی و کوردی نوسیوێتی خزمەتێکی گەورەی رۆشنبیری گەلەکەی کردوە و چەند بەردێکی مەحکەمی لە دروست کردنی کۆشکی کوردناستی سۆڤیێتدا داناوە .

حاجی جندی کە زانایەکی ناسراو و گەورەی کوردی سۆڤیێتە ، لە کۆکردنەوە و رزگارکردنی فۆلکلۆردا لە مەترسی خزمەتێکی زۆر و بێشوماری کردوە .

(٥٥) ئەمینی عـەڤدالّ ، کولتوری کوردی ئەرمەنسـتان ، گۆڤـاری « رۆژهەلاتناستی » ، یەریڤان ۱۹٦۰ ، ب ۱ ، ل ۱۷٦ ـ ۱۸۹ .

(٥٦) ئەمینی عەڤدالّ ، پەیوەندی خێزانتی لە ناو کورددا ، یەریڤان ۱۹٦٥ .

یەکەم نوسراوی ئەم زانایە کتێبی « فۆلـکلۆری کوردی » یە کە سالّی ۱۹۳٦ لەگەڵ ئەمینی عەڤدالّدا بلاّویانکردۆتەوە و کە لە سەرەوە لێی دواوین . هەر لە سالّی ۱۹۳٦دا حاجی جندی بە هاوکاری کارۆ زاکاریان هەندێ تێکستی فۆلکلۆری کوردی لە چاپدا[٥٧] . لەم کتێبەدا بە شێوەیەکی سەرەکی گۆرانی دڵداری و ئەڤین و هەڵپەڕکێ و قارەمانێتی ..... تۆمار کراون و هەروەها نوسەران لە بەرهەمی فۆلکلۆری کوردی کۆڵیونەتەوە .

حاجی جنـدی گەلێك وتاری لە بارەی ئەدەب و فۆلـکلۆری کوردی ئەرمەنستانی سـۆڤێتیەوە بلاّوکردۆتەوە ، وەك : « دەنـگی قارەمانێتی و ئازایەتی کوردی ئەرمەنـستانی سـۆڤێت لـە فۆلـکلۆردا »[٥٨] ، « فۆلـکلۆری کوردی و سۆڤێتی »[٥٩] ، « ئەدەبی کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێت »[٦٠] .... وە لە سالّی ۱۹٥۷دا لە ژێر

(٥٧) حاجی جندی و کارۆ زاکاریان ، گۆرانی میللی کوردی ، یەریڤان ۱۹۳٦ .

(٥٨) بڕوانە : « دەنـگوباسی ئەکادیمیەی زانسـتی ئەرمەنستان » ، یەریڤـان ۱۹٤۲ ، ژ ۹ ــ ۱۰ .

(٥۹) بڕوانە : « دەنـگوباسی ئەکادیمیـەی زانستی ئەرمەنستان » ، یەریڤان ۱۹٥۱ ، ژ ۱۰ .

(٦۰) بڕوانە : گۆڤـاری « ئـەدەب و هـونەری سـۆڤێتی » ، یەریڤـان ۱۹٥۱ ، ژ ۲۰ .

ناوی « فۆلکلۆری کوردی » دا کتێبێکی لە چاپدا.[61] ئەم نووسراوە (٢٩٣) لاپەڕەیە و ناوەڕۆکەکەی بەم جۆرەیە : پێشەکی (ل ٣ ـ ٤) ؛ داستان و سەرگوزشتە (ل ٥ ـ ١٥٩) ؛ ئەفسانە (ل ١٦١ ـ ١٨٦) ؛ گۆرانی دلـداری و ئەڤین (ل ١٨٩ ـ ٢٢٣) ؛ گۆرانی شـایی (ل ٢٢٥ ـ ٢٤٨) ؛ پەندی پێشینان و قسەی نەستەق (ل ٢٥٠ ـ ٢٨٢) ؛ فۆلکلۆری کوردی پاش شۆڕش (ل ٢٨٣ ـ ٢٩٣) .

سـاڵی ١٩٦١ یش بەرگی یەکەمی کتێبی « حیکایەتی کوردی » بە زمانی کوردی بڵاوکردەوە[62] . لە پێشەکیدا (ل ١ ـ ١٥) لە بارەی فۆلکلۆری کوردییەوە دواوە و باسی هەموو جۆرەکانی حیکایەتی کوردی کردوە . لە سـاڵی ١٩٦٢ دا بەرگی دووەم[63] و لە ساڵی ١٩٦٩ دا بەرگی سێیەمی[64] ئەم کتێبەی لە چاپدا .

هەر لە ساڵی ١٩٦٩دا لە ژێر چاودێری و سەرپەرشتی حاجی جندیدا کتێبی « گۆرانی و حیکایەتی کوردی » بڵاوکرایەوە[65] .

---

(٦١) حاجی جندی ، فۆلکلۆری کوردی ، یەریڤان ١٩٥٧ .

(٦٢) حاجی جندی ، حیکایەتی کوردی ، ب ١ ، یەریڤان ١٩٦١ .

(٦٣) حاجی جندی ، حیکایەتی کوردی ، ب ٢ ، یەریڤان ١٩٦٢ .

(٦٤) حاجی جندی ، حیکایەتی کوردی ، ب ٣ ، یەریڤان ١٩٦٩ .

(٦٥) خ. مورادوف ، م. رودێنکۆ ، ق. کوردۆ ، ع. شەمۆ ، ئی. تسوکەرمان ، گۆرانی و حیکایەتی کوردی ، مۆسکۆ ١٩٦٩ ،

لەم نووسراوەدا گەلێك داستانی كوردیی ، وەك : « مەم و زین » ، « سیڤا ئاجی » ، « دمدم » ، « زەمبیـل فرۆش » ، « لەیل و مەجنوون » ..... تۆمار كراون .

لە كۆكردنەوە و تۆمار كردن و بڵاوكردنەوەی فۆلكلۆری كوردیدا حاجی جندی دەورێكی گەورەی بینیوە . ئـەو سامانە نەتەوایەتیەمانی لە مەترسـیی لە ناوچوون و فەوتان رزگار كردوە و ئـەم كارە بووە بە كەرەستەیەكی زۆر و سـەرچاوەیەكی راست و زانستیی بۆ لێكۆڵینەوە لە زمان و مێژوو و ئەتنۆگرفیا ...ی كورد . ئەم خزمەتە بێشـومارەی حاجی جندی بووە بـە هۆی رێز و تەقدیرێـكی بەرز بۆ نووسەر و كاری پیرۆزی .

هەروەها بەم كارە حاجی جندی رێگەی نیشانی زانایانی بەرەی نوێ دا و ئێستا گەلێك لە كوردانی سـۆڤێت بـە كۆكردنەوە و رزگاركردنی فۆلكلۆرەوە خەریكن ، بە تایبەتی ئۆردوخانی جەلیل و جەلیلی جەلیل ...

لە ساڵی ١٩٦٤دا ئۆردوخانی جەلیـل كتێبێكی لە ژێر ناوی « چوارینەی فولـكلۆری كوردیی ـ گۆرانی دڵداریی و ئەڤین » دا بڵاوكردەوە[٦٦] ، وە لە سـاڵی ١٩٦٩ و ١٩٧٠دا دوو كتێبی بچووكی

(٦٦) ئۆردوخانی جەلیل ، چوارینەی فۆلـكلۆری كوردیی ـ گۆرانی دڵداریی و ئەڤین ، یەریڤان ١٩٦٤ .

« پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی »[٦٧] و لە ساڵی ١٩٦٨ کتێبی داستانی قارەمانێتی کورد « خانی لەپ زێڕین » و « قەڵای دمدم »ی[٦٨] لە چاپدا .

یەکێك لە کارە هەرە گەورە و زانستێکانی ئۆردوخانی جەلیل کتێبی « پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی »یە کە بە هاوکاری جەلیلی برای بە زمانی کوردی و روسی نوسیویێتی[٦٩] لێرەدا پێویستە سەرنج بو ئەوە رابکێشین کە وا نوسەرانی ئەم کتێبە لە بریتی پێشەکی بە روسی (ل ٥ ـ ٢٣) و بە کوردی (ل ٢٤ ـ ٤١) بە کورتی بە شێوەیەکی پێویست و شێوازیکی زانستی لە بارەی مێژوی لێکۆڵینەوە و نرخ و شوێن ......ی پەندی پێشینانی کوردی دواون .

هەرچەندە لە وەرگێڕان بۆ سەر زمانی روسی و خستنە سەر ئەلفبای لاتینی چەند ناتەواوی و هەڵەیەکی کەم دەبینرێت ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کارێکی پوخت و نایاب و سەرکەوتوە و کەلێنێکی

---

(٦٧) ئۆردوخانی جەلیل ، پەندی پێشینان و قسەی نەستەق ، یەریڤان ١٩٦٩ و ١٩٧٠ .

(٦٨) ئۆردوخانی جەلیل ، « خانی لەپ زێڕین » و « قەلای دمدم » و مۆسکۆ ١٩٦٧ .

(٦٩) ئۆردوخانی جەلیل و جەلیلی جەلیل ، « پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی کوردی » ، مۆسکۆ ١٩٧٢ .

گەورەی لە کوردناسیدا پڕکردۆتەوە .

جەلیلی جاسم کە کوردناسێکی لاوە ، جگە لە چەند وتارێك دوو کتێبی نایابی لە بارەی مێژووی کوردەوە بڵاوکردەوە : کتێبی یەکەمیان لە بارەی شۆڕشەکەی شێخ عوبەیدوڵڵاوەیە کە لە ساڵی ۱۸۸۰دا دژی نارەوایی و ستەمی رژێمی تورکیا و ئێران بەرپا بوو.[۷۰] کتێبی دووەمیان لە بارەی پێشکەوتنی سیاسەتی میللەتی کورد دەدوێ لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا ـ واتە لەو دەورەی کە لە ئەنجامی دواکەوتن و لاوازبوونی باری ئابوری و جەنگی و سیاسەتی فەرمانڕەوایی سوڵتانەکانی عوسمانی لە کوردستاندا ئەمارەتە کوردییەکان بەهێز بوون و فروان کران[۷۱] .

ئەوەی شـــایانی باســـە ئەوەتە کە کتێبی یەکەمیان وەرگێڕراوەتە ســـەر زمانی عەرەبی و لە رۆژنامەی « التآخی » ساڵی ۱۹۷۲دا بە چەند زنجیرەیەك بڵاوکراوەتەوە ، کتێبی دووەمیشیان ئێستا د. کەمال مەزهەر خەریکی وەرگێڕانێتی بۆ عەرەبی و تاکو ئێستا چەند زنجیرەیەکی ئەو تەرجومەیەی لـەگەڵ لێکۆڵینەوە و تێبینی زانســتی خۆی لەو کارە لە هەمان رۆژنامەدا خستۆتە بەر دەم خوێنەران .

---

(۷۰) جەلیلی جەلیل ،شۆڕشی ساڵی ۱۸۸۰ی کورد ، مۆسکۆ ۱۹۶۶ .

(۷۱) جەلیلی جەلیل ، کوردی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا ، مۆسکۆ ۱۹۷۳ .

خالیدی چەتۆ کە ئێستا سەرۆکی بەشی کوردیی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسیی ئەکادیمیەی زانستیی ئەرمەنستانە چەند نوسراوێکی لە بارەی مێژوی کوردەوە بڵاوکردۆتەوە، بە تایبەتی کتێبی «کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتی»[٧٢] و «کورد لە شەڕی دووەمی جیهاندا»[٧٣] ... ناسراوان و سەرنج رادەکێشن . لە کتێبی یەکەمدا سەبارەت بە دەوری پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان گەلێك نمونەی کە بون بە هۆی پێشخستنی رادەی ئابوریی و سیاسیی و رۆشنبیریی ... چینی کرێکاری کورد هێناوەتەوە . بەم بۆنەیەوە نوسەر لە پێشەکیدا نوسیویێتی دەڵێ : لەم کتێبەدا ئەو گۆڕانە کۆمەڵایەتیی و ئابورییەی لە بنەڕەتا پاش دامەزراندنی دەسەڵاتی سۆڤێت بەسەر کورددا هاتووە رون دەکرێتەوە[٧٤] .... لە کتێبی دووەمدا دەوری کوردی سوڤێتی نیشان داوە لە هاوبەشیی راستەقینەدا لەگەڵ هەمو میللەتانی تری سۆڤێتدا لە شەڕی دووەمی جیهاندا بەرامبەر بە هێرشی ئەڵمانیای نازیی .

شەکرۆی خودۆ ماوەیەکی درێژ لە رۆژنامەی «رێیا تازە» کاری دەکرد و ئێستا لە بەشی کوردییەکەی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسیی یەریڤانە . لێکۆڵینەوەکانی ئەم نوسەرە بە زۆریی دەربارەی بزوتنەوەی

---

(٧٢) خالیدی چەتۆ ، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتی ، یەریڤان ١٩٦٥ .

(٧٣) خالیدی چەتۆ ، کورد لە شەڕی دووەمی جیهاندا ، یەریڤان ١٩٦٩ .

(٧٤) سەرچاوەی ناوبراو ، کوردی ئەرمەنستانی سۆڤێتی ، ل ٥ .

ئازادیی نەتەوایەتیی کوردە لە عێراق و هەروەها چەند وتارێکیشی لە بارەی وەزعی کوردی تورکیا پاش شەڕی دووەمی جیهان بڵاوکردۆتەوە .

مەکسیمی خامۆش لە بارەی زمانی کوردییەوە چەند وتار و نامیلکەی بڵاوکردۆتەوە ، وەك : « رەخنە لە کتێبەکەی چ. خ. باکایێف ( شێوەی کوردیی تورکمەنستان ) »[٧٥] ؛ « مەرفۆلۆژیای شێوەی بادینان »[٧٦] ...

گ. ب. ئاکۆپۆف دەربارەی نەژاد و مێژوَی کورد هەندێ وتاری بڵاوکردۆتەوە . کاری هەرە گەورەی ئەم زانایە نامەی دوکتۆرێکەیەتی کە لە ژێر ناوی « رەخنەی مێژوَیتی لە مەسەلەی نەژادی کورددا » نوسیویێتی . ئەم نوسراوە پتر لە (٥٠٠) لاپەڕە دەبێت . گ. ب. ئاکۆپۆف لەم لێکۆڵینەوەیەدا گەلێك زانیاری راست و چەسپاوی شێواندوە و لە روَنکردنەوەی نەژاد و زمان و کولتوری گەلی کورددا گرنگی بە تیۆری بورجوازیی و یافیتیی و سامیی و شۆڤێنێتی فارسیی و تورکیی داوە، هەروەها بۆ ئەم مەبەستە گەلێك لاپەڕەی لەسەر لێکدانەوەی هەندێ ئەفسانەی جیاوازی کوردیی و عەرەبیی و فارسیی نوسیوە و بەم بۆنەیەوە دەڵێ : « هیچ یەکێك لەم سەرگوزشتە و داستانانەی سەدەکانی ناوەڕاست بە

(٧٥) بڕوانە : گۆڤاری « مێژو و فیلۆلۆژیا » ، یەریڤان ١٩٦٥ ، ز ٣ .

(٧٦) بڕوانە « کورتەی نامەی دوکتۆری » ، یەریڤان ١٩٦٥ .

خۆڕایی هەڵبەستراون و رەگیان دەگەڕێتەوە بۆ زۆر کۆنیا، لەبەر ئەوە لێکۆڵینەوە لە ئەفسـانە و سـەرگوزشتە و داستان بۆ رۆنکردنەوەی نەژادی کورد دەوری خۆی دەبینێ »[77] . راستە سەرگوزشتە هەن کە هەڵبەسـتراون و رێك خراون بە گوێرەی پێویستی چەرخ . ئەو جۆرە سەرگوزشتە و داستانانە ناتوانن ببن بە بەڵگەی مێژوویی بۆ لێکۆڵینەوەی باسێکی زانستی . توسەر جیاوازی لە نێوان ئەفسانە و سـەرگوزشتە و داسـتانی راست و ناڕاست ، رووداو و هەڵبەستراودا نابینێت ، هەر لەبەر ئەوەشە گەلێك لاپەڕەی بەو ئەفسانانە پڕکردۆتەوە کە دەڵێن کورد لە شـەیتانەوە پەیدابوون[78] .

ك. ب. ئاکۆپۆڤ گەلێـك بیر و رای دوور لە زانسـتی هێناوەتەوە و ویستویەتی لەو رێگەیەوە بکاتە ئەنجـام . هەروەها هەوڵی زینـدوو کردنەوەی گەلێ تیۆری چەوت و بۆرجوازی وای داوە کە لە مێژە لەناو براون ... بێگومان ئەمانە هەموو بوون بـە هۆی لاوازی لێکۆڵینەوەکە .

---

(٧٧) ك. ب. ئاکۆپۆڤ ، « رەخنـەی مێژوویی لە مەسـەلەی نـەژادی کورددا » ، (کورتەی نامەی دوکتۆری) ، یەریڤان ١٩٦٩ .

(٧٨) لە وتارێکی ق. کوردۆوە وەرگیراوە ، کە هێشتا لە چاپ نەدراوە .

## لە لێنینگراد :

ساڵی ١٩٢٨ کۆمیتەی ناوەندیی پارتی کۆمۆنیستی ئەرمەنستان ژمارەیەك قوتابیی کوردی نارد بۆ « زانستگەی کرێکاران » لە لێنینگراد . پاش تەواوکردنی زانستگە هەندێکیان گەڕانەوە بۆ ئەرمەنستان و چەند کەسێکیان لە ئاموزگای زمانەوانیی زانکۆی لێنینگراد وەرگیران . بەم بۆنەیەوە سەرۆکی بەشی ئێرانیی پرۆفیسۆر ئا. ئا. فرێیمەن بەشی کوردیی کردەوە ، وە بۆ پتەو بوون و فراوان کردنی بەشەکە چەند قوتابیەکی لە میللەتانی تری سۆڤێت وەرگرت و هەروەها ئی. ئا. ئۆربیلی بۆ وتنەوەی زمانی کوردیی و ئەتنۆگرافیای کورد بانگ کرد .

ساڵی ١٩٣٣ چەند قوتابیەکی پۆلی سێهەم : قەناتی کوردۆ و عەرەبی شەمۆ و ئیسحاق تسوکەرمان بە رابەریی مامۆستاکانیان لە بارەی زمانی کوردییەوە دوو وتاریان بڵاوکردەوە : « ئیزافە لە زمانی کوردیدا »[٧٩] و « نێر و مێ لە زمانی کوردیدا »[٨٠] . لەم دوو وتارەدا بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردناسیدا هەست بە هەندێ

(٧٩) بڕوانە : گۆڤاری « شۆڕش و نوسین » ، مۆسکۆ ١٩٣٣ ، ژ ١ ، ل ٥١ ــ ٥٦ .

(٨٠) بڕوانە : کتێبی « نوسین و شۆڕش » ، مۆسکۆ ١٩٣٣ ، ژ ١ ، ل ١٧٩ ــ ١٨٠ .

خاسیەتی دابەشکردنی ناو بەسەر نێر و مێدا و نیشانەی ئیزافەدا کراوە.

پاش ماوەیەك سێ قوتابی لە دەرچوانی بەشی کوردی زانکۆی لێنینگراد : یو. یو. ئاڤالیانی ، ق. کوردۆ ، ئی. ئی. تسوکەرمان لە بەشی دوکتۆرا وەرگیران و ســالی ۱۹۳۹ — ۱۹٤۱ خوێندنی دوکتۆرایان تەواو کرد .

پێگەیاندنی کادری کوردناسی لە بەشی ئادابی زانکۆی لێنینگراد بە تایبەتی بە یارمەتی ئا. ئا. فرییمەن و ئی. ئا. ئۆربیلی هەنگاوێکی گەورە بێ لە پێشخستنی کوردناسیدا بە گشتی و وەرگرتنی شێوەیەکی راست و شێوازێکی زانستی لە لێکۆلینەوەی مەسەلەی کوردناسیدا .

لە مانگی شوباتی ســالی ۱۹۵۹دا بە فەرمان و سەرپەرشتی سەرۆکی ئاموزگای رۆژهەلاتناسی لێنینگراد ئی. ئا. ئۆربیلی ئەو چەند کوردناسەی کە لە بەشی ئێرانی بوون جیا کرانەوە و وەك کۆمەلێکی سەربەخۆ لە ژێر ناوی « کەبینێتی کوردی »دا رێکیان خستن و ئەمەش هەنگاوێــکی گەورەی تر بێ لە پێشخســتنی کوردناسی سۆڤێتدا ، بەلــگەش بۆ ئەمە ئەو ژمارە زۆرە کارە زانستییە نایاب و بەنرخانەن کە کارگێرانی بەشــی کوردی لە ماوەی ئەم چواردە سالەدا لە بارەی زمان و ئەدەب و فۆلکلۆر و مێژوو و ئەتنۆگرافیای کوردەوە بلاویان کردۆتەوە .

هەروەها حەز دەکەم سەرنجیش بۆ ئەوە رابکێشم کە وا ئی. ئا. ئۆربیلی لە یەکێتی سۆڤێت بناغەی کوردناسی دانا و خزمەتێکی

باشـــی ئەم زانستەی کـردوە و لە لێکۆڵینەوەی کورد و زمانی کوردیدا دەورێکی تایبەتی هەیە. لەگەڵ ئەوەی بە کاروباری کارگێڕی و مەسەلەی زمانەوانییەوە بە گشتی زۆر خەریك بووە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا جاروبار لە کورد و زمانەکەی کۆڵیوەتەوە و لە نـاو دەستنوسەکانیدا هـەندێ لێکۆڵینەوەی لە سـەر زمانی کوردی ئەرمەنستان هەیە .

ماموّســتا قەناتی کوردۆ کە لە پاش ئی. ئا. ئۆربیلییەوە تا ئێستا سەرۆکی بەشە خزمەتێکی گەورە و شایانی کوردناسی کردوە و لەم ڕووەوە گەلێك کاری زانستی نوســیوە ، کە زۆربەیان بـــۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی تەرخان کراون ـ واتە نوسینی ڕێزمانی کوردی ( تـیۆری و پراکتیك )، لێـکۆڵینەوە لە زمانی گفتوگۆ و لە زمانی ئەدەبی ، بەراوردکردنی دیالێکتی کرمانجی ژوورو و خوارو ، دانانی فەرهەنگی کوردی ـ ڕوسی و ئەو بابەتانە .

ئـەو کارە زمانەوانیانەی ق. کوردۆ نوســیویێتی ئەمانەن : دوو فەرهەنگ ـ کوردی ( کرمانجی ژوورو ) ـ ڕوسی[81] ، وە کوردی (کرمانجی خوارو ) ـ ڕوسی[82] . چەند کتێب و نامیلـکە لە بارەی ڕێزمانی زمانی کوردییەوە ، وەك : « ڕێزمانی زمانی کوردی » ( بە

---

(٨١) ق. کوردۆ ، فەرهەنـگی کـوردی ( کرمانجی ژوورو ) ـ ڕوسـی ، مۆسکۆ ١٩٦٠ .

(٨٢) ئامادە کراوە بۆ چاپ .

زمانی كوردی )[83] ، « رێزمانی زمانی كوردی » (بە زمانی رووسی )[84] ، « بەراوردكردنی رێزمانی زمانی كوردی »[85] ... هەروەها ژمارەیەكی زۆر لە وتار ، وەك : « تصریفی كرداری متعدی لە زمانی كوردیدا »[86] ، « مانا و فەرمانی پاشكۆی - ك ( ەكە ) لە زمانی كوردیدا »[87] ، « پێشگر و پاشگر لە زمانی كوردیدا »[88] ، « جێناوی لكاو لە زمانی كوردیدا »[89] ، « لە بابەت نڤیسكار زمان و ئەلفبایی

---

(٨٣) ئەم كتێبە لە سالی ١٩٤٩دا لە یەریڤان لە چاپ دراوە و تاكو ئێستا چوار جار - لە سالانی ١٩٤٩ ، ١٩٥٦ ، ١٩٦٠ و ١٩٧٠ دا لە چاپ دراوەتەوە .

(٨٤) ق. كوردۆ ، رێزمانی زمانی كوردی ، مۆسكۆ ١٩٦٢ .

(٨٥) نامەی دوكتۆرییەكەیەتی كە لە سالی ١٩٦٨دا دوكتۆرای علومی بۆ وەرگرتووە و ئێستا لە ژێر چاپدایە .

(٨٦) بڕوانە : كتێبی « وتاری نوێنەرانی سۆڤیێت لە كۆنگرەی بیست و چوارەمی رۆژهەلاتناسیدا » ، مۆسكۆ ١٩٦٠ ، ل ٩ .

(٨٧) بڕوانە كتێبی « مێژووی كولتوری گەلانی رۆژهەلات » ( بۆ بیرەوەری ئی. ئا. ئۆربیلی ) ، مۆسكۆ - لێنینگراد ١٩٦٠ ، ل ٣٦١ - ٣٦٨.

(٨٨) بڕوانە كتێبی « فیلۆلۆژیای ئێرانی » ، مۆسكۆ ١٩٦٤ .

(٨٩) بڕوانە كتێبی « نووسراوە دێرینەكان و مەسەلەی مێژووی كولتوری گەلانی رۆژهەلات » ، لێنینگراد ١٩٦٥ ، ل ٥٦ - ٥٧ .

پەرتوکێت دینی ئێزیدیان »[90] ...

ق. کوردۆ تەنها بە لێکۆڵینەوەی زمانی کوردییەوە خەریك نەبووە ، بەڵکو گەلێك بەرهەمی باشیشی لە بارەی ئەدەب و فۆلکلۆر و مێژوو و ئەتنۆگرافیای کوردەوە بڵاوکردۆتەوە ، وەك : « ئەحمەدی خانی و بەرهەمی ئەدەبی »[91] ، « کوردی ئەرمەنستان لە ئەدەبی دەرەوەدا »[92] ، « قەڵای دمدم ـ داستانی قارەمانێتی کورد »[93] ، « پەندی پێشینانی کوردی »[94] ، « شیکردنەوەی بەڵگەکانی کەزنەفۆن دەربارەی کاردوخەکان »[95] ، « کارەکانی پ. لێرخ لە بارەی کوردناسییەوە »[96] ... و گەلێکی تر[97] .

(۹۰) بڕوانە گۆڤاری « کۆڕی زانیاری کورد » ، بەغدا ۱۹۷۳ ، ب ۱ ، ل ۱۳۲ ـ ۱۷۲ .

(۹۱) گۆڤاری « رووناهی » ، بەغدا ۱۹٦۱ ، ژ ۹ ـ ۱۰ .

(۹۲) بڕوانە : رۆژنامەی « رێیا تازە » ، یەریڤان ۱۹٦۰ .

(۹۳) بڕوانە : کتێبی « چیرۆك و داستانی کوردی » ، مۆسکۆ ۱۹٦۰ .

(۹٤) بڕوانە : کتێبی « پەندی پێشینان و قسەی نەستەقی گەلانی رۆژهەڵات » ، مۆسکۆ ۱۹٦۰ .

(۹٥) بڕوانە : کتێبی « کورتەی وتارەکانی کۆنفرانسی زانستی ئێرانناسی » ( بۆ یادی شەست ساڵەی پرۆفیسۆر ن. ئا. بۆڵدرێف ) ، مۆسکۆ ۱۹٦۹ ، ل ۲٥ ـ ۲۸ .

(۹٦) بڕوانە : کتێبی « لە بارەی مێژووی رۆژهەڵاتناسی رووسەوە » ، مۆسکۆ ۱۹٥۹ ، ب ٤ ، ل ۳۹ ـ ٥۱ .

(۹۷) کارە زانستییەکانی ق. کوردۆ هێندە زۆرن کە لەم وتارەدا توانای

هەروەها ئی. ئی. تسوکەرمان خزمەتێکی باشی زمانی کوردی کردوە و ژمارەیەکی زۆر لە وتار و نامیلکە و کتێبی لە بارەی زمانی کوردییەوە نوسیوە. ئەوەی لە ناویاندا جێگای بەرز و دیاری وەرگرتبێ کتێبی «رێزمانی زمانی کوردی» یە کە لە ساڵی ١٩٦٢دا لە چاپ دراوە[٩٨]. ئەم نوسراوەی کە بریتییە لە (٢٤٠) لاپەڕە، دەربارەی کردارە لە دیالێکتی کرمانجی ژوروودا. بەمە و ژمارەیەك کاری زانستی تر لە مەسەلەی مەرفۆلۆژیادا[٩٩] گەلێك کێشەی ئاڵوز و گرنگی رێزمانی زمانی کوردی خاوکردۆتەوە.

هەرچەندە زۆربەی ئەو کارە زانستیانەی کوردناسانی لێنینگراد نوسیویانە سەبارەت بە زمانن بەڵام لە گەلێ روی تریشەوە درێغییان نەکردوە، بە وینە دەبینین لە بارەی فۆلکلۆر و ئەدەبەوە بە تایبەتی م. ب. رودێنکۆ کۆمەڵێك کاری نایابی بڵاوکردۆتەوە، وەك: «مەم و

= ئەوەمان نیە باسی هەموێان بکەین. هەروەها مامۆستا کوردۆ تا ئەمڕۆش کە تەمەنی گەیشتوەوە بە شەست و سێ ساڵی رەبەق لەم مەیدانە سەختەدا هەر خەریکی رازاندنەوەی کتێبخانەی زانستی کوردییە بە بەرهەمە بەهادارەکانی.

(٩٨) ئی. ئی. تسوکەرمان، رێزمانی زمانی کوردی، مۆسکۆ ١٩٦٢.

(٩٩) بە وێنە: «وشەی مرکب لە زمانی کوردیدا» (لە کتێبی: وتاری زانایانی ئامۆزگای زمانەوانی، لێنینگراد ١٩٦٣)؛ «نیشانەی کۆ لە دیالێکتی کرمانجی ژوروودا» (فیلۆلۆژیای ئێرانی، مۆسکۆ ١٩٦٩)......

زینی ئەحمەدی خانێ »[١٠٠] ، « شێخی سەنعانی فەقێ تەیران »[١٠١] ، « لەیل و مەجنونی حارسی بتلیسێ »[١٠٢] ... لە بارەی ئەتنۆگرافیاشەوە « عادات و رسـومات نامـەی اکرادیەی مـەلا مەحمـودی بایەزیدێ »[١٠٣] ....

کاری هـەرە گەورە و سەرکەوتوو لە مەسەلەی مێژووی گەلی کورددا شـەرەفنامەی شەرەف خانی بتلیسییە کە ی. ئی. ڤاسیلیڤا کردویە بە رووسی و لە سالی ١٩٦٧دا لەگەڵ پێشەکیەکی نایابـدا بڵاوی کردۆتەوە[١٠٤] .

لە نێوان کارەکانی ژ. س. موسیلیاندا « بیبلوگرافیای کوردناسی » کە سالی ١٩٦٣ بڵاوی کردۆتەوە[١٠٥] ، جێگای تایبـەتی خـۆی

(١٠٠) م. ب. رودێنکۆ ، « مەم و زین »ی ئەحمەدی خانـێ ، مۆسکو ١٩٦٢ .

(١٠١) م. ب. رودێنکۆ ، « شێخی سەنعان »ی فەقێ تەیران ، مۆسکو ١٩٦٥ .

(١٠٢) م. ب. رودێنکۆ ، « لەیـل و مەجنـون »ی حارسـی بتلیسـێ ، مۆسکۆ ١٩٦٥ .

(١٠٣) م. ب رودێنکۆ ، « عادات و رسومات نامەی اکرادیە »ی مەلا مەحمودی بایەزیدێ ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

(١٠٤) ی. ئی. ڤاسیلیڤا ، « شەرەفنامە »ی شەرەف خانی بتلیسێ ، مۆسکۆ ١٩٦٧ .

(١٠٥) ژ. س. موسیلیان ، بیبلیوگرافیای کوردناسی ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

وەرگرتووە . زارێ یوسوپۆڤاش جگە لە هاوکاری کردن لە دانانی ئەو فەرهەنگە کوردیی (کرمانجیی خوارۆ) - رۆسیەدا کە لە سەرەوە ناومان برد ، هەروەها چەند وتارێکی نایابی لە بارەی رێزمانی کوردییەوە (دیالێکتی کرمانجیی خوارۆ) بڵاوکردۆتەوە .

ئو. ل. ڤیلچێڤسکی گەلێك نوسراوی مێژوویی و ئەتنۆگرافیی و ئەدەبیی و زمانەوانیی بڵاوکردۆتەوە ، بەڵام بە داخەوە مەرامی هەرە گەورەی لە لێکۆڵینەوەکانیدا ئەوەبوو کە تەشەنە بە بیر و را چەوتەکانی ن. یا. مارر ، بدا و بیان چەسپێنێ و جێگیریان بکات .
ئو. ل. ڤیلچێڤسکی دژیی ئەو رێگا راستە مێژووییە راوەستابوو کە بۆ لێکۆڵینەوەی زمانە ئێرانیێکان و بە تایبەتی بۆ زمانی کوردیی بەکار دەهێنرا . ڤیلچێڤسکی زمانی کوردیی وەك زمانێکی تێکەڵاو تەماشا دەکرد و وای دەدایە قەڵەم کە رێگای پێشکەوتنی لە زمانە یافیتێکانەوە دەست پێ دەکات و دوایی لە رێگای زمانە ئێرانیێکان و عەرەبییەوە بەرەو زمانی تورکیی دەڕوات .

هەر لەبەر ئەوەی لە زمانی کوردیدا هەندێ وشە هەن لە زمانی تورکییەوە نزیکن ، ڤیلچێڤسکی دەڵێ کە گوایا لە سەدەی ١٣دا لە تورکیا زمانی چینی سەرکاری کورد تێکەڵ بە زمانی تورکیی بوو ، بەڵام زمانی چینی زەحمەتکێش هەر لەسەر شێوەی کۆنی دەڕۆیشت ، کە یافیتیی و ئێرانیی و عەرەبیی بوو .... « پاش ماوەیەك ، لەسەرخۆ زمانی چینی زەحمەت کێش لە زمانە سامێکان نزیك

دەبێتەوە . لە پڕ لە زمانە سامێکان دوور دەکەوێتەوە و وەك زمانی چینی دەرەبەگی ساکاری ئەو دەورەی لێ دێت »[106] .

ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لە وتاری « کەرەستەی زمانەوانیی دەربارەی مێژووی شێوەی کۆمەڵایەتیی کوردستان »[107] و « پێشکەوتنی زمانە زیندووەکانی ئێران »دا[108] ، زمانە ئێرانیێکانی ناوچەی ئێران بەسەر زمانی ئەدەبیی و زمانی گفتوگۆدا دابەش دەکات . بەم جۆرە زمانی فارسیی ـ بە زمانی ئەدەبیی ، وە زمانی فارسیی زیندوو و دیالێکتەکانی زمانی کوردیی ـ بە زمانی گفتوگۆ دەداتە قەڵەم و لەم رووەوە توسیوێتی دەڵێ : زمانی ئەدەبیی ـ لە سەرێکەوە زمانی چینی بەڕێوەبەرانە و لە سەرێکی کەشەوە یەکێکە لە زمانە هیند و ئەورووپاییەکان . زمانی گفتوگۆ ـ زمانێکی زیندووە و پەیوەندییەکی کۆن و بە هێزی هەیە لەگەڵ زمانە یافیتێکاندا ، یاخود هێشتا لە دەوری یافیتیی دان .

لەبەر رۆشنایی لێکۆڵینەوەکانی ئو. ل. ڤیلچێڤسکیدا وا

---

(١٠٦) ئو. ل. ڤیلچێڤسکی ، پێشکەوتنی زمانە زیندووەکانی ئێران ، « ئەکادیمیەی زانستیی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر » ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٣٥ ، ل ١٩٤ .

(١٠٧) زمانە ئێرانیێکان ، ب ١ ، ١٩٤٥ ، ل ١٣ ـ ٣٠ .

(١٠٨) سەرچاوەی ناوبراو ، ئەکادیمیەی زانستیی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر ، مۆسکۆ ـ لێنینگراد ١٩٣٥ ، ل ١٩١ ـ ١٩٨ .

دەردەکەوێ کە کورد میللەتێکی رەسەن نییە و خاوەنی یەك زمان نییە ، بەڵکو لە جیاتی یەك زمان کە هەمۆ کۆمەڵی کورد تێی بگەن خاوەنی سێ چوار زمانن ، وە لـە چۆنیەتی دروست بۆن و پێشکەوتنیشدا زۆر جیاوازن لە یەکتر . هەر لەبەر ئەم باوەڕەشە کە دەڵێ : « لە زمانی کوردێ ، راستتر لە زمانە کوردییەکان دەبێ باش بـکۆڵرێتەوە ـ واتە لەسەر شێوەی زانیاری نوێ ، ئەوسا گەلێك دەوری لە بیرکراوی ئادەمیزاد ئاشکرا دەبێ »[109] .

ق . کوردۆ زۆر راست پەنجەی بۆ ئەوە را کێشاوە کە ئو. ل. ڤیلچێڤسکی لە هەمۆ نۆسینەکانیدا کە دەربارەی کورد و زمان و ئەدەب و مێژوی کۆمەلایەتی کوردن باش دەردەکەوێ کە یەکێکە لە چالاکترین لایەنگیران و پڕوپاگەندەکەرانی تیۆرییە چەوتەکەی ن . یا. مارر لە بارەی نەژادی کورد و زمانی کوردییەوە . لە گشت نۆسینەکانیدا تەشـەنە بە بیر و باوەڕەکانی ن . یا. مارری مامۆستای دەدات و بە هەمۆ چەشنێك هەوڵی داوە نیشانی بدات کە کورد خاوەنی زمان و مێژو و کولتوری خۆیان نین[110] .

هەروەها د. کەمال مەزهـەر لە وتارێکیدا کە لە ژمارە

---

(١٠٩) گۆڤاری « ئەتنۆگرافیای سۆڤێت » ، ژ ٤ ـ ٥ ، ١٩٣٦ ، ل ١٢٣ .

(١١٠) ق. کوردۆ ، رەخنـە لە بیر و باوەڕی چـەوت بەرامبـەر بە زمانی کوردێ ، گۆڤاری « کورتەی دەنگوباسی ئامۆزگای رۆژهەلاتناسی » ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ب ١٢ ، ل ٤٧ .

(١)ی ساڵی ١٩٧٢ی گۆڤاری « بەیان » دا بڵاوی کردۆتەوە[111] .
بە گەلێك بەڵگەی زانستی و واقعی ئەو هەڵانەی ئو. ل.
ڤیلچێڤسکی راست کردۆتەوە کە لەو باسەی لە بارەی « کورد » و
« کوردستان » دا لە ئینسکلۆپیدیای مێژوی سۆڤێتدا کردویتی .

لە ساڵی ١٩٦١دا ڤیلچێڤسکی لێکۆلینەوەیەکی لە ژێر ناوی
« کورد . سەرەتایەك لە مێژوی ئەتنۆگرافیای گەلی کورد »
بڵاوکردەوە[112] . ئەم کتێبە کە ١٦٢ لاپەڕەیە پێکهاتووە لە :
پێشەکی (ل ٣ ـ ٤) و هەشت فەسڵ (ل ٥ ـ ١١٦) و هەندێك
سەرنج و ئەنجام (ل ١١٧ ـ ١٦٢) .

نوسەر لەم کتێبەدا لە رێگای هێنانەوەی هەندێ نمونەی
ئاشکرا لە زانستدا دەربارەی کۆمەڵی خاوەن کۆیلەکان ، لە رێگای
نیشاندانێکی زۆر لە بیر و رای هەندێك لە زانایان دەربارەی دروست
بونی کۆمەڵ و سیاسەتی میللەتان و هۆزانی جیاوازی زۆ کە لە
ناوجەرگەی کوردستانی ئێستادا جێگیر بوبون ، لە رێگای
بەراوردکردنی هەندێ بەڵگەی مێژویی و کۆمەڵایەتی و

(١١١) د. کەمال مەزهەر ، کورد و کوردستان لە ئینسکلوپیدیای مێژوی سۆڤیەتیدا ، گۆڤاری « بەیان » ، ژ ١ ، بەغدا ، ١٩٧٢ ، ل ٢٠ ـ ٢٣ .

(١١٢) ئو. ل. ڤیلچێڤسکی ، کورد . سەرەتایەك لە مێژوی ئەتنۆگرافیای گەلی کورد ، مۆسکۆ ١٩٦١ .

رەوشـــنبیری ، هەروەها لە رێــگای بیر و باوەڕێــکی شــێواو و نەگونجاو و بێ هـیچ بەڵــگەیەکی زانستی و لەســـەر بنچینەی تیۆرییەکی چەوت و نازاســت ویستویەتی پەیوەندی کورد لەگەڵ میللەتانی دراوســێیدا نیشان بدات . ئەو باوەڕەی زانایان هەیانە دەربارەی ئەوەی کە هیچ بەڵــگەیەك نییــە بۆ نیشاندانی پەیوەندی ئەتنۆگرافی و زمانی لە نێوان کوردی ئێستا و خێڵە ســامێکان و عەرەبەکان و یافیتێــکان و تورکەکاندا نوســـەر بە راستی نازانێ و هەوڵی داوە بە هــەر چەشنێك بێت لە ناو کورددا شتێك هـــەر بدۆزێتەوە ، کە لەو رێــگایەوە کورد لەگەڵ ئەو میللەتانەی ناومان بردن بکات بە خزم . هەروەها ڤیلچێڤسکی بێ هیچ بەڵــگەیەك دژی رای راســت و چەسپاوی ئەو زانایانە وەستاوە ، کە کوردی ئێستا بە نەوەی ماد و کاردۆخ دادەنێن .

کەریم ئەیوبی و ئی . ئا . سمیرنۆڤا جگە لە چەنـــد وتارێــکی بە نرخ ، خاوەنی کتێبی « دیالێــکتی کوردی مــوکری »ن[113] . کە دەنــگێــکی باشی لە کوردناسی ســـۆڤێتدا داوەتەوە ، بە تایبــەتی چونــکە نوســـەرانی ئەم کتێبە بە شێوەیەکی زانستی و راست لە رێزمانی کوردی کۆڵیونەتەوە و بە بیری من ئەم کتێبە پێویستە بکــۆڕدرێتە سەر زمانی کوردی .

(١١٣) ك. ر. ئـەیوبی و ئی. ئــا. سمیرنۆڤا ، دیالێــکتی کوردی موکری ، لێنینــگراد ، ١٩٦٨ .

پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین کە ژمارەیەکی زۆر لە کوردی سۆڤیێت و دەرەوە لە شـــاری لێنینگراد پێ‌گەیشتوون و نامەی دوکتۆرییان نوسیوە و بەرهەمی زانســـتی خۆیان بڵاوکردۆتەوە . لە ناو کوردە عێراقیێـکاندا د. مارف خەزنەدار چالاکانە کاری دەکرد و لەو ماوە کەمەدا توانی ژمارەیەك وتـاری نایاب(١١٤) و کتێبێـکی بە نرخ لە بارەی ئەدەبی کوردییەوە(١١٥) بڵاوبکاتەوە و هەنـدێك چیرۆکی کوردی وەربگێڕێتە ســـەر زمانی رووسی و لە چاپیان بدا(١١٦) . هەروەها چ ئەو و چ د. کاوس قەفتـــان و چ خاوەنی ئەم وتـارە درێغییان لە یارمـــەتی دانی هەندێك لە کاربەدەســـتە

(١١٤) بە وێنە : شۆڕشی ئۆکتۆبەری مەزن و بەرهەمی شـاعیری کورد ـ ئەحمەد دڵزار ، لە کتێبی « نوسراوە دێرینەکان و مەسـەلەی مێژووی کولتوری گەلانی رۆژهەلات » ، لینینگراد ١٩٦٧ ، ل ٨٣ ـ ٨٥ ؛ مامۆستایانی قوتابخانەی شیعری نوێ لە کوردســتانی خواروودا ، لە کتێبی « نوسـراوە دێرینـەکان و مەســەلەی مێژووی کولتوری گـەلانی رۆژهەلات » ، لینینگراد ١٩٦٦ ، ل ٥٠ ـ ٥١ .

(١١٥) لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی تازەوە ، مۆسکۆ ١٩٦٧ . ( ئەم کتێبە کە ٢٣٢ لاپەڕەیە لـە ماوەی ٧٠ساڵ ( واتە ١٨٩٠ ـ ١٩٦٠ ) لە زیانی ئەدەبی کوردی دەدوێ ، نامەی دوکتۆرییەکەیەتی کە بە زمانی رووســی بلاوی‌کردۆتەوە ) .

(١١٦) دوانزە سوارەی مەریوان ، مۆسکۆ ١٩٦٩ . ( ئەم نامیلـکەیە ١٥ چیرۆکی کوردییە ، رێکخستن و ئامادەکردنی بۆ چاپ و نوسینی پێشەکی د. مارف خەزنەدار ، گۆڕینی بۆ رووسی لەگەڵ یانینا خەزنەدار ) .

زانستێکانی بەشی کوردی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی لێنینگراد نەکردووە .

## لە مۆسکۆ :

لە شاری مۆسکۆش بە تایبەتی ب. ف. میللیر و چ. خ. باکایێف و ن. ئا. خالفین و ئی. س. لازارێف ...... لە پێشخستنی کوردناسی سۆڤێتدا دەورێکی بالایان هەبووە .

پرۆفیسۆر ب. ف. میللیر کە زانایەکی گەورە و ناسراوە دەربارەی زمانە ئێرانێکان خاوەنی گەلێك نووسراوە . لەو کارانەیدا کە بەر لە ساڵانی ۳۰ نووسیویێتی دوور بووە لە تیۆرێکەی ن. یا. مارر ـ واتە لەوەی کە ن. یا. مارر ئەسڵی نەتەوە ئێرانێکانی بە یافیتی داناوە . بەڵام لە ساڵانی (۳۰) یەوە دەبێت بە پشتگیری تیۆری یافیتی کە ناویان لێ نابوو « لێکۆڵینەوەی نوێ دەربارەی زمان » ، وە بە هەموو توانایەوە هەوڵی دەدا ئەم تیۆرییە بەسەر زمانە ئێرانێکاندا بەگشتی و بەسەر زمانی کوردیدا بە تایبەتی بچەسپێنێ . ئەو لێکۆڵینەوانەی لەسەر بنچینەی تیۆرییەکەی ن. یا. مارر نووسیویێتی ئەمانەن : « ئامرازی کۆ (ئان) لە زمانە ئێرانێکاندا »[117] ،

(۱۱۷) بۆ بیرەوەری ئەکادیمی ن. یا. مارر ، ۱۹۳۸ ، ل ۱۹۰ ـ ۱۹۵ .

« کارەکانی زانایانی رووس لە بارەی زمانە ئێرانییەکانەوە »[118]، « هەندێ چەڵەمەی فۆنێتیکی زمانی کوردی »[119]، « زمانی کوردی »[120]... هتد.

ئەو تیۆرییەی ن. یا. مارر کە کورد بە یافیتی دادەنێ بۆ یەکەم جار لە لایەن ب. ف. میللیرەوە لە وتاری « زمانی کوردی »دا لایەنگیری کرا. لەم وتارەدا نووسیویەتی دەڵێ: « ئەو زمانناسانەی لە زمانە ئێرانییەکان و دیالێکتەکانیان دەکۆڵنەوە بە تەواوی گرنگی نادەن بەو پاشماوانەی کە ماون لەم زمانانەدا بەر لەوەی ببن بە ئێرانی... »[121] ... « خاسیەتی تێکەڵاوی زمانی کوردی لەگەڵ زمانە یافیتییەکاندا پتر لە فۆنێتیک و مەرفۆلۆژیادا دەردەکەوێ »[122].

سەبارەت بە پاشماوەی یافیتی لە زمانە ئێرانییەکاندا لە وتاری « ئامرازی کۆ ( ئان ) لە زمانە ئێرانییەکاندا » نووسیویەتی: « شکی

(١١٨) نامەی زانایانی زانکۆی مۆسکۆ، ژ ١٠٧، ب ٣، ١٩٤٦، ل ٧١ ـ ٨٥.

(١١٩) زمانە ئێرانییەکان، ب ٢، ١٩٥٠، ل ٦١ ـ ٧٧.

(١٢٠) ئینسکلوپیدیای ئەدەبی، ١٩٣١، ب ٥، ل ٧٥٣ ـ ٧٥٤؛ هەروەها ئینسکلوپیدیای گەورەی سۆڤیت، ١٩٣٧، ب ٣٥، ل ٥٣١ ـ ٥٣٢.

(١٢١) ئینسکلوپیدیای ئەدەبی، ١٩٣١، ب ٥، ل ٧٥٣.

(١٢٢) ئینسکلوپیدیای گەورەی سۆڤیت، ١٩٣٧، ب ٣٥، ل ٥٣٢.

تێدا نییە کە لە رێگای زمانە هیند و ئەوروپاییەکانەوە هیچ رۆنکردنەوەیەکمان دەست ناکەوێ »... « تەنها لە رێگای لێکۆڵینەوەی نوێ ( تیۆری یافیتی ـ ئەوژەحمان ) دەربارەی زمان دەتوانین بگەینە ئەنجام و خاوکردنەوەی گەلێك کاری ئاڵۆز »(١٢٣).

هەروەها لە وتاری « تێکەڵاوی زمانە ئێرانێکان »دا نوسیویێتی : « لە زمانە ئێرانێکاندا وە نەبێ کەم پاشماوەی یافیتی هەبێ کە دەگەڕێتەوە بۆ دەوری کۆنیان »(١٢٤).

لە وتاری « هەندێ چەڵەمەی فۆنێتیکی زمانی کوردی »دا دەیەوێ نیشانی بدا کە فۆنێتیکی زمانی کوردی وەك فۆنێتیکی زمانە یافیتێکانە . ئەو وا دەداتە قەڵەم کە هەندێ دەنك لە زۆردا ناقۆڵا بوون ، بەلاّم کە بە دەوری یافیتیدا تێپەڕین چاك و فراوان بوون . بەم بۆنەیەوە نوسیویێتی : « ئەگەر لە دەنگی ( ع ) و ( غ )ی عەرەبیدا لێك چوونێك لە نێوان زمانی کوردی و زمانە سامێکاندا هەبێت ، ئەوە پەیوەندییەکی پتر لە سێ دەنگی گرنگدا لە نێوان زمانی کوردی و زمانە یافیتێکاندا هەیە »(١٢٥).

مامۆستا قەناتی کوردۆ پەنجەی بۆ ئەوە راکێشاوە کە ب. ف.

---

(١٢٣) بۆ بیرەوەری ئەکادیمی ن. یا. مارر ، ١٩٣٨ ، ل ١٩٣ .

(١٢٤) ئەکادیمەی زانستی سۆڤێت بۆ ئەکادیمی ن. یا. مارر ، مۆسکۆ ـ لینینگراد ، ١٩٣٥ ، ل ٢٩٧ .

(١٢٥) زمانە ئێرانێکان ، ب ٢ ، ١٩٥٠ ، ل ٦٩ ـ ٧٠ .

میللیر نزیکەی لــە هەمو لێکۆڵینەوەکانیدا هەوڵی ئەوەی داوە کە نیشانی بدا لە زمانە ئێرانیێکاندا لە فۆنێتیك و مەرفۆڵۆژیادا پاشماوەی یافیتی هەیە و بە باوەڕی ئەو نەتەوە ئێرانیێـکانـ تێـکەڵاون و دروست بۆن لە یافیتی و ئێرانی ... بە گوێرەی باسەکانی ب.ف. میللیردا وا دەردەکەوێ کە زمانی کوردی زۆ یافیتی بووە و لە پاشا بووە بـــە یەکێك لە زمـانە ئێرانیێکان ، وە فۆنێتیکی هەندێ گۆڕرا[126]...

چەرکەزی بەکۆ ( باکاییێف ) کە کوردی سۆڤێتە لە ئامۆژگای زمانەوانی مۆسکۆ کار دەکات . ئەم زانایەش خاوەنی گەلێك وتار و نامیلکە و کتێبە . زوربەی نوسینەکانی سەبارەت بە بەشە دیالێـکتی کوردی ســـۆڤێتە . لە کارە زانستێـکانیدا ، بە تایبەتی فەرهەنگی « کوردی — رۆســی »[127] و کتێبی « زمـــانی کوردەکانی ئازربایجان »[128] دیارن .

شایانی باسە باکاییێف خاوەنی یەکەم فەرهەنگی کوردی ـ رۆسییە کە دوای شۆڕشی ئۆکتۆبەر چاپ کراوە . ئەم فەرهەنگە بریتییە لە ( ١٤ ) هەزار وشـەی کوردی و ٦١٨ لاپەڕە . لە پاشـــکۆی ئەم

(١٢٦) ق. کوردۆ ، رەخنە لە بیر و باوەڕی چەوت بەرامبەر بـــە زمانـی کوردی ، گۆڤاری « کورتەی دەنگوباسی ئامۆژگای رۆژهەڵاتناسی » ، مۆسکۆ ١٩٥٥ ، ب١٢ ، ل ١٥٧ .

(١٢٧) ج. خ. باکاییف ، فەرهەنگی کوردی ـ رۆسی ، مۆسکۆ ١٩٥٧ .

(١٢٨) ج خ. باکاییف ، زمانی کوردەکانی ئازربایجان ، مۆسکۆ ١٩٦٥ .

نوسراوەدا (ل ٥٠٩ ـ ٦١٨) کورتەیەکی ڕێزمانی کوردی داوە. هەر چەندە لەم کارەدا گەلێك ناتەواوی هەیە، وەك شێواندنی بەشە کوردییەکەی بە وشەی ڕوسی کە بە هیچ جۆرێك لە زمانی کوردیدا بەکار ناهێنرێن، یاخود کەم و کورتی لە شـەرح ولێکدانەوەی مانای هەندێ وشەدا، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێگەیەکی دیاری لە کوردناسی سۆڤێتدا هەیە.

کتێبی «زمانی کوردەکانی ئازربایجان» ەکەی بریتییە لـە ٢٨٤ لاپەڕە. بە شێوازێکی زانستی و فروان لە فۆنێتیك و مەرفۆلۆژیا و سینتکسیس کۆڵیوەتەوە. نوسەر لەم کتێبەدا سەرکەوتووە و هەندێ مەسەلەی زمانەوانی خاوکردۆتەوە و ئەنجامی بەکەڵکی داوە.

هەروەها چەند مانگێك لەمەوبەر باکایێف لە ژێر ناوی «زمانی کوردەکانی سۆڤێتدا» کتێبێکی بەنرخ و ڕازاوەی بڵاوکردەوە[١٢٩]. باکایێف لەم نوسراوەدا لە ئەنجامی بەراوردکردنی بەشە دیالێکتەکانی کـوردەکانی سۆڤێتدا گـەلێك شـتی نوێی لە ڕێزمانی کـوردیدا دۆزیوەتەوە.

ن. ئا. خاڵفین و م. س. لازارێیف کە دوو زانای بەناوبانگن و لە ئامۆژگای ڕۆژهەڵاتناسـی مۆسـکۆ کار دەکەن لە مەسەلەی نوسینی مێژوی کورددا خزمەتێکی باشی کورد و کوردناسییان کردوە.

ن. ئا. خاڵفین ساڵی ١٩٦٣ لە ژێر ناوی «بەربەرەکانی لەسـەر

(١٢٩) چ. خ. باکایێف، زمانی کوردەکانی سۆڤێت، مۆسکۆ ١٩٧٣.

کوردستان » کتێبێکی نایابی بڵاوکردەوە[130] ، کە بە شێوەیەکی زانستی لە بارەی بزوتنەوەی ئازادیی نەتەوایەتی میللەتی کورد و باری سیاسیی کوردستان و مەسەلەی کورد لە سەدەی نۆزدەدا دواوە ؛ باسی نیزاعی ئابووری و سیاسی ، جیاوازی و شەڕی نیوان ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ئێران لەسەر کوردستان کردوە ؛ هەروەها سەبارەت بە کۆششی ئنگلتەرە و روسیا و ئەمەریکا لە رێگای بڵاوکردنەوەی تاسیری سیاسی و ئابوریان لەم وڵاتەدا کۆڵیوەتەوە . ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە نوسەر لە نیشاندانی ئەم بارە سیاسیەی کوردستاندا بە شێوەیەکی راست و واقعی لە پێشکەوتن و رەوی بزوتنەوەی ئازادیی نەتەوایەتی گەلی کورد لە رێگای کوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆدا دواوە و هەروەها دژی ئەو بیر و را چەوت و هەڵە و نالەبارانەی کە کورد بە چەتە و رێگەگر دادەنێن راوەستاوە .

بۆ نوسینی ئەم کتێبە ن. ئا. خاڵفین سودێکی زۆری لە کەرەستەی ئارشیف وەرگرتووە ، بەمە و بە گرتنی رێگایەکی زانستی لە لێکۆڵینەوەکەیدا توانیوێتی کارێکی بە نرخ بهێنێتە بەرهەم . ئەم کتێبە نایابە د. ئەحمەد عوسمان وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و ساڵی ١٩٦٩ بڵاوی کردوتەوە[131] .

(١٣٠) ن. ئا. خاڵفین ، بەربەرەکانێ لە سەر کوردستان ، مۆسکۆ ١٩٦٣ .

(١٣١) الدکتور آ . خالفین ، الصراع علی کردستان ، مۆسکۆ ١٩٦٣ ، ترجمە الدکتور احمد عثمان ، بغداد ١٩٦٩ .

پاش تێپەڕبوونی سالێك بەسەر دەرچوونی ئەم کتێبەدا ، م. س. لازارێیف لە ژێر ناوی « کوردستان و مەسەلەی کورد »دا کتێبێکی بلاوکردەوە[١٣٢] . ئەم نووسراوە لە بارەی کوردستان و مەسەلەی کورد لە سالانی ١٨٩٠ ـ ١٩١٧ دەدوێ ـ واتە لەو ماوەیە کە پڕ لە رووداوی ناوخۆ و دەرەوەیە و کە چارەنووسی گەلی کوردی تێدا ساغ بووەوە . لەو ماوەیەدا بوو کە بزووتنەوەی تورکەکان دژی رژێمی عەبدولحەمید پەرەی سەند و هەروەها نیزاعی ولاتە ئیمپریالستەکان تیژ بوو بۆ دابەش کردنی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و ئێران ، کە ئەمەش پەیوەندییەکی توند و راستەوخۆی هەبوو لەگەل مەسەلەی کورددا بە گشتی .

نووسەر لەم کتێبەدا توانیویەتی گەلێك لەو شێواندن و وەرچەرخاندنەی لە نووسینی مێژووی کورددا کراوە راست بکاتەوە و بخاتە روو .... ماوەیەکە د. کاوس قەفتان خەریکی وەرگێرانی ئەم نووسراوەیە بۆ سەر زمانی کوردی و تا ئێستا چەند بەشێکی لە گۆڤاری « برایەتی » دا بلاوکردۆتەوە[١٣٣] .

(١٣٢) م. س. لازارێیف ، کوردستان و مەسەلەی کورد ، مۆسکۆ ١٩٦٤ .

(١٣٣) بڕوانە : گۆڤاری « برایەتی » ، ١٩٧٠ ، ژ ٣ ، فەسلی یەکەم ، ل ٢١ ـ ٢٣ ؛ ژ ٤ ، بەشی دووەم ، ل ٤١ ـ ٤٣ ؛ ژ ٥ ، بەشی سێیەم ، ل ١٢ ـ ١٤ ؛ ژ ٦ ، ل ٢٠ ـ ٢٢ ؛ ژ ٨ ، ل ٢٧ ـ ٢٩ ؛ ژ ٩ ، ل ١٤ ـ ١٦ .

جگە لە مامۆستایان : ب. ف. میللیر و چ. خ. باکاییێف و ن. ئا. خاڵفین و ئی. س. لازارییێف، هەروەها ئی. ئۆ. فاریزۆف و ر. ئا. تسابۆلۆف .... یش خاوەنی چەند بەرهەمێکن، بە تایبەتی ئی. ئۆ. فاریزۆف کە جگە لە لێکۆڵینەوەی مێژوی کورد بە گشتی، لە ساڵی ١٩٥٧دا فەرهەنگێکی روسی — کوردی بڵاوکردەوە[١٣٤] .

## لە باکۆ :

لە شاری باکۆ بە گەلێك کاری زانستی خزمەتی کوردناسی کراوە و ژمارەیەك نامەی دوکتۆری دەربارەی ئابوری و ئەدەب و زمان و مێژوی گەلی کورد نوسراون، وەك : « پەیوەندی کشتوکاڵ لە سەروی کوردستانی ئێران »[١٣٥] ، « پارتی دیموکراتی کوردستان »[١٣٦] ، « بزوتنەوەی ئازادی نەتەوایەتی لە کوردستانی عیراق ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ »[١٣٧] ، « بزوتنەوەی ئازادی نەتەوایەتی لە

(١٣٤) دەربارەی ئەم فەرهەنگە باسێکی تایبەتیان هەیە ، هیوادارم بەم زوانە بە چەند وتارێکی تایبەتی بیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەڕێز .

(١٣٥) عەلی گەلاوێژ ، باکۆ ١٩٥٤ ( نامەی دوکتۆری ) .

(١٣٦) رەحیمی قازی ، باکۆ ١٩٥٤ ( نامەی دوکتۆری ) .

(١٣٧) کەمال مەزهەر ، باکۆ ١٩٦٣ ( نامەی دوکتۆری ) .

کوردستانی عیراق ۱۹۱۸ ـ ۱۹۵۸ »[۱۳۸] ، « ریالیزم لە ئەدەبی کوردیدا »[۱۳۹] ، « کردار لە زمانی کوردیدا »[۱٤۰] « شیعری شاعری ئەم دەمەی کورد ـ عەبدوڵلا گۆران »[۱٤۱] ، « بەرهەمی جگەر خوێنی شاعیری ئەم دەمەی کورد »[۱٤۲] ، « شەرەفنامەی شەرەف خانی بتلیسی ، وەك سەرچاوە لە بارەی مێژوی گەلی کوردەوە »[۱٤۳] ....

بێگومان هەر یەك لەو نامانەی لە سەرەوە ناومان بردن بە گوێرەی پێویست خزمەتی خۆیان کردوە و دەوری خۆیان بینیوە . ئەوەی لە ناویاندا دیار بێ نامەی دوکتۆرییەکەی مامۆستا د. کەمال مەزهەرە ، کە بە شێوەی کتێب لە ساڵی ۱۹٦۷دا بڵاوکرایەوە[۱٤٤] .

نوسەر لەم کتێبەدا بە شێوازێکی زانستی لە هەموو ئەو روداو و هەڵسان و شۆڕشانەی کورد دواوە کە لەو ماوەیەدا بون . سەرکەوتنی گەورەی ئەم نوسراوە لەوەشدایە کە گەلێك سەرچاوەی

(۱۳۸) کەمال مەزهەر ، باکۆ ۱۹٦۹ ( نامەی دوکتۆرای علوم ) .

(۱۳۹) عیزەدین مستەفا ، باکۆ ۱۹٦۳ ( نامەی دوکتۆری ) .

(۱٤۰) نەسرین فەخری ، باکۆ ۱۹٦۵ ( نامەی دوکتۆری ) .

(۱٤۱) کورد ئۆگلی ، باکۆ ۱۹٦٦ ( نامەی دوکتۆری ) .

(۱٤۲) عەسکەر شامیل ، باکۆ ۱۹٦۹ ( نامەی دوکتۆری ) .

(۱٤۳) م. ئی. شەمسی ، باکۆ ۱۹٦۷ ( نامەی دوکتۆری ) .

(۱٤٤) د. کەمال مەزهەر ، بزوتنەوەی ئازادی نەتەوایەتی لە کوردستانی عیراق ( ۱۹۱۸ ـ ۱۹۳۲ ) ، باکۆ ۱۹٦۷ .

وەها بەکار هێنراوە کە تا نووسینی ئەم کتێبە ناویان نەهێنراوە ....
هەروەها بە شێوازێك کە لەگەڵ واقع و ڕاستیدا بگونجێ ڕەخنەی
لە هەمق ئەو بیر و ڕا چەوت و هەڵانە گرتووە کە مێژووی
بزووتنەوەکانی گەلی کوردیان شێواندووە .

ئەوەی شایانی باسە ئەوەتەکە ساڵی ۱۹۶۹ نووسەری ئەم کتێبە
لە نووسینی ئەو کارە نوێیەی بووە کە هەر لە بارەی بزووتنەوەی
ئازادیی گەلی کوردەوەیە و دوکتۆرای علومی پێ وەرگرت(۱٤٥) .
ئەم نووسراوە بریتییە لە سێ بەش و دە فەسڵ ... بە دوور و درێژی
لە باری سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی کوردستانی عێراق و
خەبات دژی ئیمپریالست و داگیرکەران و پەرەسەندنی بزووتنەوەی
ئازادیی نەتەوایەتیی ... دواوە و کۆڵیوەتەوە .

هەروەها پێویستە ئەوەش لە بیر نەکەین کە د. کەمال
مەزهەر لەو ماوەیەی لە باکۆ بوو ، جگە لەو کارە زانستییانەی
لە سەرەوە ناومان بردن ژمارەیەك وتاری نایابی بە زمانی ڕووسی
بڵاوکردۆتەوە ، وەك : « مانگرتنی کرێکارانی نەوتی کەرکوك لە
ساڵی ۱۹٤٦ دا »(۱٤٦) ، « تیشکی ئۆکتۆبەر لە سەر ڕۆژهەڵاتی

(۱٤٥) ساڵی ۱۹۶۹ لە مۆسکۆ کورتەی ئەم نامەیەی بڵاوکراوەتەوە ، هەروەها بەشی دووەمی ئەم نامەیە بە ناوی « مەسەلەی کورد لە عیراق لەساڵانی ۱۹۳۲ ـ ۱۹٤٥ » وەیە وا لە ژێر چاپدا .

(۱٤٦) بڕوانە : گۆڤاری « میللەتانی ئاسیا و ئەفەریقا » ، مۆسکۆ ۱۹٦۸ ، ژ ٦ ، ل ٥٥ ـ ٦۲ .

عەرەبی »[١٤٧] ، « چاپەمەنیە کوردییە پێشکەوتووەکان سەبارەت بە شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالستی مەزن »[١٤٨] ... گەلێکی تر .

د. عیزەدین مستەفا رەسوڵ ئەو نامەی دوکتۆرییەی کە بەرهەمی سالانی خوێندنی بوو لە باکۆ ، وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و سالی ١٩٦٦ لە بێروت بلاوی کردەوە[١٤٩] . کورد ئوگلیش لە سالی ١٩٦٩دا نامەی دوکتۆرییەکەی وەك کتێبێك بە زمانی ئازربایجانی لە چاپ‌دا[١٥٠] . ئەوەی شایانی باسە ئەوەتە کە مامۆستا شوکور مستەفا ئەم نوسراوە بەنرخە نایابەی بە زمانێکی پاراو و رەوان وەرگێڕاوەتە سەر عەرەبی و بە چەند زنجیرەیەك لە رۆژنامەی « التآخی » دا بلاوی کردۆتەوە و ئێستاش ئامادەی کردووە کە بە کتێبێکی تایبەتی لە چاپی بدات .

* * * * * *

لەبەر رۆشنایی ئەم باسەدا دەردەکەوێت کە لەبەر چەند

---

(١٤٧) بڕوانە : گۆڤاری « دەنگوباسی ئەکادیمیەی زانستی ئازربایجانی سۆڤێتی » ، باکۆ ١٩٦٧ ، ژ ٣ ـ ٤ ، ل١٦١ ـ ١٦٧ .

(١٤٨) بڕوانە : کتێبی « ئۆکتۆبەری مەزن و خەباتی ئازادی گەلانی رۆژهەلاتی نزیك و ناوەڕاست » ، باکۆ ١٩٦٧ ، ل ١٤٨ ـ ١٦٠ .

(١٤٩) د. عزالدين مصطفى رسول ، الواقعية في الادب الكردي ، بيروت ١٩٦٦ .

(١٥٠) د. کورد ئوگلی ، شیعری شاعیری ئەم دەمەی کورد ـ عەبدوللا گۆران ، باکۆ ١٩٦٩ .

هۆیەکی ئاشکرا پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە مەسەلەی کوردناسیی گرنگیی دراوە ، وە کوردناسیی رۆسیای قەیسەریی ناوبانگی دەرکردووە . بەلام سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە شێوەیەکی عادیلانە و بە مەبەستێکی پیرۆز کارێکی ئێجگار گەورەی هەبوو لە پێشکەوتن و پەرەسەندن و گەشەکردن و سەرکەوتنی کوردناسیدا و توانی بیگەیەنێتە ئەو رادەیەی ئەمڕۆی کە لە بارەی زمان و ئەدەب و مێژوو و ئەتنۆگرافیا ... ی کوردەوە ژمارەیەکی بێشومار و جوان و پوخت و نایاب کاری زانستیی بنوسرێ ، بە رادەیەك کە سەرنجی کوردناسانی جیهان رابکێشێ ، وە بە جۆرێك کە لە زوربەی کاری زانستیدا پەنجەیان بۆ رابکێشن و بکرێن بە سەرچاوە .

* * * * * *

# حول
# الدراسات الكردية في روسيا والاتحاد السوفيتي

د. عبد الرحمن معروف

## الدراسات الكردية في روسيا

كان الاكراد وغيرهم من الشعوب الناطقة في منطقة ماوراء القفقاس الواقعة ضمن الحدود السياسية والاقتصادية للامبراطورية الروسية ، محور اهتمام العديد من الرحالة وعلماء الاثنوغرافيا . كما ان عددا من الدول الكبيرة اهتمت بالحياة الاجتماعية والسياسية للأكراد بسبب كثرتهم العددية في الدولة العثمانية وايران .

تعود المعرفة بالاكراد وبلغتهم في روسيا الى النصف الثاني للقرن الثامن عشر ، اي في تلك الفترة التى طبعت فيها اكاديمية العلوم الروسية « القاموس المقارن لجميع اللغات واللهجات » الذي صدر في بطرسبورغ عام ١٧٨٧ وكان يضم ٢٧٣ كلمة بـ ٢٠٠ لغة ، بما فيها اللغة الكردية .

وفي نهاية النصف الاول من القرن التاسع عشر ، نشرت بعض الكراريس عن اصل ونفوس وتقاليد الاكراد. ونشرت ايضا بعض المعلومات عن العشائر الكردية الرحالة في منطقة ماوراء القفقاس ضمن عدد من الاحصائيات والمطبوعات الرسمية . ولاشك ان تلك المقالات والكراريس كانت تتميز بالسطحية والاختصار والنقصان. وهكذا نرى انه حتى نهاية النصف الاول من القرن التاسع عشر لم تظهر في روسيا القيصرية ابحاث علمية بارزة عن لغة وتاريخ واثنوغرافيا الاكراد .

أما الاهتمام العلمي بالاكراد في روسيا القيصرية ، فقد بدأ في نهاية النصف الاول وبداية النصف الثاني من القرن التاسع عشر . وبالرغم من أن بعض كتابات تلك الفترة كان لها علاقه بالحرب الروسية ـ التركية ـ والروسية ـ الفارسية ، الا انه نشرت بعض الابحاث العلمية من قبل علماء الروس والحكومة القيصرية نفسها ، وعلى سبيل المثال اعمال ف. ديتيل و خ. ابوڤيان و اى. بيريزين و پ. ليرخ ... الخ .

تجول ف. ديتيل قرابة ثلاث سنوات في كردستان وجمع ، خلال ذلك ، مادة فولكلورية واثنوغرافية واسعة . وقد تحدث العالم المذكور عن هذه المادة ، مبديا فيها بعض الاراء الصحيحة ، وذلك في دراسته الموسومة « ثلاثة اعوام في ارجاء الشرق » التي نشرت في الجزء الرابع من مجلة وزارة المعارف الشعبية الصادرة في بطرسبورغ عام ١٨٤٧ .

واعتباراً من عام ١٨٤٧ قام خ. آبوڤيان بنشر سلسلة من المقالات تحت عنوان « الاكراد » ، في مجلة « القفقاس » التي

كانت تصدر في (تبليس) . ونلاحظ في تلك المقالات انها استندت على مادة واسعه ومفيدة تتعلق باثنوغرافيا وتاريخ وحياة وعادات وتقاليد وفولكلور ولغه الشعب الكردي.

أما عالم الايرانيات الروسي المعروف ي. بيويزين ، الذي كان بروفيسورا في جامعة قازان ، فقد تعلم اثناء رحلته الى الشرق الاوسط لهجتي «خوراسان والموصل» الكرديتين . وقد تحدث عن اللهجتين المذكورتين في كتابه « دراسة في لهجات فارس » الصادر عام ١٨٥٣.

ويحتل المستشرق المعروف بيوتر ليرخ مكانة خاصة وبارزة بين العلماء الروس الذين اهتموا بالدراسات الكردية . استطاع پ. ليرخ ان يبحث ، بشكل علمي وصحيح ، في قضايا الاكراد ولغتهم وأثنوغرافيتهم وفولكلورهم ، وذلك على اساس نقد الاعمال السابقة المتعلقة بالاكراد ولغتهم . وقد نشر في اعوام ١٨٥٦ و ١٨٥٧ و ١٨٥٨ ثلاثة كتب قيمة تعتبر حتى يومنا هذا من المصادر الأصيلة والنادرة في مكتبة الدراسات الكردية .

وبين اعوام ١٨٣٦ ـ ١٨٦٩ بدأ آ. ژابا الذي كان قنصلا روسيا في أرضروم ( تركيا ) خلال الفترة المذكورة ، بدأ بتعلم ودراسة اللغة الكردية وجمع المواد المتعلقة بادب وفولكلور واثنوغرافيا الشعب الكردي بشكل عام ، بينما اهتم بشكل خاص بالمخطوطات الكردية .

وقد استطاع فعلاً جمع عدد كبير من المخطوطات القيمة والهامة ، وهي محفوظة في الوقت الحاضر في المكتبة العامة بلينينغراد ومكتبة معهد الاستشراق التابع لاكاديمية العلوم السوفيتية . وفي عام ١٨٦٠ قام هذا

العالم بطبع مجموعة من الحكايات الكردية باللغتين الكردية والفرنسية ، كما انه ساهم مساهمة كبيرة في تأليف قاموس كردي . وهو صاحب اول قاموس كردي - فرنسي طبعه بعد وفاته فردیناند یوستي بقرار من الاكاديمية الروسية ، وذلك في عام ١٨٧٩ . ويتألف ذلك القاموس من ٤٦٣ صفحة ويضم حوالي ١٥ ألف كلمة .

وفي عام ١٨٨٠ نشر عالم الايرانيات المعروف فردیناند یوستي كتابا عن القواعد الكردية يتناول علم الاصوات و سبك الكلمات و الصرف وبناء الجملة في اللغة الكردية ، كما قام بمحاولة لمقارنتها مع اللغات الايرانية الاخرى .

وفي نهاية القرن التاسع عشر نشر المستشرق آ. سوتسين كتابا عن القواعد الكردية والمستشرق س. آ. يگيزاروف كتابا عن اثنوغرافيا الشعب الكردي .

يعتبر مقال ن. يا. مار « مرة اخرى حول كلمة ( چلبي ) » من اشهر الدراسات التي وضعها هذا الكاتب . وبالرغم من انه ذكر بعض النماذج الجيدة عن دور الكرد في تأريخ ثقافات شعوب الشرق الاوسط ... الا ان ما يثير الدهشة ويدعو للانتقاد هو ان ن. يا. مار اعتبر أصل الاكراد من اليافيتي . وينبغي لنا الاشارة الى ان علماء الدراسات الكردية السوفيت قد اصلحوا خطأ مار هذا منذ زمن بعيد .

## الدراسات الكردية في الاتحاد السوفيتي

نالت الدراسات الكردية مزيداً من الاهتمام والانتشار بعد ثورة اكتوبر . وقد كان وجود اقلية كردية في هذه البلاد وتعرض

حياتها لتغييرات جديدة .. كان ذلك عاملا كبيراً في إزدهار وتقدم علم الدراسات الكردية في الاتحاد السوفيتي . وقد كان من ابرز نتائج ذلك ان ابناء هذه الاقلية انفسهم اخذوا الأمر على عاتقهم ودخلوا الميدان بجرأة . وفي الوقت الحاضر هناك اربعة مراكز للدراسات الكردية في الاتحاد السوفيتي : يريڤان ولينينغراد وموسكو وباكو .

## في يريفان :

يستطيع المرء ان يلمس تقدم الدراسات الكردية في ارمينيا السوفيتية بشكل خاص ، وذلك منذ ان وضعت الابجدية الكردية في عام ١٩٢١ ، وافتتحت مدرسة كردية . وفي عام ١٩٣٠ تأسست عدة لجان ارسل اعضاؤها الى القرى الكردية لجمع مواد تتعلق باللغة والاثنوغرافيا والفولكلور . وقد اشترك عالمان كرديان في اعمال تلك اللجنة وهما : أمين عودال وحاجى جندى . كما ان مؤتمر الدراسات الكردية الذي انعقد في عام ١٩٣٤ في يريڤان كان له اكبر وابرز الاثر بالنسبة لتقدم علم الدراسات الكردية في الاتحاد السوفيتي .

في عام ١٩٣٣ صدر قاموس ارمني - كردي ، وفي عام ١٩٢٥ صدر قاموس آخر أرمني - كردي ايضاً للمصطلحات العلمية . وفي عام ١٩٣٢ قام آ. خاجاتوريان بطبع كتاب عن القواعد الكردية باللغتين الارمنية والكردية ، بينما اشترك مع حاجي جندي في عام ١٩٣٥ في وضع كتاب للقواعد الكردية للمدارس المتوسطة . وفي عام ١٩٣٦ نشر امين عودال وحاجي جندي كتاباً كبيراً عن الفولكلور الكردي احتوى على عدد كبير من الاغاني والملاحم والاساطير .

وقام امين عودال ايضاً بنشر كتاب اثنوغرافي في عام ١٩٤٨ عن حيــاة المرأة الـكردية ، ثم كتــاب آخر في عام ١٩٥٢ بعنوان « اثنوغرافيـا وفولـكلور الاكراد ودراستها » . كما انه نشـر مؤلفاً آخر في عام ١٩٥٧ عنوانه « تقاليد أكراد ماوراء القفقاس » .

نشر حاجي جندي سلسلة من الـكتب الجديدة عن الفولـكلور الـكردي ، منها ، على سبيل المثال : « الفولـكلور الـكردي » ( يريڤان ، ١٩٥٧ ) ، « الحـكايات الـكردية » ( يريڤان ، مجلد ١ ، ١٩٦١ ؛ مجلد ٢ ، ١٩٦٢ ؛ مجلد ٣ ، ١٩٦٩ ) . ومما تجدر الاشارة اليه هو ان امين عودال وحاجي جندي قاما بدور كبير في جمع وتسجيل مواد عن اثنوغرافيا وفولـكلور الاكراد . وقـد انقذا ، بفضل هذا العمل ، ثروة قومية من الضياع والتلف ، وأمكن بهـذا الجهد جمع مواد ومصادر واسعة للقيام بدراســات علمية وصحيحة في اللغة والتاريخ والاثنوغرافيا المتعلقة بالاكراد .

ويعنى الاخوان الشابان اوردوخان جليل وجليلي جليل ، اولهما بجمع ودراسـة الفولـكلور ، وثانيهما بكتابة التاريخ . وقد انجزا في هذين المجالين عدداً من المقالات والـكتب القيمة .

أما خالد چتـو الذي يشغل حالياً منصب رئيس القسم الـكردي في معهد الاستشراق التابع لاكاديمية العلوم في ارمينيا ، فقــد نشر بضعة اعمال عن تاريخ الاكراد ، نخص منها بالذكر « اكراد ارمينيـا السوڤيتية » ( يريڤان ١٩٦٥ ) و « الاكراد خلال الحرب العالمية الثانية » ( يريڤان ١٩٦٩ ) ، وهما كتابان مشهوران وجديران بالاهتمام .

هـذا ويبذل المؤرخان شكرو خدو وك. ب. آكوبوف، وكذلك اللغوي مكسيم خامو، وجميعهم باحثون في القسم الكردي في يريڤان، جهودهم من اجل نشر الدراسات الكردية، كل حسب امكاناته.

## في لينينغراد:

في عام ١٩٢٨ أرسلت اللجنة المركزية للحزب الشيوعي الارميني عدداً من الطلبة الاكراد الى «المعهد العمالي» في لينينغراد. وبعد تخرجهم، تم قبول بعضهم في معهد اللغات، حيث قام البروفسور أ. أ. فريمن رئيس القسم الايراني بفتح قسم للغة الكردية بهذه المناسبة. وفي شهر شباط عام ١٩٥٩ تم تأسيس «القسم الكردي» بأمر من الاكاديمي أوربيللي مدير معهد الاستشراق في لينينغراد وتحت اشرافه مباشرة. وقد لعب أ. أ. فريمن و أي. أ. أوربيللي دوراً كبيراً في تهيأة الكادر الضروري للدراسات الكردية، وفي تطوير هذا العلم.

وبعد أوربيللي ترأس القسم، وما زال، الاستاذ قناة كوردوييف، فقدم خدمات جليلة لعلم الدراسات الكردية، وانجز عددا كبيراً من الاعمال كرس معظمها لدراسة اللغة الكردية. ونذكر منها، على سبيل المثال: «القاموس الكردي (اللهجة الكرمانجية) ـ الروسي» (موسكو ١٩٦٠)، «القاموس الكردي (اللهجة السورانية) ـ الروسي» (تحت الطبع)، «قواعد اللغة الكردية» (باللغة الكردية، يريڤان ١٩٤٩، واعيد طبعه في اعوام ١٩٥٦ و ١٩٦٠ و ١٩٧٠)،

« قواعـد اللغة الـكردية » ( باللغة الروسـية ، موسكو ١٩٦٢ ) ، « القواعـد المقارنة للغة الـكردية » ( اطروحته التي نال عليهـا درجة دكتوراه علوم ، وهي حاليـاً تحت الطبع ) .. هذا اضافة الى العديد من الدراسات في مسائل الادب والفولـكلور والتاريخ والاثنوغرافيا .

ومن العلماء الآخرين الذين خدموا اللغة الـكردية لابد ان نذكر أي . أي . تسوكرمان الذي نشر عددا من المقالات والدراسات والـكتب في اللغـة ، ابرزها كتاب « قواعد اللغة الـكردية » الصـادر في عام ١٩٦٢ .

ونشرت م . ب . رودنـكو كتبا قيمة في الفولـكلور والادب والاثنوغرافيا ، منها « مم وزين » لاحمدي خاني ( موسكو ١٩٦٣ ) ، كما ان زاري يوسوبوفا كتبت بضعة مقالات مكرسـة للغة الـكردية . وفي عام ١٩٦٧ صدرت شرفنامة شرف خان البتليسي التي قامت بترجمتهـا ي . أ . فاسيليفا . ومن ضمن اعمال ژ . س . موسيليان نشير ، بشكل خاص ، الى كتابها « بيبليوغرافيا الدراسات الـكردية » .

ألـف أو . ل . فيلچيڤسكي ابحاثا عديدة في تاريخ واثنوغرافيا وادب ولغة الاكراد ، من بينها كتاب « الاكراد . مقدمة في تاريخ واثنوغرافيا الشعب الـكردي » ( موسكو ١٩٦١ ) .

أما كريم أيوبي و أي . آ . سميرنوڤا ، فقد صـدر لهما كـتاب بعنوان « اللهجة الـكردية الموكريانية » ( لينغراد ١٩٦٨ ) ، وذلـك عدا عن ابحاثهما ودراساتهما الاخرى .

وينبغي علينا ان لاننسى أن عددا كبيرا من الأكراد السوڤييت وغير السوڤييت درسوا في مدينة لينينغراد وكتبوا اطروحاتهم ونشروا مؤلفاتهم العلمية فيها . فلقد عمل الدكتور معروف خزندار ، وهـو من الاكراد العراقيين ، بنشاط ، واستطاع خلال الفترة القصيرة التي بقى هناك ان ينشر بعض الاعمال ، وخصوصاً كتابه الذي يبحث فيه عن تاريخ الادب الكردي والذي صدر في لينينغراد في عام ١٩٦٧ باللغة الروسية .

في موسكو :

لاشك ان ب. ف. مـيللر و چ. خ. باكاييف و ن. أ. خالفين وأي. س. لازارييف قد لعبوا دوراكبيرا في تطوير الدراسات الكردية في موسكو .

كتب البروفسور ب. ف. ميللر عـــددا كبيرا من الاعمال في الدراسات الكردية بشكل عام ، وفي اللغة بشـكل خاص : « علامـة الجمع (ئان) في اللغات الايرانية » ، و « بعض مشاكل علم الاصوات في اللغة الكردية » ... الخ .

ويعمل چركس بهكو (باكاييف) ، وهو كردي سوڤيتي ، حاليا في معهد اللغات بموسكو . وقد نشر هذا العالم عددا من الاعمال القيمة ، تبحث اغلبيتها في اللهجات الفرعية للاكراد السوڤييت . ويمكن ان نشير الى بعض اعماله المعروفة وهي : « القاموس الكردي ـ الروسي » (موسكو ١٩٥٧) وكتاب « لغة اكراد اذربايجان » (موسكو ١٩٦٥) وكتاب « لغة الاكراد السوڤيت » الذي صدر قبل بضعة شهور .

واصدر ن. أ. خالفين في عام ١٩٦٣ كتابه الرائع « الصراع على كردستان » الذي تناول فيه بشكل علمي موضوع الحركة الوطنية ـ التحررية للشعب الكردي ، وكذلك الوضع السياسي في كردستان والمسألة الكردية في القرن التاسع عشر .

وبعد مرور عام واحد على صدور ذلك الكتاب ، صدر كتاب م. س. لازاريف بعنوان « كردستان والمسألة الكردية » ، وهو يبحث في موضوع كردستان والمسألة الكردية خلال اعوام ١٨٩٠ ـ ١٩١٧ ، أي في فترة مليئة بالاحداث الكبرى الداخلية والخارجية التي كانت مصيرية بالنسبة للشعب الكردي .

ومن المؤلفين الآخرين نذكر ان اي. او. فاريزوف و ر. آ. تسوبولوف وضعا بعض الدراسات الهامة ، وخصوصاً القاموس الروسي ـ الكردي الذي اصدره فاريزوف فى عام ١٩٥٧ .

## في باكو :

قدمت مدينة باكو خدمات كبيرة لعلم الدراسات الكردية . وقد دافع في معاهدها عدد من الباحثين عن اطروحاتهم العلمية ، ومنها : « العلاقات الزراعية فى شمال كردستان ايران » ( على گەلاويژ ١٩٥٤ ) ، « الحزب الديمقراطي الكردستاني » ( رحيم قاضي ١٩٥٤ ) ، « الحركة التحررية الوطنية في كردستان العراق ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ » ( كمال مظهر ١٩٦٣ ) ، « الحركة التحررية الوطنية فى كردستان العراق » ( كمال مظهر ١٩٦٩ ـ اطروحة دكتوراه العلوم ) ولقد دافع عنها في معهد

الاستشراق بموسكو ، « الواقعيـــة في الادب الكردي » ( عزالدين مصطفى رسول ١٩٦٣ ) ، « الفعل في اللغـــة الكردية » ( نسرين فخري ١٩٦٥ ) ، « النتاج الشـعري للشاعر الكردي المعاصر عبدالله گوران » ( كورد اوغلي ١٩٦٦ ) ، « شرفنامه شـــرف خان البتليسي كمصدر لتاريخ الشعب الكردي » ( م. أي شمسي ١٩٦٧ ).

ولا شـك ان كل واحدة من الاطروحات المذكورة لها أهميتها الخاصة واسهمت في خدمة الدراسات الكردية . هذا وقد قام الدكتور عزالدين مصطفى رسول بترجمة اطروحته الى اللغة العربية وصدرت في كتاب في بيروت عام ١٩٦٦ . كما انـــ كورد أوغلي طبع اطروحته ايضا وصدرت في كتاب باللغة الاذربايجانية في ١٩٦٩ .

على ضوء ما كتبنا ، يظهر لنا ان الدراسات الكردية كانت محور اهتمام كبير في روسيا قبل ثورة اكتوبر لاعتبارات واسباب معروفة . غير ان انتصار ثورة اكتوبر اعطى زخماً نوعياً وكميـــاً لحركة تطور وتقدم الدراسات الكردية ، التي وصلت الى ما هى عليه الانـــ ، بحيث استطاعت اثارة اهتمام العـــالم كله ، واصبحت قدوة يشار اليها بالبنان .

* * *

# هەندێك
# لەو زاراوانەی واتایەك زیاتر ئەبەخشن

ئەندامی یاریدەر : جەمال بابان

پێشەکی : هەرچەندە زمانی کوردی زمانێکی دەوڵەمەند و فراوانە ، لەگەڵ ئەوەشـدا هەندێك ناوی لە دوو شت یاخود زیاتر ناوە ، کە لە یەکەوە دوورن یا لە بنچینەدا یەکن و نزیکن بەڵام بەرە بەرە هەر ناوە لەوی تر جیا بۆتەوە و دوورکەوتۆتەوە . ئەمەش گەلێك هۆی هەیە ، وەك :

١— هۆی مێژوویی : بنچینـەی زاراو یا وشـەکان لە رەگەزدا یەك بوون بەڵام بە تێپـەڕبوونی کات و رۆژگار لە یەك دوور کەوتونەتەوە .

٢— رێکەوت : ناو هەیە بە رێـکەوت بەسەر دوو شتدا سەپاوە و هـەر یەکە شوێنی خۆی چەسپاندوە وەك : کەو ( باڵندە ) و کەو کە لە بابەتی بێژنگە و دەغڵی پێ پاك ئەکرێتەوە .

٣- لە زمانێکی ترەوە[١] : وشـــە هەیە لە زمانی بێـــگانەوە کەوتۆتە ناو زمانەکەمانەوە ، دە هـــەر ئەو وشەیە بە کوردی هەیە و مانایەکی جیـاوازی هەیە ، وەك « آذار » کە مانـگی مارتی عەرەبییـــەو لە کوردیدا بووە بە ( ازار ، ئازار ... ) . ئازاری کوردیش هەیە کە ئێشە .

٤- زۆری شێوە ( تعدد اللهجات ) وەك ( شواشێنك ) کە درەختێکی بەهاری هەمیشە سەوزە گەڵای وەك مۆرد وایە ، بەرێك ئەگرێ وەك چوالە تاڵە . هەر ئەم وشـەیە لە بادینانەدا ناوە بۆ جۆرە ترێیەك وە بۆ جۆرە هەنجیرێـکیش[٢] . هەروەها ( چـای )

(١) دوکتۆر عەبدولڕەحمان مەعروف لە باسـەکەیدا کە لە یەکەم کۆڕی لێکۆڵینەوەی کتێبی قوتابخانە بە زمانی کوردی لە شـەقڵاوە ( ٢٥ - ٢٧ / ٧ / ١٩٧٣ ) پێشکەشی کرد ، بەمەیان ئەڵێت وشەی هاوکۆ ( مشـترك لفظی Homonym ) ، وە ئەڵێت ئەوە لەو وشانە نین کە مانایان زۆرە بەڵـکو ئەو وشانەن کە تەنها لە خوێندنەوە و نوسیندا وەك یەکن ئەگینا لە واتا و پەیدابوندا جیـاوازن . ئنجا ئەڵێت : « وشەی ( باو ) دەبینین سێ وشەن کە مانایان جیاوازە و لە یەك دوورن هەرچەندە هەرسێـکیان لە نەژادا کوردین ، بەڵام پەیدابوون و دروست بوونیـان لە رێـگای جیاوازەوە هاتووە . ( باو ) دەستوور : فیسار شت بووە بە باو . ( باو ) باوك . ( باو ) زیادەی شتێك بەسەر شتێـکی تردا .. هتد » ( بڕوانە لاپەڕە ١٢ ی وتاری ناوبراو ) .

(٢) بڕوانە : شیخ محمـــدی خاڵ ، فەرهـەنـگی خاڵ ، جزمی دووەم ، سلێمانی ١٩٦٤ ، ل ٣٢٨ .

لەناو لوڕەکاندا بە (سارد) ئەڵێن . لە هەندێك شوێنی تر چاییە کە ئەخورێتەوە[٣] . ئنجا (ساو) کە بە هەتاو ئەڵێن و لە هەوراماندا بە (سێو)[٤] ... هتد .

جگە لەوانە چەند هۆیەکی تریش هەن . سەیر ئەکەیت هەندێك وشە هەن لە رێگای کورت کردنەوە و سووانەوە لەگەڵ وشەیەکی تردا یەك ئەگرنەوە . وەك (بەخش) بووە بە (بەش) بە مانای (پشك ، حصة) وە هەر (بەش) لەو شێوەیەدا بە واتای (کراوە ، منفرج) دێت وەك بڵێیت (زاری بەش بووەوە) یاخود (دەمەبەشکەی پێوە نوسا) .

هەروەها جاری وا هەیە لە رێی لکاندنی ئامرازەوە بە وشە ، دوو وشەی لە یەك دوور یەك (شکل) وەردەگرن وەك (باران ـ بارانە) کە ناوی گۆرانیەکە و (بار ـ بارانە) کە باجی بار ئەگەیەنێت . لێرەدا بۆمان دەرئەکەوێت کە وشەی (باران) ئامرازی (ە) ی پێوە لکاو کردی بە ناوی گۆرانی ، کەچی وشەی (بار) ئامرازی (انە) ی پێوە لکا و واتاکەی کرد بە باج ....

لە کاتێکدا کە خۆم گەلێك وشەی لەم بابەتەم کۆکردبووەوە ، لە لایەکی تریشەوە لە تەواوکردن و راستکردنەوە و راڤەکردندا سوودێکی هێجگار زۆرم لە فەرهەنگی شێخی بەڕێز مامۆستای

---

(٣) هەمان سەرچاوە ، ل ١٥ .

(٤) هەمان سەرچاوە ، ل ٢٥١ .

خاڵ وەرگرتووە ، هەروەها سـوودم لە فەرهەنـگی کشت و کاڵی مامۆستا شێخ مارفی قەرەداغی و فەرهەنگی مامۆستا تۆفیق وەهبی بەگ و ئەدموندس و فەرهەنـگی مەردۆخ و رابـەر و گەلێك فەرهەنـگی تر وەرگرتوە .

بێ گومان ئەمە فەرهەنـگ نییە کە پێشکەشم کردووە ، هەرچەندە بە ناچاری واتای هەندێك وشەم لێك داوەتەوە ، ئەوانی تر نزیکترین هاوتا یاخود پەنـدی پێشینان یا وتەی فۆلکلۆریم لەگەڵـدا هێناوەتەوە بۆ ئەوەی زۆر خۆیان و واتاکەیان دەرکەون . لە دواییدا پەیوەندی بەینی وشەکان و جیاوازیانم بە ( را ) ی خۆم لێکداوەتەوە ، رەنـگ هەیە راسـت بم ، رەنگیش هەیە بە هەڵەدا چووبم یا بە لای کەمەوە کەموکورییـەك لە لێـکدانەوەکەمدا هەبێت . ئەوە داوا لە خوێندەوارانی بەڕێز ئەکەم بۆم راستکەنەوە و بۆم تەواوکەن .

| زاراو | واتاکانی | پەیوەندی یا جیاوازییان (بە رای من) |
| --- | --- | --- |
| ئاتەشی | تووڕە و کەللەڕەق ؛ گوڵێـکی سـووری بێ بۆن ؛ گەرمی و هێزی جنسی . | بنچینەکەی گەرمی و سورییە وەك ئاگر . |
| ئار | ئاگر ( ئاتەر ـ لە ئاوێستادا ) ؛ ئارد ( زازا ) ؛ هێز و توانا . | گۆزانی شێوە |

| وشە | مانا | تێبینی |
|---|---|---|
| ئارەق | ئـاوی لەش ؛ خواردنەوە ـ مشروب . | لە زمانی بێگانەوە . |
| ئاری | خۆڵەمێش (لە ئار ـ ئاگرەوە) ؛ رەگەزی ئـاری کە کوردیش ئەگرێتەوە و لە بنچینەدا (ئاریان)ە . | ئاریەکەی بێگانەیە تێکەڵاو بە کوردی بووە . |
| ئازار | مانگی مارت ـ بە عەرەبی (اذار) ؛ ئێش . | مانگەکە عەرەبییە تێکەڵاو بە کوردی بووە . |
| ئاژاڵ | مەڕومالات ؛ سەوزەگیا و لەوەڕ . | |
| ئاش | شوێنی پاکردن و هاڕینی دانەوێڵە ؛ چێشت . | ئاشی چێشتەکە بێگانەیە . |
| ئاڤی | کشتوکاڵی ئاوی (زازا) ؛ شەونم ؛ زەمینی بەراو . | بنچینەکەی تەڕی و ئاوە . |
| ئاگرە | شەرا و گڕە ؛ نەخۆشـی کشتوکاڵ ؛ برینی دەموچاوی منداڵ . | بنچینەکەیان سووری و گەرمییە . |
| ئـاڵ | رەنگی سووری کاڵ ؛ نەخۆشیەکە تووشـی زەیستان ئەبێ (هاڵ) سوور هەڵئەگەڕێ . | لە ئاڵیبا یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| ئـالاّ | بەیداخ (دوَر نییـــە لە ئاڵەوە بێت)؛ قەڵەمی نوسیَن . | رەنـگ یاخود دارەكە یەكیان ئەخات . |
| ئاڵۆز | مرۆ و وڵاخی توڕە ؛ رۆژی سارد و توش . | ئاسـایـی نەبوَن یەكیان ئەخات . |
| ئانیشكە | لوَلە و گوَنجـی كەوانە دار ؛ داریَـكی دوَ پەلە لە ئامرازی ئاش . | شكاندنەوەكە یەكیان ئەخات . |
| ئـاوا | ئاوەدان كردنەوە بە تایبەتی دێهات وەك : ئەحمەد ئـاوا ، عەلیاوا ( ئاڵیاوە ) ؛ رۆژئاوا ؛ ئاوا ، ئاوەها : (هكذا) . | |
| ئاوگرتن | توَرە ئاو ؛ گەیشتن و خۆشبوَنی میوە . | دار و درەختیش كە كەوتنە بەردان ئەوەنـدە ئـاویان ناوێت . |
| ئاور | ئاگر ؛ ئاوس ( ئاوسان ) . | شوێنی ئاوسانیش گەرمە ، دوَر نییە گـەرمی یەكیان بخات . |
| ئاوس | ئاودز ، پەنـاو ؛ ئافرەت و وڵاخی سك پڕ . | بنچینەیان رەوینەوە و گەورە بوَنە . |
| ئاونگ | ئاورنگ ، شەونم ؛ ترێی مێلاق. | دوَر نییە دەنكی ترێكە و قەترەی ئاورنگەكە پەیوەندیپان هەبێت . |

| | | |
|---|---|---|
| ئەسپەرە | داری کلکی بێڵ ؛ ئەگریجە . | درێژی یەکیان ئەخات . |
| بـا | هەوا ؛ هاتنە بای سەگ و گورگ<br>لە ( باە )ی عەرەبییەوە . | بە رێکەوت . |
| بابۆڵە | پاروە نانی گەورە ؛ مەلۆتکە . | پێچانەوە یەکیان ئەخات . |
| باپێچ | پێچی سك ؛ ئەو شوێنەیە (با)<br>پێچی تیا ئەخوات . | پێچ خواردنەکە یەکیان<br>ئەخات . |
| بـار | باری وڵاخ ؛ ( ظروف ، وضع )<br>( باری فەرش : دیوەکەی ) ؛<br>بێباری : هەڵپەرستی ؛<br>( تویژاڵێکە ئەنیشێتە سەرلێو ) . | |
| بارانە | جۆرە گۆرانیەکە چەند ژمارەیەکی<br>هەیە ؛ ( بار ـ انە ) باجی بار ؛<br>( باران ـ ە ) : ئەبارێت . | لە رێی لکاندنی ئامرازەوە<br>بوون بە یەك . |
| بـاز | باڵیندەیەکی راوکەرە ؛ چاوگ ؛<br>هەڵبەزینەوە و خۆفڕێدان ـ قفز . | |
| بازۆ | قۆڵ ؛ بەڵەك ؛ لاشێیان . | قۆڵ و لاشیان نزیکن . |
| بـاڵ | باڵی باڵیندە ؛ پەلی مرۆ . | یەکن . |

| وشە | واتا | تێبینی |
| --- | --- | --- |
| باڵا | ژوَروَ : بەرواری باڵا ؛ باڵای مرۆ : ئافتاو باڵای بەرزە واتا کەڵەگەتە . | لە بەرزیدا بە یەك ئەگەن . |
| باڵە | بێڵی ئاسن ؛ دەستکێشی چەرم . | |
| باڵەبان | بازی تەوار : مێنگە ؛ ئێستری زەلام و قەڵەو ؛ پارچەیەك لە پارچەکانی مۆسیقا . | |
| بانە | ئەو بەشـەیە جوتیار وەردی ئەداتـەوە بۆ تۆو کە رۆژە جوتێـك یاخود گاوخانێکە ؛ بەرزایی ناو دوَ دێراو ؛ ئاڵف جاڕ . | هەموی پەیوەندی بە ئاژاڵ و کشتوکاڵەوەیە . |
| باو | عادەت ؛ باوك ؛ باوی شتێك بەسەر شتێکی تردا . | رێکەوت . |
| باوی | بادەم ؛ بادار . | گۆڕانی شێوە . |
| باهوَ | شـان و قۆڵ ؛ ئاسۆ ؛ داری چوارچێوەی دەرگا و پەنجەرە . | بە رێکەوت . |
| بڕبڕە | ئێسکی تێ هەڵکێشی مۆرەغەی پشت ؛ نەتەوەی ساغي تیرەیەك ؛ | لە تێهەڵکێشان و هـاتنی بـە دوای یـەکدا یەکن داسەکە نەبێت ، |

داسێکی بچکۆڵەی کەوانە دارە وەك مشار .

| | | |
|---|---|---|
| بڕشت | پێت و بەرەکەت ؛ توانا و لێهاتن ؛ تیژیی تیغ و مەقەست . | بڕشت یەکیان ئەخات . |
| بڕك | بنج و لاسکی کاڵەك و شوتی و ترۆزی ؛ قڕقێنە . | |
| برك | فڕێدان و هەوادان ؛ کۆڵنج . | زۆری شێوە . |
| بڕە | کەڵبەی بەراز ، یەکانە ؛ کەڵەمێرد ؛ کچ ؛ گۆترە ؛ بەیارێکە لە زەوی لە ناو دوَ وەردا . | بە رێکەوت . |
| بز | ( بزن ) ؛ چاوی بز ؛ ماستی گەورە ( بە عەرەبی ) . | بە رێکەوت . |
| بزڕکان | بزڕکاندنی شیر و ماست ؛ بزڕکاندنی قسە : قسەی بێجێ . | |
| بزە | زەردەخەنە ؛ بزەی چاو . | پەیوەندییان بە باری دەموچاوەوەیە . |
| بست | پێوانە دەستێك بە پەلی ؛ بلۆسکی ئاش . | پەیوەندییان بە مشتەوە هەیە . |

| | | |
|---|---|---|
| بڵق | بڵقی ئاو ؛ بڵۆقی سوتاوی . | یەكن . |
| بلوێر | بلوێـــری بێشـكەی مـناڵ ؛ پارچەیەكی موسیقایە وەك شمشاڵ. | هەر دو بلوێرن . |
| بناوان | بناوانی ئاو ؛ ئافرەتی گەورە و سەرپەرشتیكەر لە ماڵدا . | هەر دو بنچینەن . |
| بنە | گای گێرە ؛ سـوكەماڵ كە ئەبرێت بۆ سەر رەز یا هەوار . | هەر دو بنچینەن . |
| بۆز | دێز ، خۆڵەمێشی ؛ سـەر و ریشی ماشوبرنج . | لە رەنگدا یەك ئەگرنەوە . |
| بۆق | قورباقـە ؛ هـالاو و هەڵمی گەرم . | رێـكەوت . |
| بۆڵ | دەنك و هێشـــوی تـرێ ؛ زەنگی ملی ئاژاڵی پێشەنگ ؛ خۆڵەمێش . | دوانیـان لە بەربونـەوەدا یەكن . |
| بوك | ئافرەتی تازە شـوكردو ، ژنـی كوڕ ؛ بوكی شوشە یا پەڕۆ ؛ گوڵاڵە سورە . | لە جوانیدا یەك ئەكەون . |
| بوم | قـوم ( قدوم ـ عەرەبـی ) ؛ بەرهەمی زەوی و زار . | ئەنجام و بەرهەم یەكیان ئەخات . |

| | | |
|---|---|---|
| بیر | ( بئر ـ عەرەبی ) ؛ بیر و هۆش . | قوڵتی نزیکیان ئەخاتەوە . |
| بەر | بەری دار و درەخت ؛ پێش ؛ بەردەم ؛ خوار متوسڵدان . | رێکەوت . |
| بەرگ | کاڵا ، جل ؛ بەرگی کتێب ؛ گـەڵای دار و درەخـــت و سەوزایی . | |
| بەرماڵ | بەرماڵی نوێژ ؛ بەردەرگای ماڵ . | لـکاندنی ئامراز . |
| بەران | نێری مەڕ ؛ مژان . | رێکەوت . |
| بەڕە | قایشی پێش سنگی وڵاخ ؛ نەتەوە ؛ وتەی جوتیارە بە گاجوت کە لە هێڵ دەرئەچێت . | رێکەوت . |
| بەز | چەوری ؛ دەرگا . | |
| بەزاندن | کوڵ پێدان ؛ بەزاندنی مێزی منداڵ لە بلوێرەوە . | رێکەوت . |
| بەزین | دابەزین ؛ خستنی ماڵ و کوچ ؛ پەڕینی وڵاخی بەرزە . | هەردوکیان دابەزینی تیایە . |
| بەست | روبارێکە لـــە زێی بچوکتر ؛ حەماڵی خانو ( زازا ) ؛ شێوی وشك کە ئاوی لێ ئەبڕێت . | روبار و شـێو نزیکن ، حەماڵی خانوەکەش زۆری شبۆەیە . |

| | | |
|---|---|---|
| بەستن | مەیینی ئاو ؛ گرێ لێدان ؛ بەستنی زاوا لە پەردەدا . | رێـكەوت . |
| بەق | نێرەكەو ( هـەورامی ) ؛ بـۆق ( بادینانی ) . | گۆڕانی شێوە . |
| بەل | چاو بەل ؛ ئافرەتی چاو لە دەر ؛ بزنی گوێ لوول ؛ بەلە بـەل : تەكە تەك . | لام وایە جولاندن (حركة) یەكیان ئەخات . |
| بەڵەك | بازوَ ، رەش و سپی ؛ نەخۆشی پێست ؛ بەڵەك چـاو : چـاو رەش و سپی تەواو . | : رەش و سپی ، یـا سوور و سپی یەكیان ئەخات . |
| بەن | خوری رێسراو ؛ داری قەزوان ( دارەبەن ) ؛ دەور و پشتی دێ ( زازا ) . | گۆڕانی شێوە . |
| بەندك[٥] | پەت ( بادینانی ) ؛ بۆیباخ (زازا) ؛ گیایەكی بۆنخۆشە تێكەلاو پەنیر ئەكرێت ( زازا ) . | گۆڕانی شێوە . |
| بەنك (زازا)[٦] | پەتی ژێرچەنەی ژنان ؛ بەنی | بەنی ژێر چەنە و بەند یەكن. |

(٥) فەرهەنگی خاڵ ، جـزمی ( ١ ) ، لاپەڕە ١٧٦ .

(٦) سەرچاوەی پێشوو .

| | | |
|---|---|---|
| | ڕێسراو ؛ درەختی قەزوان (دارەبەن) . | |
| بەنك[٧] | (مخدر) بۆ کێشـان ؛ نیشان (زازا) ؛ کات (زازا) . | لۆزانی شێوە . |
| بەیار | زەوی نەکێڵراو (بـــور) ؛ (عاشق) : کێ بگرم بـە یار شێوەی لە تۆ بێ . | یەکگرتنی دوو وشە . |
| بەور | بەبر (جۆرە پڵنگێکە) ؛ بەفر . | ڕێکەوت . |
| بێچوو | ســـاوای گیاندار ؛ دراوێکی زێوینی بچکۆلەیە . | لە بچوکێدا یەکیان گرتووە . |
| بێخ | بنـــك ؛ گوڵێکی جوانی کوێستانییە . | |
| بێز | قێز ؛ ڕەنگ : ڕەنگی فەرش و قاڵی یا قوماش (شەیتان بێزی) . | ڕێکەوت . |
| پاتاڵ | پەڕۆ و پاتاڵ ؛ مەردومی بێکارە . | لە بۆسوودیدا یەك ئەگرن . |
| پارە | دراو ؛ پارچە ؛ هەلاهەلا . | |
| پارێز | دەمگێڕانەوە لە خواردەمەنی ؛ خۆلانانەوە لە پارێزدا لە ڕاوا . | خۆگرتن . |

---

(٧) سەرچاوەی پێشوو .

| | | |
|---|---|---|
| پاشبەند | زنجیری پاشبەندی وڵاخ ؛ پاشبەندی رست . | هەردوکیان لە دواوە بەکارئەهێنرێن . |
| پاشەبەرە | دواسکی ژن و دوا منداڵ ؛ دوا بەری بێستان . | دوا بەر . |
| پاڵانچە | ماسولکەی گۆشتی ئەملاولای مۆرەغەی پشت ؛ بەرد و قوڕ و قسڵ کە ئەدرێنە پاڵ گونجی ئاو ؛ ئەو خوریەیە کە لەسەر پشتی بەران ئەهێڵرێتەوە دوای بڕینەوەی . | یەکەم و دوەەم ئەو شتانەن پاڵ ئەگرن . |
| پاڵتو | پارچەیەکی پانە لە کورتاندا ئەکەوێتە ژێر کلکەوە ؛ دارێکە ئەدرێتە بەر نێی ئاش بۆ نەجولاندنی ؛ پەراسو . | بەکارهێنانیان بۆ چەسپ کردن و پاراستنە . |
| پانتۆڵ(٨) | European - Style Trousers پانتۆڵی لەبەر کردن لەگەڵ چاکەتدا ؛ Pendulum پندۆڵی سەعات . | پێلانەن و رێکەوت نزیکی خستونەوە . |

(٨) فەرهەنگی تۆفیق وەهبی ، لاپەڕە ١٠٢ .

| | | |
|---|---|---|
| پانکە | باوەشێنی کارەبا ؛ جۆرێکە لە ماستی : ماسییە پانکە ؛ بەری داری مازوَ . | رێکەوت و تێکەلاوبوونی وشەی بێگانە . |
| پایە | (منصب) ؛ پایەی دیوارو خانوو . | یەکن . |
| پرك | توێژیکی سپییە لە شتی شل پەیدا ئەبێ ؛ پەڵـەیەك زەوی یا دەغڵ ؛ بڕێك ئاژاڵ . | رێکەوت و گۆڕانی شێوە. |
| پشت | لە مل بەرەوخوار تا سەر سمت ؛ ئەرخە ؛ باوك و باپیر . | هێز و یەکبوون یەکیان ئەخات. |
| پشك | بەش : بەشی خەرمان و بەشکردنی شتی تر ؛ پشکی کوندە و مەشکە و هیزە ئەو چیلکەیەیە کونەکانیان ئەگرێت . | لە هەردوکیاندا هەر چیلکەکەیە . |
| پل | پلێك گۆشت : کوتێك ؛ پەنجە . | نزیکن یا خود یەکن . |
| پلە | پلەی پەیژە و قاڵدرمە ؛ پایە . | یەکن . |
| پلار | توانج ؛ کورتە دارە کە بهاوێژرێت . | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| پزۆ (٩) | پـزۆی دەرپێی کوردێ ؛ دەردێکە تووشی مەڕ و بزن دێت وەك هەلامەتی ئادەمیزاد ؛ دەمی ڕەشکەی کاکێشان . | یەکەم و سێیەم لەیەك ئەکەن . |
| پۆپ (١٠) | پۆپنەی کەڵەشێر و مریشك ؛ قژی ئافرەت . | یەکن . |
| پۆز | لووت ؛ (هەوا و غرور) . | یەکن لە لووت و لووت بەرزیدا. |
| پەپکە | گونکە هەویر ؛ خەرواری هەنجیر و پەنیر ؛ خۆپێچانەوەی مار . | یەکن لە نەرمێ و کۆبێتیدا . |
| پەپوولە | (فراشە) ؛ پەروانە . | یەکن لە سووڕانەوەدا . |
| پەتڵە | ساوەری نەهاڕاو ؛ دانەوێڵە . | یەکن . |
| پەچە | هاوەڵی عەبا ؛ پەچەی گاگەل یا ئاژاڵی تر : ئەو شوێنەیە لە دەرەوە مۆڵی تیا ئەخۆن . | یەکەمیان بێگانەیە . |
| پەڕ | پەڕی باڵیندە ؛ کەنار ، ئەو پەڕ یا ئەم پەڕ . | ڕێکەوت . |

(٩) فەرهەنگی خاڵ ، ج١ ، ل ٢١٥ .

(١٠) سەرچاوەی پێشوو .

| | | |
|---|---|---|
| پەڕە | پەڕەی کاغەز ، پەڕەی پەروانە ؛ پەڕەی لوت و گوێ و دڵ ؛ گەڵای دار و درەخت . | یەکێ لە تەنکییا . |
| پەردە | پەردەی گوێ ( غشاء ) ؛ پەردەی پەنجەرە ( ستائر ) . | یەکێ لە تەنکییا . |
| پەڕین | هەڵاتنی وڵاخی نێر لە مێ ؛ ترازان و دەرچوونی شت ؛ لە کۆ چوونی ئەندام . | رێکەوت . |
| پەشم | قسەی بێ نرخ ، گاڵتە ؛ خوری . | رێکەوت . |
| پەڵخ | گوێرەکەی گامێش ؛ پەڵخە بەراز : بەچکەی بەراز . | بەچکەی زل و قەڵەو لە چاو بەچکەی تردا . |
| پەل | چوارپەلی وڵاخ : هەر دوو دەست و هەر دوو قاچی ؛ لق و پۆپی دار و درەخت ؛ بڵاو ، فراوان . | |
| پەڵە | نوخشە باران کە زەوی تێر ئاو ئەکات ؛ لەکە ، کە ئەکەوێتە سەرجل و قوماش ؛ پەڵەزەوی یادەغل : پارچە . | هەمو بریتین لە کەم لەچاو زۆردا . |

| | | |
|---|---|---|
| پەنا | هانا (استنجاد) ؛ كووچە (زاویە) . | ڕێكەوت . |
| پەند | (درس ، عبرة) ؛ پەند و پەنگ (بەدناوی) . | یەكن لە (دەرس) وەرگرتندا . |
| پەی | (تأمینات : پەی لەسەر دانان) واتا پێ داگرتن لە (مزایدە یا مناقصە)دا ؛ شوێن : پێی هەڵگرتووە ؛ ڕێ و ماوە ؛ ئاوەكە پەی ئەدا بۆ لێدان . | بۆداگرتن یەكیان ئەخات . |
| پۆل | (صف) ؛ پۆلی باڵندە . | یەكن لە زۆریدا . |
| پوول | فلس ؛ (طابع) . | ئەوسا نزیك بوون لە نرخ و وێنەدا . |
| پێ | قاچ ؛ پەلەپیتكەی تفەنگ ؛ پێی ئاش : ئەو دارەیە بەرداشی پێ ئەجوڵێنرێت . | هەموویان بۆ جوولاندنن . |
| پیر | پیاوچاك : پیرمەسوور ، پیرخدر ؛ بەساڵاچوو . | یەكن . |
| پیرەلۆك | پیربوونەوەی ئەندامی لەش لەبەر مانەوەی لە ئاوا ؛ داری كەندەڵ . | یەكن . |

| | | |
|---|---|---|
| پێك | چەکوشی قورسی ئاسن ؛ فیقەنە ؛ لاسکی گەنم و جۆ . | رێکەوت . |
| پێلە[١١] | قۆزاخەی کرمی ئاوریشم ؛ گاجۆتێکە شاخەکانی بەلای گوێچکەیدا شۆڕ بۆبێتەوە ؛ پێلۆ ( ئەردەلانی ) . | گۆڕانی شێوە . |
| تاپۆ | قەباڵەی بە خاوەن بونی زەوی و خانو ؛ تارمایی شت . | یەکەیان بێگانەیە و بە رێکەوت ناوەکانیان لەگەڵ دوەمدا یەککەوتون . |
| تات | تەلە بەرد ، شاخ و کێوی سەخت ؛ ئەو ئافرەتەیە ئێسقانی کڕکڕاگە یا پارچە گۆشت لە زێیدا هەبێت . | لە رەقیدا یەك ئەگرنەوە . |
| تار[١٢] | تاریك ؛ پارچەیەکە لە پارچەکانی مۆسیقا ؛ گیاندارێکە تەرە بۆبێت . | رێکەوت . |
| تاق | کەلەبەرێکی کەوانەییە لە دیواردا شتی تیا دائەنرێت ؛ کات ؛ تاقی پێش نیوەڕۆ ؛ تاك ؛ پێستی مەڕ و بزن . | رێکەوت . |

(١١) فەرهەنگی خاڵ ، ج١ ، ل ٢٥٩ .

(١٢) سەرچاوەی پێشوو .

| | | |
|---|---|---|
| تاڵ | تـامی تفت و ناخـۆش ؛ تاڵ ـ دانی مەشکەو شتی تر : خۆشە کردنیان بە جەوت و توێـکڵە هەنار و مازوَ ؛ تاڵ ـ ەدەزوَ : هەودا ؛ پارچەیـەك گۆشـتی رەشە لە ناوەندی سیوجگەردا . | تاڵی هەموویان یەك ئەخات ، تاڵە دەزووەکە نەبێت . |
| تام | رۆنی چێشت ؛ ( طعم ) . | یەکن . |
| تانە | خاڵێـکی سپییە لە سەر گلێنە ؛ نیشـــانەی پی‌گەیشتنی میوە ؛ تەشەر ( طعن ) . | رێکەوت . |
| تاو | تاو ـ ە دەزوَ : تاڵە دەزوَ ؛ تاو ـ ە باران : لێزمەی‌کـەم ؛ تاو ـ ێك ( بۆ کات ) دەمێـکی کەم ؛ تاو ـ ی سەندووە : گەرم بووە و گوڕی سەنـدووە ؛ تـاو ـ ی داوە : تینـووە ؛ تاو ـ دانی وڵاخ : غارپێ کردنی . | زەبر هەندێکیان ئەگرێتەوە ، ئەوانی تریش رێکەوتن . |
| تەرازوَ | ( میزان ) بۆ کێشانی شتومەك ؛ تەرازوَی ( بەنا ) کە رێـکتی پێ ئەپێوێت ؛ چەند ئەستێرەیەکن | لە کار و دیتمەندا یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| | له بەینی کۆ و گەلاوێـژدا لە تەرازوَ ئەکەن . | |
| تاوڵە | تەویلەی وڵاخ ـ پشـت تێر ؛ جۆرە یارییەکە بە پتۆلی تەختە و زار ئەکرێت . | بێگانەن ، بە رێکەوت لەیەك ئەچن . |
| تاوێر | تاشە بەردی شێنکار ؛ ئەندازەیەکە لە برێشکە یا کەشك کە لە ناو ساجدا ئەبرژێنرێت . | |
| ترۆکاندن | هەڵبزین و جـوڵاندنی پێڵوی چـاو ؛ دەسـت هێنان بە پەلەپیتکەی چەکدا بێ فیشەك ؛ کون کردنی هێلکە لە لایەن مریشکەوە ؛ دەرهێنـانی تۆو کتۆلەکە و تۆو بێستان بە دان . | کردنەوە هەندێکیان یـەك ئەخات . |
| تریفە | شەوقی مانـگ ؛ نەخۆشـییەکی ئاژاڵە سییەکەی ئەنوسێت بە لای ورگیەوە ؛ جۆرە دەردێـکە لە تینوێتییەوە تووشی ئاژاڵ و وڵاخ ئەبێت ریخۆڵەی رەش ئەکات . | دوهەم و سێهەم یەکن و بە رێکەوت لەگەڵ یەکەمـدا یەکیان گرتووە . |

| | | |
|---|---|---|
| تۆپ | تۆپی یاری Football ؛ تۆپی قوماش ؛ تۆپی شەڕ ( مدفع ) ؛ تۆپی بەردانی گونج : دارێکە پەڕۆ بە سەرەکەیەوە ئەبەستن . | قـەواره و گردی یەکیان ئەخات . |
| تۆراخ | تـۆراخی ماســـت و دۆ : تونـدبونەوەیان لە تورەکەدا ؛ هێزە ، مەشکە . | هەمو دەفرەکانیان وەك یەکن. |
| تورت | تورتی توێکڵە هـــەنار : تفتیەکەیەتی ؛ شتێـکە لە شکانا زۆ بپەڕێت . | |
| تۆڕ | تۆڕی راوە ماسی ( شـبکە ) ؛ ولاخی تۆڕ : بزێو و جـــوتە وەشێن یاخود تورە ؛ پەردەیەکە بەسەر چاودا ئەکشێت لە چاو یەشـەوە پەیدا ئەبێت ؛ تۆڕی لۆکس : کیسەکەیەتی . | تورەیی ولاخــەکە نەبێت ئەوانی تر لە بنچینەدا لەیەکەوە نزیکن . |
| تۆز | تۆز ـ و خۆڵ ، گەرد و وردە خۆڵ ؛ تۆز ـ ێك : بەشێـکی کەم . | یەکن . |
| توش | رۆژێـکی توش : تـــۆف و | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| | سارد و سەخت ؛ ڕێگای سەختی قەد شاخ ؛ ئێستر و وڵاخی نارەحەت . | |
| تۆتە | پەنجە پچکۆلەی دەست و پێ : تۆتە ، ڕای تۆتە ، باڵابەرزە ، دۆشاومژە ، ئەسپێ کوژە ؛ تۆتە ـ لە سەگ . | لە بچوکیتدا یەك ئەگرنەوە . |
| تور | تور و شێلم ، ترپ ؛ جەواڵی بچوك . | ڕێکەوت . |
| تیل | چاوی مەیلەو خێل ؛ تیل ـ ی هەڵهات . | ڕێکەوت . |
| تەبارە | تەبارەی شینایی : دەغڵی نەدرواو ؛ کێشە ، شارا ؛ تەبارەی ناو زەوی : کەڵەکە بەردە و نیشانەیە بۆ جیاکردنەوەی دوو زەوی . | لە قەوارە و پەیوەندی بە زەوی و کشت سازیدا یەکن. |
| تەبەق | لەنگەری : سینی تەختە ؛ نەخۆشیەکی ژێر سمی وڵاخە . | ژێر سمی وڵا خیش چاڵە وەك چاڵی لەنگەری؟ |
| تەپکە | تەپکەی راوی چۆلەکە و | |

| | | |
|---|---|---|
| | سوێسکە ؛ گەمژە : شیاکە و ڕێخی وشکەوەبوی ئاژاڵ لە گەوڕدا . | |
| تەتەڵە[13] | تەتەڵەی برنج : هەڵتەکاندنی لەسەر سینی یا لەنگەری ؛ تەتەڵەی سمت : کلۆك ؛ ڕوَمەت (ئەردەلانی) ؛ سێبەندە (هەورامی) . | گۆڕانی شێوە . |
| تەژە | تکە ، سابوێن ؛ رایەڵی بن میچی خانو ؛ مرۆی زەبەللاح . | ڕێکەوت . |
| تەرس[14] | پیسایتی ماین و ئەسپ ؛ کاری پێچەوانەی نالەبار ؛ (ئەم کارە تەرسی هاتووە) . | |
| تەرم | تەرمی مردوَ : لاشەکەی ؛ کۆڵێتی مێو ؛ دارە مەیت . | تۆ بلێی هەموی لە کەوتن و درێژبونەوە نەهاتبێ ؟ |
| تەقلە | تەقیلە : کلاو ؛ کەڵبەی هەنجیری نەگەیشتو . | |

(١٣) فەرهەنگی خاڵ ، ج١ ، ل ٣٠٤ .

(١٤) سەرچاوەی پێشو .

**تەکیە** — تەکیەی شێخ : شوێنی نوێژ و یادی یەزدان ؛ بارێکە سەکۆ . — لە بنچینەدا لە ( سەکۆ ) کە وە هاتووە .

**تەم** — تەم و مژ : هەڵمی زەوی تەڕ یا ئاو ؛ لێڵایی چاو ؛ خەم . — لە بیر خەریك کردن و بەر چاو گرتندا یەکن .

**تەمەڵ** — تەوەزەل و بێکارە ؛ بناغە و بنچینەی دیوار . — تۆ بڵێی لە قورستیدا یەکنەگرنەوە ؟

**تەوس** — قسـەی بە ماناو پلار ، تانە و لۆمە ؛ بەتەوسەوەچوون : جۆرە بێهۆشییەکە بەسەر ئادەمیزادا دێت بەهۆی ڕوداوێکەوە . — کارتێ کردن یەکیان ئەخات؟

**تێبەردان** — تێبەردانی کار و بەرخ بۆ مژینی دایکیان ؛ تێبەردانی سەگ و تانجی بۆ گیانی نێچیر ؛ پەڕێنی نێر لە مێ لە کاتی تەڵەبدا . — لە ڕتن و یەکگرتندا یەك ئەکەون .

**تێچاندن** — بۆی تێچاند : قسەی خراپی دەربارەکرد ؛ تێچاندنی شتێکی ورد بۆ ناو شتێکی شل کەم کەم تاکو تێکەڵ ببێت . — یەکن .

| | | |
|---|---|---|
| تێژ | دەفر : جەواڵە و دەمی لــە تەنشتیەوە ؛ مڕۆی مۆژەوەبۆ ( ئەردەلانی )[15] . | گۆڕانی شێوە . |
| تیرە | هۆز ، ئێل ؛ تیرەی بن کلاش ، سیرمە یاخود رایەڵەکەی ژێریەتی . | گۆڕانی شێوە . |
| تیرەشان[16] | شانەی هەنگوێن هەنگ لەسەر لا هەڵی بەستبێ ؛ تیرەشـانی شاخ و کێو : درێژایی تەوقە سەر و پۆپەکەی . | لەیەك بنچینەوە هاتون . |
| تێکەوتن | تێکەوتن لە یارێدا : دۆڕاندنیەتی ؛ چونە ناو ئاو ، وسڵ دەرکردن ؛ بۆت تێ ئەکەوم: بۆت تێئەکۆشم . | |
| تیر | تیری کەوان ؛ تیری مەرەزە : گۆلەکانی . | لە درێژیدا یەکن . |
| جاخ | جاخە توتن : تورەکەیەکە لــە گونیە یا مشەمما ؛ دیوارێکە لە دار دروست کرابێت . | رێکەوت . |

(١٥) فەرهەنـگی خاڵ ، ج١ ، ل ٣٢٨ .

(١٦) فەرهەنـگی کشت و کاڵ ، ل٩٦ .

| | | |
|---|---|---|
| جاڕ | جاڕدان : بانگەواز بە گەڕانەوە ؛ جاڕە گەنم : پەرێزەکەیەتی دوای دروێنە ؛ زەوی سەختی نەکێڵراو ؛ نێرگسەجاڕ : شوێنی نێرگس . | هەموویان لە سەرچاوەیەکەوە هاتوون جاڕدانەکە نەبێت . |
| جام | جامی ئاوخواردنـــەوە ؛ جامی شووشە : تەبەقە شووشە ؛ جامی رەسم : (عکس)یەتی . | بێـگانەیە . |
| جامباز | فرۆشیاری دەستگێڕ ؛ فێڵباز و تەشقەڵەکەر . | یەکن . |
| جریوە | دەنگە دەنگی چۆلەکە ؛ ورشەی ئەستێرە . | |
| جقە | جقەی کەڵەشێر : پەنجەیەکی زیادە کە پێیر بۆ لە پێی دەردێت ؛ فشە کڵاونە ، شوان خەڵەتێنە ؛ زیادە پەڕە بەسەر باڵیندەوە . | شتێکی زیادە لە پەلـەور دەردێت . |
| جوجکە | جوجەڵە ، جوجە ؛ کلێنجکە : کلکی ئاژاڵ و حەیوان . | |
| جووت | کێڵاندنی زەوی ؛ دوو . | زەوی کێلانەکەش بـە جووتێك گایە : یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| جۆتە | جۆتەی وڵاخ : لەقە هاویشتنی بەپاشۆی ؛ دوَ گیاندار بەیەك سك ببن : توأم ؛ ئەو وڵاخەیە دوَشـــا رەگ لە ناو چەوانیا بەرزبۆبێتـەوە ؛ دراوێکی زێوینی ئێرانییە بە دوَ قران ئەچێت . | هەموو لە (جوَت)دا یەکن. |
| جەخت | جەختی هێنا : دوَ جار پژمتی لە کاتی قسەدا کە نیشانەی باشییە ؛ هەوڵ و کۆششی لەسەریەك بۆ کارێك ؛ ئێوارە وەختە ؛ جرِن بە جەختە ( بەگوڕە ) . | دەستدانە ئێـش یەکیان ئەخات . |
| جەنجەڕ | جەنجەڕی خەرمان کوتانـدن ؛ چەرخی ئاو هەڵـگۆزین لە بیر . | لە سوڕانەوە وە هاتون . |
| جەوهەر | گەوهەر ؛ بە جەوهەر : تواناو لێهاتو ؛ خاڵ و نیشانی دەمی خەنجەر . | لە نرخدانا یەکن . |
| چاخ | هاوچاخ : هاوکات ؛ ئـاژاڵی قەڵەو ؛ شتی ساز و لەبار ؛ تاف. | ڕێـکەوت . |

| | | |
|---|---|---|
| چارۆکە | خامی خومکراوی شـتێن بۆ کۆڵوانـەیژنــە لادێیتی ؛ منداڵدان ، پزوَ ؛ گیایەکە وەك بامێ گوڵێکی زەرد ئەگرێت . | ڕێـکەوت . |
| چاڵمە | سەعاتی چاڵمە : سەعاتی گەورەی ناو چوارچێوەی تەختە بـــە دیواردا هەڵئەواسرێت ؛ کتێسە توتنی نێرگەلە (ئەردەلاّنی)[17]. | گۆزانی شێوە . |
| چاو | ئەندامی بینێن ؛ توَلی تەڕ کە پێچرابێت بە شتێکدا . | ڕێـکەوت . |
| چاویلـکە | عەینەك ؛ برینێـــکە لە لەش پـەیـــدابوَبێت و چـاوگەی داکەوتبێ . | ڕێـکەوت : |
| چڵپە | دەنگی ئاوخواردنەوەی سەگ و پشیلە ؛ چڵپـاندن : چەکاندنی مەمك و گوان ؛ چڵپ و لێس : لستنەوە و هەڵ لوشێن : پوَرە فەرەنـگێز ، بەشـەکەی خۆی | لـە بـەکار هێنانی دەم و زماندا یەك ئەگرن . |

(۱۷) فەرهەنـ ی خاڵ ، ج۲ ، ل ۱۰ .

ئەدا بە نیوە ڕێس ، خۆشی بەر
ئەبێتە چڵپ و لێس .

**چلوورە** — سەهۆڵی زستانە بەکوێسوانەدا
شۆڕ ئەبێتەوە : نەسرین گوڵی
زستانە ، شەوچرای کوردستانە ،
چلوورەی کـــوێ کوێسوانە ؛
جۆرە خواردنێکی ســـارد و
شیرینە لە شیر و شەکر و بەفر
دروست ئەکرێت بۆ هاوین .
— یەکن .

**چنگنە** — گیاندارێـکی ورد و بە ئاڵۆشە
ئـەداتە بنـکی مووی چڵـکن ؛
گیایەکی گەڵا وردی ڕیشەدارە .
— لە ئاڵۆشداندا یەکن .

**چۆك** — بەچۆکا هاتن : دانیشتنە ئەژنۆ
بۆ پێشەوە ؛ ئەندامی جنسیی
لە پیاودا ؛ قامیش .
— لـە درێـژکۆڵەییدا یـەك ئەگرنەوە .

**چۆڵەکە** — باڵیندە ؛ ئامرازێـکی جۆلاییە ؛
دوَ پارچە تەختەی تەنکی باریکی
کورتە جلی شۆڕاو بە تەنافەوە
چەسپ ئەکات .
— بە ڕواڵەت یەکن .

**چەتاڵ** قـولاپ ، چنـگاڵ ؛ دەواری بچوك ؛ دار یا شیشێکی دوَ پەلە لوَلەی تفەنـگی ئەخرێتە سـەر لە کاتی تەقاندنا راوکەر بە کاری ئەهێنێت .

**چەخماخ** تفەنــك . چەخماخســاز : تفەنگساز ؛ چەخماخی جگەرە داگیرسان ، ئەستێ . — لە ئاگر و چەخماخەدا یەك ئەگرنەوە .

**چەرخ** چەخماخ ؛ ماکینە ؛ دەم و سەدە . — لە خول خواردندا یەکن .

**چەرخوفەلەك** جۆلانە ؛ دنیا و کارەسات . — لە هانوچۆکەدا یەکن .

**چەکەرە** گـۆپکـە : چرۆی درەخت ؛ کەرَوَ ؛ دوَدڵی و ( شك ) .

**چەقەنە** چەقەنەی ئاش ؛ چەقەنە لێدان ؛ درەختێـکە بـەریك ئـەگرێت وەك بەری مۆرد .

**چەك** ( سـلاح ) ؛ خشڵی ژنانـ ؛ چەرمی پاژنەی کەلاش ؛ ( صك : Check ) . — بـە لای منەوە هەمـوَ ا بنچینەدا یەکن ( صك ) نەبێت کە وشەیەکی بێگانەیە .

| | | |
|---|---|---|
| چەماو | ترۆزیە چەمێلە ؛ چەم . | ترۆزیەکە لە چەمدا ئەکرێت بۆیە ئەو ناوەی بەسەرا سەپاوە . |
| چەمەرانە | دەهۆڵ و زورنایەکە لە شێوەندا ئەکوترێت ؛ شێوەنێکی دوَ دەستەیی پیاو و ژنە وەك ئەڵقەی چەمەرە ئەوەستن بۆ شێوەن کردن . | لە شێوەنەکەدا یەك ئەگرنەوە . |
| چەو | چاو ؛ کانییەکی روَنی بەر تریفەی مانگە شەو .<br>لە بنیا بلەرزێ مرواری زێخو چەو . | رێکەوت . |
| چەورە | مرۆی بێشەرمی بەرەڵای هاروهاج ؛ دەسەسڕ . | رێکەوت . |
| چەورۆکە | دوَ جۆرە گیای بەهارێن ؛ دەسرۆکەی بچۆك . | رێکەوت . |
| حەلەقمەلەق | قسەی پڕوپوچ و بێسەروپێ ؛ بەیتێکە لە کاڵە مستیدا ئەوترێ:<br>حەلەق مەلەق ، دەنوکی لەقلەق ،<br>کیسە و کەمەر ، یا پێغەمبەر . | قسەی پڕوپوچن . |

| | | |
|---|---|---|
| حەماڵ | کۆڵکێش ؛ حەماڵی خاتو : نێرگەکەی . | لە هەڵگرتندا یەك ئەگرن . |
| خاراو | خاراوبوونی چەرم : جیڕبوونەوەی لە ئاوا ؛ کوپەی خاراو : شتی شلی زۆر مژیوە ، تێربووە . | بە شت مژینەکەدا یەکن . |
| خاکە | خاکەی برنج و دانەوێلە ؛ جۆرە مێشولەیەکی زۆر وردە . | لە وردیدا یەك سەرچاوەن. |
| خاڵ | وەك خاڵی رومەت و خاڵی کوتراو ؛ برای دایك (لالۆ) ؛ پەڵەی رەش بە هەرشتێکەوە ؛ (نقطە) ؛ بەفری زستان : کوێستانان خاڵ خاڵ بەفری ناچێتۆ . ئەو کچە منداڵە ، ژیری نابێتۆ . | تەنها (خاڵ)ی (برای دایك) نەبێت ، هەموویان یەك سەرچاوەن . |
| خان | شوێنی حەسانەوەی کاروانچی و وڵاخ ؛ رێزە بۆ ژن : گەلاوێژ خان ؛ (لەقەب)ی ئاغاکانی کوردستانی ئێرانە وەك : مەحموخان ، حەمە رەشید خان . | دوهەم و سۆهەم بۆ رێزلرتن و یەکەم بێگانەیە و بە رێکەوت هاتووە . |

| | | |
|---|---|---|
| خلێنە | تۆپە بەنی متوی ڕێسراو ؛ ئەو پیسی‌یەیە بە پاشـــەڵی مەڕەوە خڕ و وشك ئەبێتەوە . | بە خڕیەکەدا یەکن . |
| خڕ | شتی گرد ؛ شوێن لافاوە کە خڕە بەردی زۆر بێت وەك : خڕی چەناخچیان ؛ دەرگاکە خڕ دابخە واتا : کڵۆمەکە بکە بە شوێنی خۆیدا . | |
| خشت | کەرپوچ ؛ ڕێك و پێك . | ( لە ڕێکیدا ) یەکن . |
| خەساندن | ئەسـپەکەیان خەساند : گونیان تەقاند و دەرهێنا ؛ شکاندن و لارکردنەوەی لقی گیای تەماتە تاکو پەل بڵاوکاتەوە ، بەرەکەی زۆر و باش بێت . | هـەر دو ( عمـلیەتـەکە ) بـریتین لە شـکانـدنەوە و تەقاندنی ئەندامی گیان لەبەر . |
| خرس | ورچ ؛ مانگر . | مان گرتنەکەش یەکێکە لە خووەکانی مام ورچ . |
| خەمڵاندن | قەسراندن (تخمین) ؛ خەمڵینەوە : گەشانەوە . وا وەتەن خەمڵیوە وەك گوڵ نەوبەهاری میللەتە ، شادمانی قەومی کوردە وەختی لوتف و رەحمەتە . | |

| وشە | واتا | تێبینی |
|---|---|---|
| داخ | خەم و خەفەت ، ( أسف ) ؛ ڕۆن داخ کردن : هەڵقرچاندنی ؛ وڵاخ داخ کردن : سوتاندنی شۆێنی ئازارەکەی ؛ شاخ و داخ ( داغ ) . | |
| دادۆشێن | دۆشێنی گوان ( بۆ ماڵات ) ؛ دادۆشێنی ئەندامی لە جێ چو : دەست پیاهێنانی لە ئاوی گەرما بە سابون بۆ هاتنەوە جێی ؛ شت لێ کێشانەوە . | یەکەم و دوەهەم لە دەست پیاهێنانەکەدا یەکن و یەکەم و سێهەم لە شت کێشانەوەکەدا یەکن . هەرسێکیان لە بنەڕەتدا لە یەك سەرچاوەوە هاتون . |
| داکوتان | داکوتانی بزمار و مێخ ؛ ڕواندن یاخود داوڵینی گەنم و جۆ تاکو دانەکەی جیا بکرێتەوە . | بە لێدانەکە هەردوك یەك ئەگرنەوە . |
| داڵ | داڵی کەر خۆر : گۆشت خۆر ؛ هێشوە ترێی شاش ؛ گیانداری لاواز . | ڕێکەوت . |
| دان | دانی ناو دەم ؛ دانی ئەڵێی صەدەفە بەحری دەری هێناوە | لە قەوارەدا نزیکن لە یەکەوە . |

| | | |
|---|---|---|
| | پەلکەی ئەڵێی رەشمارە لە کون سەری کێشاوە ؛ دانەوێڵە : دەغڵ و دان ؛ دانی چێشت : بەرەکەی . | |
| داهاتن | داهێنانی دار بە مشار ؛ داهاتنی چاو : گڵ‌کردنی ؛ داهێنانی قژ ؛ تازە پەیدابوون و باوسەندن : تازە داهاتووە ئاوی بەلوعە ، پێم‌وت بۆ ماچێ وتی مەمنوعە . | هەندێکیان بە رێکەوت یەکیان گرتووە . |
| دوکان | دوکان : کۆگا : شوێنی شت فرۆشتن ؛ خانەی ورد ورد لە زەوی شەتڵی تیا ئەڕوێنرێت . | لە ئەندازەی شوێندا نزیکن . |
| دەستگر | پەڕۆی داگرتنی مەنجەڵی گەرم ؛ ئەو کارەیە بەدەستەوە قورس بێت . | یەکن |
| دەستور | (قانونی ئەساسی) ؛ باو ، (عادەت) ؛ دەستور کرا : حوقنەیان کرد . | یەکەم و دوەهەم یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| دەفە | دەفەی شان : ئێسقانی بن قۆڵ ؛ دەفەی جۆڵا : ئەو تەختەیەیە تەنراوی پێ سفت ئەکات . | ڕێکەوت . |
| دەقدانەوە | کوتانەوەی برنجی نیوە کوتراو ؛ دەقی دایەوە : کوتای و کوزەرو بەربای عەمری دایەوە ؛ بێژانەوەی دانەوێڵە جارێکی تر . | لە کوتاندن و پاك کردنەوەدا یەکن . |
| دەڵ | دەڵە سەگ ( مێیەکەی ) ؛ دەڵ ـ دەڵاندن . | دەڵی سەگ لە گوانەکانیدا کون هەیە تۆتەڵەکانی شیرەکەی لێوە ئەمژن . |
| ڕازان | ئامادە و ساز بوون ؛ پاڵکەوتن ؛ نوستن . | |
| ڕاستە | ڕاستەی هێڵ کێشان ؛ جۆرێکە لە هەڵپەڕکێ . | یەکن . |
| ڕان | ڕانی مەڕ : گەلە مەڕ ؛ ڕانی مرۆ ، ئاژاڵ ، وڵاخ .. | ڕێکەوت . |
| ڕایەڵ | حەماڵ ، نیرگە ؛ چەند هەودایەکی ڕاستە کە پۆی شتی لەسەر ئەتەنرێت . | یەکن . |

| | | |
|---|---|---|
| رزق | مشکی گەورەیە کە بەزۆری لە دەشتایە ؛ دانەوێڵە و خواردنی هەڵگیراوی ناوماڵە . خـــوا رزقت بدا : واتا ئەو شتانەت بداتێ . | مشکی رزقیش هەر لە رزق خواردنەوە ناو نراوە . |
| رست | رستی هۆنراوە ؛ تەناف ؛ پەت یا قایشی درێژ تـانجی راوی پێ ئەبەسرێتەوە لە کاتی راودا . | هەمـوی لە بەسـتنەوەوە هاتووە . |
| رۆژ | ( خۆر ـ شمس ) ؛ ( شەو و رۆژ ـ لیل ونهار ) ؛ کات : دەم : ئەم رۆژە چ رۆژێـکە کە دنیـــا شڵەژاوە ، هەرکەس بە جەخارێ جگەري قیمەکراوە . | |
| رەحەتی | رەحـــەتی نەوت : قمـــع ؛ حەســـانەوە ؛ خاوبونەوە دوای دروَست بوَن . | یەکەمیان هۆیەکە بۆ تێکردنی نەوت بە ئاسانی ، دوانەکەی تر یەکن . |
| رەشکە | رەشکەی کاکێشان ؛ رەشکە و شمـڵتی : دانەوێڵەی بۆنخۆشن ئەکرێنە ناو نانەوە بۆنی خۆش | تۆ بڵێی بەهۆی رەشییەکەوە ناوەکەیان بەسەردا سەپابێ . |

| | | |
|---|---|---|
| رەشبۆنەوە | دامردنەوەی ئاوڵە و سورێژە ؛ چۆنەوەی بەفر و تواندنەوەی ؛ کوژانەوەی ئاگر . | هەمو لە بنچینەدا یەکن . |
| رەشبەڵەك | دەست گرتنی ژن و پیاو لە هەڵپەڕکێدا ؛ رەش و سپی . | بە تێکەڵاوبون یەکن . |
| رەشمە | رەشمەی وڵاخ ؛ خشڵ . | یەکن . |
| رەند | مرۆی رووخۆش و قسە خۆش ؛ زەمینێکە لە ناو چەمدا بەهۆی ئاو هەڵسانەوە پەیدا ئەبێت . وەك رەندی حەسەن ئەفەندی لە گوێ چەمی تانجەرۆ . | رێکەوت . |
| رەندە | رەندەی دارتاش : تەختەی پێ پوخت ئەکرێت ؛ رەندەی پەنیر : پەنیر و شتی تری پێ ورد ئەکرێت ؛ رەنە : قرتاندنی کوڵی مەرەزە . | هەمویان لە رنینـدا یەك ئەگرن . |
| رەوە | رەوە وڵاخ ؛ لیسێکی گەورەیە گەزۆی پێ ئەتەکێنرێت . | رێکەوت . |
| رێخ | زێخ و وردە چەو ؛ پیسی ئاژاڵ . | لە نیشتندا یەکن . |

ڕیپۆق چڵـکی چاو بە وشکێ ؛ چڵمی وشکەوەبو لە لوتدا . یەکن .

ڕێژاو جۆرە هەنجیرێکی بەناوبانـگە ؛ تاڤـگە ؛ قەڵبەز .

زار دەم ؛ زاری تاوڵە ؛ زار و گریە. زاری تاوڵەکە بێگانەیە .

زبان لسان ؛ لغە . لەقسەوەیە بــە جولاندنی زمان .

زرنگانەوە زرنگەی پاوانە و پڵپڵــــە و ســـاجلەخ و جام : جام ئەڵێ بشکێم ونەزرنگـــێم[18] ؛ زرنگانەوی گوێ : گوایا گوێ بانگی ئـــەکات ؛ کزربونەوەی شتی تەڕ . دەنـگدانەوە هەندێکیان یەك ئەخات .

زەرد ڕەنگی زەرد ؛ زەردەی خۆر ؛ ( نحاس ) . لــە بنچینــەدا یــەکن ( لەرەنگدا ) .

زیخ زیـخ و چەو ؛ ئازا .

زەردویێ مووروی دەست و ملی ژنان ؛ نەخۆشی زەردویێ . لــە بنچینــەدا یــەکن ( لە رەنـگدا ) .

(18) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| زەل | زەلی گوێی چەم و ئاو ؛ قوڕی ڕەش ؛ جگەرەی قامیش . | بێجگە لە قوڕەکە ئەوانی تر لە درێژیدا یەکن . |
| زیقاوڵە | مەلێکی سـوورباوە لە کۆتر بچـوکتر ، لە نیشـتنەوەدا ئەزیقێنێ ؛ گیاندارێکی بۆری چوار پێیە لە دەڵەك گەورەترە و پێستی بەنرخە . | لە دەنگدا یەکن . |
| زێ | (نهر) ؛ زێی ئافرەت (رحم) . | یەکن ، (ئەو شوێنەی ئاوی لێ دێ) . |
| سوور | ڕەنگ : من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ . مژدەی شەفەقی لێ دەرئەکەوێ ؛ سوێر ؛ سوور ـ بوون لەسەر ڕا . | ڕێکەوت . |
| سوورمە(١٩) | قوماشی سیمدار بۆ جلی ژنان ؛ کل : سـوور و سپی سوورمە لەچاو(٢٠) . مەحموە فەندی کاکی حەلاو . | |

(١٩) سوورمە بە تورکی پیاهێنانە ، کل و کلتووریش بە چاودا ئەهێنرێن .

(٢٠) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| سێ | ( ٣٠ ، ژمارە ) ؛ ( رئە ) . | رێكەوت . |
| سەیوان | چەتر ؛ خێوەت . | یەكن . |
| سێلە | سەرسوچی كۆڵان[٢١] ؛ سێلەی رەحم ( صلة الرحم ) ؛ رەققە . | |
| سەوڵ | سەوڵی بەلەم و كەڵەك ؛ گیایەكی بەرزی كەلاپانە ، گوڵێكی سور ئەگرێت وەك پۆپنەی كەڵەشێر ؛ داری سەرو . | بێگانەن و بە رێكەوت یەكیان گرتووە ؟ |
| سێپا | سێ كوچكەی سەرئاگر ؛ سێ داری بەستراون بەیەكەوە ، مەشكەی پیا هەڵئەواسرێت بۆ ژەنن . | یەكن . |
| سیخوڕ | جاسوس ؛ پێستی ناو سكی ئاژاڵ ، ریخ ؛ سوچەر . | رەنگ هەیە لە پیسییەكەدا یەك بن . |
| شاخ | كێو ؛ شاخی ئاژاڵ . | لە رەقی و رەنگدا نزیكن . |
| شانە | شانەی قژ داهێنان ؛ شانەی هەنگ ؛ سەركار ( بادیناتی ) . | شانەی قژ و هەنگوین لە دانە دانەكەیاندا یەكن . |

(٢١) سێلەی كۆلان ( صلە ) ، دو كۆلان بە یەك ئەگەیەنێت .

| | | |
|---|---|---|
| شاگرد | قوتابی ؛ شاگرد دارتاش ... | یەکن . |
| شکار | راو ـ شکار ؛ کۆمەڵە بەرد ؛ زەوی بەردەڵان . | راویش لە شوێنی بەردەلاندا ئەکرێت ! |
| شەلاخ | زللە ؛ قامچی . | لە لێداندا یەك ئەگرن . |
| شوشە | قاپ : بطل ؛ شوشەی پەنجەرە : جام . | یەکن . |
| شێ | کەژو : (رطوبة) ؛ ولاخی شێ : سوورباوێکی کاڵ . | رێکەوت . |
| شیر | شیر و ماست (حلیب) ؛ تێغ . | ئایا رەنگ نزیکیان ناخاتەوە ؟ |
| شەوق | روناکی ؛ ئارەزو . | |
| شەوە | بەردی بەنرخ : شەوە ردشە ، شیلان سوورە ، شۆربا شلە ... ؛ مۆتەکە . | کە شەوەش یەکێك ئەگرێت شێت یاخود رەش هەڵئەگیرسێت ، چونکە خوێن ناجولێت . |
| غەزەل | ئاوریشمی مێل مێلی رەنگاو رەنگە وەك شیرداخ ؛ شیعری دلداری . | لە (غزل)ەوە هاتون کە تەونە . |

| | | |
|---|---|---|
| فاتەبۆرە | جۆرە كاڵەكێـكی پێست رەشە ؛ جۆرە گیـایەكی گەڵاّ پانە وەك كاڵـەك بەرێـكی درێژكۆلەی شیرین ئەگرێت . | لە رەگەزدا یەكن . |
| فت | وشەیەكە لە یاری كلاوێـن دا بەكار ئەهێنرێت وەك : فت ، فت .. دەستە گوڵ ؛ فت كردنی سـەبیل : فڕێدانی توتنـە سوتاوەكەی . | لە رەگەزدا یەكن |
| قاپوت | پاڵتۆ ؛ وەرگرتنی سێ خاڵە لە یاری ئەسكەملدا بە كاغەز ، یەك خاڵ ئۆینە ، دوَ خاڵ مەرزە . | بێگانەن . |
| قاش | قاشی كاڵەك و ترۆزی .. ؛ برۆ ؛ قاشی ئافرەت : حـەز لەیەك كردنیان . | یەكگرتن و جـوت بون یەكیان ئەخات . |
| قاڵب | بەدەن ، وەك : رأس سەرە ، عین چاوە ، بدن قالب ، اسم ناوە[22] ؛ قاڵبی كولیچە و كـاڵ كـاڵی . | قاڵبی بەدەن ئەو ( هیكل )ەیە كە گۆشت و خوێنی نیایە ، لەگـەڵ قاڵبی تردا یـەك ئەگرنەوە . |
| قەبز | توندبون و دەرنەچونی سك ؛ تەنگ ـ كـئیب . | لە ( قبض )ی عەرەبییەوەیە و تەنگی ئەگەیەنێت . |

(22) ئەحمەدی ، شێخ مارفي نۆدێ ، رەواندز ، ١٣٤٥ك ، ل٧ .

| | | |
|---|---|---|
| قۆپیە | کاغەزی کاربۆن ؛ (غش) . | بێگانەن ( Copy ) یەکیان ئەخات . |
| قۆخ | مێوە ؛ کۆخت : کوخ . | رێکەوت . |
| قۆڵ[٢٣] | باڵی مرۆ ؛ ئیشکگر : دوریة ؛ (طرف ، جهة) . | بێگانەن ( تورکیی ) . |
| کار[٢٤] | کار ـ ژۆله ؛ ئیش ؛ تێن . | کاری کارژۆله نەبێت ئەوانی تر بێگانەن ، ( تورکیی ) . |
| کاژ | پێستی مار کە هەڵی ئەدا ؛ داری سنەوبەر . | دارەکەش توێکل هەڵ ئەدات . |
| کاشی | قاپی چێشت : ماعون خزفی ؛ خشت کە تەختی ناو ماڵی پێ فەرش ئەکرێت . | رووە لێکچوەکە یەکیان ئەخات. |
| کناچە | پۆر ؛ کچ . | رەنگ هەیە جوانیی یەکیان بخات . |
| کنر | کنر (کاعوب) : کنر و ماست بۆ وەعدەی خۆی[٢٥] ؛ دەزوو . | رێکەوت . |

(٢٣) سەیری قاموسی تورکیی ئۆکسفۆرد ل ١٩٦ ، بکە .

(٢٤) سەرچاوەی پێشوو .

(٢٥) پەندی پێشینان .

| | | |
|---|---|---|
| کۆ | ئەستێرەی کۆ ؛ کۆی زوخاڵ ؛ کڵۆکۆ ؛ کۆ — کردنەوە : گردکردنەوە . | رێکەوت . |
| کوڵ | کورتە بنە ؛ مریشکی کوڵ : بێ کلك ؛ کوڵ ـ ای چێشت . | رێکەوت . |
| کۆلارە | باڵیندە : کۆلارە ، جوجك مەخۆ بەهارە[٢٦] ؛ کۆلارەی کاغەز کە منـاڵ هەڵی ئەدەن بە ئاسماندا . | یەکن . |
| کوللە | پەردەکوللە ؛ ( جراد ) . | کوللەی پەردەکە نورکییە . |
| کۆم | چەماوە ، قەمتور ؛ ( مخرج ) . | رێکەوت . |
| کۆك | رێك ، تـەواو ؛ کۆك گرتنی جل : دروَمانی ( موقت ) . | یەکن . |
| کتۆڕ | سست بوَنی جەستەی بەدەن ( کتور بوَن ) ؛ شاخی کتوَڕ : سەخت و نارەحەت ؛ چەماوە . | سەرکەوتن بە شاخی سەختدا نوشتانەوە و مانـدو بونی ئەوێت . |
| کیف | بەرگی دەمانچـە و تفەنـگ لە چەرم ؛ کیفی پارە : جزدان ، کیسە . | یەکن . |

(٢٦) قسەی منالاًن .

کەژ    کێو : کەژ و کێو ؛ (فصل) .

کەل    لێو خوراو : کەلەفیچ ؛ لەکەل دەرکەوتی بناسە دەنگم — تۆزی غەریبێ نیشتوە لە رەنگم .    رێکەوت .

کەڵەك    بەردی وشکە سی لەسەریەك ؛ ساختە و لە خشتە بردن ؛ بەلەم : کەڵەکی یاسین ئاغا .    رێکەوت .

کەمەر    ناو قەد ؛ بەرد .    رێکەوت .

کەو    باڵندە : باژە کەو ، نێرەکەو ؛ لە بابەتی هێڵەك ، کونەکانی گەورە ترە .    رێکەوت .

کەوانە    کەمانچە ؛ (زاویة) .

کەوە    بۆر ؛ (دائرة) .

گاز    گاز — گرتن بە دان ؛ گازی بزمار دەرهێنان ؛ گازی پشت ؛ گاز — کردن : بانگ کردن .    رێکەوت .

| | | |
|---|---|---|
| گاڵ | هەرزن ؛ گاڵ — دان : ڕاسپاردن بە هەڕەشەوە ؛ گاڵەگاڵ : دەنگەدەنگ . | گالدان و گالە گاڵ یەکن . |
| گڕ | گڕی ئاگر ؛ مرۆی گڕ : ئەو کەسەیە دانەکانی پێشەوەی گەورە بێت ، گڕخواردن : سوڕانەوە . | ڕێکەوت . |
| گرد | (تل) : گردی مامە یارە(٢٧) ؛ کۆ : کۆمەڵ : (جمع) ؛ گرد — یلە : خڕیلە . | ڕێکەوت . |
| گژ | سەرگژن : قژی ئاڵۆزکاو و دانەهێنراو ؛ زاراوێکە بەرامبەر بە ڕەشە وڵاخی تۆڕ بەکار ئەهێنرێت لەکاتی هەڵتیزاندندا ؛ بە گژدا چوون . | |
| گل | ئێشتی چاو ؛ گلان — گلاندن : کەوتنی وڵاخ و بەربوونەوەی سوار . | |
| گلێنە | دانەوێڵە : ڕەگ بە ڕەگێشە و گلێنە بەبنە تۆو(٢٨) ؛ گلێنەی چاو . | لە یەك ئەچن لە ڕەگەزدا . |

(٢٧) ئەکەوێتە ڕۆژهەلاتی سلێمانی .

(٢٨) پەندی پێشینان .

**گۆ** مـــوروی زەردی گەورە ؛ گۆ ـ ی شەقێن : تەختەیەکی خڕی بچوکە وەك تۆپ لە یاری شەقێندا بەکارئەهێنرێت . — خڕییەکە یەکیان ئەخات .

**گۆت** گۆت بون ، سست بونی جەستە ؛ گۆت ـ لێدان : تەوژم و پاڵ وەك : لە یاری یەکە و گۆتەکە و گوژمی چەرخ و فەلەکدا هەیە . — گۆت بو : لە تەوژم کەوت ، گۆت لێدان : تەوژم دانە .

**گۆشە** لە سەرێن بچوکتر ؛ زاویة : کەوانە . — یەکن .

**گەڕ** نەخۆشێ پێست ؛ گەڕ ـ پێ کردن : بیانو پێ گرتن ؛ کەوتنەوە گەڕ : دەست پێ کردنەوە . — رێکەوت .

**گەلاوێژ** ئەستێرەی گەلاوێژ ؛ مانگی گەلاوێژ : تەموز : تیرماهێ . — ( فلکیات ) یەکیان ئەخات .

**گەمە** یاری ؛ گاڵتەپێ کردن ( استهزاء ) . — یەکن .

**گەنج** پارە و سامان : گەنجی قارونی هەیە ؛ هەرزەکار .

| | | |
|---|---|---|
| لاله | ئاوێزه ؛ لالۆ (خاڵ) . | رێکەوت . |
| لەواشە | کولێرەی تەنك و درێـژ ؛ له واشـەی لـۆزی ولاخ : وەك مەقاش وایه له تەختـە ، لۆزی پێی ئەبەستن له کاتی ناڵ کردندا . | رێکەوت . |
| مانـگ | (قـــمـر) : مانـگ دیاره چ حەوەجەی به ئەموستە[٢٩] ؛ شهر. | (فلكيات) یەکیان ئەخات . |
| مایه | گۆشەیەکە له نان پێوەداندا بەکار ئەهێنرێت ؛ مایه : ماڵ : سەرمایه . | رێکەوت . |
| مژ | تێر ؛ مژ ـ اندن : مژەی سەگ پێش وەڕین . | |
| مرۆ | مرۆڤ ؛ هەرمێ . | گۆڕانی شێوه . |
| مز | حەق : ماف ؛ (رصاص) مز : مامز : ئاسك . | رێکەوت . |
| مق | تاڵێك له قژی سـەری مرۆ ، مۆی بزن ؛ گرێیـەکە وەك دومەڵ له دەست و قاچ دێت . | رێکەوت . |

(٢٩) بەندی پێشبینان .

| | | |
|---|---|---|
| مۆر | (طمغه ، مهر ، ختم) ؛ رەنگی بنەوشەیی . | مۆری (مهر) بە رەنگی مۆر کاغەز مۆر ئەکات (یەکن) . |
| مۆم | (شمعه) ؛ داری ترێ . | گـۆرانی شێوه . |
| ناڵ | ناڵی وڵاخ ؛ ناڵ — اندن ناڵەناڵ . | |
| ناو | (اسـم) : یەك هەر خوادیە ، تاك و تەنهایە ، ناوی ئەڵڵایە(٣٠) ؛ (داخل) ناوئاخن ، ناوجەرگە. | (اسـم)ەکە نەبێت ئەوانی تر یەکن . |
| ناوك | (صرة) ؛ (نواة) . | یەکن . |
| نۆ | ژمارە ، (٩) ؛ نۆ ، نۆ ، نوێ ، نۆبەرە . | رێکەوت . |
| نیشانه | (نوط) ؛ خاڵ بە بەژنی مرۆوە؛ نیشـانە کردن : دیاری کردن وەك نیشانەی بۆك . | یەکن . |
| وار | شوێن : ئەو وارە ، نە ئـەو بەهارە(٣١) ؛ واری قومار : باج سەندن لە یاری کەران . | واری قومار بێگانەیە . |
| واڵا | خۆشك ؛ واڵای منداڵ : ئەو | گۆرانی شێوه . |

(٣٠) فۆلکلۆرە ، لە بێواندا ، لەکاتی سوربوونی خەرماندا ئەوترێ .

(٣١) پەندی پێشینان .

سـەرە پارچانەن لە قوماش کە منداڵ یارییان پێ ئەکەن .

وەجاخ — وەچە، بنەماڵە وەك: وەجاخ زادە بە ئیشارەت، ناوەجاخ بەکوتەك[٣٢]؛ وەجاخی چایخانە: ئەو شوێنەیە کە چای تیا لێ ئەنرێت . — وەجاخی چایخانە بێگانەیە .

هێڵ — خەت ؛ شوێن گاسنی جوتیار لە کاتی جوتدا . — یەکن .

هەڵهاتن — راکردن و خۆدەربازکردن (کلاڤە کردن)؛ هەڵهاتنی هەویر (تخمر) . — گۆڕانی شێوە .

هەڵهێنان — هەڵهێنانی هێلکە : بونی بـە جوجەڵە ؛ هەڵهێنانی مەتـەڵ : دۆزینەوە و زانینی . — یەکن .

هەوا — بـا ؛ هەوای بەرزە : لوتی لە ئاسمانە ؛ هەودا دەزو . — بێگـانەیە .

هەور — (غیم) هەوری پایز خۆری ، دەوڵەمەند ریشی خوی بڕی[٣٣]؛ اسفنج . — (اسفنج) بێگانەیە .

---

(٣٢) پەندی پێشینان .

(٣٣) پەندی پێشینان .

- ملخص المقال -

# بعض المصطلحات الكردية التي لها اكثر من مدلول

العضو المؤازر : جمال بابان

بالرغم من سـعة اللغة الكردية ووفرة مصطلحاتها ، الا انها اطلقت بعض الاسماء على شـيئين ( او اكثر ) كانا متباعدين اصلا او من اصل واحد الا انهما ابتعدا بصورة تدريجية . ولهذه الظواهر اسباب عديدة اهمها :

١ـ عوامل تأريخية : لا يستبعد ان يكون اصل المصطلحات او الكلمات واحداً ثم تشـعب بمرور الايام وتباعدت الفروع عن بعضها .

٢ ـ عامـل الصدفـه : هناك أصطلاح واحد اطلق على مسـميات عديدة عن طريق الصدفة . وقد ثبت كل اسم وتركز واصبح

شيئاً مألوفا ، مثل : ( كەو ) وهو ( طير الككلك ) و ( كەو ) (وهو الشبيه بالمنجل ويستعمل لتنظيف الحبوب من المواد الغريبة) .

٣ — المصطلحات الدخيلة : هناك بعض الكلمات الغريبة دخلت اللغة الكردية وهي كلمات عربية او فارسية او تركية . . فأخذت مكانها واعتاد الناس اســتعمالها وفي عين الوقت توجد نفس الكلمة باللغة الكردية الا ان مدلولها يختلف اختلافاً كـليا عن مدلول الكـلمة الدخيلة مثل ( اذار ) وهو الشـهر الثالث من السنة الشمسية عند العرب وقد حرف الى ( ازار ) باللغة الكردية . وفى نفس الوقت توجد كلمة ( ازار ـ ئازار ) وهي كلمة كردية اصيــلة وتعـنى الالم . وتســمى هـذه الظـاهرة بـــ ( الكلمات المشـتركه لفظاً HOMONYM ) ويقــول الدكتور عبدالرحمن معروف بهذا الصدد : « ان هذه الكلمات لا تدخل في نطاق ( الكلمات المتمدده المعنى ) . صحيح انها كلمات مشتركة عند القراءة والكتابه الا انها مختلفه في التكوين وفي المعنى » . ثم يضرب مثلا لذلك فيقول : « ان كلمة ( باو ) لها معاني عديدة مختلفة كما ان نشـوئها وتكوينها جاء في فترات مختلفة او متباعدة بالرغم من كونها جميعاً كردية أصيلة فـ ( باو ) تعنى ( العادة والعرف والدستور ) وتعنى (باوك ـ الاب) وتعنى ( تفضيل شيء على غيره ) »[1] .

---

(١) راجع البحث الذي قدمه الدكتور عبد الرحمن معروف ( الحلقة الدراسية للكتاب المدرسي باللغه الكردية المنعقدة في شقلاوه ) ، بتاريخ ٢٥ـ٢٧/٧/١٩٧٣ .

٤ – تعدد اللهجات : مثل كلمة (شواشينك) التي هي شجرة دائمة الخضرة واوراقها تشبه الـ (ياس) ويطلق نفس الكلمة في منطقة البهدينان على نوع من العنب وعلى نوع من التين ايضاً . كما ان (چاى) تعنى في اللهجة اللرية (سارد ـ بارد) وفي اماكن اخرى تعني الشـــاي .

هناك اسباب اخرى : فنرى اتحاد بعض المصطلحات عن طريق الاختصار والادغام أو عن طريق تركيب الكمات او . . .

اني في الوقت الذى اجمع فيه المصطلحات من هذا النوع منـذ مـدة غير قصيرة الا انني اعتمـدت هنا الى حـــد بعيد على معجم الخال ومن ثـم على معاجم الشـــيخ معروف القرەداغى والاستاذ توفيق وهبي وادموندس والمردوخ والمرشـــد (رابەر) . . . وتســـهيلا للفهم قمت بشـــرح معاني بعض الكلمات او ضربت لها امثال دارجـة او فولكلوريـة ومن ثـم فأنني تطرقـــت الى تأويل وشـــرح العلاقة بين المدلولات حسب رأي الشـخصي ، فلا يستبعد ان اكـون صائباً او مخطئـاً . وفي الحالـة الاخيرة ارجو العون من القارىء الكريـم وذلك بمساعدتي في التصحيح في الاعداد القادمة خاصة وان هذا البحث هو الاول من نوعه تقريباً .

* * * * * *

# نوسراوەکانی لێرخ لە بارەی کوردەوە

ئەندامی کارا : پرۆفیسۆر قەناتێ کوردۆ*

لە ناوەندی سەدەی نۆزدەهەمدا ئەکادیمیای زانستێ رۆسستان بە وردی لەسەر لێکۆڵینەوەی مێژوو ، ئەتنۆگرافیا ، زمان و

---

* ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری کورد و سەرۆکی بەشی کوردێ لە دەزگای رۆژهەڵاتناسێ لینینگراد پرۆفیسۆر قەناتێ کوردۆ دەمێکە خۆی بە فێربوونی سۆرانییەوە خەریك کردووە و تەنانەت ماوەیەکی تر ئەو فەرهەنگە کوردێ ( سۆرانێ ) ـ رۆسییەی لە ژێر چاودێری ئەودا دانراوە بڵاودەکرێتەوە .

مامۆستا کوردۆ لەم وتارەیدا هەوڵی داوە بە شێوەی سۆرانێ بنوسێ و ئێمەش وەك خۆی دەیخەینە بەر چاوی خوێندەواری بەڕێز . ئەندامی یاریدەری کۆڕ مامۆستا شکور مستەفا شێوەی نوسینی ئەم وتارەی لە لاتینییەوە گۆڕیوە و کورتەی عەرەبییەکەی بۆ نوسیوە .

ـ لیژنەی گۆڤار ـ

ئەدەبیاتی کوردی گەلێك کاری کردووە .

بە ئاریکاری ئەکادیمیای رووسستان گەلێك نوسراوی بەنرخ و گرانبەها لە بابەت نەتەوەی کورد لە چاپ دراون ، مەسەلە ، لەو سەردەمەدا ئەم نوسراوانەی ژێرەوە لە چاپ دراون :

١— لێکۆڵینەوەی پ. لێرخ « لە بارەی کوردەکانی ئێرانەوە » ، کەبریتی یە لە سێ کتێبان .

٢— مێژووی نەتەوەی کورد هی شەرەف خانی بتلیسی بە وەرگەڕاندن ونوسینی مێژوو ـ ئەتنۆگرافی . ئەم کتێبە بە زمانی فرانسزی لە چاپ دراوە .

٣— کۆمەڵەی سەرهات و سەربەوردی کوردی ، کە ئا. د. ژابا لە ئەرزەرۆم کۆی کردبۆوە .

٤— فەرهەنگی کوردی ـ فرانسزی ، ئا. د. ژابا رێکی خستبو .

٥— رێزمانی کوردی ف. یوستی بە زمانی ئەڵمانی نوسیبوی .

٦— کۆمەڵە تێکستێکی کوردی ، کە ئا. سۆسۆن لە تورابدین و بۆتان کۆی کردبۆوە .

پێشکەوتن و بەرزبونەوەی کوردناسی لە پێتەرزبورگ بە زۆری بە ئیشکاری پ ـ لێرخەوە بەسترابو .

پ. لێرخ هەرە گەورەی زانیارانی رووس بو ، کە لە نیوەی

سەدەی ١٩ـدا دەســـتی بە لێکۆڵینەوەی نەتەوەی کورد و زمانی کوردی کرد.

پ. لێرخ لە ساڵی ١٨٢٨ـدا لە دایك بووە، و لە ســـاڵی ١٨٥١ـدا خوێندنی خۆی لە زانینگای پێتێربورگدا تەواوکرد و ناوی پێشەکزانی زمانانی رۆژهەڵاتی وەرگرت.

لە پێشدا پ. لێرخ لە کۆمیتەی ئاکادیمیای ئیمپراتۆری رۆسدا کاری وەرگێڕی و نوسینی پراتۆکۆلی دەکرد. لە پاشان بو بـــە کتێبخانەداری کتێبخانەی رۆژهەڵات لە زانینگای پێتێربورگدا.(١)

لە سەری ساڵی ١٨٥٠ـدا پ. لێرخ دەســـتی بە تۆژینەوەی مەسەلەی کورد کرد بو. بەڵام نەیتوانی هەمیشە خۆی بە تۆژینەوەی کوردانەوە خەریك بکات. لە ناو ساڵانی ١٨٥٨ـ١٨٦٠ـدا لێرخ لە ئەکادیمیای رۆسدا کاری دەکرد. لەو ســەردەمەدا دەبێ بە هاوکاری ئێکسپێدیسی ن. پ. ئیگناتۆڤ و لەگەڵی دەچێ بـــۆ بوخارا و خێو و ئۆرینبورگ. لەم ئێکسپێدیسی‌یەدا مەبەســـتی پ. لێرخ لێکۆڵینەوەی مێژو، ئەتنۆگرافی و زمانی دانیشتوانی ئەو هەرێمانە

(١) ИАЛО,\Фонд Петербургского университета, Формулярный список о службе Лерха.

ئارشیفی مێژو ـ لقی لینینگراد، فۆندی زانکۆی پیتەربورگ، دۆسیەی خزمەتی لێرخ.

بۆ ، هەروەها ژی مەبەستی ئەوەبۆ ، کە شتومەك و دەستنوسەکانی خەڵکی رۆژهەلات کۆبکاتەوە . لە ساڵانی ۱۸٦۷ـ۱۸٦۸دا ئەکادیمیای روس دیسانەوە پ. لێرخی بۆ ئاسیا نارد بۆ دۆزینەوە و پشکنینی ماکەکانی ئارخیۆلۆژی لە شاری خەرابە ، لەبەر دەمی روباری سیر ـ داری .

لە ناو ساڵانی ۱۸٦۹ـ۱۸۷٤ـدا پ. لێرخ بۆ سوید و دانیمارك دەچێ و وتارێك لە کۆنگرەی زانیارانی ناو نەتەوەکاندا بڵاو دەکاتەوە . سەبارەت بە چاکتر بەجێ هێنانی کارسپاردنی دەوڵەت ، کاری لێکۆڵینەوەی مێژو ، ئارخیۆلۆژی ، جیۆگرافی و ئیتنۆگرافی و زمانی نەتەوەکانی ئاسیا ، هەروەها ژی سەبارەت بە لێ تۆژینەوەی کورد و زمانی کوردی ، ئەکادیمیای روسی ناوی شێورداری بە شەرەف و ناوی شێورداری بە کرێکار ددا بە پ. لێرخ لە ساڵی ۱۸۷٦ـدا لە سۆنگەی نەخۆشی یەوە پ. لێرخ دەستی لە کار دەکێشێتەوە و ئازاد دەبێ و دەچێتە ئەڵمانیا . لە ساڵی ۱۸۸٤ ـ دا لێرخ کۆچی دوایی کرد .

سێ کتێبی پ. لێرخ لە بابەت کوردەوە لە ژێر ئەم ناوەدا لە چاپ دراون : « لێکۆڵینەوەیێ لە بابەت کوردەکانی ئێران و باب و باپیرانی کلدەکانی باکور »(۲) . بەلام لە خوێندنەوەی نوسراوەکانی پ.

(۲) П.Лерх, Исследования об иранских курдах и их предках северных халдеях (Пб., кн. I, 1856; кн.II, 1857; кн.III, 1858).

لێرخدا وا دەردەکەوێ کە ئەو هەر بە تەنێ خەریکی پشکنین و لێتوێژینەوەی مێژوو ـ ئێتنۆگرافیی کورد و زمانی کوردیی بووە. لێرخ لە بابەت کاغدانەکانەوە وەك باپیرانی نەتەوەی کورد قەت شتێك نانوسێ.

کتێبەکەی پ. لێرخ بـــریتی‌یە لە پێشـــگۆتن ، لە مێژووی لێکۆڵینەوەی کورد و زمانی کوردیی.

لە پێشگۆتنی خۆیدا ئیسپاتی دەکات ، کە بۆچی پێویستە خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژوو ، ئێتنۆگرافیی و زمانی کوردیی بن. ئـەو یـەك بە یەکی مەعلوماتەکانی هەموو کتێب و مقامەکانی کە لە بابەت کورد و زمانی کوردەوە لە چاپ درابوون عەلام دەکات وخەسـیەتی نەتەوەی کورد ، ژیان ، ئایین و زمانیان دەنوسێ.

لە کتێبی خۆیدا لێرخ ئیسپاتی دەکات ، کە لە نوسراوەکانی ئەو رێـگەرۆکانەی ، کە خەریکی نەتەوەی کورد بوون ، هیچ شتێك بە دروستیی لە بابەت کوردانەوە نەنوسراوە و مەعلوماتەکان بە چاکیی ناهێننە بـەر چاوی خوێنـدەواران . ئەو دەنوسێ : « قەت کەسێك لەو لێـگەرۆکانە ، کە چوبوونە نك کوردان ، بە تەواوی خەریکی لێـکۆڵینـەوەی ژین و ئایینی کورد نەبووە . لە گەلێك نوسراواندا لە بابەت کوردکان قسە دەکەن ، بەلام لە ناو واندا هیچ نوسراوێك

═ پ. لێرخ ، لێـکۆڵینەوە لە بارەی کوردی ئێران و خالدیـکانی باشووری باو و باپیرانیانەوە ، پیتەربورگ : بەشی یەکەم ١٨٥٦ ؛ بەشی دووهـەم ١٨٥٧ ؛ بەشی سێهەم ١٨٥٨ .

نی‌یە ، کە ئێمە بتوانین زانینی چاك و مەعلوماتی تەواو لەبابەت ئەم نەتەوەیەوە وەربگرین »[٣] . لەپاش ئەمە پ . لێرخ دیسان دەنووسێ : « من زانیبتوم ، کە گەلەك لێکەرێ یان لە زوروفی خرابدا بوون ، یان ژی چاکتر حازر نەبوون کە مەعلوماتەکان باش کۆبکەنەوە . جا بە هۆی ئەمە گەلەك شتی نادروست ، چــەوت و چەڵەمەیان لە بابەت کوردانەوە نووسیوە و کوردناسی‌یان خالفاندووە »[٤] .

پ. لێرخ لە نووسراوی خۆیدا هەموو مەعلوماتەکان لە بابەت ســەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەی ئێتنۆگرافیی کورد و لەمەڕ قەبیـل و عەشـیرەتەکانی کورد بە وردی دەنووسێ . پ. لێرخ لەمەڕ ئـەم کارەی خۆوە دەنووسێ : « وردە ـ وردە نووسینەوەی ناڤ و نیشانی قەبیل و عەشیرەتەکانی کورد رێگای ئاریکاریی خۆش دەکات بۆ ئاسان کردنی لە چاپ دانی مێژووی کورد ( هی شەرەف خان ـ ك ـ ك . ) و بۆ رێکەرۆکان ، کو دوازۆژ خەریکی کۆم کردنەوەی مەعلوماتەکانی ئێتنۆگرافیی بین و دەیانەوێ کتیبێکی راست و دروسـت لە بابەت کوردان بنووسن » . لەگەڵ ئەمەشدا پ . لێرخ لەســەر ئەو بڕوایەیە ، کە وردە ـ وردە نووسینی ناڤ و نیشـــانی قەبیـــل و عەشیرەتەکانی کورد تەواو نی‌یە و بە تەواوەتی نەنووسراوە .

لە ٢٣ ی مانگی کانوونی یەکەمی سالی ١٨٥٦ ـ دا لە رۆژنامەی

(٣) هەمان سەرچاوە ، بەشی یەکەم ، ل ٢٣ .

(٤) هەمان سەرچاوە ، بەشی دووەم ، ل ٦ ـ ٧ .

« سێڤیرنایا پچیلا » ی روَسیدا وتارێکی ك . مێکێشین بە ناونیشانی « کوردی ف سمۆلینسکۆی گۆبێرنی » لە چاپ درابو ، دە وتارەکەیدا نوسیبوی ، کو لە هەرێمی سمۆلێنسکی کوردە دیلەکانی عەسکەری هەنە ، دیارە کە لە ناف سالانی ١٨٥٠ ـ ١٨٥٣ ـ دا شەڕی روَس و ترك بو . ئەم کوردانە لەگەڵ عەسکەری ترك بون و لە کاتی شەڕدا لە لایەن عەسکەری روَسەوە بە دیل گیرابون و ناردرابونە شاری روسلاڤل . ئەو کاتە گەورە زانیارانی روَس لە ناف خۆدا بڕیاریان دا کو داوا لە ئەکادیمیای روَس بکەن کە کەسێکی زانیار بنێرێتە شاری روسلاڤل بۆ لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی .
لە نامەی خۆدا بۆ سکرتێری ئەکادێمیای روَس ، روژهەلاتناسە ئەکادیمیکیەکان دۆرن ، بیەتلینگ ، بروَس ، کۆنیك و کەپپین نوسییان کە لێرخ بنێرنە شاری روسلاڤل ، نك کوردە دیلەکانی عەسکەری بۆ لێتۆژینەوەی زمانی کوردی ئەوان لە نامەی خۆیاندا لەمەڕ لێرخیان نوسیوە : « لێکۆڵینەوەی نەتەوەی کورد لە لایەن زمانەڤانیەوە هەر بە تەنێ ئێستا دەستی پێکراوە . بەڵام گومان و شك لەوەدا نیە کو زمانی کوردی دەتوانێ ببێتە کانگایەکی مەزن بۆ لێکۆڵینەوەی جیاواز — جیاوازی زمانی ئێرانی ، کە تائێستا مێژوَیان نەپشکنراوە . هەتا ئێستا گەلەك لە رێگەڕۆکان کە چوبونە نك کوردەکان چاك حازر نەبون بۆ لێتۆژینەوە و لێگەڕان و پشکنینی زمانی کوردی . جا بۆ ئەم کارە ئێمە ئاغا لێرخمان هەڵبژارد

چونکی ئەو یەکەم پیـــاوی ئەوروپایە کو بەرەپێشین لە لایەن جیۆگرافیی ، ئێتنۆگرافیی زمـــانەوانیی و مێژوویی‌یەوە بۆ بە ناسی خەڵـکی کورد . بۆ ئەم کارەش ئەو سوودی لە رووسەکان وەرگرتووە ، هەموو لێـکۆڵینەوەیەکی لە چاپ داروی لەمەڕ زاراڤەکانی کوردی‌یەوە خوێندۆتەوە و سوودی لێ وەرگرتوون ، بە تایبەتی لێرخ بۆ بە ناسی مەزموونی مێژوویی کورد هی شـەرەف خان ، کو بە زمانی فارسی لە سەدەی ١٦ ـ دا نووسیویە . پ. لێرخ هەر وەها ژی بۆ بەناسی سەرچاڤەکانی تر »(٥) .

لەسەر بناخەی دوایی زانیارەکانی ناڤبراو ئەکادیمیای رووس پ. لێرخی نارده شاری روسلاڤل . لێرخ دەوری سێ مانـگێك لە ناڤ کوردە دیلەکاندا مایەوە ، ئەم کوردانە لە هەرێمەکانی ماردین ، جزیر ، دێرسیم ، مووش ، دیاربەکر ، ئورفە ، بیردچك ، بیگنسی ، مالاتی ، مادین ، عەرەبکەر و ئەرزەرۆم بوون و هەموو ٥٠ کەس بوون .

لێرخ بە ئاریکاری ئەم کەسانە چاك فێری زمانی کوردی دەبێ و تێکستەکانی زاراڤەکانی کورمانجی و زازا دەنووسـێتەوە و ماتریالی ژین و ئایینی کورد کۆم دەکاتەوە . هـــەموو ماتریالی زمانەڤـانیی و

---

(٥) Архив Академии Наук СССР, ф.2, оп.I4.
ئارشـیفی کۆڕی زانیاری یەکیەتی سـۆڤیێت ، فۆندی ـ ٢ ـ ، لیستەی ١٤ .

ئێتنۆگرافی‌یەك ، کە لێرخ نك ئـەم کوردانەی کۆم کردبۆوە و هـەروەها ژی ئـەو مەعلومانە زێـدانەی کە لە نوسـراوی زانیارەکانی رۆس و ئەوروپایی وەرگرتبون ، لە کتێبەکانی دووەم و سێیەمی‌دا لە چاپ دراون .

لە گوتاری خۆدا ، کو لە کتێبی دواییدا لە چاپ دراوە ، لێرخ لەمەڕ کاری خۆوە لە شاری روسلاڤل‌دا وردە ـ وردە مێژوی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی ئەعلام دەکات و بە زانستی خۆرو و خوسوسی زمانی کوردی دەنوسێ و بیر و رای خۆی دەرهەق پەشکنینی زمانی کوردی و زاراڤەکانی بەرپێشی دەکات . ئـەو دەنوسـێ : « ئەو رێگەزانەی کو لە ناف کوردەکاندا مابونەوە ، بە وردی لەسـەر زمانی کوردی کاریان نەکردبو زۆربەیان نەیان وسـتبو چاکتر خەریکی ئـەم زمانە بن . ئەو کەسانەی ، کو بون بە ناسی کوردەکان ، هەر بە تەنێ خەریکی یەك زاراڤەی کوردی بون ، دوایی زمانەڤانی یانیش نەزانیبو »[٦] .

لە مێژوی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردیدا ئاشـکرا و رونە کە چەند کەسێك لە پێش لێرخ خەریکی زمانی کوردی ببون . ئەو کەسانەش ئەمانەن :

م. کلا پروت ، لە تفلیس سـێ سەد وشەی هەرێمی موشـی نوسیبو ؛

ریچ دوسەد وشەی چوار زاراڤەی کوردی کـۆم کردبۆوە ؛

(٦) ب. لێرخ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەشی یەکەم ، ل ٣٤ .

ئەولیا چەلەبێ ناوی پازدە زاراڤەی کوردێ نوسیبوَ ؛
ی. بێرێزین ماکێ دوَ زاراڤەی کوردێ لە چاپ دابوَ ؛
زانیاری ئەڵمانێ هۆرنلی خۆی لەمەڕ دابەشکردنی زاراڤەکانی کوردێ یەوە لە چاپ دابوَ .

پ. لێرخ لە بابەت نوسراوێ ئەم ڕێگەڕۆك و زانیارانەوە دەنوسێ :
« ئەم کەسە ناڤبراڤانە کو لەسەر چەند لاپەڕێك شرۆکردنی فۆرمی ڕێزمانی کوردییان نوسیبوَ . بە قوَڵ و وردێ خەریکی لێتۆژینەوەی زمانی کوردێ نەبوَن ، ماتریالیان بەشی نەکردووە و بۆ لە بار ترێن لێکۆڵینەوەی ئەم زمانە گران بووە لە لایان ، چەند مەسەلێك وەرگرن و بۆ ئەم کارە زانەستییە شێ بکەنەوە . بێجگە لەمە ئاشکرایە کو تا ئێستا فۆنێتیکی زمانی کوردێ نەپشکنراوە و گەلێك فۆرمی ئەم زمانە نە عەیان و نادیار ماونەوە ئەوانی ترژی ساف و روَن نەکروانەوە »[۷] .

پ. لێرخ لەسەر بناخەی نوسراوەکانی کوردناسان و هەروەها ژی لەسەر بناخەی لێکۆڵینەوەی خۆی زمانی کوردێ دابەش دەکاتە سەر پێنج زاراڤان :

۱ ـ کورمانجێ ؛
۲ ـ لوڕێ ؛
۳ ـ کەلهوڕێ ؛

(۷) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوەم ، ل ۱۹ .

٤ ـ گۆرانی ؛
٥ ـ زازا .

پ . لێرخ هەر بە تەنێ توانیبوی ببێ بە ناسی زاراڤەکانی کورمانجی و زازا ، ئەو بە وردی موژولی زاراڤەی کورمانجی دەبێ . لە بابەت زاراڤەی کورمانجی‌یەوە دەنوسێ : « کورمانجی لە هەمو ولاتانی کوردستانی رۆژئاڤادا پەرەساندراوە ، لە موسلەوە هەتا ئاسیای پچوك و سلێمانی . لە ناڤبەینی قەبیلەکانی کورمانجی باکوردا و کورمانجی خوارۆی روباری فوراتدا جیاوازی وشە و جیاوازی گوتو ـ بێژ و جیاوازی فۆرمی رێزمانی هەیە . بەلام ئەم جیاوازی‌یانە ئەوەندە گەورە نین کو قەبیلانی جیاواز یەکتر تێ نەگەیێن و یەکتر فام نەکەن »[٨] .

لە بابەت زازا وە پ. لێرخ دەنوسێ : « لە بەراوردکردنی زازا وکورمانجیدا گەلەك خوسوسی و خۆرویی زازا دەهێنە بەر چاڤان . لە زازادا خوسوسی‌یەتی سەوتەکان و وشەکان لە هی کورمانجی جیاوازترن . لە سۆنگەی ئەمە رەنگە پێویست بێ ناوەکی دی لە زازا بنێین و بە زاراڤەکی ئێرانی سەربەخۆی حەساب بکەین . کوردی کورمانج زاراڤەی زازا تێ ناگەیێن و فام ناکەن بەلام زازا زاراڤەی کورمانجی دەزانن و قسەشی پێ دەکەن »[٩] . کاتی خۆی زانیاری

(٨) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوەهەم ، ل ٢٢ .

(٩) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوەهەم ، ل ٢٠ .

ئەڵمانی پرۆف - پۆت لەمەڕ زمانی کوردی‌یەوە نوسیبوی کو زمانی کوردی زمانەکی ئێرانی سەربەخۆیە قانونی خۆ و ڕێزمانی خۆی هەیە . پ. لێرخ ئەو بیر و رایەی پۆت قوبوڵ دەکات و دەنوسێ : «لەسەر بناخەی ئەو ماکانەی من هەمە هیچ شتێکم بە دەستەوە نی‌یە کو ئەز لەسەر بیر و رای پرۆف - پۆت نەمێنم . پرۆف - پۆت گەلەك جار گوتیە و ئیسپاتیشی کردووە کو لە ناڤ زمانەکانی ئێرانیدا زمانی کوردی جێگای سەربەخۆی گرتووە و لە ناڤەندی کوردستاندا سەربەخۆیی خۆی پاراستووە ، ئەو نێزیکترین خزمی زمانی فارسی‌یە ، بەڵام بەبێ زمانی فارسی پێشکەوتووە » . « وشەی بیانی‌یان ، کو دەناڤ زمانی کوردی کەتنە ، هیچ گرینگ نی‌یە و نەشبووە و قەت تەئسیرێکیان لەسەر سازمانی دەرونی زمانی کوردی نەکردووە »(10) .

پ. لێرخ فیکری خۆی لە بابەت سۆنگەی جیاوازی زمانی کوردی و زمانی فارسی‌یەوە دەبێژێ و ئەو دەنوسێ : « جیاوازی زمانی کوردی و زمانی فارسی ئەوە بو کە کوردەکان گەلەك جار لە قەدیمدا لە قەبیلەکانی ئێرانی جودا بونە »(11) . لێرخ ئەمە بە هۆی خوسوسی‌یەتی فۆنێتیك و ڕێزمانی کوردی‌یەوە ئیسپات دەکات . لە کاتی خۆیدا روهەڵاتناسی روس بێرێزین خەریکی زمانی کوردی

(10) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوهەم ، ل ٣٢ .

(11) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوهەم ، ل ٣٢ .

دەبوَ . ئەو لە نوسراوەکانی خۆدا لەمەڕ کوردی خۆراسان و زاراڤەی کوردی هەرێمی موسلەوە فۆرمی زمانی کوردیی شرۆ دەکرد وەکو یەکێك بێ لە فۆرمەکانی زمانی فارسی و بە بێ بناخە زمانی کوردیی وەکو زراڤەکی فارسی لە قەلەم دەدا . لەبەر ئەمە پ. لێرخ لامەی بێرێزین دەکات و دەبێژێ چۆن پێویستە خەریکی لێکۆلینەوەی زمانی کوردیی بین . ئەو دەنوسێ : «کاتێ کو زمانەڤانیی ئێران گەهیشت بە چاکترین بەراوردکردنی سازمانی رێزمانی و پێکهێنانی وشەکانی هەمو زمانەکانی ئێرانی جیاواز ـ جیاواز ، ئەو کاتە مومکین دەبێت باسی بەستن وگرێدانی زمانی کوردیی و زمانی فارسیی بکەین و لەمەڕیان بنوَسین »[۱۲] .

لە جێگەیەکی تردا پ. لێرخ دیسان دەنوسێ : «هەتا کو زمانی کوردیی و زاراڤەکانی لە هەمو لایەکەوە لێ نەتۆژێنرێنەوە نابێ زمانی کوردیی بەرامبەر بە زمانێکی تر رابگرین» ، «ئێستا هیچ مومکین نییە رێزمان و لێکسیکی زمانی کوردیی بەراورد بە زمانی ئێرانیی بکەین ، هەر بە تەنێ پێویستە دەست پێبکەین و خەریکی زاراڤەکانی جیاواز — جیاوازی کوردی ببین و وردە — وردە مانی یێ هەمو فۆرمی ، فۆنێتیکی و لێکسیکی بپشکنین ، ساف و رۆنی بکەینەوە و شرۆی بکەین ، چونکی هەتا ئێستا ئەم پرۆبلانە بەجێ نەهێنراون ، هەر وەها ژی پێویستە بە وردیی سەرچاڤەکانی

(۱۲) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوهەم ، ل ۲۲ ـ ۲۳ .

لەمەڕ مێژوی کوردان بکۆڵینەوە و بتۆژینەوە .

جا هەر لە پاش بەجێ هێنـــانی ئەم داوا و خوازانە دەگاتە هەرە پوختـەی بەرهەمان لەمەڕ لێ‌تۆژینەوەی مێژوی کورد و زمانی کوردی‌یەوە »[13] .

پ. لێرخ لە کتێبی دووەمیـــدا تێکستی کوردی لـــە چاپ داوە . ئەم تێکستانە لە ئەرزەرۆم و تەورێزەوە ناردرابون و هەموی لە زمانی تورکی و فارسییەوە وەرگیرابون . لە ســەرەتای نوسراوەی خۆیدا لێرخ دەنوسێ ، کو ئەو : « ویستی لە پێشدا تێکستە کوردییەکان بە پێی ئەلفبای ئۆسێتی ــ روسی بنوسێتەوە » . ئەو دەڵێ « من دەگونجا ســەوتەکانی زمانی کوردی بە هۆی نوسین نیشـــانە بکەم ، بۆ ئەمە دەبا من ئەو ئەلفبایەی کە ئاکادێمیك ( شێگرێنی ) خوالێ‌خۆشبو بۆ زمانی ئۆسێتانی لەسەر بناخەی ئەلفبای روسی پێکی هێنابو بە کاری بهێنم ، من ئەلفباکەی شێگرێنی ــ م ، ئەوەی بۆ ئۆسێتی ــ روسی دای‌هێنابو ، هەڵ بژارد ، چونــکی بە هۆی ئەلفبای عەرەبی ــ فارسی ، کو ئێستا کوردە خوێندەوارەکان بە کاری دەهێنن ، مومکین نییە ســـەوتەکانی زمانی کوردی نیشانە بکەین . لە زمانی کوردیدا هەندێك سەوت هەنە ، کو بە هۆی ئەم ئەلفبایەوە قورسە ئەوانە نیشانە بکەین »[14] . بەڵام کاتێ لێرخ ئەم

(١٣) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوهەم ، ل ٢٠ .

(١٤) = « Bulletin de la classe des sciences historques de

بیر و رایەی خۆی لە جڤاتی زانیاراندا دەربڕی ، جڤاتی زانیارانی مێژوویی - فیلۆلۆژی ئەمـــەی قوبوڵ نەکرد و بیر و رایـەکی تری دەرهێنا .

دەو بیر و رایەدا نوسرابو : « پـێویست نییە ئەلفبایەکی نوێ بەکار بهێنین ، چەوت و چەڵەمەی تـازە بۆ فیلۆلۆژی پەیدا مەکەن . بۆ زمانی کوردی چاکترین ئەلفبای زمانەڤانی باشە ، خاسما ئەو ئەلفبایەی ، کو لە لایەن ئاکادێمیکی بەرلین پرۆف . لێپسیوسـەوە تەرتیب کراوە »[15] .

لەســـەر بناخەی بڕیاری تیۆری زانیارەکان ، لێرخ تێـکستە کوردییەکانی بە هۆی ئەلفباکەی لێپسیوسەوە لە چاپ دا .

ئاشکرا و روونە ، کو لێپسیوس سەوتەکانی دەنـگانی و بێ دەنـگانی بە گوێرەی زمانەکانی ئەورووپای رۆژئاوا پێك هێنـــابو و خۆرویی زمانانی خەڵـکی رۆهلاتی تێدا نیشان نەکردبو ، لە ئەلفبای ویدا سـەوتەکانی دەنـگانی دابەشـکرابۆوە سەر سەوتەکانی کورت (a ، e ، e ، i ، i ، o ، o ، y ، y) و سەوتەکانی درێژ (ù ، ī ، è ، é ، á ) ، سـەوتەکانی بێ دەنـگانی دابەشکرابونە سەر ئەم کۆمەڵانە : سەوتەکانی گەورنـگێ ( h ، h ) ، سەوتەکانی سەر زمانی (m ، n ،

=l'Académie Impèriale des sciences de St - Petersburg »,
V. xiv, No 15 .

(۱۵) Ibid, Vol xiv, No. 15 .

سەوتەکانی ناف زمان و ددان ( q ، k ، k ، g ، g ) ، ( d ، t ، n ) ، سەوتەکانی دەنتالی (d ، s ، z ، r ، l ، ȿ ، d ، h ، d) ، سەوتەکانی لێف ( m ، f ، v ، w ) .

هەڵبەت ئەم نەخشەی ئەلفبایە بە پراکتیکی گونجاوی سیستەمی سەوتەکانی زمانی کوردێ نەدەبۆ ، پرنسیپی دابەشکردنی سەوتەکان ژی بە قانونی زانستێ پێك نەهێنابۆ .

ئاشکرایە کو لە زمانێ کوردیدا سەوتەکانی دەنگانی درێژ و کورت وەکو فۆنێم نین ، درێژێ و کورتێ سەوتان لە زمانی کوردیدا هەر بە تەنێ نیسبەتی موزیکی گرینگە . جگە لەمە هەر سەوتە دەنگانییەکانی a ، e ، î ، o ، û بە درێژ و کورت بە کار دەهێنین . لە کۆمەڵەی سەوتەکانی بێ دەنگانیدا لێرخ سەوتی u و سەوتەکانی p' ، t' و سەوتەکانی p ، t بە نیشـانەی تایبەتی جودا نەکردوونەوە ، نیشانەکانە g' ، d' ، n' ، کو لە کۆمەڵەی سەوتەکانی بێ دەنگانیدا هەن ، زێدەنە ، چونکی لە کورمانجێ و زازادا سەوتی گونجاوی وان نین .

کافکاززانی روس ل. زاگورسکی ، کو تێبینی خۆی لەمەڕ ئەو تێکستە کوردییانەوەی ، کو س. ئەگیازارۆڤ ئامادەی کردبون لە چاپ بدرێ ، دەرهەق ئەلفباکەی لێپسیوس دەنوسێ : « ئێمە گەلێك قەدر و نرخی ئەلفبای لێپسیوس ستاندارێ دەزانین ، بەلام نازانین ئایا ئەم ئەلفبایە دەتوانێ هەمو سەوتەکانی تەعیین بکات ؟

تەرتیبکارانی ئەم ئەلفبایە زانیارە ئەڵمان و ئینگلیسەکان بوون ، ئەوان ئەلفبایان بە گوێرەی زمانی ئەڵمانی و ئینگلیسی پێـــك هێنابو ، سەبارەت بەمە پ. لێرخ چەوت و چەڵەیەکی زۆری وە شاقەل گیر بىو و ناچار بو لە ناف سەوتەکانی ئەڵمانی و ئینگلیسی دا سەوتەکانی زمانی کوردی بدۆزێتەوە ، لە ســـۆنگەی ئەمە ئەو نەیتوانی بو سەوتەکانی خۆروی کوردی نیشان بکات »[١٦].

سەرۆکی مۆزەخانەی ئاسیا ئاکادێمیك دۆرن لە نوسراوەکەی خۆیدا لەمەڕ تێکسـتی کوردییەوە ، کە لـــە زاراڤەی کوردە دێلە عەسکەرییەکانەوە نوسرابون ، دەنوسێ : « من بە وردی لە تێکستە کوردییەکانم نوازی و هاتمە سەر ئەو بیر و رایە ، کە چاکترین لێ تۆژینەوەیە کە ، یارمەتی ئاغا لێرخ بدات ، کو رێزمانی کوردی و تێکستی خوێندن و فەرهەنگی پێ بنوســێتەوە . ئەگەر ئەو کاری خۆی بە جێ بهێنابا ئەم نوسراوانە بۆ دوارۆژ دەبونە چاکترین ماکی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی » .[١٧]

(١٦) Л.Загурский, Кавказские алфавиты ("Известия Кавказского отдела Императорского русского географического общества", т.IX, вып.2, 1888, Приложение, стр.15).

ل. زاگورسکی ، ئەلف وبێ قەفقاسییەکان ، « هەواڵەکانی لقی قەفقاسیای کۆمەڵی جوگرافی روسی ئیمپراتۆری » ، بەشی ـ ٩ ـ ، ژمارە ـ ٢ ـ ، ١٨٨٨ ( پاشکۆ ) ، ل ١٥ .

(١٧) پ. لێرخ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەشی دوەەم ، ل ٢ .

کتێبی سێیەمی پ. لێرخ بریتییە لە سەرەتا ، لە وتارێکی مێژوویی - ئەدەبیاتی ، لـە فەرهەنگۆکانی زاراڤەکانی کورمانجی و زازا . لێرخ زوربەی ئەم فەرهەنگۆکانەی لەسەر بناخەی ئەو تێکستە کوردییانە پێك هێنا بو ، کە لە روسلاڤل لـــە زاری کوردە دیلە سەربازەکانەوەی نوسیبونەوە . لە پێکهێنانی ئـەم فەرهەنگۆکانەدا لێرخ لـە هەندێ جێگا وشە کوردییەکان دەگەڵ وشـــەی زمانە ئێرانییەکانی دیکەدا بەراورد دەکات ، بۆ ئـەوەی مێژوی پەیدابونی وشە کوردییەکان نیشان بکات .

لە بەرایی کتێبەکەی خۆیدا لێرخ لەمەڕ مێژوی لێتۆژینەوەی زمانی کوردییەوە دەنوسێ : « لە پێش چونمدا بۆ نك کوردە دیـلە سەربازەکان ، من هەمـــو سەرچاوەکانی لەمەڕ زمانی کوردی - م دۆزییەوە و نواڕیمن . ئەوانە گشت بریتی بون لە کۆمەڵەیەك وشەی کوردی کە زوربەیان راســت و دروست نەنوســرابــون . سۆنگەی ئەمەش ئەوە بو ، هەندێك زانیار کە مـێژوی زمانەکانی ئێرانیان دەزانی ، من نەم توانی سودیان لێ وەربگرم . لەم ســـەرچاوانەدا هیچ تێکستێکی راست و دروست بۆ لێتۆژینەوەی زمانی کـوردی نەبـــو . سـەبارەت بەمە من ناچار بوم تێکستی نوێ وەچەنـگ بێنم » .

لێرخ لەو بڕوایەدا بو ، کە ئەو ماکانەی خۆی کۆی کردبونەوە کەمن و نابنە بناخە بۆ مێژوی شرۆکردنی پێوەندی زمانی کوردی و زمانە ئێرانییەکانی تـــر ، چـــونکە ماکێکی زۆری پێدەوێ بۆ

وردکردنەوەی رێزمان و وشەکان[18] .

پ. لێرخ لەکاتی لە چاپدانی هەرسێ کتێبەکانیدا ، بە زمانی ئەڵمانی دوَ کتێبی بەناوی « Forschungen ulier die Kurolennordchal den » لە چاپدا .[19]

پێویستە وە بیری بێنینەوە ، کە پ. لێرخ لە پێشدا نوسراوەکانی بە زمانی روَسی دانا بوَ « ئیسلێدوَڤانیا ئوَب ئیرانسکیخ کورداخ ئی ئیخ پریدکاخ سێڤیرنیخ خالدیاخ » واتە : « لێکوَڵینەوەیەك لە بابەت کوردان و باب و باپیرانی کلدەکانی ئێرانی باکوور » . ئەوەشت لە بیرنەچێ کە ناوی نوسراوەکەی لێرخ بە زمانی ئەڵمانی جیاوازە لەگەڵ روسییەکەی . ئەمەش وێ دەچێ کە لێرخ لە بیر و راکانی لەمەڕ پەیدابوَنی نەتەوەی کورد لە کلدەکانی باکوورەوە پاشگەز بوَبێتەوە و نەینوَسی بێ . رەنگە هەر بوَیەش بێ کە یەکەم کتێبی وەرنەگەڕاندە سەر زمانی ئەڵمانی . چونکی ئەو لەم کتێبەی دا بیر و رای خوَی لە بابەت رەسەنی کورد لە کلدانەکانی ئێرانی باکوورە وە نوسیبوَ .

جگە لەم نوسراوانە پ. لێرخ چەند نوسراوێکی دیکەی لەمەڕ ئەدەبیاتی کوردەوە بە جیاواز لە چاپ دابوَ ، مەسەلەن ،

(١٨) هەمان سەرچاوە ، بەشی دوَهەم ، ل ١ ــ ٤ .

(١٩) P. Lerch, Bericht über « Notices sur la littérature et les kourdes, fait par jaba » ( Mélange asiatique, t. III,=

نوسراوێك بە ناوی « بیر و رایێ » لەمەڕ نوسراوی ئا. د ژاباوە دەربارەی ئەدەبیاتی کوردێ و عەشیرەتەکانی کوردی نوسیبو[٢٠] .
هەروەها ژی « بیر و رایێ » لەمەڕ بەرهەمەکانی ئەحمەدی خانێ ، « مەم‌وزین » وەی نوسیبو کە لە لایەن ئا. د. ژاباوە ، لە سالی ١٨٥٨ — دا کتێبخانەی نەتەوەیێ روس کە بە ناوی سالتیکۆف — شێدرین — ەوە بو لە لێرخی خواستبۆوە ، کە فیکری خۆی لەمەڕ فەرهەنگەکانی ئا. د. ژابا هی کوردێ — فرانسزێ و فرانسزێ — روسێ — کوردییەوە و کۆلێکسی دەستنوسەکانی بنوسێ .

پ. لێرخ بۆ کتێبەکانی نەتەوەی روس هی پێتێربورگ دەنوسێ ، کو پێویستە ئەو دەستنوسانەی کە ئا. د. ژابا ناردبونی هەموی بە دەست بهێنن ، « چونکی ئەوانە زۆر بە نرخن ، و شایەتێ بۆ دەوڵەمەندێ ئەدەبیاتی کوردێ دەدەن » .
هەروەها ژی لێرخ بۆ ئاکادیمیای روسێ نوسیبو ، کە پێویستە فەرهەنگەکانی ئا. د. ژابا لەگەڵ دەستنوسەکانی لە چاپ بدەن .

=1858 ); P. Lerch, Bericht über « Resumè de l'ouvrage kourde d' Ahmed Efendi khan, fait et traduit par A. Jaba ( ibid ) .

(٢٠) P. Lerch, Bericht über « Notices sur la littérature et les kourdes, fait par Jaba » ( Mélange asiatique, t III, 1858 ) .

بە ئاریکاری پ. لێرخ ئەکادیمیای رۆسی ئەم دەستنوسانەی لە چاپدا . جگە لەم ئیش و کارانە پ. لێرخ خەریکی نوسینی رێزمانی کوردی بو . ئێستا دو دەستنوسی رێزمانی کوردی لێرخ هەنە . یەکێکیان لە کتێبخانەی ئینیستیوتی رۆژهەلاتناسی لێنینگرادە و یەك ژی لە کتێبخانەی زانینگای لێنینگرادە . ئەم دەستنوسانە وا نیشان دەدەن ، کو پ. لێرخ ویستی رێزمانێکی کوردی گەورە لە بابەت فۆنێتیك و مۆرفۆلۆژی زمانی کوردییەوە بنوسێ . پ. لێرخ لە نامەی خۆیدا کە بۆ بەشی مێژوی — فیلۆلۆژی ئاکادیمیای رۆسی نوسیوە ، دەلێ : « لە سالی ١٨٥٦ ـ دا من لە لێکۆلینەوەی خۆمدا دەستم بە نوسینی رێزمانی کوردی کرد . هێشتا ئەم کارەم تەواو نەکردووە . لە جڤاتی زانیاران ئیلتماس دەکەم کە بڕیاری خۆی دەربهێنێ و ئاریکاری من بکات . کە بەلکو لە مانگی فێڤرالدا دەستی پێ بکەم و ئەم نوسینە تەواو بکەم و لە چاپی بدەم لە پاش راوەستانی لە چاپ دانی ئەم نوسراوە ، من گەلێك جار لەسەر راستکردنەوە و زێدەکردنی نوسراوەکەی خۆم کارم کردووە[٢١] .

دەستنوسی رێزمانەکەی پ. لێرخ بریتییە لە بەراییەکی

(٢١) P. Lerch, Forschungen über die Kourden, Abt. III ( بڕوانە : ئارشیڤی دەزگای رۆژهەلاتناسی کۆڕی زانیاری یەکیەتی سۆڤیێت ، فۆندی ٣٦ ) .

کورت لە بابەت مێژووی لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی . لەم بەراییەدا ، ئەو لە بابەت ئەو داستانە کوردییانەوەی ، کە ئا. د. ژابا نووسیونی ، دەنووسێ و هەروەها ژی لەمەڕ نووسراوەکەی ئا. خۆدزکۆوە دەڵێ : « زاراڤەی کوردی سلێمانی »[٢٢] . و بیر و رای خۆی دەردەبڕێ .

لەپاش ئەمە لێرخ دەنووسێ ، بە چ رەنگێ پێویستە فاکت و ماکی رێزمانی کوردی کۆبکەینەوە و بینووسین .

لەم دەستنووسەی پ. لێرخدا چەند گۆرانییەکی کوردی ژی نووسراون ، و بە نموونەی فۆلکلۆری کوردی ، کە لە زاراوی کوردە دیلە سەربازەکانەوەی وەرگرتبوون دەژمێردرێ .

لەپاش ئەمە پ. لێرخ لەمەڕ سیستەمی سەوتەکانی دەنگانی و سەوتەکانی بێ دەنگانی زمانی کوردییەوە دەست پێدەکات کە لەسەر بناخەی ئەلفباکەی لێپسیوس داینابوو و وردە ـ وردە مناسبەتی سەوتەکانی زاراڤەکانی کوردی (کورمانجی ، زازا ، سلێمانی ، ئامێدی و خێردۆستی) دەپشکنێ و پێوەندی سەوتەکانی ئەم زاراڤانە و زمانەکانی ئێرانی نیشان دەکات ، هەروەها ژی گۆڕینی سەوتان لە زمانی کوردیدا دەهێنیتە بەرچاڤان .

ئەم بەشە نووسراوەی پ. لێرخ بە نووسینی « مناسبەتی سەوتەکان لە رەگی وشاندا » تەواو دەبێت .

لە دوای ئەمە لێرخ ویستی لەمەڕ سازمانی رێزمانی کوردییەوە بنووسێ . سەبارەت بەمە ئەو گەلەك وەخت کاری کۆکردنەوەی ماتریاڵ

(٢٢) هەمان سەرچاوە .

و تەرتیب‌کردن و ئامادەکردنی نوسراوی رێزمانی کوردی کرد ، ویستی بە تەواوەتی لە هەموو لاوە ماتریاڵ بکۆڵێتەوە و سود لە بەرهەمەکانی بەرامبەرکردنی زمانەکانی ئێرانی وەربگرێ و لە پاش ئەمە ئەنجا نوسراوەکەی خۆی لەمەڕ مۆرفۆلۆژی زمانی کوردییەوە لەچاپ بدا .

لە نامەی خۆدا لەمەڕ ئەمەوە پ. لێرخ بۆ جڤاتی زانیاران دەنوسێ : « لەپێشدا بەرنامەی رێزمانی من هی پراکتیکی و زانستییە ، من لە نوسینی خۆمدا ناچار بوم خەریکی هەموو ماتریالەکانی پێشکەوتنی فۆرمەکانی تاریخی زمان ببم و حەسابی لێکۆلینەوەی بەراوردکردنی ماتریاڵەکانی زمانەکانی ئەفغانی و مازەندەرانی ببینم ؛ چونکی لەم زمانانەدا گەلەك مەسەلەی وەك مەسەلەی زمانی کوردی هەنە »[٢٣] .

لەپاش ئەمە لێرخ دەنوسێ ، کو لە ناڤ سالانی پاشندا ئەو لەسەر پناخەی تێکستەکانی ئا. د. ژابا زانینی خۆی لەمەڕ زمانی کوردی فرانسزییەوە دەربڕیوە . پ. لێرخ لە دەستنوسی دووەمیدا ، کو لە کتێبخانەی زانینگای لێنینگراد دایە و بریتییە لە چەند دەفتەرێك و بەزمانی ئەڵمانی نوسراوە « Kurdische grammatik » ، لە لاپەڕەکانی ١ ـ ١٩دا لەمەڕ فۆنێتیك و لە لاپەڕەکانی ٢٠ ـ ٢٤ ـ دا لەمەڕ پێکهێنانی وشان و لە لاپەڕەی ٢٥ ـ ٢٦ ـ دا لەمەڕ گۆڕانی فۆرمەکانی ناڤ ، و لە لاپەڕەی ٢٧ ـ دا دەرهەق رادەی بەراود کردنی

(٢٣) هەمان سەرچاوە .

رەنگناڤانی نوسیوە ؛ لەپاش ئەمە دەستنوسەکە بە زمانی رۆسی نوسراوە ولەمەڕ هەژمار و جیناڤان دەکۆڵێتەوە (لاپەڕە ٢٨ـ٣٢) ، لە لاپەڕەکانی ٣٣ ـ ٣٩ ـ دا لەمەڕ فێل نوسراوە ، لە لاپەڕەکانی ٤٠ـ٤٢ ـ دا لەمەڕ فێل و بەرناڤان و وشانی پەڤگریکی ( بەستەکی ) یەوە نوسراوە .

بەشـەکانی ناڤبراڤی رێزمانی کوردێ ، کو پ لێرخ نوسـیتی ئەوە نیشـان دەکەن ، کە رێزمانی کوردێ بەکورتێ نوسـراوە وناتەواوە . لەبەر ئەمە لێرخ بە خۆ دەنوسێ ئەو لە نامەیەکی دیکەی خۆیدا لە بەشی میژوو ـ فیلۆلۆژی ئاکادیمیای روسێ ئیلتماس دەکات ، کە یارمەتی بدەن نوسینی رێزمانەکەی خۆی تەواو بکات . ئەو دەنوسێ : « گەلەك وەخت کە من ئەم رێزمانەم دەنوسی ، هەمیشە چەوت و چەڵەمەکانی خۆم راسـت دەکردەوە و ماکی زێدەم لەسـەر زێدە دەکردن و لە پێشکەوتنی فیلۆلۆژی ئێرانم دەنوازی » . هەر وەها ژی ئەو دەنوسێ: «تێبینی من لەمەڕ مەعلوماتەکانی زمانی کوردێ ، بەتایبەتی لەمەڕ پێکهێنانی وشەی گۆڕاودوە ئەوەیە کە گەلەك فاکتی رێزمانی زمانانی ئێرانێ کۆنن ، بناخەیەکی قایم ـ یان وەچەنگ خستم بۆ فیلۆلۆژێ ئێرانێ کاتێ کو من دەستم بە چاپ کردنی رێزمانی کوردێ کرد ئەم فاکتە نوێیانە نەبون »[٢٤] .

---

(٢٤) Архив Института Востоковедения АН СССР, ф.36, л.I.

« ئارشیڤی دەزگای رۆژهەلاتناسێ کۆڕی زانیاری سۆڤیەت » ، فۆندی ٣٦ ، لیستە ـ ١ ـ .

بۆ تەواوکردنی ڕێزمانی کوردی گراف بلۆدۆف پێشنیازێکی خستە پێش ئاکادیمیای ڕوسی ، کو پ. لێرخ پەسەندی بکات و لە ئاکادیمیادا کار بکات . ئەو لەمەڕ پ لێرخەوە دەنوسێ : «بە تەبیعەتی و راستی پێویستە لە وردەکاری پ. لێرخ بنوارین ، چونکی نوسراوەکەی لەمەڕ کوردان و ڕێزمانی کوردییەوە گەلەک گرینگ و بە نرخە . ئەو لە ناف گەلەک سالدا خەریکی ئەم کارە بووە و ، بۆ زانست گەلەک بە سوودە » . ئاکادیمیا پێشنیازەکەی گراف بلۆدوفی پەسەند کرد و پ. لێرخیش قوبولی کرد ، کە ئەو نوسراوەی خۆی تەواو بکات .

پ. لێرخ سالێك لە ئاکادیمیای ڕوسدا وەك کرێکارێکی زانستی لەسەر نوسینی ڕێزمانی کوردی بەردەوام بو . بەلام لە پاش سالێك جڤاتی مێژو - فیلۆلۆژی ڕوس بڕیاریدا ، کو لێرخ بنێردرێتە هەرێمی ئۆرێنبورگ بۆ کۆکردنەوەی ماتریالی لێکۆلینەوەی زمانانی قرغیز و باشکیرەکان .

لەپاش ئەوەی لێرخ لە ئاسیا گەڕایەوە دیسان دەستی بە نوسینی ڕێزمانی کوردی کردەوە . بەلام پ. لێرخ نەیتوانی ئەم ڕێزمانە تەواو بکات ؛ چونکی لە سالی ۱۸۸٤ — دا نەخۆش کەوت و ، چو بۆ ئەوروپا و لە پاش مانگێك کۆچی دوایی کرد .

لەسەر بناخەی کورتنوسینی ئێش و کاری پ. لێرخ لەمەڕ نەتەوەی کورد و زمانی کوردییەوە ئێمە دەتوانین بێژین ، کو

لە نیوەی چەرخی ۱۹ — دا ئاکادیمیای روسێ مەرکەزی دامەزراندنی لێکۆڵینەوەی مێژوویی ، ئێتنۆگرافی ، زمان و ئەدەبیاتی کوردی بۆ . بە ئاریکاری ئاکادیمیای روسی گەلەك نوسراوی ئێرانناس و کوردناسان لەم کتێبەدا چاپکرابون . پێشکەوتن و بەرزبونەوەی کوردناسی لە پێتێربورگدا زوربەی بە ناوی پ. لێرخەوە ، بە ئیش و کارەکانی پ. لێرخەوە بە سترابو . پ. لێرخ گەورەترین زانیاری روس بو ، کە گەلەك وەخت خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و شارستانێتی نەتەوەی کورد بو نوسراوەکانی پ. لێرخ بنکە و بناخەی لێکۆڵینەوەی کوردناسی لە روسستاندا دامەزراند . لەم نوسراوانەدا وردە ـ وردە مێژووی لێکۆڵینەوەی نەتەوەی کورد و زمانی کوردی نیشان کراوە و قیمەت و نرخی نوسراوەکانی کوردناسەکانی ئەوروپا و روس دیارکراوە . سوپاس بۆ لێرخ ، کە توانی بە نوسراوەکانی خۆی کوردناسی لە ئێرانناسی دەربهێنێ و لە سەر رێگای پێشکەوتنی سەربەخۆی دابنێ .

لێرخ دەکوشا لێکۆڵینەوەی زمانی کوردی بە مێژووی پەیدابون و پێشکەوتنی نەتەوەی کوردەوە و باری سیاسی وانەوە گرێبدا . لێرخ وای بۆ دەچو ، کە مێژوو و شارستانێتی رابوردوی نەتەوەی کورد گەلەك دەوڵەمەندە ، ئەو دەینوسی ، کو ئەدەبیاتی کوردی بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوویی شارستانی و زمانی کوردی گەلەك گرینگە . لێرخ گەلەك ئاریکاری ئیدارەخانەی

رونا کبیری زانستی روسی کرد ، کو دەستنوسەکانی مێژوی ئەدەبیاتی کوردی کۆبکەنەوە و وەچەنگیان بهێنن و لە چاپیان بدەن .

لێرخ زمانی کوردی وەك زمانێکی ئێرانی سەربەخۆ لە قەڵەم دەدا و دەیگوت ، زمانی کوردی و فۆندی وشەی کوردی لە زمانەکانی ئێرانی ئێستا جیاوازترن ، « ڕێزمانی کوردی سازمانێکی دەروَنی تایبەتی خۆی هەیە » . لێرخ هەروەها ژیِ دەیگوت ، پێویستە گەلەك ماتریاڵی مێژوَیی ، ئێتنۆگرافی ، زمانەوانی ، ئەدەبی ، فۆلکلۆری کوردی کۆ بکەینەوە ، « هەر بە تەنێ بە جێ هێنانی ئەم خواستانە خۆیان زانستی ئێتنۆگرافی دەگهێنە چاکترین بەرهەمی لێکۆڵینەوە لەمەڕ کوردان »[٢٥] . لێرخ لە نوسراوەکانی خۆیدا هەمیشە داوای دەکرد و دەیگوت ، پێویستە هەوەسکاری و ئینترێس لەسەر لێکۆڵینەوەی کورد بەرز و بڵندبێ . ئەو نوسیتی : « کورد گەلەك شایانی سەرنج و دیقەتی مێژوَنوس و نژادناسانە ، بەڵام پێویستە ئەو هەوەسکاری و ئینترێسە بەرز و بڵندبێ لەمەڕ کوردانەوە ، چونکی ئێستا سەردەمی ژینەوە و ژیاندنەوەی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتە ، سەردەمی ئەوەیە ، کە نەتەوەکان دەتوانن ژێنێکی نوێ بژین»[٢٦] .

---

(٢٥) ب. لێرخ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەشی یەکەم ، ل ٣٣ .

(٢٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٢ .

ئەمە تەرجەمەی ئەو گوتارەیە کە بەناوی « ترودی پ. لێرخ پو کوردۆڤێدێدنیو (لـ ڤوپرۆسی ئیزوسێنیو ئیستوری‌یی کوردۆف ڤ روسـی‌یی ) لە کتێبی « ئۆچێرکی پۆ ئیستۆری‌یی روســۆگۆ ڤیستوکۆڤێدینی‌یا » س ب. IV ، م. ١٩٥٩ لە چاپ دراوە .

* * * * * *

## - ملخص المقال -

# حول آثار ب. ليرخ في حقل الدراسات الكردية

العضو العامل : البروفيسور قناتي كوردو

قدمت الاكاديمية الروسية في القرن التاسع عشر انجازات عظيمة في الابحاث والدراسات التاريخية والاثنوغرافية واللغوية والادبية وغيرها مما يتصل بتراث الشعب الكردي .

ومن هذه الانجازات التى طبعت في ذلك التاريخ :

١— بحث پ. لرخ « عن كرد ايران » ويقع في ثلاثة كتب .

٢— ترجمة الشرفنامة لشرف خان البدليسي الى اللغة الفرنسية مع دراسة تاريخية ، اثنوغرافية .

٣— مجموعة السير والتراجم الكردية ، وقد جمعها أ. د. جابا في ارضروم .

٤ــ القاموس الكردي ـ الفرنسي ، لـ آ. د. جابا .

٥ــ قواعد اللغة الكردية بالالمانية ، لـ ف. يوستى .

٦ــ مجموعة نصوص كردية ، جمعها آ. سوسون فى ترابدين وبهتان .

ولعل أشهر واخلص من أبلوا في ميدان رفع شأن الكردلوجيا البلاء الحسن ب . لرخ ، اعظم علماء روسيا .

ولد پ. لرخ عام ١٨٢٨ م واكمل دراسـته سنة ١٨٥١م في جامعة بطرسبرغ ، وحاز على لقب رائد اللغات الشرقية دون منازع .

وتبدأ دراسات پ لرخ في المسائل الكردية منذ عام ١٨٥٠م ، غير أن تشعب مهامه العلمية فيما بعد وتوفره على معظم الدراسـات الشرقية وتقلبه في طول الشرق والغرب حال دون ان يحصر كل ابحاثه في الكردلوجيا وان كان ذلك يحظى باهتمامه اكثر من غيره . وتوفي سنة ١٨٨٤ م .

وقد طبع من ابحاث لرخ ثلاثة كتب يبحث فيها عن كرد ايران واجدادهم وكلداني الشمال . ومما يلفت النظر انه اقتصـر اخيراً على الدراسـات التاريخية والاثنوغرافية واللغوية والادبية الكردية ، ولا يفيض في الحديث عن أجداد الكلدانيين افاضته في اجداد الكرد واصولهم وجذورهم التاريخية الموغلة في القدم .

يتساءل لرخ لماذا يجب أن يتناول المسألة الكردية من النواحي التاريخية والاثنوغرافيـة واللغويـة بالبحث والتدقيق والتحقيق ؟ وفي اجاباته ما يحملك على أن تقتنع بان معظم ما قيل او روي او كتب عن الكرد انما هو الى محض الافتراض اقرب منـه الى التثبت العلمي في

اكثر الاحيان ولا يعكس حقيقة هذا الشعب بقدر ما يشوه ملامحه القومية والتاريخية ، ويعلل تخبط الكثير من الدارسين لهذه المسألة وتعثرهم ومخادعتهم للكردلوجيا بغياب الظروف المؤاتية في اثناء دراساتهم وفقدان الاستعداد الكامل للكشف عن متاهات الشرق ومجاهله . فهو لا يثق بالابحاث والدراسات التي اجراها سلفه ويشك فيها كل الشك .

كيف بدأت الدراسات الكردلوجية في روسيا ؟

ففي الثالث والعشرين من كانون الاول سنة ١٨٥٦م نشر ك. فيكشين في جريدة « سيڤيرنايابچيلا » الناطقة باللغة الروسية مقالا حول كرد ايران الذين اسرتهم القوات الروسية خلال الحرب الروسية التركية عام ١٨٥٠ ـ ١٨٥٣م واستقربهم المقام في مدينة روسلافل . وحينذاك اوفدت الاكاديمية الروسية پ. لرخ لاجراء البحوث والدراسات على اللغة الكردية .

يرى لرخ ان اللغة الكردية اغنى مصدر لشتى انواع الدراسات في فروع اللغات الايرانية التي لم تكتشف بعد . فهو على موقفه الواضح من دراسات سابقيه لم يستغن عما كتب عن الكرد بالانجليزية والفرنسية والالمانية والروسية ، الا انه افاد من الشرفنامة واختص به اكثر من غيره .

ومن الطريف ان الاسرى الكرد الذين اسكنوا في مدينة روسلافل لم يتجاوز عددهم ٥٠ شخصاً ومع ذلك ولحسن المصادفة انه كان بينهم من تقاذفت به الحرب من ماردين ، والجزيره ، ودرسيم ، وموش ، ودياربكر ، واورفه ، وبيرەجك وبيكنسي

وملاطية وماردين وارضروم . ومن هؤلاء تعلم لرخ اللغة الكردية ، وبهم بدأ في تدوين اللهجة الكرمانجية والزازائية ، ومنهم جمع المواد الخاصة بالحياة والتقاليد والعادات الكردية .

ومما يؤاخذ لرخ غيره عليه في دراساتهم عن الكرد انهم لا يتوفرون الا على لهجة واحدة من لهجات اللغة الكردية وعلى اساسها ينظّرون المسألة فتأخذ مستوى وحيد الجانب وتغيب الحقيقة الكلية ...

اما المستشرقون الكردلوجيون الذين سبقوا لرخ في الدراسات الكردية فهم : م. گارسونى ، مؤلف قواعد اللغة الكردية والقاموس الكردي ـ الايطالي ، وكلابروت جامع (٣٠٠) كلمة كردية من منطقة موش ، وريچ جامع (٢٠٠) كلمة من اربع لهجات كردية ، واوليا چلبي الذي ذكر ١٥ لهجة كردية . كما طبع بيريزين مادة لهجتين كرديتين . وفي دراسة هورنلي رأيه المعروف بصدد اقسام اللهجات الكردية .

ينتقد لرخ مستوى ابحاث ودراسات سلفه ، لافتقارها في الاقل الى التوفر على تحليل حتى بعض الامثال والاقوال المأثورة ، وتكديس مادة الاستنباط بقدر كاف ليصح الاستقراء او القياس ، كما يلفت النظر الى أن الناحية الصوتية لاية لهجة من اللهجات الكردية لم تدرس الى الان ، ومازال معظم اشكالها مجهولا . اما ما درس منها فما برح ناقصاً لم يتبلور بعد . ثم ان اقسام اللهجات الكردية عند لرخ ، كما عند غيره خمسة :

١ــ الكرمانجية .

٢ــ اللرية .

٣— الكلهورية .

٤— الكورانية .

٥— الزازائية .

فقد عني لرخ بالكرمانجية والزازائية بوجه خاص ، وكتب عن الكرمانجية : « ان الكرمانجية اكثر اللهجات الكردية انتشاراً في شتى انحاء كردستان الغربية ، تمتد من الموصل حتى آسيا الصغرى والسليمانية » ، « ان بين لهجة العشائر الكرمانجية الشمالية ولهجة العشائر القاطنة جنوبي الفرات فوارق واختلافات من حيث الالفاظ والمفردات والتراكيب النحوية والبناء الصرفي ، الا أن هذه الفوارق والاختلافات ليست من العظم بحيث يصعب على الناطقين بها ان يتفاهموا بها . وعند المقارنة بين الكرمانجية والزازائية يبدو الاختلاف كبيراً ، فخواص الالفاظ والاصوات في الزازائية لاشبيه لها في الكرمانجية . ان الكرد الكرمانج لايتفاهمون مع الزازا بالزازائية في حين يعرف الزازا الكرمانجية ويتفاهمون بها » [1].

يتفق لرخ مع العالم الالماني البرفسور بوت القائل بأن اللغة الكردية لغة ايرانية مستقلة ولها نحوها وقواعدها الخاصة ، وانها اقرب ذوات الارحام الى اللغة الفارسية . ولكنه يستدرك « ان تطور اللغة الكردية انما جرى بمعزل عن تطور اللغة الفارسية » و « ان

---

(١) وشبيه ذلك ملحوظ بين الهورامانيين وغيرهم في كردستان العراق ، وبين الكرمانج وغيرهم ايضاً .

المفردات اللغوية الدخيلة في اللغة الكردية لم تكن من الاهمية بحيث تؤثر في بنائها الداخلي » .

أما سبب الاختلاف بين اللغة الكردية واللغة الفارسية فرده عند لرخ الى انفصال الكرد في الفترات الموغلة في القدم في معظم الاحيان عن القبائل الايرانية وهذا الاختلاف ثابت بطريق الخصائص الصوتية والنحوية والصرفية . فقد كتب لرخ بصدد دحض آراء المستشرق الروسي بيريزين حول اعتبار لهجات كرد خراسان ولهجات كرد مناطق الموصل من اللهجات الفارسية : « لاسبيل الى الربط بين اللغة الكردية واللغة الفارسية الا اذا بلغت الدراسات اللغوية الايرانية اعلى اشكالها العلمية في البحث المقارن من حيث المفردات اللغوية والاصوات والتراكيب النحوية والبناء الصرفي ، وعند ذاك فقط يمكن التثبت من ذلك او نقيضه » كما كتب ايضاً : « ومالم تدرس وتحقق سائر اللهجات الكردية فليس بالامكان المقارنة بأي وجه من الوجوه بين اللغة الكردية وبين اية لغة اخرى » . فهو يوصي بأن ينصب الاهتمام على دراسة اللهجات كلها وشرحها ومقارنتها بعضها مع البعض واستنباط اوجه الشبه والاختلاف بينها على اساس من العلم والدراية . وحينئذ يمكن الحصول على افضل النتائج والحلول .

لقد طبع لرخ في كتابه الثاني النصوص الكردية التي ارسلت اليه من ارضروم وتبريز مأخوذة من اللغتين التركية والفارسية ، فقد كتب في مقدمته : « أنه اراد في الخطوة الاولى ان يدون هذه النصوص حسب الابجدية الاوسيتية — الروسية » ، و « أنه كان عليه

أنْ يعين أصوات اللغة الكردية كتابة ، وان يعتمد في ذلك الابجدية الاوسيتية التي وضعها الاكاديمي المرحوم (شيگرني) على اساس الابجدية الروسية ؛ اذ ليس في الامكان تعيين تلك الأصوات بالأبجدية العربية ـ الفارسية ، لما في اللغة الكردية من الاصوات مالايمكن كتابته بها » ، الا أن رأيه لم يقبل لدى هيئة علماء التاريخ والفيلولوجيا ، فصـــار العلماء الى رأي آخر ، تحاشياً لما قد يخلق هذا الرأى من مشكلات وصعوبات جديدة ، فاوصي باعتماد ابجدية البروفيسور الالماني ليبسيوس . وبناء على قرار هيئة العلماء طبع لرخ النصوص الكردية ليبسيوس .

ومن المعلوم ان ليبسيوس وضـــع الحروف الصائتـة والحروف الصامتة وفق خواص لغات اوروبا الغربية . وبمعزل عن خواص اللغات الشرقية ، فقد قسم الحروف الصائتة الى الاصوات القصيرة والاصوات الصامتة الى اصوات الحلق ، واصوات أطراف االسان واصوات عمق اللسان والأسنان والاصوات الدنتالية ، وأصوات الشفة .

وبالطبع لم تكن هذه الابجدية لتنسجم والنظام الصوتي للغة الكردية من الناحية العملية ، كما ان تقسيماتها هي الأخرى لم تكن على اســـاس من القوانين العلمية . فمن الواضح ان الاصوات المصوتة القصيرة منها والطويلة على خلاف الفونيم ، وان التناغم الموسيقى هو الاهم في طول وقصر أصوات اللغة الكردية . وعدا ذلك فان الكرد لاينطقون من الصوائت سوى (a ، e ، i ، o ، u) بطويلها وقصيرها . وفي المجموعة الصامتة لم يعين لرخ الصوت (u) والصوتين (p' ، t') ، و (p ، t) بالعلامات الفارقة . وتعتبر العلامات الموضوعة الى يمين كل

صوت من الاصوات ( n'، d'، g' ) زيادة لامبرر لهـا ؛ اذ ليس في الـكرمانجية والزازائية مثل هذه الاصوات .

اما بصدد ابجدية ليبسيوس التي اعدها س. اكيازاروف ليطبع بها النصوص الـكردية ، فقد كتب عالم المسائل القفقاسية الروسي ل . زاكروسكي : « اننا نجّـلُ ونثمن للبرفيسور ليبسيوس ابجديته، ولكننا لا نعلم أتستطيـع هذه الابجدية أن تعين الاصوات كلها ؟ فقد كان واضعوها من العلماء الالمان والانجليز ، وكان هدفهم من وضعها مدى تحقيق تناسبهـا واللغة الالمانية والانجليزية . وكان امام لرخ صعوبات جمة لم يجد مفراً من العكوف بصبر واناة على اكتشـاف الاصوات الـكردية من بين الاصوات الالمانيـة والانجليزية ، ولذا لم يستطع ان يعين على وجه التحقيق الاصوات الـكردية الصحيحة » .

كما كتب الاكاديمي والناظر للمتحف الآسيوي دورن في مؤلفه عن النصوص الـكردية المدونة من أفواه الجنود الـكرد الاسرى في روسلافل : « لقد انعمت النظر في النصوص الـكردية وانتهيت الى أنها امثل بحث يعين الزميل لرخ لوضع قواعـد اللغة الـكردية ونصوص القراءة وتأليف القواميس . فلو قدر له أن يكمل اعماله لأضحت هذه المدونات افضل مادة في المستقبل للبحث والتحقيق في اللغة الـكردية » .

اما الـكتاب الثالث للرخ فعبارة عن مقدمة وبحث تاريخي ادبي وقواميس للهجات الـكرمانجية والزازائية . فقد رتب لرخ معظم هذه القواميس على اساس النصوص الـكردية التي دونهـا من افواه الجنود الاسرى الـكرد في روسلافل كما اسلفنا . وفي ترتيبه لهذه القواميس

يقارن لرخ في بعض المواضـــع بين الالفاظ الـكردية وبين الالفاظ الايرانية الأخرى ليعين تاريخ ظهور الالفاظ الـكردية .

وبصدد تاريخ دراســـة اللغة الـكردية كتب لرخ في مقدمة كتابه يقول : « قبل ان أذهب الى الجنود الكرد الاسرى حصلت على سائر المراجع المعنية باللغة الـكردية ، وانعمت النظر فيها ، اذا بهـــا جماء مجموعة كلمات كردية لم يدون معظمها على وجه صحيـح . وهـذا ما جعلني لا استطيع الانتفاع بما عنـد بعض العلماء العارفين بتاريخ اللغات الايرانية ، فعدلت مضطراً الى الحصول على نصوص أخرى ادنى الى حقيقة اللغة الكردية » .

على أن لرخ كان يرى ما جمعه من مواد أقل ممـا ينهض اساساً متيناً لتاريخ العلاقة بين اللغـة الكردية واللغات الايرانية الأخرى ، وتفسيرها . فقد كان ينشد من المواد اكثر من ذلك .

وان للرخ عدا كتبه الثلاثة باللغة الروســـية ، كتابين آخرين مطبوعين بالالمانية .

ومما يذكر أن لرخ وضع كتبه باديء الأمر باللغة الروســـية بعنوان « بحث عـن كرد ايران واجداد كلداني شمال ايران » . وان ماكتبه بالالمانية يختلف عنوانه عمـا كتبه باللغة الروسية . ويُستشـفّ من هذا أنه عدل عن آرائه بصدد نشوء الـكرد من كلداني الشمال في ايران . ولعل في الاقتصار على ترجمة كتابه الاول دون غيره الى الالمانية ما يؤكد هـــذه الحقيقة ، إذ فيه اوضح آراءه بشأن علاقة الـكرد بكلداني شمال ايران .

وخلا ما اتينا على ذكره من كتب لرخ فأنه طبع ابحاثاً مستقلة عن الادب الكردي ، كبحثه بعنوان « (رأي) حول ما كتبه آ. د. جابا عن الادب الكردي والعشـائر الكردية » ، وبحثه بعنوان « (رأى) عن احمدى خاني ومم وزين » .

ويوصي لرخ بضرورة الحصول على مؤلفات آ. د. جابا ، لانها تشهد بغنى الأدب الكردي .

طبعت الاكاديمية الروسـية بمعونة لرخ معظم تلك المؤلفات . وللرخ عدا ما ذكرنا من مؤلفات مخطوطتان في قواعد اللغة الكردية ، احداهما محفوظة في معهد الاستشراق في لينيغراد ، وثانيتهما محفوظة في مكتبة جامعة لينينغراد . ويتضح من المخطوطتين ان لرخ كان يسعى لوضع كتاب كبير في قواعـد اللغة الكردية من حيث الفونوتيك والمورفولوجيا . ومخطوطته هذه في قواعد اللغة الكردية عبارة عن مقدمة قصيرة حول تاريخ البحث عن اللغة الكردية . فهو يتحدث في هذه المقدمة عن تلك الملاحم الكردية التي دونها آ. د. جابا وعن كتاب آ. خودزكو بصدد (لهجة كرد السليمانية) . ثم يتحدث لرخ عن الطريقة التي يمكن بها جمع المواد الاساسية لقواعد اللغة الكردية . كما أن في مخطوطته بعض الاغاني الفولكلورية التي دونها من افواه الاسرى الكرد في روسلاقل . حتى اذا فرغ لرخ من هذا بدأ بذكر نظام الاصوات الصائتة والاصوات الصامتة للغة الكردية التي وضعها على أساس ابجدية ليبسيوس ، متحرياً على مهل عن تناسب الاصوات في اللهجات الكردية الكرمانجية والزازائيـة والسليمانية والآميدية

والخيردوستية ، معيناً العلاقة بين هذه اللهجات وسائر اللغات الايرانية الأخرى ، كما يشير الى نظام تغير الاصوات في اللغة الكردية ايضاً .

ثم ان لرخ اراد ان يتوسع في دراسة البناء والاساس لقواعد اللغة الكردية ، وسعياً دؤوباً وراء جمع المواد الضروريه لهذه الدراسة اضطر الى الاشتغال بسائر المواد المتعلقه بتطور الاشكال التاريخية للغة والاخذ بالمقارنة والمشاكلة والمجانسة بين مواد اللغات الافغانية والمازندرانية ، لما في هذه اللغات من المسائل ما يشبه شديد الشبه بمسائل اللغة الكردية .

ويتضح مما كتبه لرخ عن قواعد اللغة الكردية انها دونت مقتضبة وبصورة ناقصة . وفي رسائله الى الاكاديمية الروسية ما يؤكد هذا ويعترف به لرخ نفسه . فهو يلتمس منها المزيد من العون والدعم ، لاستكمال مشروعه ، الا انه رغم موافقة الاكاديمية الروسية على اقتراح گراف بلودوف بشأن تفرغ لرخ لاكمال المشروع ، لم يستطع ذلك ، اذ حالت مهماته العلميه الاخرى في جمع المواد المتعلقة باللغتين القرغيزيه والبشكيرية في منطقة اورنبرك دون تحقيق ذلك فوافته المنية على فراش المرض فى اوروبا .

وفي ضوء ما انجزه لرخ بشأن القومية الكردية واللغة الكردية ، يمكن القول بان الاكاديمية الروسية امست في النصف الثاني من القرن التاسع عشر مركزاً مهماً للابحاث والدراسات التاريخية والاثنوغرافية واللغوية والادبية الكردية . فقد طبعت جملة من الدراسات والابحاث حول المسائل الايرانية والكردية بمعونة الاكاديمية الروسية . وان

معظم الانجازات العلمية بشأن الكردلوجيا في بطرسبورغ انما يقترن بجدارة باسم لرخ وباعماله العظيمة .

لقد كان پ. لرخ اعظم علماء روسـيا قاطبة . فقد انفق كثيراً من وقته وجهده في دراسة التاريخ الكردي والحضارة الكردية . ان لرخ هو الذي اسس الأسس للدراسات والابحاث الكردلوجية في روسيا .

ان المؤلفات التي اتينـا على ذكرهـا ما هي الا علامـات مضيئة على طريق تاريخ الدراسـات والابحاث عن تاريخ القوميـة الـكردية وعن اللغة الكردية ، وفيها تتعين قيمة ابحاث الكردلوجين الاوروپيين والروس . فشكراً للرخ الذى اســتطاع ان ينتزع الكردلوجيا من الدراسات الايرانية وان يضعها على طريق تقدمها المستقل وازدهارها .

* * *

# کلامێد جمعەتا کوردایە لیریکی یێ

ئەندامی یاریدەر : پرۆفیسۆر حاجی جندی*

ناڤا کولتورا جمعەتا کوردادا زارگۆتنا ـ فۆلکلۆرا وێ یە کەڤنە ـ تەزە ، یاکو گەلەکی دەولەمەند و پر ژانرە ، جیکی هـــەری لاییق دگرە .

د وێ خەزنا نەحەسابکریدا ، باوەر بکە ، ئەمەکێ هەر نەفەرەکە وێ جماعەتێ هەیە : هەرگێ ب عەفراندنا خودڤا ، هەرگێ ب ژێ

---

* ئەندامی یاریدەری کۆڕی زانیاری کورد پرۆفیسۆر حاجی جندی زانایەکی ناوداری کوردە لە ئەرمەنستانی سۆڤیێت و گەلێك بەرهەمی زانستی هەیە کە بەشی زۆریان لە بارەی فۆلکلۆری کوردەوەن . پرۆفیسۆر حاجی جندی ئەم وتارەی بەتایبەتی بـۆ گۆڤاری کۆڕ نوسیوە و ئەنـدامی یاریدەری کۆڕ مامۆستا شکور مستەفا شێوەی نوسینەکەی لە لاتینییەوە گۆڕیوە و کورتەی عەرەبییەکەی بۆ نوسیوە و ئەو فەرهەنگۆکەی بۆ داناوە کە لە پاشکۆی وتارەکەدا بلاوکراوەتەوە .

ـ لیژنەی گۆڤار ـ

هلانینا خوەڤا. جماعەتا کورد ب ڤی تەحەری، چاوا نڤیسکارێ ئەرمەنی ناڤودەنگ خ. ئابۆڤیان هەق دکە، جماعەتەکە دەنگبێژە ئەو دبێژە: «پۆیێزیا جماعەتا کورد گهیشتییە دەرجەکێ ئوسا بلند، کو مەرڤ ب پیشداچوونینا وێ شاش و مەعتەل دمینە. هەر کوردەك، حەتا هەر ژنەکە کوردێ ژی عەسل ب روحێ خوەڤا پۆیێتە. ئالییێ تشت بەر خوە دەرخستنێدا کەمال، مەعریفەتا وان هەر یەکی ژی پڕە... ئەو گەلەکی سادە و خەبەرزەلال دەسترێن ددرهەقا گەلی - گەبۆزێد خوەدا، گوڕگوڕادا، کانی - چەغکانییێدا، کولیکادا، چەك - رحالادا، مەعنەگییادا، قەومانێد مێرخاسییێدا، دەرهەقا بەدەوێد خوە و کاوا - کوبارییا واندا، دەرهەقا وان حەمو تشتادا، چ کو نێزیکی دلێ وان و فەعمدارییا وانە، گشکی ب همبەرکرناڤا دنەترینن، و دجەعدینن وان حەمویا ب کلامێد خوەیە مقامە خوەش، کو ئایهای هنەکێ گوهێ مەرڤێد ئێڤروپایێ خوەش نائێن؛ دها ب ژێن بدنە کڤشێ، لێ بها گرانن، چاوا شەعدەتییا عەمرێ وانی روحانییێ و چاوا قەیدێ فکراندنا جماعەتەکە خوە خوەتییێ...»[1]

دەنگبێژی - زارگۆتن ناڤا ڤێ. جماعەتێدا بویە عەددت، چاوا رەقاس، عەید - عەرەفات. لەما ژی ناڤا زارگۆتنێدا تەمامییا عەمر،

(١) خ. ئابۆ ڤیان، کورد، بنهێرە کتێبا «دەستەلوێ»، نڤیسکارێد ئەرمەنییا دەرهەقا کورددا، حازرکر و تەرجەکر ح. جندی، یەریڤان، ١٩٦٣، روبێلێ ٥.

رابوون و رۆنشتاندن ، عەدەت ، فکرداری و خوەستنا . جماعەتێیە دەور و زەمانا تێ کڤشکرنێ . پێڕا ژی تێ بەلوکرنێ مەعریفەتا وێ هندا عەفراندنێد ئوســادا ، ئێدکو ئیـدا ژێڕا بوونە مۆنۆمێنتێد دەورانبێژە دومکدرێژ .

ناڤا وێ زارگۆتنێدا دلێ جمەتەکێ دکوتە ، دخوێنە ســەر بلندایا وێ ، فیلۆسۆفی‌یا و جەڕباندنا وێیە قوڕن و دەورانا تاریقا وێ ب جوڕێ زارگۆتنێ .

ب ڤی تەحەری زارگۆتنا جمەتا کورد ، چاوا جەوەك ، ناڤا سال و زەمانادا بوویە چێمەکی مەزن ، سالۆ ب سالۆ تەزە بوویە و عەیانی وی خەیسەتی‌یە چ کو جمەت ، ب خوەیە ، بوویە نەینکا دلێ وی‌یی سدقتەمز ، ئاقا حەلال ، چقا چلکا شیرێ دێ . « حەتا وێ رۆژێ من کلامەك ئوسا نەبهیستبو ، وەکی ئاقا رابوون ـ رونشتاندن ، خەیسەتێ ملەتی‌یێ بدا کڤشێ ، وەکی ئاقا روحێ جمەتێ بداکڤشێ ، چاوا کلاما کوردا . گاڤا کلاما کوردا دبهێیتی ، کورد خوە ـ خوە تێ بەر چەعڤێ تە » .[2] رۆمان‌نڤیسێ ئەرمەنیێ عەیان رافی دەرهەقا زارگۆتنا کوردادا وا گۆتی‌یە .

زارگۆتنا جمەتا کورد عەفراندنا تەمامی‌یا جمەتـــەکە ب دینێ بەشقە ـ بەشقەیە : ( موسولمان ، ئیزدی ، عەلی ـ ئیلاهی ، خاچپارێز ، جمەتەکە ژ هەڤدو پارپاریکری کوردستانێ ئیرانێ ، یا تورکیایێ ، یا

(۲) رافی ـ بریسك ، بنهێڕە کتێبا « دەستەگول » ، روبێلێ ۱۱ .

عیراقێ ) . ئاها ئەڤ جمعەت ب ئاهل و جاهل ، ب خۆرت و قیز ، ب کاڵ و پیر ، ل سـەر زارگۆتنـا خوە خەبتیە ، روحێ خوە کرییە ناڤ ، تام تەمام شمشات و حەلکرییە قوزنە پەی قوزنا ماك و دەوڵەتی کرییە و ب خودزا تەڤایی ئانییە گیهاندییە مە .

کلاما جمعەتا کورد ، هـەر نموونەکە زارگۆتنا وێ جمعەتێ تو سینۆرێ دەولەتا ناس نەکرییە ، ژ بـەر سینۆرا ، چاوا تەیرەکە ئاتمەجە ، دەرباز بوویە ، گهیشتییە جماعەتێ ، تو دینا پێشی نکاربوویە لێبگەزە ، ب فکرا خوەڤا پێش بوویە ، دلێ هەر خەباتچیکیزا خەبەر دایە و ئەو دایە خەبەردانێ و سترانێ . ناڤا ئەڤێ نمیسـارێدا بێتما مە ئەو نینە ، وەکی ئەم دەرهەقا نموونێ زارگۆتنا جمعەتێدا ب تەمامی گلی بکن . ئەم دخوەزن تەنێ سەر سێ پرسا بسـەکنن ، بنڤیسن دەرهەقا کلامێد خەباتێ ، حزکرنێ و تەبیەتێ ، وەکی ب هـەڤزا دکەڤنە ناڤا ژانرا لیریکییێ .

## کلامێد خەباتێ و ئێد دەرهەقا خەباتێ

ناڤا زارگۆتنا جمعەتا کوردادا گەلەکن عەفزاندنێـد خەباتێ ، شوخول ، عەمەل . کلامێد ئوسا دوپا وەختێ خەباتێ تێنە عەفزاندنێ — ل گوندا ، مالا ، کۆنادا ، لێ پایێ پزێ ل دەرڤا د عەفزن : ل جییێ ، گاڤا شـڤان کەرێ پێز دچێرینـە ، تینە گوهێزێ ،

كو بده مەخەلێ ؛ ل دەشتێ و زۆزانا ، گـاڤا گـاڤان ل بـــەر دێوێره ، دێوێر تينه قيالـگێ ؛ ل كەوشەنێ گوند ، گـاڤا بەرخڤان و گۆلـكڤان بەرخ و گۆلـكا دچێرينن ؛ ل وى عەردى ، كيـدەرێ جۆتـكار زەڤىيا رادكن ، ب « هۆرۆڤێلا » هـــەڤ تينن خيرەتێ . وەختێ مەدا ئوسا ژى كلامێد دەرهەقا تراكتۆر و تراكتۆريستادا ، كۆمباينچيێ و كۆمبايناداد عەفرن .

دێمەك ، ڤى تەحەرى ، خەبات ب خوە چەعڤـكانىيا عەفراندنێد ئوسانه ، و ئەوه ، وەكى حەواسێ ددە خەباتچيێيا ، كو دلێ خوەزا بێژن ، نەكو تەنێ خوە . پێ بدنه موژولـكرنێ ، لێ ئوسا ژى ب وان كلام و قەيدا سەركارىێ ل حەيوانێ بەرخوە بكن .

ب گلیكى ، كێدەرێ خەبات ، شـــوخول و عەمەل ، ل وێ دەرێ ژى كلام و دەنـگبێژى .

كلامێد دەرهەقا خەباتێـدا ، چاوا ئەمێ ژێرێ ببێنن ، گەلەك جارا نەكو تەنێ مەرڤەك ژ بەر خوە دەردخه ، لێ ئوسا ژى كۆما خەباتچيێيا ، ب كۆم ، وەكى دێ گۆتى — حەمێ مەرڤێد سـەر خەباتێ : ئێ كو دبێژن ، ئێ كو وانا ڤەدگـەزينن ، دوەكلينن .

گەره بێ گۆتنێ ، وەكى كلامێد دەرهەقا خەباتێـدا وا خوزێ نينن ، ئـەو حملى ب كلامێ حزكرنێزا تێنه گرێدانێ . پرســـەكێ خەبات و حزكرن ژ هەڤدو نائێنه چيت و پەردەكرنێ .

وەختا خەباتێ ، نەكو تەنێ خەبات ل بەر چەعڤێ عەفراندارە ،

لێ ئوسـا ژی حزکرییا وی ، یانێ ژی حزکرییێ وێ و ئەڤا یەکا هێ قەوەت و سحەتێ ددە مەرڤ ، وەکی خەبات سەر وی گران رۆنەنی ، هێسا و شا دەربازبە ، تێ دەرناخە ، چکا چاوا رۆژا خوە دەربازکر .

عەفرِاندنێـد کلامێد کوردایە خەباتێ حملی گوندێنە : شڤان و گاڤان ، بەرخڤان و گۆلـکڤان ، بێریڤان ، جۆتـکار و هۆریکڤان ، کێلەندیکێش ، دەعسـکێش ، گورزچێ و ترمخچێنـــە ، کەڤربڕ ، پێشەکرانێ جودە — جودە ، قیز ، بوک و ژن ، ئێد کو شوخولێ مالێ دکن : خالی — خالیچە چێ دکن ، دچنە زبارا — هرییێ دشکنن ، دەو دکلێن ، پەز و چێلەکا ددۆشن و شوخولێ دنێ دکن .

ناڤا عەفرِاندنێـد دەرهەقا خەباتێدا ، مە چاوا گۆت ، گەلەک کڤشن کلامێـــد دەرهەقا شڤانییێ ، کەری — سـورییێد پێز و چێڕاندنا واندا . ئەڤا یەکا فەعمدارییە ، چمکی ئەم دەرهەقا جمەتەکە ئوسادا خەبەر ددن ، چاوا جمەتا کوردە ، وەکی چقلەکی مالهەبوونا وێیـە حمـلی ژی خوەیکرنا حەیوانێ گر و هور بوویە . لەما ژی کلامێد شڤانییێ ئاڤا زەعفن ناڤا زارگۆتنا وێدا . بەعێ خەبەرێ :

شڤانۆ ، شڤانێ تێجرانۆ ،
تە ل ملا توکی بەر خانۆ ،
تە ل پشتێ کۆد و هەڤانۆ ،
ل دەستان چۆنـگری گاڤانۆ .

بێ سبێ حۆکە قزانی میانۆ ،
کۆچ و کەرییێ کیکان و ملان گرانە ،
دەربازکە هەرە ل وارا نۆ .

کلامەك دندا تێ عەیانکرنێ ، کو دلکەتی بەرخوە دکەڤە ،
وەکی شڤان ل چۆلێ « کنجێ وی قلێرن » ، وەکی ژ حزکرنا وێ ،
گەدە لاوەکێ وێ « تەعشتێ » و « فراڤین » بەردا نەچویە ،
دخوەزە ، وەکی نفرییا لێ نەکن .

ناڤا کلامێ جمەتییێ تەنێ دەرهەقا شڤین نینە ، ویرا تەڤایی
پێشدا تێ بێریڤان ، یا کو پێز دەدە بێر ، پێز ددوشە . کلام دەرهەقا
بێریڤانێدا گەلەك و گەلەکن ، و دناڤا وانادا شڤان ب خوە پێشدا
تێ :

بێریڤانا من سەکنییە سەر تەڤنێ ،
بەژنزراف ، مێزەر کەڤنێ ،
شەڤێ نیڤێ شەڤێ
ئەز عەڤدالێ خوەدێ تێمە خەونێ .

شڤان حەرەتا بێریڤانێیە ، ئەو ژ بۆنا وێ نەخوەش دکەڤە و
خوەستنا وی تەك ئەوە ، وەکی قە نا جارەکێ ببینە :

بێریڤانێ ، کوبار ، کوبار خوە ل با نەکە ،
جەژێ خوە هلدە کانییا پشت مالا مە قەستێ مەعنەکە ،

ئالیکی جگەرا من ساغ مایە ،
خراب نەکە .

ئاڤا کلامێد شڤانی‌یێ ـ بێریڤانی‌یێ مۆتیڤەك وا هەیە ، ـ ئەوە ، شڤان وەختا پەز دوتنێ « مەمکێ » بێریڤانێ دبینە ، وســەر وێ یەکـێ ژی کلام ب هەڤدو هاتنە هەڤانینێ ، بەسە خەبەرێ :

کەچێ ، کـولمالێ ، وەختێ من چفتێ زەر مەمکێ تە زەر دیبوٗن ،
سەرێ تەدا فینۆیێ تونسێ بوٗ ،
قۆتکە تەرەزمانی بوٗ ،
دەستێ تەدا گۆبالێ زیڤین بوٗ ،
لنگێ تەدا گـیزمێ رەشە فرەنگی بوٗن ،
پەزێ مالا باڤێ تە دەعنا بوٗ ،
مینکا قەرە بەشە سەر بەرانی
بەر بێریێی رەڤی بوٗ ،
تو بەرژا بەزی بوٗیی
تو ل عەردێ کەتی ـ
سێسەد شێست و شەش بشکۆکێ
بەر بەدەنا تە قەتیا بوٗن ـ
منێ وی چاخی چفتێ زەر مەمکێ تە زەر دیبوٗ .

ئاڤا کلامێد شڤانی‌یێ ـ بیریڤانی‌یێ مۆتیڤا نفرێ پێکرنێ ژی هەیە . ئەڤا یەکا بەرێ عەولن مالتەنکی‌یێرا تێ گرێدانێ گاڤا دێ و

باڤێ گەدە قەلەن نکارن بدن ، یانێ ژی نەخوازن کوڕێ خوەڕا قیزێ بخوەزن . ئاوا :

پەزێ گەدە لاوکێ من گەلەکە ،
نیڤی قەرە ، نیڤی قەربەلەکە ،
ئەزێ ئیرۆ قێمشێ گەدە لاوکێ خوە ناڤم ـ
تو نفرێیا ل پێ بکم .
بەلکی پەزێ گەدە لاوکێ من
هەڕە قەرسا شەوتی
پهێن لێکەڤە ، پەز باها نەکە .

هندا پێزدا گەلەکی پەسنێ نێری تێ داینێ . ناڤێ جوڕێ پێز ناڤا عەفرازاندنادا گەلەکی تێن بیرانینێ ، چاوا ـ کاڵ ، کوڕ ، سۆر ، قەرقاش ، قەر ، قەربەڵەك و دنێ . مەسەلە :

وەی لۆ ، حەسۆ ، حەیرانۆ ،
هۆگەچێ بەرتەیی هندکە ،
گشکی کەڕێ ، کۆڕی کەلی ،
پشت قاپوتی ، ستودارەکە .

پڕبتونا ڤان ناڤا ئوسا ژی شەعدێ وێ یەکێیە ، کو ژ ئالییێ مالهەبونێ جمعەتا کورد چقا زەعف پەز خوەیکری‌یە .

گەلەك عەفزاندن دەرهەقا بەرخ و برخڤانا دانن ، وکی ب جوڕێ

خودڤا دۆپا مینا ئێد زارانن . مەسەلە :

بەرخڤانۆ ، بەرخا بینە ،
تو جی‌یێ خوەش بچێرینە ،
دایکا تە قوربانا تە ،
تو بدە سەر نانێ تە .
بەرخڤانێ مە دەلالە ،
دەستەکا وی کارا چالە ،
ئێڤارێ بینە مالە .

ناڤا کلامێد ئوسادا گەلەکی پەسنێ جۆتکار تێ داینێ . بۆنا ڤێ پرسێ ، هەما ئەم بێر بێنن بەیت ـ سەرهاتی‌یا « مەمێ وزینێ » . ناڤێ وێدا جۆتـکارە ، وەکی خەم و خەیالێ مەمێ ددە ردڤاندنێ ، رێ نیشانی وی زلامێ خالفی ددە و دبێژێ ، کا وێ کوڕا هەڕە و ل جزیرە مالاکێ .

مەرڤێ جۆتکاری حزکری‌یە ، ئەوە ، وەکی دنیایێ تێر دکە ، نان پێڕا دکـهینە .

ئەڤا فکرا ناڤا کلامێد جمـەتا کـوردایە خەباتێدا گـەلەکی تێکـڤشێ . ئاوا ، روبەیتەکێدا تێ گـۆتنێ :

جۆتکاریۆ ، جۆت ل خەتێ ،
خوەدێ بدە ڤی جۆتکاری قەواتێ ،

ئێسال بچێنە نابێ دەستنیگارێ ،
سالك دن بچێنە ئێ دەعواتێ .

جۆتکارێرا تەڤایی پرسا گایێ جۆتا تێ دانینێ . گایە ، وەکی جۆتکاریرا دبە پشت و قەوات ب وی جۆتکار زەڤیا خوە رادکە ، ب وی رسقێ مال و کولفەتێ خـۆ پێرا دکهینە . « دنیا سـەر خەتا گێ‌یە » ، ـ وا دبێژە مەسەلەکە کوردایە فکرکورژ . بـۆنا وێ یەکێ ژی ، چاوا نیشانا رسق ، دەولەتێ ، سترویێ گا ل رەخ یانێ ژی فێزا دەرێ خوە دخن . ب وێ ئێتێ ژی گا ، باوەر بـکی ، خەباتچیکی مالێ حەساب دبە ، نەفەرێ مالێ . ئێزباتی‌یا ڤـێ پرسـێ یەك ژی ئەوە ، وەکی ناڤا کولوچێ سەرێ سالێدا ، نەفەرێ مالێرا تەڤایی ، پارا گایێ جۆتا ژی هەیە . وێ شوندا ، ناڤـا ئێزدی‌یادا وەختێ رۆژی‌یا ، گاڤا زارا دۆلیدانگێ دگەراندن ، چاوا نیشانا خێر و خۆشی‌یێ ناڤێ گایێ جۆتا ژی هلدان ، ئاوا :

دۆلی ، دۆلی ، دۆلیدانـگێ ،
پیرا مالێ قوربانگێ ،
خۆرتێ مالێ زەعڤـا کێ ،
گایێ مالێ جۆتانـگێ ،
کشکی تێکن ڤێ دۆلیدانـگێ .

بۆنا گا و هــۆریکڤانا کلامێد کۆتانێ هەبون ، وەکی ب ریتـــم و ب کۆم دهاتنا گۆتنێ : کۆمەکێ دگۆت ، یا دنێ لـێ

ڤەدگەڕاند ، یانێ ژی خانەك د ئالیێ خوە سەردا زێدەکن . ئـا ژ وان کلامانە ئەڤا هانێ :

— سەرێ کۆتانێ هەزە ،
بنێ کۆتانێ هەزە ،
خودێ قەواتێ بدە ،
گایێ دلـگەڤەزە .
هۆرۆڤێل ، هۆ ، هۆ ، هۆ ...

— سەرێ کۆتانێ چڤە ،
بنێ کۆتانێ چڤە ،
منێ ژێ چنی
گۆپاڵ و شڤە .
هۆرۆڤێل ، هۆ ، هۆ ، هۆ ...

— سەرێ کۆتانێ بی‌یە ،
بنێ کۆتانێ بی‌یە ،
لێ دچێرن بەرخ و می‌یە ،
هۆرۆڤێل ، هۆ ، هۆ ، هۆ ...

— سەرێ کۆتانێ کەشە ،
بنێ کۆتانێ کەشە ،
خوەدێ قەواتێ بدە ،

گایێ کەلەشە ،
هۆرۆڤێل ، هۆ ، هۆ ، هۆ ...

وەعدێ گۆتنا کلامێد دەرهەقا جۆت - جۆبەری یێدا پـێڕا ژی تێنە بیرانینێ تۆخم رەشاندن ، ساپ کشاندن ، بێـدەرو تێخ چەهلێد گەنم و جەهـ ، تەمامی‌یا عەمرێ چاندن ـ چنینێ . ئاوا :

سەرێ بۆقەتینێ مە زەڤێنە ،
لاوکۆ ، دە تو راڤە کێلاندی‌یا خوە هلدە ،
مێرك و چیانێ مە بچێنە .

نانڕا تەڤایی پرسا کیها درونێ تـــێ دانینێ پرسا دەبارێ . بێدەرێ ژی ب خەباتێڕا تەڤایی پرسا حزکرنێ پێشدا تێ ، مەسەلە :

گهێ بدرو ، گهێ پالێ ،
هەی بدرو ، بنەعلە ،
وەکی منێ شەرما خوەیا شەرم نەکرا
منێ قەرەفیلا پۆزێ خوە ـ
تەڕا تێ‌کرا کێلەندی ، بچوما مالێ .

یەکە دن :

وەی پالەنگۆ ، پالەنگرۆ ،
دەعسا دەستێ تە زەنگلۆ ،

دەتو وەرە مێرگا مالا باڤێ منڕا لێخێ ئەشیق و دلۆ .
ئەزێ شەعرا گەڤەز خوە و تەڕا تێکەم سی چادرۆ .
پێ کێلەندی‌یێ خەباتچی رسقێ دێ و باڤێ خوە پێڕا دگهینە ،
بەرەف دکە :

کێلەندی‌یا دەڤزراڤێ ،
تو د دەستێ مندا تێ‌یی مینا ئاڤێ
ب تە دچنن قسمەتێ دێ و باڤێ .

ئەڤا خەباتا گوندێتی‌یێ ئوسا ژی نیشان ددە ، وەکی جمەتا
کورد چقا ب خوەلیێڕا گرێ‌دایی‌یە ، جۆت و جۆبار کری‌یە .

هەرگێ چ کۆ حەتا نها مـــە گۆت گوێ‌دایی بو خەباتا
دەرڤاڕا ، چۆلێڕا ، کلامێد ئوسا ژی هەنە ، وەکی مالادا دعەفرن ،
وەختا خەباتا مالێ . ئاوا ، کەڤانی وەختی چیلەکا ددۆشە ، بەر خوەدا
کلامەکێ ، تشتەکی دبێژە و چێلەکا هین‌بویی شیرێ خوە تەمام ددە ،
وەختا هەڤیر دکە ، مالێ هلتینە ـ داتینە و شوخولێ دنێ دکە ، دیسا
جارنا دعەفرینە ، چاوا :

کوبار ، بەرفا گوندێ مە شەپەیە ،
دەلال ، بەرفا گوندێ مە شەپەیە ،
ئێلێ گوندی‌یا هەڤڕا گرتن زبارەیە ...

خەباتا زبارەتی‌یێ ، وەختێ کۆما قیز و بـوکا ب سـرێ مال
ب مال هری‌یێ دشکنن ، حازر دکن بۆنا رستنێ بەڕ و خالیچە چێ

دکن ، یا کۆلێـکتیڤیێیە . ئەڤا جۆرێ خەباتێ وەکی ب تەخمینا مە عەمرێ هەلەقەتێیا قەبیل و بەرێزا گرێدایە ، گەلەکی بەرێـدا ناڤا کوردادا هەبویە . ب سرێ ئالی هـــەڤدو کرنە . ب هەلەقەتیێـد پاترۆنۆمیێیێرا تێ گرێدانێ . گەلەك جارا ، گاڤا خالی ـ خالیچە ، جارجم ، لۆپ ، بەڕ و تشتێد هرییێیە دنێ تێنە چێ کرنێ ، قیز و بوکێ گوند دچن ئالی هەڤدو دکن ، وان وەختا دیسا کلام ژی ب جی دعەفرینن . ئا ژ وان کلامانە ئەڤا هانێ :

من هەڤرینـگ ئانی ، پەز بڕی ،
کرە تێڕێ ، برە سەر ئاڤێ ،
من شوشت ئانی مالێ ـ
زبارە کرتن .
من شە ئانی ، زبارە شکنین ،
من تەشی ئانی ، کرە کتۆلی ،
من رست ، من بادا ،
من کرە تەڤن داخست ،
من کەرگیت ئانی خالیچە چێکر .

کلامێ کوردا دەرهەقا پێشەدا کێم تێنن و پەسنێ وان پێشەکزانا تێداینێ ، ئێ کو هۆستێ باشن ، دەستەعمەلن ، ب پیر و پێشەنە .

ئاوا ژ وان کلامانن :

ئەزێ بەختێ وەدامە :

بنهێزن کانێ هۆستە موراد هات ل دکانێ .

بلا کاوا منزا چێکە خەزێمێ :

زەر و زێف ، لال و دوڕ ، جەواهر ب مرجانی .

جماعەتێ ب کلامێ خەباتێ گەلەك جارا پرسێ تەربەتکرنێ ، ئێ خوەشی پێکرنێ پێشدا کشاندییە . ل تەمبەڵ و بێ عەمەلا کەنییایە ، قەرفێ خوە پێکرییە ، تەعنا ئێ ئوسا کرنە سۆسرەت ، مەسەلە :

ئەز چوم خومێ نەمال بو ،

جەوێ دەردێ خوەدا بو ،

گەڤەر خەملا خوە دابو ،

کلا وان مەشکێدا ما بو .

یانی :

وەرنە ژەعژییێ ، ژەعژییێ ،

ژەعژی تینە ، تەڤ تۆماستە ،

کۆرماتێدا کاستە ـ کاستە ،

ناڤێ کاڤانییێ ئالیاستە .

خێنز کلامێ خەباتێ ، کو چاوا هاتە گۆتنێ ، گەلەك جارا خوژی نینن ، بۆنا سڤێککرن و شا دەربازکرنا خەباتێ ، جماعەتێ

ئوسا ژی گەلە قەیدە (مقام) عەفراندنە ، کو ب بلورێ ، زورنێ ، تولمێ ، مەیێ و حاجاتێد دنێ یە سازبەندی یێ تێنە لێخستنێ ، گوتنێ . ئەڤ قەیدە خورێنە و ناڤێد وانرا ژی هەما ئەو یەك کڤشە ، چاوا « قەیـــدێ نێری یا » ، « ســـەراولێ نیری یا » ، « گازی یا پێز » ، « بێریڤـــانێ » ، « لور ـ دە ـ لور » و ئێ دنێ ، وەکی حملی چێراندن ، ئاڤدان بێرا پێزرا هاتنە گرێدانێ . شڤان ب لێخستنا بلورێ ، ب ســـەروێری یا نێری یا هێسا و رەحەت سـەرکاری یێ ل کەری و سوری یێ پێز دکە ، چڤا ژی ئەو کەری سوری مەزن بن و پەزێ هینبوی یێ ب قەیدەکێرا ئیدا تێ دەردخە ، چکا وێ کودا هەرە ، چ بکە : بچێرە ، هەرە ئاڤێ ، رابە شـەڤینێ ، هـەرە بێری یێ و مەخەلێ ...

خ . ئابۆڤیـــان گلیکی وا نڤیسی یە : « شڤانێ کورد تو جارا دەستێ وانا ژفیقێ و بلورا حزکری نابە ، ب وانا ئەو بینتەنـگی یا تەنێ بونا خوە ددنە بێرکرنێ و ب هۆستاتی کەری ـ سوری یێد پێز ل هەڤدوَ دهێورینن(٣) .

خێنژ بلورێ ، مە چاوا گۆ ، ب زورنێ و مەیێ ژ حەیوانا هین دکن . ڤێ دەرەجێدا هینکرنا هەسپا جیکی فەرز دکرە . ئاوا ، عەیانە « قەیدێ جریدێ » و « قەیدێ ســـیارا » . جودا گوتی ، « قەیدێ جریدێ » ئەو روحێ هەســـپانا ، ئێ ئەشق و رەقاس ،

---

(٣) خ . ئابۆڤیان ، کورد ، بنهێرە کتێبا « دەســـتەئول » ، روپێلی ٦ .

دەف و بەزا وانە . ڤێ دەرەجێدا ریتما قانونی ، وەکی بەزا لنگێ هەسپێڕا تێ ییمیشکرنێ ، حەواسکارییا بێحەد و حەســـاب پێشدا تینە . سیار ب هەسپێڤا دبە یەك ل وێ ئۆرتێ دبە تەیرێ هەوابز .

کلامێد دەرهەقا خەباتێدا ، بەشقە گۆتی ئێ وەختێ سۆڤێتیێدا هێ گواڤە ددن و پێشدا تین یەعنی ئەوە ، وەکی خەبات ب کۆلێکتیڤی تێ کرنێ ، مەرف ب کۆلێکتیڤی خەباتا کۆلخۆزی ، سۆفخۆزێ و زەڤۆدێ دکن و هەما وان وەختـــا ژی پێشدا تێن کلامێد تەزە . بریگاد ب هەڤڕ دکەڤنە سۆسلەجیێ و هەر یەك دجەعدینە ، وەکی خەباتێ خوە رند بقەدینە . هەما وان چاخا ژی کلاما داڤێن سەر هەڤدو ، ئەشقێ ، خیرەتێ ناڤا هەڤـــدا پێشدا تینن . کلام ل ڤێ دەرێ دبە بەربینا خەباتچیێ ، کەلا جەعداندنا وی ( وێ ) زێدە دکە . ب ڤی تەحەری پێشدا تێ و هاتنە کلامنە ئوســا ، کو ب سەرجەما خوەڤا لاپ تەزەنە ، مەسەلە :

مە زۆزانێ بلند دانی ،
مە ژکانییا ئاڤا سار ئانی ،
ئەمێ بخۆن قاتخێ تیر ،
ئەمێ رۆن هلدن ژ ماشینێ شیر .
قیز و بوکێ مە کۆچەرێ لێدخن ،
کۆلێکتیف دەرێن سۆسیالیزمێ ،
کانی ، کولیلك نۆتلا هیڤا ،

ئەم خەبەردن و کۆلێکتیڤێ .

وێ تەزەبوونا خوەڤا ئەڤ جورێ کلاما نە کو تەنێ دەوسا ئێ کەڤن دکرن « هۆرۆڤێل ، و ئێ دنێ » ، لێ ئوسازی سیکاڵەکە تەزە ناڤا وێ زارکۆتنێدا پێشدا تینن ، گرێ داین عەمرێ تەزەڕا ، ئێ کۆلێکتیڤێڕا .

ئوسا ژی گەرە بێ گۆتنێ ، وەکی کلامێد دەرهەقا خەباتێـدا ئێ ودعـــدێ مەدا دۆپا ب چاپ ، ب بانـگ و بانـگ تێنـــە عەفڕاندنێ ، ب خانە ـ خان ، مینا ئێ گۆڤەندێ ، چاوا :

هازۆکن ، زۆکن ، زۆکن ،
کێ ئەم هەڤڕا لۆدکن .
دەعوەتا لاوك بکن . . .
ئێڤارێ ، دە زۆ بکن ،
هرینگێ هەڤڕا شەکن ،
دەعوەتا کەچکێ بکن .
دەزۆکن ، زۆ ـ زۆبکن ،
خەباتێ هون زۆبکن ،
دەعوەتێ پایزێ بکن .

کلامێـد ڤی تەحەری ، وەکی ب کۆلێکتیڤی تێن عەفڕاندن و سترانێ ، نەـا گەلەکی دعەفڕینن ، هنە جارا ژی ب دۆ زمانا ، ب

زمانێ ئەرمەنی و کوردی . مەعنـــا وێ ئەوە ، وەکی کـــەلە کۆلخۆزادا و ســـۆڤخۆزادا ئەرمەنی و کورد ب هـــەڤرا دخەبتن ، زمانێ هەڤدوَ زانن . مەسەلە :

(٤) Յոթնամյակն ենք կատարում,

لۆی لم ، لۆی لم ، لۆی لم ،
دایێ ، جانێ عەمرێ خوەشێ سەیرۆکێ .

(٥) Մրցման պայման արեցի,

لۆی لم ، لۆی لم ، لۆی لم ،
دایێ جانێ ، عەمرێ خوەشێ سەیرۆکێ .

(٦) Փոխանցիկը շահեցի,

لۆی لم ، لۆی لم ، لۆی لم ،
دایێ جانێ ، عەمرێ خوەشی سەیرۆکێ .

دەورانا سۆڤێتی‌یێ ـ کلامێد ب سەرەجەما سۆسیالیستی‌یێ و ب جورێ ملەتی‌یێ ـ ئەڤە ئەو قەوماندنا تەزە پێشدا هاتی ، وەکی

---

(٤) حەفت سالی‌یێ ئەم دقەدینن .

(٥) پەیمانا لەجێ گرێدا .

(٦) پەیراقا دەربازۆک من ستاند .

ئەم ناڤا سیکلا کلامێد کوردایە خەباتێدا دبینن . پرسەك ژی ، بۆنا عەفرۆاندنا کلامێد ڤێ سیکلێ ، کرنا کۆمێد خوە عەفرۆاندنا ، وەکی گوندادا ـ ل رەخ کلوبێد کۆلخۆز و سـۆڤخۆزادا ، ل مەکتەبادا هاتنە و تێنە تەشکیلکرنێ ، جیکی مەشور دکرە .

# کلامێد دەرهەقا حزکرنێ

## مێرکرنێ ـ زەواجێ

ناڤا زارگۆتنا کوردادا کلامێد حزکرنێ ( بەنکیتیێ ، ئەڤینێ ) وەکی دنێ چاوا تێنە ناڤکرنێ « کلامێد کەچکا » ، گەلەکن . ئەڤ جورێ کلاما راستیێ ژ پایێ پرێ کەچکا ( قیزا ، ژنا ) بەر خوە دەرخستنە . خێنژ وێ ئەو کلام هەرگێ خۆرتا ژی بـــەر خوە دەرخستبن ، بەر خوە دەردخن ژی ، دیسا حملی ژ عەمرێ کەچکانە ، قیزا گەهیشتی ، ژنا مێرکری : هەرگێ دەرهەقا حزکرنا وێ دابە ، هەرگێ دەرهەقا حالێ وێ و رۆژا وێیە دژماردابە .

ئەڤ جورە کلام ، نەهێزی وێ یەکێ ، وەکی ، قەدرێ وانا وەختا بەرێ تو نەبو ؛ ناڤا مجلسێد مێرادا شەرم حەساب دبو بێنە گۆتنێ ، لێ دیسا ئەڤا سیکلا کلاما گەلەکی دەولەمەندە . مەعنـا ڤێ یەکێ ئەوە ، وەکی ئەڤ جورێ کلاما حملی دەرڤا هاتنە گۆتنێ ، دل ناڤا ئازاییێدا ڤەبویە ، ل چـل و چیـا ، چۆلێ . وەختێ وا نە

تەنێ زار ، لێ عەینی دلا دەنگ دانە هەڤ ، دلێـــد حزکرێ زاری هەڤ بۆنە . وی وەختێ ئەم دوَ مەرڤا دبینن ـ قیزێ و خۆرتێ بەر ب مراز دوَ دلا ، وەکی ژ هەر دوَ ئالیا ژی هەڤ دپەسنن ، حزکرنا خوە بەلودکن ، یانێ ژی گازنێ خـوە ب هەڤدوَ دکن و ب کلاما حالێ دلێ خوە هەڤ ددنە فەعمکرنێ .

ئەڤ عەڤڕاندن حملی یا جاهلانە ، جاهلن ـ ببە قیز ، ببە خۆرت ، وەکی کلامێد وا ژ بەر خوە دەردخن و جابێ سەر هەڤدوَدا دشینن ، یا دلێ خوە دبێژن .

وەختێ وا دل دبـە کلام ، کانیك ، هـــەر دەرا خوە ددە حەساندنێ . خۆرت و قیزا بەنگی ، بەشقە ل چۆلێ ـ کەوشەن ، جێیێ ل زۆزانا ، ل دەشـتا ، ل بنداروکا سـبا زوَ حەتانی ئێڤارا درەنگ دبە کاکە ـ کاکا وانا ، و تو هەو زانیبۆنە شاروَر و بلبل ، دسترێن و خلازبۆنا سترانا وانـ تونە . دل دبە بلبل . حزکرن ، ئەڤینا دل ب کلاما تێ گۆتن و کلام تێنە نتراندن و خوەشکۆتنێ . بۆنا حزکرییا خوە ، یانێ ژی بۆنا حزکرییێ خوە ، دل پێدا ـ پێدا دبە ئاگر . د هندا خوەدا دلێ بەنگی ئاگر ب دلێ مە دیسا دخە ، دل چاوا بەعر فورددە ، پێل تێ پێلا ئوندا دکە ، دبە تێل و قەیتان د ناڤا هەوێدا دچە دکهیژە دلێ حزکری و دکەکینە ، و ئەو گشك ب کلاما تێنە گۆتنێ ، ب کلامێد ئالاڤگوڕ تێنە گوڕکرنێ . دل ئاگر ، کلام ئاگر .

خوەشن ئەڤ کلام ، تەزە ، چاوا بەرفا یەکشەڤی ، چاوا ئاڤا چەعڤکانی یانە سبێ شەبەقێ ، و کوڕن ئەڤ کلام ، چاوا ئاگر ، چاوا ئانتێخ و تەندوَرا زمزمی ، و ب کەلن ، چاوا سێلا سەر ئاگر کەلپێ کەتی . ئو بێ حەسابن ئەڤ کلام ، وەکە ستەیرێد رو عەزمین ، وەکە گول و گیێ زوزانا . هەر دلەك کانەکا کلاما ، هەر دلەك بەرەکە کلاما . دل دبە دەنگبێژ . ئەڤە مەعنیا گولڤەدانە کلامێد کەچکا ، ئێ حزکرتێ ، بە نکیتی ی - ئەڤینی بێ د ناڤا جاعەتا کورد ادا .

ناڤا کلامێد ئوسایە تەبیەتی یێ یە حازرعفرێدا تێنە پەسناندنێ قیزکێ (کەچکێ) ، چەعڤێد وێ یە بەلەك ، یانێ رەشە ئاگرێ ، بەژنا وێ یەتاژهان ، زراڤە بلند ، چال و چار گولی یێد وێ بە درێژ ، رێڤاچونا وێ یە وەکە یا محینا کحێل ، خەبەردانا وێ یە شیرن ، دەف و لیڤێد وێ یە زراڤە مینا کاغیتێ ، تلی - پیچی ییێد وێ یە مورموری . تێن پەسناندنێ ئەو ، چ کو سازی وێ و بەژن و بالێ وێ تێ . ئاوا :

دەلۆ ، لۆ لاوکۆ ،

سەرێ من قوربانا سەرێ تە بی یە ،

وەرە وەزێ سالخ - سوخلێ ،

زێری بێ مالا قوتو تەرا بدم .

زەری یی مالا قوتو دئوسانن :

ناڤکێلێ وانە زراڤینە ،

بەژنا وانە قازاختینە ،

لنگێ وانە کوندەلێ سوره فرنگینە ،

گۆرێ وانه ساقێ عەجەمێنه ،
دەڤ لێڤێ وانا مژمژۆکێنه ،
سورەتێ وانا سۆره خال ـ خالێنه ،
ددانێ وانه سەدەفێنه ،
چەعڤێ وانه رەشە لەگلەگێنه ،
برۆیێ وانا رەشە قەیتانێنه ...
مەرڤ مالا خوه بدە ، سەرێ خوێ بدە ،
یەکە ئوسا خوەژا بێنه ،
توجار ، توجار پوشمان نێنه ...

کلامێد « کەچکا » د ناڤا خوەدا نەکو تەنێ بەدەویا قیزێ ددنه کفشکرنێ ، حزکرناوێ ، لێ ئوسا ژی دەرد و کولێ وێ ، گازن و شکیاتێ وێ دەرهەقا وێ یەکێدا ، کو چاوا ناهێلن ئەو ب دلێ خوە هەژە مێر . ئەختیاریا وێ ددستێ دێ و باڤێ وێدانە .
شکیاتێ قیزێ ، ئایهای ، بەرێ عەول ل سنفا دەولەمەندیا خوەش نەدهات ، وەکێلێ کیژانێ دکاربون سێ ـ چار ، دهـ و دەنزدەهـ بستەندنا ، لەما ژی کلامێد ئوسا ژ ئالیێ وانا پێکەنی و شەرم دهاتنه حەسابکرنێ . گەلەك کلامێد ئوسائێ ئاساخیێ بۆن و چڤا جی نەددان وانا ، ئەو ئاڤا ل هەڤ هێ زێدە دبون . قیز ، ژنا کورد ب کلامێد خوە نەکو تەنێ شکیاتێ خوە ددا بەلوکرنێ ، لێ ئوسا ژی بۆنا ئەختیاریا خوە شەڕ دکر پێشبەڕی عەدەتێ کەڤن .

ئاوا ، نها ئەم بسەکنن سەر چەند پرسا ؛ ئێدکو ناڤا « کلامێد کەچکادا » ژی گرتنە .

ژ وان پرسا یەك یا قەلەنە .

قەلەن ، بەرێ عەول نیشان ددە ، وەکی قیزا کورد ، یانێ ژی ژنەبی وکیلا مێرکرنا خوە تینە وەکیلێ وێ و مێرکرنێ ئەو مەرڤن (باڤ ، برا ، کوڕئاپ و ئێد دن ) ، ئێد کو ئیزنا وانا هەیە قەلەنێ وێ ببڕن ، قەلەن بستینن . دەرهەقا ڤێ نەهەقیێدا گەلەك و گەلەك کلامێد ب نێتا نفڕکرنێ و شکیاتکرنێ عەفرینە . قیز حەتا نفڕێ دێ و باڤێ خوە ژی دکە ، شکیاتی پێشیا وی عەدەتی دکە ، وەکیچەتنایا پێشدا تینە ، ناهێلە ئەو ب دلێ خوە هەڕە مێر .

ئاوا ، کلامێد تێ گۆتنێ :

دە برا خوەدا قە دێ و باڤێ منزا قە هلنەدا ،
دە چاوا نەدابۆم خۆرتەکی چاردە سالی
مال ب گوند ، دلێ من تێ هەبۆ .
دامە قونجکێ بەزیێ کەڕەشڤانێ مالێ ،
نا وەلە سەڤ خاترێ چار کاپێکێ دنیالکێ .

ب « چار کاپێکێ دنیالکێ » ، وەکی دەوسا خەبەرا قەلان هاتنە گۆتنێ ، قیزکا مێرکری ، دکەڤە دەستێ یەکی ئوسا ، کو مەرڤ ژێ زەرزەندە دبە ئاوا ، دیسا د وێ کلامێد تێ گۆتنێ :

ده برا خوەدێ دێ و باڤێ منرا قه هلنەده .
ده چاوا نەدامه خۆرتەکی چارده سالی مال ب گوند ،
دلێ من تێ هەبوو .
دامه قونجێ پیسێ مێرا . داری کارنیخێ ،
ساڤێری ڤۆلۆ ، چیمێ دەڤ کولەکێ ،
ئاترۆستی مێرا -
سبێ حەیا ئێڤارێ سەر سینگێ کەڤەر ،
درێژه گەندێ ، گەمارێ ، خلینکێ ، ڤێ گیلازێ .

کلامێد وایه ب نفڕ چقا بێژی ، مەرڤ دکاره بینه ئۆرتێ گاڤا دانه کالێ ٧٠ ـ ٨٠ سالی ، یانێ ژی قیزا گهیشتی ، یان ژی ژنابی گەدەکی تفال ، زاڕو . ئاوا :

ئەلەگەزێ ل وان گرا ،
برا کوڕێ سەبابکارێ من بمره ،
چاوا سالا ئیسالین .
دەستێ من گرتن .
دانه گیسکێ کوڕی ناف کاڤرا .
ڤرا فەمەداری‌یه ، وەکی «گیسکێ کوڕی» گەدەیه ، ئێ عەمردا چوك .

تونەبوونێ ، یانێ تەمایا مالێ دنێ ، گەلەك جارا قیز بێ دلێ وێ هەما مالدا دانه مێر ، دانه کوڕئاپ ، کوڕ خالێ وێ ، وەکی

قەلەن نەدن ، یانێ ژی کێم بدن و ئەڤێ یەکێ دیسا هێسر وگری ، هکیات و گازن پێشدا ئانی‌یە . کلامێدا وا تێ گۆتنێ :

منێ خەونەك دی‌یە ژ خەونێدا ،
چار ساله خار بوٚم سەر خانێدا ،
خوەدێ رەشکە مرازێ مالێدا .

ناڤا «کلامێ کەچکادا» ، تەنێ دەرد و کولێ کەچکا نینە ، وەکی تێ‌خانێکرنێ ، ڤێ دەرەجێدا خوٚرتێ کەسیب ژی ژ دەستەنگتی‌یا دنیالکێ نکارن قەلەن بدن ـ بگهیژن مرازێ خوە ، حزکری‌یا خوە بسینن :

خوەدێ مالێ دنێ خراب بکە ،
مالێ من هندکە ،
قەلەنێ کاوا کوبارا من دەرنایێ .

قەلەن پرسەکە سوٚسیالی‌یێ‌یە : هەبوٚنا کێ هەبوٚنە کو تەنێ دکاربوٚ قیزا هەره بەدەو بستاندنا : قیزا چوٚك ، یا مەزن ، ژنەبی‌یێ ، لێ ئوسا ژی چەند بکرا ، وەکی دنێ چاوا دبێژن هێوی بانی‌یا . هێویتی عەمرێ ژنا کورددا وەکە مرنێ بوٚیە ، وەکە روٚژا رەشە حش ، چاوا :

دەردێ هێوی‌یێ دەردەکی گرانە ،
نەیێ سەرێ کورێ چیانە ،

ئەیێ سەرێ دار و بەرانە ،
ئەیێ سەرێ کەڤرانە ،
کوچکێ سەرێ چیانە ، -
دەردێ هێویێ زەعف گرانە ،
ئۆلانی ڤۆلنجیا روڤی‌یانە .

ناڤا کلامێد کوردایە حزکرنێـدا جیکی کفش دگرن کلامێد دەرهەقا خەریبی‌یێ ، یانێ ژی ، چاوا دبێژن ، «کلامێد خەریبی‌یێ» . خەریبی دوَیا گرێـدایی بتۆیە تونەبتونێڕا : ژ دەستێ تونەبونێ جاهـل چۆنە جی‌یێ دوَر - خەریب ، وەکی بۆنا پاری نان بخەبتن ، کو قەلەنێ خوە دەرخن . خەریبی ، ئوسا ژی ب ئەسکەری‌یێڕا گرێدایی بتۆیە ، ب گرتن و ســـوڕگونکرنێڕا . بەیت - ســـەرهاتی یێڕا « مەمێ و عەیشێ » هەما دەرهەقا وێ یەکێدانە .

قیزێد بەر ب مراز ژ کوڕایا دلێ خوە نەعلی‌یانە و ڤێ پرسێدا گەلەك - گەلەك کلامێد ئاگر ئالاڤ ب هەڤ ئانینە ، گۆتنە گازن و شکیاتێ خوە ل بەر ســـەبەبا کرنە . ئاوا ، دەرهەقا خەریبی‌یێ ڤی تەحەری هاتی‌یە گۆتنێ :

زەوال گەدە ، دچی وەلاتێ خەریبا ، من بێر نەکە ،
من سێڤەکە خەلاتیکە -
بەری‌یا خوەکە .
وەختا دچی وەلاتێ خەریبی‌یێ ،

بینا تە تەنـگ دبە ـ دەرخە ،
ئەشقا من و خوەڕا قاسەکێ لێ مێزەکە .
خەریبیێ ، گەلەك جارا ، وەختەکی درێژ کشاندیە ، سالا :
هەتا خەریب ڤەگەڕیانە حزکریا وی دەست خوە چویە ، پیر بویە ،
پۆرێ سەرێ وێ سپی بویە .
نەما ، نەما ، کەلەش لاوکۆ ،
لاوکێ من چویە خەریبیێ ،
دەرەنـگی بو ، دەرەنـگی بو ،
حەتا هاتبو چەرمێ جانێ من ماشیا بو ،
پۆرێ سەرێ من سپی بو .
سـەبەبیا خەریبیێ گەلەك بەخت و مراز شحتینە ، دو دلێ
حزکری نەگهیشتینە مرازێ خوە ، و مرازێ وان چەعڤادا مایە ،
ئاوا :
کەوا گۆزەل دەرکەتیە دەرێ مالێ ،
سەر ملێ چەپێ من دنهێڕە ،
سەر ئانیا کەڤەردا خالکری چار گۆل زێڕە .
حەتانی چوم وەلاتێ خەریبا ، ڤەگەڕیام ،
دەستێ کەوا کۆزەل گرتنە دانە مالی مێرە .
قیز ، ژنا کورد ، وەکی ژ وی حالێ چەتن دەرێ ، ژ خوەڕا
رێ دیتنە : ئەوێ بەرێ عـەول نفڕینە کو تەنێ دێ و باڤێ خوە

کرنە ، وەکی دەستێ وێ گرتنە زۆرێ دانە مێرێ نە ب دلێ وێ ،
لێ ئوسا ژی نفرێ ل وان دەر و جینارا کری‌یە ، ئێ کو « ئۆرتا
دۆ دلادا ، چار چەعقادا » فەسادیێ کرنە ، قۆسیتی کرنە ، چاوا :

مالی ـ گوندینۆ ، هەڤال ـ هۆگرنۆ ،
هەرچا ئۆرتا من و ئەما حەمودا خەبەردە ،
برا مالا وی مالانە دەربە ،
تژی مەعر و مشك ، دۆپشکێ ل زەربە ،
برا بوکا مالێ تمێ ـ تمێ ل ستەور بە ،
برا قیزا مالێ حەڤت سالی‌یا خوەدا زکی ل بەربە ،
برا جاهلێ مالێ‌یێ مرێ بە ،
مالخوێ مالێ‌یێ بەر مەزەل بە ،
خولە ـ خولا قازی‌یان و مفتی‌یان ها ل سەربە .

ژن ، کولفەتا کورد ، وەکی پاشمایێ ماتێریارخاتێ ( دێـپادشایێ )
جەم وێ هێ دما ، تم جارا دجێژباند ، وەکی ژ وی حالی دەرێ ،
بکاربە ب دلێ خوە هەژە مێر و مێر بکە . جارنا ئوسـا دقەومی ،
وەکی ئەو دچوێ سەر حزکری‌یێ خوەدا رۆدنشت[۱] ، دچو مالا وی و
ئیـدا ژ مالا وی دەرنەدکەت . ڤی تەحـەری یا[۲] دلێ خوە دکـر .
هەرگێ دەرهەقا ڤی جورێ مێرکرنێـدا کلام تونەنە ، یانێ کێمن ،
لێ دەرهەقا رەڤا ژنێـــدا گەلەك جورێ زارگۆتنێ هەنە و ئەو قیز
هاتی‌یە پەسناندنێ ، یا کو ب حزکری‌یێ خوەڕا رەڤی‌یە . نە گۆرە

دایە دێ و باڤا ، نە دەر و جینارا . ئەڤێ یەکێ جماعەت ژی ب مەسەلا خوە هەق دکە : « رەڤا ژنێ ، عەدەتێ دنێ » .

ئەڤا جورێ مێرکرنێ ئوسا ژی ناڤا بەیت ـ سەرهاتیێد کوردایە ئێپیکیێ ژی تێنە خانێکرنێ ، چاوا « خەجێ زەرێ و سیابەند » ( خەجێ ب سیابەندرا دەرڤە ) .

ڤێ دەرەجێدا تەنێ پرس ئەو تێنە ، وەکی خوەرت ب زۆرێ قیزکێ بڕەڤینە ، یانێ ژی خوەستن تەنێ ئالیێ خوەرت بە . نا ، تەنێ ئەڤا یەکە تێنە . پرس ئەو پرسە ، وەکی ئەو یەك حملی ژ ئالیێ قیزێ ، ژنێ دبە ، و نەکو تەنێ ب قایلبونا وێ ، لێ ب خوەستن و شێورا وێ ژی . ئەو گەلەك جارا جابێ دشینە سەر حزکریێ خوە ، وەکی بێ وێ بڕەڤینە ، رێ نیشان ددە ، چکا چ چاخ بێ ، کی ئالی بڕەڤینە و ببە کیژان گوندی مالا کێ . ئاوا ، کلامەکێدا وا تێ گوتنێ :

بەژنا دێری ، بەژنا دێری ،<br>
مێرێ کۆنی ، خوەلی سەری ،<br>
گەدە قوربا ، ئەزێ دبێم :<br>
ئیسال پێزا وەرە من بڕەڤینە ،<br>
کێ نەوێری . کێ دترسی ؟<br>
دارا بەر دەرێ باڤێ من زیتونە ،<br>
شاغێ دارێ بەرژێر چونە ،

دەتو وەرە من بژەڤینە ،
دێ و باڤێ من هەمن ،
گۆتنە خوە پوشمان بونە .

را پرسەکە حەوەسکار ژی ئەوە ، وەکی دێ و باڤێ قیزێ ژی دەخوەزن ، کو قیزا وانا ب خوەستی‌یێ دلێ خوەژا بژەڤە .

ڤی تەحەری پرسا هلدانا عەدەتێ کەڤنی – مایی تێ ئۆرتێ ، وەکی زرارەکە مەزن ددا هەرچێ خەباتچی . کلامەکێدا تێ گۆتنێ :

وەی دل ، وەی دل ؛
خوەدێ را حاسل نەکە مرازێ بێ‌دل ،
مرازێ بێ دل ئوسانە ،
نۆلا باغ و باغچێ بێ گول ،
نۆلا گاکی رەشی ، قۆلی بێ جل ،
نۆلا مەشکەکێ ،
دەستێ جۆتە پیرێ حەفتاسالیدا بێ کل .

یان :

را دلی دل بە ،
را سەر من جل بە ،
مل من شل بە ،
تورێ پارسێ ملێ من بە ،
کۆتکی من قالکێ کوسی بە ،

پێخوەرنا من پێسیرێ چۆلێ بە ،
کراسێ جانێ من تونە بە
گایێ منی بێ جل بە ،
تورکێ پارسێ بیم مل بە ،
بنێ تورێ قول بە ،
پارسا ڤرا نێن بە ،
پارسا وەلاتێ دوَر بە ،
تەکدە برا دلی دل بە .

ئەم ئوسا ژی ڤرا بێر نەکن ، وەکی مەسەلێ زۆرن چاوا ژ دلێ قیزێ ، ئوسا ژی ژ دلێ خۆرتن ، بیرنەکن ولێ پرسێ ژی ، وەکی دێ و باڤا گەلەك جارا کوڕێ خوە ژی بێ دلێ وی دزەوجاندن . لێ چاوا بکن ، وەکی ژ ڤی حالێ « بێ دل » دەرێن ؟ ئا ، هەما دەرهەقا ڤێ یەکێدا ژی قیزا کورد ، ئوسا ژی خۆرتێ بەر زەواجێ ، پرسا سبێ ناڤا کلامێ خوەدا پێشدا دکشینن . ئەوە گەلۆ چ چاخ ولێ بێ ئەو زەمان ، وەکی قەلەن بێهلدانێ ، ژن ب دلێ خوە هەڕە مێر ، خۆرت ب دلێ خوە بزەوجە ، وەکی ژن هەرگێ لازم بە ، مێرێ نەئانگۆری خوە ئازابە ، دێمەك ، ژێ جهێ بە ، هەڤد و بردانێ ژێ بستینە . کلاما « بێریڤانێدا » تێ گۆتنێ :

بێریڤانێ ، دەردا سەر دردا ،
هێشین دکە کیهایێ حەمتو عەردا ،

جابەکێ بهاتا بەردانا ژنێ بۆ عەدەتە .

دەنگبێژ خوەزلا خوە تینە وێ رۆژێ ، گاڤا جاهل ب چەعڤێ خوە ببینە ، دلێ خوە بحەبینە هێژا بزەوجە ، چاوا :

خوەزلا من وی عەڤدی ،
چەعڤێ خوە دی ، دلێ خوە زەوجی .

یانـــی :

خوەزکا وی مەری ،
پێ خوە بگەڕە ،
چەعڤێ خوە ببینە ،
کێڤا دلێ خوە زەوجی .

ژنا کورد ئازابۆنا خوە ناڤا دەولەتا سۆڤێتیێدا ستەند . ل ڤێدرەرێ هات هلدانێ عادەتێ کەڤن . ژنا کورد ، چاوا کو هەر ژنەکە سۆڤێتیێ ، ژ هەر چەتنایا خلازبۆ ، پێڕا ژی هاتە هلدانێ قەلەن . ئو ئەو رۆژا ، کو چقا ـ چقا قیزا و خۆرتا دخوەست ، وەکی بێ رودنێ ، ب دەستی دەولەتا پالا و گوندیا هات ـ بۆ رۆژا فرە . دەرهەقا ڤان پرسادانە کلاما « دلبەرێ » :

ئێلێ ، دلبەرێ تۆڕنێ ،
دە برا شێن بە دەولەتا شێورێ ،
ئە ز و دلبەرا خوە کەتنێ .

وەختێ مەدا ل وەلاتێ سۆڤێتیێدا کلامێد دەرهەقا قەلاندا ، ئێد خەریبیێ ، هێویتیێ ، ردڤا ژنێدا ئیدا نائێنە عـەفزاندنێ : ئەو هاتنە هلدانێ ، دەست ب کلامێد تەزە بونە ، گرێ دایێ حزکرنا « دلی دلڕا » عەسل حزکـر نێڕا :

خۆش بە دیوانا شێورێ ،
قەلەن هاتە هلدانێ .
قیز ، خۆرت بەختێ خوە شانە ،
دەورانە مە خوەش دەورانە ....

## کلامێد دەرهەقا تەبیەتێ

تەبیەت ئـەو نەخش و نیگـارا کلامێد جماعەتا کـوردە . ب وێڤا خەباتچی دلێ خوە ڤەدکە و چکو دلێ ویـدا هەیە بە خەبەرێ بەدەوییێ دنترینە . تەبیەت ، ڤێ دەرەجێدا ، مینا کلیتەکێیە ، کو دلێ وی ڤەدکە ، ددە خەبەردانێ و ب خوە ژی دل ڕا دبە یەك . ئەو ب سێورداریيا خوەڤا پێڕا دکێلمە و ب خوە ژی دبە روحبەرەك . چیا ، گەلی و گەبۆز ، گێدوك و زەرا ، زنار و قەیا ، با و باگەر ، بەرف و باران ، تەیرۆك و لێیی ، جەو ، کانی چەمێد لەمە ـ لەم ، عەور ، مژ و دومان ، ستەیرێد رو عەزمین ، هیڤ و رۆ ، گـول وگـیها ، گـولیلکێد حەزارنافی ، باغ و باغچە ، رەزێد تریيا ، کارێد

کارخەزالا ، کەو شەیر ، شەڤ و رۆ ، رۆزگارێد سالێ ، ـ ئەڤ گشـــك خوبەر ـ خوبەر د ناڤـا کلامێدا هەما ئوســـا تێن و و جی ـ وار دبن ، دل ددنە سترانێ ، دکەنە دەنگبێژ .

هەرچێ چیا ئەو روحێ دەنگبێژێ کوردە ، جی ـ مسکەنێ حزکرنا وی ، ب ویڕا تەڤایی کول و دەردێ خوە رۆ دکە : ب وێرا تەڤایی شا دبە و ب وێڕا تەڤایی دژمنێ خوە ئالت دکە . چیا پشتوڤانێ وی‌یە ، وارێ مرازا ، دلکەتی‌یا .

ناڤا زارگۆتنا جماعەتا کورددا ناڤێ گەلەك چیا راستی مە تێن ، چاوا ـ چیایێ جودێ ، چیایێ شەنگالێ ، ئێلەگانێ ، گۆسەداغێ ، بینگۆلێ ، چیایێ سیپانێ خەلاتی ، گریداغێ ، سینەکێ ، توژك بابا (ئێ دێرسیمێ) و ئێـد دنێ . هەر گێ ئەم ڤێ پرســـێدا موژول بن ، گـەلەك ، ناڤێد ئوسا ئەم دکارن بیر بینن ، چمکی کوردی ل کێدەرێ بتویە ، کیژان چیا دیتی‌یە دەرهـــەقا ویدا ژی ئانی‌یە بیراخوە و د ناڤا عەفڕاندنا خوەدا شکلکرنێ .

خـەبەرا چیا د ناڤا زمانێ کوردیدا گـەلەکی تێ ئاخاڤتنێ ، ئوسا ژی ناڤا مەسەلادا ، چاوا :

چیایێ بێ گول ،
مەرڤێ بێ سوژ
هەردوٙ ژی یەکە .

ڤێ دەرەجێدا ،چاوا تێـــن ، پارالێلیزم ، عەفڕاندن هێ تێ

نتراندنێ ، روحبەر دبە .

لێ عەفڕاندنا ئوســـا ژی هەنە ، گاڤا چیا ب خوە ، چاوا مێرخاســـەك ، خوەیی و خودانەك ، تێ پەسناندنێ . ئەوە ، وەکی ستارێ ل خەلقێ زێراندی ، کەسیری ، وەستیای دکە ، ب جەو و کانیێ خوە هەر دەرا شێن دکە : ئەوە ، وەکی مێرخاسێد وی ناڤا کەڤر و کوچکێد ویدا ل بەر زنارێـــد ویدا ب ئەسکەرێ دژمنڕا شـەڕکرنە و ئالتکرنە . چیا بتونە پشت و پشتوڤان ، چاوا چیایێ گریداغێ ، تۆژك بابێ و ئێ دن . « چیایێ بلند ژ جینارێ خراب چێترە . » ـ جماعەت وا دبێژە . لێ چیـــا ژی هەنە ، وەکی جی مسکانێ زۆزانن : هەر دەرا هێشایی ، گول و گیها ، جەو و کانی ، ل کو کەری ـ سوریێد پێز دچێرن ، گازانێد دێوێر ، ل کو دلـکەتی راسـتی هەڤدو تێن و دگهیژنە مرازێ خوە . ڤێ پرسێدا ئەم دکارن بیر بینن چیایێ سیپانێ خەلاتێ ، ل کو بەیت ـ ســەرهاتییا « سیابەند و خەجێ » هاتییە عەفڕاندنێ . ئا ، چیاکی ئوسـانە ژی چیایێ شەنگالێ ، وەکی ناڤا گەلە و گەلەك عەفڕاندنادا تێ بیرانینێ .

هەما ژ وان چیـــا یەك ژی چیایێ ئەلەگەزێیە ، کو ئاڤا زەعف د ناڤا عەفڕاندنادا تێ بیرانینێ و پەسناندنێ . باوەڕ بکی دوڕا کوردێد ئەرمەنستانێ ل دۆرا ڤی چیایێ عبارەکن ( چاوا گوندێد کوردێد نەحیيا ئاپارانێ و نەحیيا تالینێ ) . گەلەکێ وان گوندا هاڤینا ب فێرمێ کۆچکۆزارا دچن ل وی چیـــایی کۆن و چـادرێ خوە

ڤەدگرن . ب گول و گیهێ وی ، ب ئاف و چەعڤـکانییێد وی ، ب تەیر و تویێ وی متحەیر دمینن و شا دبن .

چیایێ سیپانێ خەلاتێ ، ئوسـا ژی ئەڤ چیا ، نە کو تەنێ چێرەیە ، لێ ئوسا ژی جی - مسکانێ دلـکەتییانە ، حزکرن و ئەڤینێیە . ئەلەگەز ، ئوسـا ژی چیایێ بەخت و مرازانە ، چیایێ دەف و دەعـواتا ، شـــایێ و حزکرنا دلا . و ئەڤ کشك د ناڤا کلامادا تێ گلی کرنێ ، گۆتنێ :

ئەلەگەز ، ئەلەگەز ،
ئەسمەر ، جانێ ،
ئەلەگەزێ ، جۆت کانێنە ،
ڤان جۆت کانییا من گول چنێنە .

پەسنێ ئەلەگەزێڕا تەڤایی تێ گلی کرنێ دەرهەقا کەری - سوری ، گازانادا ، وەکی لێ دچێرن ، پێڕا ژی دەنـگبێژ یا دلێ خـوە دبێژە :

بهارە ، مالێ مە دەرکەتنە ئەلەگەزێ وێ ل رێزێ ،
کەری هۆگاجا ، ناخرێ گا ،
رەڤۆیێ هەسپا خوە دابۆ فێزێ ،
برا خوەدێ بکرا مرازێ مرازخوەزا ،
مرازێ من و کەوا گوزەل .

شەڤەکێ سەرێ ئەلەگەزێ ـ

ژ ئێڤاردا بهاتاما خەونێ .

چیا نەکو تەنێ بهارا و هاڤینا تێنە بیرانینێ ، لێ ئوسا ژی وی چاخی ، گاڤا بەرف لێ داتینە ، کەسەك واندەرا نامینە ، ئاوا :

سینگ و بەرێ سەیرانا مەلە موسا ئوسانە ،

حەساڤێ بەرفا ئەلەگەزێ یەکشەڤی خال کەتنێ ،

ناڤا کلامادا ئوسا ژی دەرهەقا قەیا و زنارادا ، گەلی و گەبۆزادا تێ بیرانینێ ، چاوا :

کولمال ، گۆندی دۆدۆ گە گەلێنە ،

جۆتێ زەر مەمکا چەعڤکانێنە .

گەلە کلام دەرهەقا جەو کانییادانن ، بەرف و بارانێ ، دەنگبێژ تێ دەردخن ، چکا عەورێ چاوا ، چچاخ پێشدا تێن ، مەسەلە :

زەری دۆمامێ ، عەورێ رەش بارانە ،

عەورێ سپی زڤستانە ،

عەورێ رەش بهارێ سەرێ مییانە .

رۆژگەرێ سالێزا کلام ژی دعەفرە ، لێ حزکری ، چاوا « گول » پێشدا تێ و ب نێتا فکرگوهێزێ ئەم ب فکرێ دچن ناڤا تەبیەتێ :

ئەزێ گولم ، گولا ڤێ کەڤرێ ،

سوڕا هاڤینێ ژ خوەڕا بری .
گەدە لاوك كۆ —
من ژ تەعفی ، تەیرۆكێ .
بهارێ قۆرخكری ،
تەعفی‌یا هاڤینێ لێخست .
سوڕا پایزێ ژ خوەڕا بری .

ناڤا كلامێد تەبیـەتی‌یێ ـ حزكرنێ پەسنێ گولێ ، گیهێ ، هەرچێ كولیلكێد دنێ تێنە داینێ . گول ئەو نیشانا حزكرنێ‌یە ، ئوسا ژی تەمامی‌یا كولیلكا . ناڤێد گەلە كولفەتا گولێ‌یە : گول‌بەهار ، گولشێ ، گولپەری ، گولچێ ، گولباری ، گولشا ، گولشن ، كولیلك ، رحان ، سۆسن ، چیچەك ، زۆزان و ئێ دنێ . د رەنگێ وان گول و گیهادا قیز و كولفـــەت كنجێد رەنگاوازی ل خوە دكن ، و هەر یەك ژی ، تو هەو زانی ، دبە كولیلكەك ناڤا گوشەن ، گول و گیهێ‌دا . ســـەر گول و گیهێ گەلەك كلام عەفڕینە ، مەسەلە :

كاوا گۆزەل منڕا گۆتبوو :
ـ كوڕۆ ، گەدە دوری من هەڕە ،
هەڕە گولا ، سۆسنا ، رحانا ،
داركا ، میخكا ، كۆكا قەرەفیلێ ،
كۆكا بەیبوونێ ، تەعڤدا دەستێ خوە مەدە .

ناڤا کلامێد وادا دەرهەقا هیڤێ ، ستەیر و پەیرێ رو عەزمیندا گەلەکی تێ گۆتنێ . کلامێد ئوسا ، حملی شەڤ تێنه عەفرِاندنێ ، ئەو خەباتچی دعەفرینه ، ئێدکو خەباتا وانا د چۆلێیه — شـــەڤه . وەکی دنێ عەفرِاندارێد وانا پایێ پرێ شڤانن ، هەرچێ خەباتچییێ دنێ شەڤێ و رێوی . شەڤا کەرِ ب کاکا ـ کاکا دەنگبێژرِا تژی دبه ، عەمر تێدا دکەله و دخەمله ، چاوا :

گولێ مەعرومێ ،
هاڤینه ، حەیامێ دلوك و دەعسێ ،
ستێرکێ عەزمانا ب هەڤرِا کەتنه کین و بەعسێ ،
دەستێ دلێ رەزیل ، ئەزێ بۆمه مەجروم ،
کەتمه کێف و رەقەسێ .

ئوسا ژی دەرهەقا همبەرکرنا گەلەك حەیوانێ کەدیکرێ و ئێد نەکەدیکرێ تێ بیترڤانینێ و گۆتنێ . قیزێرِا دبێژن ـ خـەزال ، کێوریشك ، کەو ، کەڤۆتك ، وەردەك ، خامبـەردیر ، کحێل و ئێ دنێ . خۆرتارِا دبێژن ـ تەیر ، نێچیرڤان و ئێ دنێ . چاوا :

دلێ من هێلینا تەیرێ لاله ،
جۆت خەزالا گەله ـ گەله ،
دێ و باڤێ من دەستێ من گرتن ،
دانه یەکی کاله .

خۆرت پێشدا تێ چاوا تەیرێ « وەستیای » ، « پەرِو باسك »

لێ وەشی‌یایە : یان :

ئەزێ تەیرانە تەیرێ رەشم ،
منێ دانی‌یە سەر سورا دیاربەکرا وێران ،
پەڕ و باسکێ من وەستیانە ،
قام ـ قەناتێ من وەشیانە ،
ئەزێ ڤێ سبێ نکارم پێ بەشم .
قیز ژی پێشـدا تێ چاوا بەرف ، خەزال ، بەردیر ، چاوا :
خەزال جاتێ ،
ئەزێ بەلەکی‌یا بەرفی چیانگێ بلند مامە ،
تاڤا سڤێ ، بانگێ عەجەم دایە منێ ،
هێدی ـ هێدی ئەز حەلیامە ،
ئەزێ یار ڤی چاخی بەردیرەکە
پالە ـ پالە بسکە دارەکە ناڤ کەری‌یا بتوم ،
ئەزێ ژ ئیسال پێڕا کەتمە
دەستێ کۆتی شندۆکێ لاوکێ مێرا ،
پەڕ و باسکێ من وەشی‌بانە . . .

چاوا ژۆری هاتە گۆتنێ ، دەگمە کلام هەبن ، وەکی بێ نەخشێ تەبیەتێ بن : حزکرن و تەبیەت تەڤ پێشدا تێن ، خەبات و تەبیەت ب هەڤڕا پێشداتێن . تەبیەت ـ ئەو نەخشێ رۆکری‌یە ، وەکی هەر دەکبێژ ، عەڤڕا: دارەك ، ژ خوەڕا تشتەکی ژی هلـددە و ب دل

نێتا خوەڕا ددە خەبەردانێ . تەبیەت ب خوە ـ خوە ناڤا هەر عەفرٛاندنەکێد . باوەڕ بکی ، تێ ئۆرتێ ، ددێ ، پەڕ و باسك دکە . لەما ژی کلامێد دەرهەقا تەبیەتێ خوڕی ، یانێ خوت کێمن .

وەکی تەبیەت ، دۆر و بەر ، چـل و چیا ، و ئێ دن ب نەخش و نموشێ خوەڤا خەملا هەر عەفرٛاندنە کێنە ـ ئەو یەك جماعەت ژی هەق دکە :

هەڕە مێشە ،
هلدە پێشە ،

دەرەجێد نەخشێ تەبیەتێ گەلەکن ، ائێ چمکی ئەمێ ئەڤی سەرێ پەیهاتیدا ژی بینن بیر ، دها پرسێد دنێ پێشدا ناکشینن .

# هەڤانینا کلاما

کلامێد دەرهەقێ خەباتێ تەبیەتێ و حزکرنێ ، چاوا هاتە گۆتنێ ، جـی ب جی ، هاهانکا دعەفرٛن ، ئەو مینا خەبەردانینە ، گاڤا یەك یەکیڕا دلێ خوە ڤەدکە . ائێ فرقی ئەوە ، وەکی دەنگبێژ ئەڤ جوڕێ کلاما دوبا خوە و دلێ خوەڕا هەڤتینن ، ل چۆلێ وەختێ خەباتێ ، تشتەکی دۆر و بەرێ خوە دەبینن ـ زنارا ، ئاڤێد چەما ، گول و گیها و وی چاخی یا دلێ خوە ژی پێرا ددن گرێدانێ . زارێ مێرڤ خوبەر ـ خوبەر دلپتە ، دکە کاکە ـ کاکێ ، ب سایا

قەیدا و بانگا خەبەر ل هەڤ تێن و دبن کلام ، خەبەرەکە خوەش ، یا دل . ڤی تەحەری حەزارا کلام پێشدا هاتنە و تێـن . ژ وان کلاما ، وەکی ئێ لیریکیێنە ، گەلەك هەما گـوتنێڕا تەڤایی ژی ئونـدا بۆنە ، بەتلینە ، جارەکـێ هاتنە گـۆتنێ و پێڕا ـ پێڕا ژی هاتنە بیرکرنێ ، باشقە ، گاڤا یەکی تەنێ خوڕا گـوتیە . گـەلەك ژی ، ئیلاهی ئێ قەوماندنەکێڕا گرێدایی ئێ کورنێتە بەدەوگۆتی ، ژ ئالیێ گـوهدارڤانا تێنە هلدانێ ، ئەو ژی دەستخوەدا دناڤا جماعەتێدا بەلە دبن وبەرە ـ بەرە گوهاستنێد خوەڤا دەور و زەمانا‌ڕا خەبەر ددن. هنـەکێ ژ وان مەرف نـکارە تـێ دەرخـە ، چچاخ ، ج زەمانی و ل کـێدەرێ هاتنە عەفڕاندنێ ، چاوا :

بارانێ ، ببار ، ببار ،
جوجکێ نانێ تە خوار ،
قژکێ تە کر هەوار .

روبەیتێد وا جیگرتنە خوەڤا مەزنێنن ، لێ د هەر یەکێدا نێتەك هەیە و ئەو نێت ب خەبەرێد بەدەویێ هاتنـــە گۆتنێ ، گەلەکی ب هەڤڕا گرێدایینە ، تامە ـ تەمامن . ناڤا وانا گەلەك جارا هەرسێ دەرەجـە ژی پێشـدا تێن و یەك ئێ دنێ تەمام دکە ، ئازورو دکە ، شمشـات و بەدەو دکە . ل ڤرا تشـتەك ژی گەرە بێ گۆتنێ ، وەکی هم د وەختێ عەفڕاندنێـــد حزکرنێ ، هم د وەختێ خەباتێ ، تەبیـەت چاوا نتراندن و نەخش تێ ئۆرتێ . وەکی دنێ ، هەرکێ ئەم وا سەرت بێژن ، تەبیـەت دبە خویا وانا ، نەکو تەنێ

کلامێ دەولەتێ دکە ، لێ فۆنێ ددێ ، بەدەوەتی‌یێ ، گۆتنـا دلێ دەنگبێژرا دبە تا ـ تێلەك ، تەعمتیسکەك ، بێهنەك . ڤی تەحەری ، ب حەزارا شکلێدا ئوســـا چێ‌بۆنە و چێ دبن و ب وێڤا تەمامی‌یا بەدەوەتی‌یا تەبیەتی و یا مێرف تێ بەر چەعڤا و مەرف لەعزەکی خوە ژ بیر دکە ب وی شکلێ خەبەرا چێ‌بوی‌ی دمینە تما . ئاوا چەنـــد مەسەلە بینن :

یارێ یەمان ، کەچێ کولمالێ ،<br>
ئاگرێ کولێ مالا باڤێ کەتێ ،<br>
تەیێ ئەز حەلاندم مسقال دەرەمان ،<br>
گۆشتێ من حەلی‌یا ،<br>
هەستویێ من نەما ،<br>
تەیێ ئەز کرمە بلبلێ سەرێ کەلەما ،<br>
تەیێ ئەز کرمە قومێ دۆرا ئاڤ و چەما ،<br>
هەڤالێ من و تەڤا زەوجین ،<br>
بونە خوەیێ ئەسمەران ، دیلبەران ، خەزالان ،<br>
ئەزێ کال بۆم ، کەتمە سەرێ دارێ گۆپالا ،<br>
هێڤیا تەمام .

ئاڤا کلامێد وادا جیکی کفشدکرن جۆت هەڤرۆك (پارالێل) ، گاڤا چەنـــد رێز دەرهەڤا تەبیەتێ‌دانن ، لێ ئێ دنێ دەرهەڤا دلێ مێرڤدانن ، سێور و متالێد وێدا ـ دنیا وی‌یە هوندورداا ، حساندنا

ویدا و ژ وان هـــەر دویێ جۆت بویتی چێدبە رەبەیتەکە تەزە ـ کلام . ئاوا :

ها سەر مەڕا عەورێ مەزن ،
بنیا مەدا جەو و کانی دلەرزن ،
لەیلێ تویتی ، مەجروم ئەزم .

یانێ :

کاڤلێ گوندێ مە دەرەجە ،
لێ شین دکە کەتە ، لێلاڤك ، گیهایێ پەندە ،
لاوکۆ ، وەرە راموسانەکێ من کەرەمکە ،
گەلەك دو ـ دەرمان جانێ تەڕا فەرزە ...

بۆڕا بەدەوگۆتنێ ، جۆت هەڤرۆکێڕا گرێدایتی ، ناڤا کلامادا جورەکی وا ژی تێ ئاخافتنێ ، ئەوە ، گاڤا نەخشـــەکی تەبیـەتێ هلدن و حساندنا خوە پێڕا ددی گرێدانێ ، وەکی دتێ ، وانا مناسبی هەڤ دکی ، چاوا :

لاوکۆ ، دلێ من باغچەنـگێ گولی ـ ملی ،
مێرگا دەرێ مالێ تەڤ خەملی ،
خەلقێ کەتیە دەردێ مال و ملـکێ دنیایێ ،
ئەز ژی کەتمە دەردێ خوە ـ ڤی دلی .

ڤی کلامێـدا تێ کفشکرنێ ، وەکی بەدەوی ، مال و مالـکێ

دنیالـکێ « بەر چەعڤێ » نائێن چمکی کەتی یە « دەردێ خوە ـ ڤی دلی » . یانێ :

ئەم همبەرێ هەڤ رونشتن ،
مە کەسەرێ کوژ داهشتن ،
کەڤر حەلیان ، دار گهیشتن .

ناڤ کلامێد جماعەتێدا ، چاوا جـــورەکی بەدەوســنەتی یێ ، گەلەکی کڤشە هیپێربولایێ ـ چاپدەری یێ ، گاڤا تشتەکی ئاقا مەزن دکن ، وەکی چاپێ دەرە . ئەڤا رەوشەکە گەلە حزکری یە و د ناڤا عەفراندنێد کوردیدا ژی گەلەکی تێ خانێ ، مەسەلە :

هەرگێ هونێ پرسا تەمام ژ من دپرسن ،
باهاێی خرخالێ لنگێ سەیرانا مەللە موسا ردڤۆنکە ـ
ژ ردڤۆنـگی هەسپێ کحێلانە ،
ناوەللە ، گا و جۆتێ کۆتانە ،
ناوەللە ، ئاخرێ چار ـ پێنج سال تارشانە ،
ناوەللە ، کەری ـ سوری یێ می یێ سەر کۆدانە
ناوەللە ، خەرجێ هەفت سال ئێلانە .

جۆرەکی بەدەوگـۆتنێ یـــە جـۆرێ ئانگۆری ، یانێ ژی همبەری هەڤـکرنێ . گاڤا دەنگبێژ ل دۆر بـەرێ خوە دنهێرە و وان تشتێ تەبیەتێ همبەری خوە و دلێ خوە ، حساندنا خوە دکە و ب وێڤا وا تەقل ، مێشنداری و شـکل کری دده کفشکرنێ خوەستنا

خوه . چاوا :

لێ ، لێ گەورێ ،
خنوس خوەشە ، بینگۆل بەردا ،
تەیێ دلێ من کرییە بەعرا وانێ ،
مسکانێ کولان و دەردا .

ڤرا پەسنێ خنوسێ ، بینگۆلێ تێ داینێ : لێ هەمبەریکرن - دلێ وییە ، وەکی بویە بەعرا « کول‌ودەردا » . شـکل گەلەکی تێ بەر چەعڤا و گەلەکی قەواتە ب وێ هەمبەرکرنێڤا . مەسەلەکە دنێ :

گوندۆ : مەمکێ خەلقێ تێلی دەلال ئوسانە ،
نوتلا ترییێ ئوشەکانێ ،
نوتلا برنجێ ئولەخانی ،
مەرڤ لەعزەکی بمینە ب دەمێدا ،
چاوا کۆتی شنەدۆکێ مێرێ وێ ، ساڤێری قۆلۆ
چاوا وێدا کەرەکی پالان ؛
مەرڤ دوَ سەپەت تری لێکە ،
سەر سیاربە ، سەر ڤەدا بتو - لۆتمەك پێدا .

ئەڤا شکلێ هەمبەریکرنێ ، کو دەرهەقا بەدەوییا ژنێ - سینگ و بەرێ وێدانە و پێڕا ژی هەمبەری وێ دبـە کۆتییێ مێرێ وێ - ساڤێری قۆلۆ ، وەکی دنێ مناسبی بەدەوجورێ خوەڕا تەڤایی ، ددە کفشکرنێ حالێ ژنێیی چەتن .

همبەرکرن ، نەکو تەنێ قەوماندنێ تەبیەتێژا تێنە کرێدان ، لێ ئوسا ژی عەمری مێرڤژا ، ئاوا :

دەردێ دلێ من دوَدوَنە ،
یەك کوڕئابێ ، یەکێ دنە ،
کوڕئابێ من تێ مینا مەعژەکی رەشی گلی ـ گلچێ
بەر چەعڤێ منە .
گاڤا کوڕێ خەلقێ تێ ـ
مینا زێڕەکی مەعمودی عەنیا منە .

ناڤا کلامێدا ، چاوا مەجالا بەدەوگوتنێ نێتکوهێزێ (فکرگوهێزێ) پێشدا تێ : دلـکەتن پێشدا تێ ـ چاوا خەزال ، باغچێ گولا ، گول ، کولیلك ، سێڤ ، قەرەفیلا کەسەك یا دوٚر ب پەڕ ، قاز ، قولنگ ، جەعنونکا تەڕە جانە بەر مراز ، پەزکوٚڤیکە کەلە سوٚر ، شەمدانا زێڕێن و ئێ دنێ . مەسەلە :

ئەزێ خەزالم ، خەزالا چیایێ ئەلەگازێ ،
جەعڤێ من ل خەوێ بوٚ ،
گوهێ من گوهدار بوٚ ،
دەڤێ من چێرە بوٚ ،
لنگێ من بانزدانێ ،
دە برا هەڤال ـ هوٚگرێ مخەنەت

خێرێ قه نه بینن -
چاوا تەعژی - تولێ خوه بەردانێ .
ل ڤێدەری حبەت پرس دەرهەقا خەزالێدا تینه ، لێ دەوسا وێ گۆتی بێ فەعمکرنێ قیز ، زەری ، لێ تەعژی - تولە ئەو مەرڤن ، ئێ کو فەسادیێ ، خرابیێ دکن ، شەڕا و بۆغدانا داڤێژنە هەرچێ بەر ب مراز . ب ڤێ فکرێ چێ بتویە ئەڤا روبەیتا هان ژی :
دالێ من عەورێ خری هاڤینێ .
هێ شتێن دکە بنیا رەوانێ ،
ناوەلله بنەتارا نۆرا جینێ
کێ دیه ، کێ بینایه ،
داری زەماندا ،
کۆندی کۆر هێلینا خوه چێکە سەر هێلینا کۆکەرچینێ .
ل ڤێدەرێ ژی کوکەرچین - قیزا بەر ب مرازە ، لێ کوندێ کۆر - ئەو مێرێ نەحەزکری ، وەکی قیز بێ دلی وێ دانه وی . مەسەلێ وا چقا بێژی ، مەرف دکارە بینه ئۆرتێ .
ناڤا کلامێد خەباتێ حزکرن و تەبیەتێ تم جارا جوزێ ئالیگۆریایێ ژی پێشدا تێ ، وەکی وەخت - وەختا نۆلانی تێدەخستۆکا تێ دانینێ ، ب پرس و جاب ، فۆرما خەوتێ . ئەو جۆرە ، ئایهای ، دیسا نەخشەکی بەدەوکۆتنێیە .
ئاوا ، کلامەکێدا ئەو یەك ب ڤی تەحەری تێ بەیانکرێ :

كه‌چێ كولمالى ،
تو جنيازێ باڤێ خوه‌كى ،
تويێ خه‌ونا من بێژى .
— من ناف خه‌ونێ ديبو :
داره‌ك سپى به‌ر كانى‌يا
مالا باڤێ ته بو ،
جۆتێ مارێ ته‌يار ره‌خ بو ،
جۆتێ سێڤێ (ئارتێمێتێ) سه‌ربو ،
جۆتێ كه‌وا سه‌ر دارێ بو .
— كورۆ ، كولمالۆ ،
دارا سپى ، تو دڤێژى ـ
به‌ژنا منه ،
جۆتێ مارێ ته‌يار ، دبێژى ،
گولى‌يا منه ،
جۆتێ سێڤێ ئارتامێتى دبێژى .
مه‌مكێ منه ،
جۆتێ كه‌وا فڕى بو ،
سه‌ر دانى بو ـ دبێژى ،
چه‌ءڤێ منه ،
ئه‌شقا دلا ، دزانى ، —
خوه .

یار ، یار ، یار پۆشمان یار .

کلامێ خەباتێ ، حزکرنێ ، تەبیەتێ ، ب قەیدەڕا (مقام‌را) تەڤایی پێشدا هاتنە عەفراندنێ ، ڕۆژی سەر هیمێ یەك خانا . گەلەك جارا ، وەکی وان یەك خانا ژ هەڤدو دورخن ، قە ب جارەکێڤا کلام نائێ شحتاندنێ ، تەك فرقی ئەوە ، وی جیێ‌هلدانا خوە ، ئوندا بکە ، بێ پاردەڤەکرنێ سەر دەرەجا ، چوك بە . و گەلەك جارا ئەو دەرەجا ( خان ) دکارن ب کلامەکێڕا بێنە بیترئانینێ ، یانێ ژی هەرن بگهیژن کلامەکە دنێ : بەعس خەبەرێ ئەم هلدن کلاما « تو ژ هەڤالا نەمینە » :

تو ژ هەڤالا نەمینە ،

وەیلا وایێ ، من خەریبێ ،

خەریبا جزیرێ ،

وەیلا وایێ ، من خەرێبێ ،

کەڤرێ بنێ بیرێ .

وەیلا وایێ ، من هێسیرێ .

خانی‌یێ باڤێ کولکمشکێ

تێدا دکن کریتی‌نی‌یێ مرێشکێ .

برا گرێدە پشتا خوشکێ .

ج کانیکا دۆر ب قجی ،

جۆتێ خەزالا بەر خارجی ،

خوەزلا من وی عەڤدی بێ ،

چەعڤادیتی ، دل زەوجی .

ڤی زناری من دی سی کر ،
بشکۆشك ڤەبتو ، سینك سپی کر ،
حەتا کەلەش لاوکێ من ژ ولاتێ خەریب هات ،
قەلڤا گولیێ من یەك رەشکر ، یەك سپی کر .

ل ڤێدەرێ چار روبەیتن ، یانێ ژی چار خان (مال) ، وەکی قە ژی ب هەڤرا نەهاتنە گرێدانێ . هەر خانەك بەشقە دکارە بێ گۆتنێ ، لێ دەنگبێژ ئەڤ هەڤانینە و کرنە کلامەك . وی تەحەرینە کلامێد دنێ ژی .

کلامێد حزکرنێ ، خەباتێ ، تەبیەتێ ، ئوسا ژی ئێ مێرا ، ئێ ئێردەکێ ، مینا ئێ گۆڤەندێ چاپکرێ نێنن ، ناکەڤنە سەر قەیدێ چاپکرێ ، حیملی ب فۆرما ئازا هاتنە ەعەڤرانێ ، سەر هیمێ سەوتێ کن و درێژ . هەر خانەك فکرەکێ ددەکڤشێ ، دێمەك کێدەرێ جوملە کوتا دبە ، وێدەرێ ژی رێز گۆتی خلاز بە ، وێ شوندا کوتا بۆنا رێزا پێشن ب بانگا خوەڤا گەرەکێ ئۆلا کوتا بۆنا رێزا خانێ‌بە پێشن بە ، وەکی دن بێژن ، بانگ گۆتی مینانی هەڤ دەرێن و وێڤا ژی روبەیت خلاز دبە . وێ شوندا ئاڤا وان هەرد و رێزادا چڤا خەبەرا دیکاری بینە ئۆرتێ ، ئاڤا ، وەکی بینا دەنگبێژ پێك بیتە ، بینا وی نەچکە . ڤی تەحەری چێ بۆنە ئەو جورێ کلاما ، وەکی تەنێ

بۆنا یەك مەری ستراناێ هاتنە عەفزاندنێ ، مەسەلە :

لاوکۆ ئەز بەدەوم نۆلا هیڤێ ،
کوڕێ کەرێ ، وەکی من زانبوٚیا
تو ئەڤسەنەیی ،
توجار یارتی تەڕا نەدکر
سەڤا دلکەتنا مەهە و نیڤێ .

ڤێدەرێ ، چاوا تێدیتنێ ، حیملی ریٚزا پێشنە ، ب کوتابوٚنا خەبەرا « هیڤێ » و یا پاشنە ب کوتابوٚنا خەبـــەرا « نیڤێ » ، وەکی ل هەڤ تێن .

هلبەت کلام ، دها راست روبەیتێد کلاما ، گشك وی جوڕەیی نەهاتنە هەڤانینێ ، هەڤ هونانێ ، ئێ ئوســا ژی هەنە ، وەکی بانگێ وان ب یەك جوڕەیی خلاز دبن ، چاوا :

منێ خەونەك دی‌یە د خەونێدا ،
دارەك هێ شین بوٚیە حەوشا باڤێ تەدا ،
ڤێ دارێ دنهێرم بەلگە لێنە ،
فێزا بەلگا جۆتە سێڤێ سۆرە لێنە ،
فێزا سێڤا دکانێ سەدەڤانە .

و ب ڤێ ڤۆرمێ ئێ دنێ ژی دیسا ب بانگا « دا » ، « نە » کوتا دبن . جوڕێ هەڤانینێ باشقەنە و بۆنا هینداری‌یا واتا خەبەك

بەشقە لازمە ، لە ماژی ئەم ناکەڤنە ناڤا هورگلییا .

بۆنا کلامێد ژۆرگۆتی ، ئوسا ژی گەلەکی فەرزن وەکلاندنا ئێ پێشڤا حازرکرنێ ، خەبەرێ گازیکرنێ ، وەکلاندنا رێزا و ئێد دنێ ، چاوا : ها هو ، ها هو ، تەو ، تەو ، جانێ جانێ ، ها ـ هی ، دەلێ ، لێ ، لێ ، دەلـۆ ، لۆ ، لـۆ ، وەیێ ، وەیێ ، وەیلۆ ، وەیلۆ ، وەی دل ، وەی دل ، دە یۆ ـ یۆ ، های ، های ، هێوا ، هێوا ، ئەمان ئەمان و ئێ دن ، ئاوا :

کاوێ هێوا سەد جار هێوا ،
نەمینم ، نەمینم ،
رێدا ها ب رێدا . .
یانێ ژی تەمامییا کلامێ تێ وەکلاندنێ ، چاوا :

—١—

هەرێ مێڤانۆ ، مێڤانۆ ،
برا شەڤ بە ، شەڤ شلی بە ،
برا کول بە ناڤا ڤزانە مییا بە ،
جیێ تە ئۆرغان ، دۆشەك ، بەعلـگی و پەڕ پال بە .
برا سیوشەش بشکۆکێ منێ زیڤێن
ژ تەڕا ڤەکری بە ،
سەرێ مەمکی منی سۆرن ، بن سپێنە ،

ژ تەڕا برا دەستور دابە :
حەیا بەربانگێ سبێ
یاساخ ژ بۆی تە تونەبە .

ـ ٢ ـ

— برا نەشەڤبە ، نە شلی بە ،
برا نە کول ناڤا قزانێ مییابە ،
نە جییێ من ئۆرغان ، نە دۆشەك بە ،
نە برا سیوشەش بشکۆکێ زیڤین ڤەکری بە ،
نە برا سەرێ مەمکێ تە سۆربە ،
نە بنی سپی بە ،
حەتا نەڤە حەلالی —
سەر نەفەسا جانێ من حەرامبە .

دێمەك ئاوا ، دومکدرێژییا کلامێد خەباتێ ، حزکرنێ ، و تەبیەتێ نەکو تەنێ ب فکرا وانڕا هاتنە گرێدانێ ، لێ ئوسا ژی ب بەدەوسنەتییا وانڕا هاتنە گرێدانێ . هەرگێ پرس تەنێ دەرهەقا نێت ، یانێ ژی سەرەجەما وانا بویە ، ئەوێ زو بهاتانا بیرکرنێ و چەتن بهاتنا بەلاکرنێ . لێ ڤێدەرێ ، بەلێ ، پرسا بەدەوسنەتییێ ( چاوا گۆتنییێ ) پرسەك گەلەکی فەرزە و هەردو ب هەڤڕا سەرەجەم و فۆرم جورا هەڤڕا پێشدا تێن و ئەو چقا ل هەڤدو بێن ، ئاڤا قورژنەتەیاخ دبن .

# فەرهەنگۆك

## ـ ا ـ

| | |
|---|---|
| ئا | : بەڵێ ، ئەرێ . |
| ئاتروس | : تەرەس ، بێ‌دین ، بەدمەزەو ، لە خوا نەترس . |
| ئاتمەجە | : هەڵۆ ، باز . |
| ئازا | : ئازاد ، سەربەست ، سەربەخۆ . |
| ئاساخ | : یاساخ . |
| ئاقا | : هێندە . |
| ئالی | : لا ، لایەن . |
| ئالاڤگۆڕ | : هالاوگۆڕ ، هەلاوی ئاگر . |
| ئانتیخ | : کونخان ، کوان . |
| ئاها | : وەها ، بەم رەنگە . |
| ئاهل | : کامڵ . |
| ئایهای | : هەیهات ، بەداخەوە ، حەیف ، مخابن . |
| ئەلی ـ ئیلاهی | : عەلی ئەڵلایی . |
| ئەمەك | : کۆشش ، ئەرك ، وەفا . |
| ئەنی | : عەنی ، هەنیە ، توێڵ ، ناوچاوان ، پێشەسەر . |

| | | |
|---|---|---|
| ئۆرتێ | : | ناوەند ، ناوەڕاست . |
| ئوسا | : | وەها ، وەسا . |
| ئوعشکرن | : | کونجاندن . |
| ئێپێکی | : | خەمناك ، خەماوەر . |
| ئێزپات | : | ئیسپات . |

## - ب -

| | | |
|---|---|---|
| باسك | : | باڵ . |
| باگەڕ | : | زریان ، تۆف . |
| بانـگ | : | لێرەدا : بیتە ـ قافیەیە . |
| باها | : | بەها ، قیمەت ، گران . |
| بریگاد | : | فیرقە ، دەستە ، تیپ . |
| بشکۆك | : | دوگمـە . |
| ب گلیکی | : | بە ڕاتەیەك ، بە وشەیەك . |
| بنداروك | : | سەیران . |
| بەدەو | : | جوان . |
| بەدەوسنەتی | : | جوانـکاری . |
| بەرب مراز | : | مرازدار ، بەمراز . |
| بەربین | : | دەلیل ، ڕێی نیشاندەر ، پێشەنـگ . |
| بەردیر | : | شەکەمەڕ ، شەك . |

بەز : غار ، بەزین ، هەڵبەزین .
بەژن : قەد .
بەژنزراف : قەد باریك .
بەشقە ـ بەشقە : جوێ ـ جوێ ، جۆر ـ جۆر .
بەعر : بەحر ، دەریا .
بەعس خەبەر : بەنموونە ، بۆمیسال .
بەلوکرن : دەربڕین .
بۆغدان : بوختان .
بێدەر : جۆخین ، خەرمان .
بێریڤان : بێریوان (ژن کە دەچتە کەژ بۆ شیردۆشین) .
بین : نەفەس ، هەناس .
بینتەنگی : هەناسە سواری ، نەفەس تەنگی .
بێهن : بۆن .

## - پ -

پار : بەش ، پارچە ، لەت ، کەرت ، کوت .
پار پار یکری : پارچە پارچە کراو .
پارس : سواڵکەر ، دەرۆزەکەر .
پالەنگۆ : پالا ، پالاینە !
پایێ بڕێ : بە زۆری .

پرس : مەسەلە ( لێرەدا ) .

پەڕ : پەڕوباڵ ..

پەزدۆتن : پەزدۆشتین .

پەسن : مەدح ، پێدا هەڵدان .

پەی : دوای ، پاش .

پۆییێت : شاعیر .

پۆییزیا : هەڵبەست ، شیعر .

پێدا — پێدا : پەیتا ـ پەیتا ، لەسەر یەك .

پێشداچویبن : پێشکەوتن .

پیشەکزان : پیشەساز .

پێل : شەپۆل ، شاپێل ..

## ـ ت ـ

تاریق : مێژو .

ترمخچی : شەنکەر ، درمخچی .

تەحەر : جۆر ، رەنـگ ، تەرح .

تەعشت : چاشت ، تاشت .

تەڤایی : وێـکڕایی .

تەك : تاك ، تەنیا ، هەر ئەو .

تەیار : فڕندە ، بفڕ .

| | |
|---|---|
| تەیرۆك | : تەرزە . |
| تو | : تۆ ، وەکو : (راناو) . |
| تو | : هیچ . |
| تۆخم | : تۆم ، تۆو . |
| تور | : تورەکە . |
| تۆژن | : میر . |
| توك | : بەرگن ، توك . |
| تولم | : جۆرە زوژنایەکە . |
| تۆماست | : قەیماخ : تۆێژ . |
| تونە | : نی یە . |
| تونەنە | : تین . |
| تێجر | : تاجر . |
| تێر | : خەست ، پەیت ، تیر . |
| تێل | : تاڵ ، داو . |

## - ج -

| | |
|---|---|
| جارجم | : جاجم . |
| جارنا | : هەندێ جار . |
| جنیازە | : جەنازە . |
| جەعداندن | : هەوڵدان . |

جەعنوك : جوانو .
جەهـ : جۆ .
جەو : جۆگە .
جۆتـكار : جوتیار .
جوتهەڤرۆك : پێوار ، رەمز .
جودە ـ جودە : جیا ـ جیا .
جینار : جیران ، دراوسێ .
جێرپاندن : ئەزمۆن ، تاقی‌کردنەوە .

## - چ -

چاپ : وەزن ، کێش .
چفت : جۆت ، جفت .
چف : چێو .
چقا : چەند .
چقل : لك ، لق .
چلك : چوك ، چوز .
چل و چیا : چل‌چیا ، کەژوکێو ، شاخ و داخ .
چەتن : دژوار .
چەعف : چاو .
چەعفـکانی : چاوکانی ، سەرچاوە .

چەك ـ رحال : چەك و شتمەکی سواری .

چیت : پەردە .

چێراندن : لەوەڕاندن .

چێلەك : چێل ، مانگا .

چیم : بەرد ، کەوچك .

چێم : چەم ، روبار .

چی‌یێ : چیا .

## - ح -

حبەت : هەڵبەت

حزکرن : دڵداری .

حش : هۆش ، ئەقل .

حەڵاڵ : راست ، حەڵاڵ ، پاك ، شەرعی ، هی‌خۆی ، شایان ، بەشەرەف .

حەواس : حەز ، هەوەس .

حەیا : حەتا ، هەتا .

حەیام : عەیام ، أیام ، رۆژگار .

حۆکەقزانێ : قاژەوبازەی مەر .

# - خ -

| | |
|---|---|
| خان | : دێر . |
| خانێ کرن | : دەرخستن ، دیارکردن . |
| خلینك | : چڵم . |
| خەبتین | : کارکردن ، ئیشکردن . |
| خەبەر | : قسە . |
| خەبەردان | : قسەکردن . |
| خەتاگێ | : خەتی کا . |
| خەیسەت | : خاسیەت . |
| خۆرت | : کوڕ . |
| خوڕی | : ڕوت ، ئەسڵ ، خۆماڵ . |
| خوەخوەتی | : خۆیتی . |
| خوەستن | : خواست . |
| خوەڤا | : خۆوە . |
| خوەلی | : خۆڵ . |
| خویا | : ئاشکرا ، ڕوَن ، دیار . |
| خوێ کرن | : بەخێوکردن . |
| خیرەت | : غیرەت . |

## - د -

| | | |
|---|---|---|
| داریزەمان | : | داریدنیا ، سەرزەوی . |
| دانەبیرکرن | : | لەبیربردنەوە . |
| دانەخەبەردان | : | وەقسەهێنان . |
| دانەکەشێ | : | کشف کردن . |
| دران | : | ددان . |
| دژمار | : | دژوار . |
| دەبار | : | ئازوخە ، ئازوقەی ئاژەل . |
| دەر | : | دەرگا . |
| دەربازبون | : | رابوردن ، بەسەر چون . |
| دەرڤا | : | دەرەوە . |
| دەعس | : | داس . |
| دەعسکێش | : | داسکێش ، درەوەنی . |
| دەعن | : | دان ، جەم ، وەجبە . |
| دەعوات | : | شایێ ، گۆوەند . |
| دەڤ | : | دەم . |
| دەڤزراف | : | دەمکول . |
| دەکمە | : | دەکمەن |
| دەلال | : | نازدار |
| دەنگبێژ | : | گۆرانی بێژ ، شایەر . |

| | | |
|---|---|---|
| دەورانبێژ | : | تەرجیع بەند . |
| دوَپا | : | زۆرتر ، زوربە . |
| دۆلیدانگ | : | هەرزاڵە ، هـــەلۆرك ، جۆلانە ، دیلانێ ، پێژك ، ستێرك . |
| دۆمام | : | دۆتمام ، کچمام ، کیژمام ، ئامۆزا . |
| دوَمان | : | دوَ ، دوَکەڵ . |
| دومکدرێژ | : | نەفەس درێژ ( هەڵبەستی درێژ ) . |
| دێ | : | دایك . |
| دێم | : | روَمەت ، گۆنا ، کوڵم . |

- ر -

| | | |
|---|---|---|
| رابوَن رۆنشتاندن | : | هەڵسان ودانشتن . |
| راڤە | : | هەستە . |
| رند | : | چاك ، باش ، کۆك ، خاس ، جوان . |
| رەڤاندن | : | رەواندن ، خەمرەواندن ( خەمرەوێن ) . |
| رەنگاواز | : | رەنگاورەنگ . |
| رەو | : | رەوت . |
| رۆ | : | رۆژ ، خۆر . |
| روبەیت | : | چوارینە ، دوَبەیت ( رباعی ) . |
| ریتم | : | هاوئاهەنگی ، توازن ، تناغم . |

| | | |
|---|---|---|
| ریێز | : | دیێز . |

## - ز -

| | | |
|---|---|---|
| زار | : | زمان . |
| زارگۆتی | : | دەماودەم ( شفویی ) . |
| زاڕ | : | منداڵ . |
| زعڤا | : | زاوا . |
| زنار | : | تاوێر ، شاخ ، گابەرد . |
| زەر | : | شاخی بەرز ، کێوی هەزاربە هەزار . |
| زەعڤی | : | زاوا . |
| زەڤیراکرن | : | زەوی کێلاّن . |
| زوَ | : | خێرا . |

## - ژ -

| | | |
|---|---|---|
| ژانر | : | بابەت ، جۆر ، غەرەز . |
| ژبەرخوەدەرخستنی | : | لەخۆڕاداهێنان ( ارتجالی ) . |
| ژنابی | : | بێوەژن . |
| ژەعژی | : | ژاژی . |
| ژی | : | ژبان . |
| ژێهلانین | : | دانان . |

## - س -

| | | |
|---|---|---|
| ساپ | : | کا . |
| سازبەند | : | مۆسیقار . |
| سازبەندی | : | مۆسیقا . |
| ساڤێر | : | کاسە ، کەویڵ ، سواڵەت . |
| سبکل | : | زنجیرە . |
| ستران | : | گۆرانی ، لاوژە . |
| ستەیر | : | ئەستێرە ، ستارە . |
| ستودار | : | شاخدار ، قۆچدار . |
| ستورو | : | شاخ ، قۆچ . |
| سدقتەمز | : | بێخەوش ، راست . |
| سرێ | : | سرە ، ڕێز . |
| سڤك | : | سوك . |
| سەرت | : | رەق . |
| سەروێری | : | سەرۆکایەتی ، سەرکاریی . |
| سۆر | : | هەمس ، مس . |
| سور | : | مشورە . |
| سورەت | : | رۆ ، روخسار . |
| سۆسلەجی | : | خزمەت . |
| سۆسیالتی | : | کۆمەڵایەتی . |

سۆڤخۆر : میرەکێل .

سینۆر : سنور ، سەرحەد ، ئاقار .

سیورومتالا : متالا و بیرکردنەوە .

سیوژی : ناوەرۆك .

## - ش -

شـا : شاد ، دڵخۆش .

شارۆر : شەحرور ، شاور ، باڵندەیەکی دەنگ خۆشە هێندەی چۆلەکەیەکە .

شاش‌مان : سەرسوڕمان .

شڤ : شو ، شوڕ .

شمشات : پەرداخ کردن ، لوس کردن ، زاخاودانەوە.

شە : شانە .

شەپە : هەرەسی بەفر .

شەعدەتی : شایەتی .

شەڤین : شەوەکێژ ، شەوبەکێو .

شەکرن : شی کردنەوە ، لە شەدان ، لە شانە دان.

شەوتی : سوتاو .

شێور : راوێژ ، مەشۆرەت .

## - ع -

عەزمان : عاسمان ، هاسمان ، ئاسمان .
عەفڕاندن : دانان ، تألیف ، داهێنان .
عەمر : ژیان .
عەور : هەور .
عەید ـ عەرەفات : جەژن و راورەسم .

## - ف -

فراڤین : فراوین ، نیوەرۆژە .
فرە : فەرەح ، خۆشی .
فکرکوژ : بیرقوڵ .
فۆن : دەنگ ، نەغمە .
فێرم : مەزرا ، کێڵگە .
فێز : سەرو ، سەربان .

## - ق -

قاتخ : ماست .
قاس : قەیر ، ماوە .
قاڵك : قەپێلك ، قاوغ .

قایە : گابەرد .
قەداندن : بەجێ‌هێنان .
قەر : رەش .
قەربەڵەك : باز ، رەش‌وسپی .
قەرف : لۆمە ، زەم .
قەلەن : شیربایی ، مارەیی .
قەوات : قەوەت ، هێز .
قەید : مقام ، دەستور .
قۆتك : کل‌وکل‌چوك ، کلدان .
قوڕن : قەڕن ، سەدە ، چەرخ ، چاخ .
قولۆ : چاڵ .
قونجك : کۆلیت ، کونج ، زنج .
قیز : کچ ، کیژ ، دوێت ، کەنی ، کەنیشك .
قیمش‌هاتن : دڵ‌هاتن .

## - ك -

کاکە ـ کاك : دەنگی گۆرانی .
گاو : شۆخ ، بەناز ، نازدار .
کلام : گۆرانی ، لاوژە ، ستران .
کلوب : یانە .

کلیت : کلیل .
کەدیکری : ماڵی کراو ، کەوی .
کەرکیت : ئەسپابی مافورچنین ، کەرگی ، هەپۆ .
کەری : ران ، مێگەل .
کەڕ : کڕ ، کپ (قڕوقپ ، کڕوکپ) .
کەسەر : خەم و کوڵ .
کەڤان : کابان ، کەیوانۆ .
کەڤربڕ : بەردبڕ ، قایەچێ .
کەڤن : کۆن .
کەل : کۆڵیس ، کوڕیس ، کۆڵ .
کەڵەش : ئازا ، چەتە .
کەوشەن : دەرەتان ، جاڕ ، مەزرا ، حەیارە ، سنور .
کودك : شەل ، خوار .
کورم : کرم .
کۆتك : مەنجەڵ .
کۆد : کاسەکەل ، کەویل .
کوڕ : کەڕە .
کوڕا : لە کوێوە .
کوڕئاپ : ئامۆزا .
کوسی : کیـەڵ .

کولتور : توراث .
کۆڵخۆز : گەلەکێڵ .
کولـکمشکرن : کایلدان .
کولمال : ماڵوێران ، کڵۆڵ ، ماڵ کاول .
کۆلێـکتیف : گەلکاری .
کولیلك : گوڵیلك ، گوڵاڵە .
کۆم : کۆمەڵ ، کۆ .
کۆمباین : مەکینەی دروێنە .
کۆن : دەوار ، خێوەت ، رەشماڵ ، چادر .
کۆندەلێ : قۆندەرە .
کێلەندیکێش : درەوتێ ، پاڵە .
کین : رك ، خەم .

## - گ -

گاف : وەخت ، کات .
گافا : کاتێ ، وەختێ .
گرێدایی : گرێدراو .
گەدە : کوڕەتیم لاوك ، کوڕەتیم حەیران ...
گەشە : بریقە ، سور .
گەلۆ : قەومێل ، گەلی براینە ، خەڵکە .

| | |
|---|---|
| کەلی کەبۆز | : کەلی و کەندالّ . |
| کەمار | : پیس . |
| کەند | : کەن . |
| کورزەچی | : مەلۆنێر . |
| کوڕ | : گڕ . |
| کوڕکوڕ | : گڕوهوّر ، گرم و هۆڕ . |
| کوڕی | : کەڕ . |
| کوهبڕ | : کەوڕ ، کەوەڕ ، پشتیر . |
| کۆپال | : کۆچان . |
| کۆتی | : پێویستە ، دەبێ . |
| کۆڤەند | : کۆوەند ، شایی . |
| کیدۆك | : بەندەن ، لوتکە . |

## - ل -

| | |
|---|---|
| لال | : لەعل . |
| لاوك | : گۆرانی ، لاوژە . |
| لەعزە | : لحظە . |
| لێخستن | : لێدان . |
| لیریکی | : غنائی . |
| لێلاڤك | : لاولاو . |

لێ‌یێ : لەهی ، لافاو .

## - م -

مالخوێی : خاوەن ماڵ .

مالهەبون : ئابوری .

مژ : تەم .

مەجروم : مەجنون .

مەخەل : ئاخەڵ ، باسمە .

مەعر : مار .

مەی : نەی .

مینا : وەکو .

مینانێ : وەکو .

مێ : مەڕ .

مێرخاس : ئازا ، کەڵەمێرد لە شەڕدا .

مێشنداری : مەهارەت ، دەسترەنگینی .

## - ن -

ناڤ‌کرن : نێونان ، ناونان .

ناڤکێل : ناوقەد ، ناوتەنگا ، کەمەر ،

نان : گەنم .
نترین : وەسف کردن .
نڤیسار : نووسراو .
نڤیسکار : نووسەر .
نقوش : خاڵ ، نەش ، نیگار .
نها : ئێستا ، ئەمێستا ، هەنووکە .
نەئانکوژی : ناهاولفت ، نەهاوزا ، نەهاوکف .
نەحسابکری : لەئەژمارنەهاتوو .
نەینك : نەینۆك ، ئاوێنە .
نۆتلا : وەکو .
نۆلا : وەکو ، مینا .
نۆلانی : وەکو ، مینا .
نێت : نیەت ، نیاز .

## ـ ه ـ

هەنگ و بانگ : بەنەزم و گۆرانی .
هری : خوری .
هرینگ : خوری .
هلدان : هەڵ گرتن .
هەرکێ : هەرکەس .

هەری : هەرە .

هەستو : ئێسك .

هەڤ : یەکتر .

هەڤان : هەمبان ، هەمبانە ، هەمانە ، دەغەر .

هەڤانین : هۆنینەوە .

هەڤدو : یەکتر .

هەڤڕا : پێکەوە ، وێکڕا .

هەڤ کرن : ئیسپات کردن .

هەلەقەتی : پێوەندی ، علاقە .

هۆرۆڤێل : هۆدانەوەی گاجوت لە جوتکردندا .

هۆستێ : وەستا .

هۆکەج : کاوڕ .

هیڤ : مانگی عاسمان .

هیڤی : ئاوات ، هیوا .

هیم : نبیچە ، بنەچەك ، بنەما ، بناخە .

هین بوون : فێربوون .

هێسا : حەسانەوە .

هێوی : هەوێ .

## - و -

وەردەك : مراوی .

وەستیای : ماندوَ .

وەكلاندن : دوَپات كردنەوە .

* * * * * *

# -ملخص المقال-

# الاغانى الكردية الفولكلورية

العضو المؤازر : البروفيسور حاجي جندي

يحتل الفولكلور الكردي الشفوي الغني المتشعب الأغراض ، قديمه وحديثه ، بين شوامخ التراث الكردي العريق قمة جديرة به .

فهو كما يقول الكاتب الارمني الشهير خ. آبوفيان فى الازدهار والتقدم ما يحار في امره المرء وتأخذه الدهشة ، ويكاد يكون الكرد برمتهم ، رجالا ونساء شعراء مطبوعين ، ومطربين موهوبين ، ففي اشعارهم وترانيمهم صور الحياة نابضة حية ، تتحدث عن البطولة والمعارك والخيل والسلاح والطبيعة والمرأة والحب والجمال والحكمة والفلسفة والسياسة والاجتماع والاقتصاد والتربية في لبوس من البساطة والشفافية مايخلب لبك ويشدك الى الحياة والارض والعمل والانسان شدأ وينفح فيك من النفحات ما يسموبك الى العلى .

ان مثل الفولكلور الكردي كمثل جدول أخذ يتسع على مر العصور حتى غدا نهراً كبيراً يجري سلسبيلا فراتا ، ثراً منعشاً من صدق المشاعر وحرارة العواطف ورقه الاحساسات وعذوبة اللواعج

وعلو الهمة وشموخ العزم ومضاء الارادة وشدة البأس وشرف الرجولة وعفة الانوثة وكمال الوفاء وجلال المواقف وسمو المروءة ونقاوة الضمير وسلامة الطوية وعظمة البطولة وبعد النظر ونفاذ الذكاء وحدة الفطنة ...

انه كما ذكر الروائي الارمني الذائع الصيت ( رافي ) نتاج الشعب الكردي بمختلف ملله ونحله وطوائفه الدينية والمذهبية من المسلمين واليزيدية والعلي اللهية والنصارى والقبائل والعشائر الكردية القاطنة في وطنها كردستان الممزقة بين تركيا وايران والعراق ، فقد ساهم في ابداعه الرجال والنساء والفتيان والفتيات والشيب والشبان باثين فيه أشواقهم الى الاحبة وذكرياتهم في الماضي وآمالهم وتطلعاتهم الى المستقبل ومشاعرهم واحساساتهم وهمومهم ، فهو مرآة صافية تعكس شخصية الشعب الكردي بأمانة وتترجم حاله بصدق اذ هو من القلوب الى القلوب ، فعلى كل قطعة منه بصمات من روحه مطبوعة وفي كل نغمة منه صدى لوجدانه . وآية حيويته وأصالته انه لم يعترف قط بالحدود والحواجز المصطنعة ، ولم تستطع الديانات والمذاهب والسياسات أن تقف دونه وأن تطبعه بلون مغاير لجوهره ، فكان وما يزال كالنسر يحلق عالياً في سماء كردستان ، حيث تبدو شامخة من اقصاها الى اقصاها ، ففيه كيان الشعب الكردي الكامل الذي يسمو فوق كل الشبهات ، انه ملاحم البطولة واناشيد الفروسية وانغام الانسانية المنتصرة .

على اننا لسنا بصدد الحديث عن الفولكلور الكردي كله ،

وانما نقتصر على ثلاثة اغراض منه :

١ — أغانى العمل .

٢ — أغانـي الحب .

٣ ـ أغانـي الطبيعة .

وهـي في جملتها مندرجة تحت الاغراض الغنائية والحماسية .

١— أغانـي العمل :

هذا اللون من الفولكلور الكردي وسيع المدى ، متشعب المرمى ، ذو أفانين مختلفة ، يبتـدع في القرى والارياف وداخل المنازل والبيوت والدواوين وفي الخيام ومضاربها ، وفي المراعي حيث يرعى الرعاة اغنامهم وفي المرابض حيث يؤوونها في الاماسـى ، وفي المدرات حيث يستدرونها وفي الموارد اذ يوردونها الماء وفي المصادر اذ يصدرونها الكلأ وفي أثناء نطاح الاكباش والتيوس وفي مواسـم الولادة وعند رعي الحملان والفصلان والعجول وفى اثناء عمل البناء وشق الصخور والترع والجداول وحفـر الابار وحراثة الارض والبذار والحصاد والدياسة والاستغلال وخزن الغلال ، والحياكـة والنساجة وجز الصوف وغير ذلك كـثير ...

ان العمل اذن هو المعين الذى لاينضب في الخلق والابداع ، وان المنظومات والأناشيد الشعبية فى كـل مايتصل شديد الاتصال بمجالات العمل ، والانتاج انما تلهم العاملين الى المزيد من حب العمل ، ينشدونها فرادى وجماعات في مستقرهم ومنتجهم . ومما يلفت الانتباه أن هذا الفولكور ليس مجرد وصف عابر جاف لحياة العمل ، وانما هو مغموس ومشبع بمشاعر الحب وعواطفه الدافئة عبر العلاقات الانسـانية السامية . ولعل مانلمسه

اليوم من ازدهار لهذا الغرض من الفولكلور الكردي الرائع متصلا بحياة المزارع الجماعية والحكومية التي انشأها النظام الاشتراكي في البلاد السوفيتية اصدق دليل على حيوية هذا اللون من الفن الغنائي الشعبي بين الاكراد الذين يعيشون مع اخوتهم الارمن والآذربايجانيين .
فاذا كان هذا الفولكلور يعكس فيما مضى أسلوب العمل ووسائل الانتاج وطريقة التوزيع وفق الانظمة البالية فهو اليوم يترجم محتوى جديداً لكل مايتصل بالثورة الاشتراكية في الزراعة والصناعة والاقتصاد ، ويتحدث عن الآلات الحديثة في الحراثة والحصاد والدياسة والاستدرار والاستغلال و ... و ... كما يتغنى بالانسان الجديد في عواطفه ومشاعره ومواقفه في العمل والانتاج بشتى فروعها .

٢- أغاني الحب :

اما هذا اللون فبحر زاخر من التعبير عن اشواق القلوب الملتاعة والعواطف الملتهبة الجياشة ، فهو حديث العشاق من الرجال والنساء والفتيان والفتيات ، يصور حياة الحب واحوال المحبين والمحبات تحت قيود وتقاليد وظروف اجتماعية قاسية تحول في معظم الاحيان دون ان تتحقق أماني العشاق والمحبين . في اغاني الحب شكوى مرة وتذمر واحتجاج صارخان على الزواج القسري وانعدام التكافؤ وحرمان المرأة من الحرية في اختيار شريكها في الحياة وثورة على الفقر وآثاره وعلى الاغتراب من جراء لقمة العيش وويلاته وعلى الابعاد بين القلبين العاشقين ونتائجه ، وعلى جشع الآباء والامهات وكوارثه .

ولعل ما تمتاز به هذه الاغاني انها تنظم رغم صرامة القيود

والتقاليد واحتجاب الحرية ، في غاية من الانطلاق والصراحة التامة .
وانها تنظم وتغنى في كل مكان : في الجبال والوديان ومرابع الرعي وعلى الينابيع وفي مرابض القطعان ، والمواشي وميادين العمل والسمر والافراح ، تصف جمال المرأة وزينتها وحديثها ومشيتها وعينيها ونظرتها وقوامها ورشاقتها ، كما تصف همومها ومشاغلها وآمالها وتطلعاتها بسذاجة وبراءة .

الا ان مصادر الشقاء والتعاسة من الفقر والزواج القسرى وعدم التكافؤ والاغتراب وغلاء المهر والصداق والجهل والجشع قد ولت الى غير رجعة ولم يعد له اثر اليوم بفضل النظام الاشتراكي الذي حرر المرأة الكردية السوفيتية . فهي تتغنى بانغام الحرية واغاني الحب على اساس من العلاقات الجديدة .

٣— اغاني الطبيعة :

ألطبيعة زين الاغاني الفولكلورية الكردية وزخرفها ، اليها يفزع الكردي في تلوين خلجات نفسه ، وبها يوشي مكنونات وجدانه ، فلايستخفه الطرب مالم يكن من جمال الطبيعة فيما يغنيه مسحة ، ولا يستهويه الاستمتاع بالحياة الا اذا استظل بأفياء من فيوضها ، ولا يستشعر الطمأنينة الا حين يلوذ باستكناه اسرارها واستشفاف مظاهرها واستجلاء خفاياها ، ولايستعذب طعم العيش الا بالأندماج فيها .
فكيف لا وفي جبالها الشم ورواسيها الشوامخ سر شجاعته ، وقوة ، رجولته وعظمة بطولته وملحمة انتصاراته وشموخ شعبه وثبات كيانه .
ان للشلالات الهادرة والمضايق والوديان والذرى والقمم والسهول

والهضاب والينابيع والانهار والجداول والسواقي وانواع الحيوان والوان الطير ، والسماء الصافية والشمس والقمر والنجوم الزهر والرعد والبرق والسحاب المسخر والثلج والبرد والريح والمطر والسيل قصصاً وحكايات ورموزاً ودلالات في اغانيه واناشيده ، فهو يحاورها ويحادثها فهي تحاوره وتحادثه .

ومما له بالغ الدلالة ان اغاني الطبيعة الكردية قد حفظت لنا اسماء معظم الجبال في كردستان ، كجبل الجودي ، وجبل سنجار وجبل ئيلگان وجبل كوسەداغ وجبل بينگول وجبل سپيانیخەلات وجبل گريداغ (آگريداغ) وجبل سينك وجبل توژكبابا في دەرسيم وغير هذه الجبال كثير في شتى ارجاء كردستان . ولن يجد الباحث عن غيرها فى طول كردستان وعرضها مشقة في تذكر العشرات منها ، ولا سيما اللواتي نسجت حولها قصص الحب والبطولة واقترنت بها اسماء العشاق من امثال (خەجيزر و سيابند) كجبل سپيان المذكور آنفاً ، حتى بلغ امر الجبال من اهتمام الكرد بها ، انها كثيراً ما تتردد في مأثوراتهم وامثالهم الشعبية وقصصهم واساطيرهم متخذة اشكالا متنوعة من التشبيهات والمقارنات المجازية والتشخيصات الرمزية والتشخيص في اصطلاح الادب تشبيه غير العاقل بالعاقل ، كقولهم : « الجبل العديم الازهار ، كالانسان العديم الاسرار ، وكلاهما سيان » . وغالباً ما يصور الجبل كبطل يذود بشرف عن حمى الكرامة ، او زعيم يجمع شمل الشتيت من العشير والقبيل او حام يحمى المظلومين والمحزونين ويخفف من نصب المرهقين والمكدودين . ومما قالوا في هذا المعنى : « الجبل الشاهق افضل من الجار السيىء » وصفوة الكلام

ان الجبال في الاغاني والامثال والمأثورات والقصص الكردية بمثابة خلفيات سحرية[1] لابد منها ؛ اذ بها يَـطّرد ذكر عناصر الطبيعة الأخر من العيون والينابيع المتفجرة والشلالات والمساقط الهادرة والجداول والسواقي الرقراقة والامطار المدرارة والثلوج الغزيرة والسحب المسخرة ، ومما قالوا في الغيوم :

يا ابنة العم الشقراء ، ان سود الغيوم أمطار .
أما بيضها فشـتاء
أحسن بسودها ! فانها ربيع مخيم على الاغنام .

٤— الخصائص الفنية للاغاني الفولكلورية الكردية :

ان الاغاني الكردية على اختلاف الوانها من اغاني العمل واغاني الطبيعة وأغاني الحب تكاد لاتعدو ان تكون بوجه عام ، ضرباً من ضروب المحادثة والمسامرة خلا انها تؤلف للغناء بحسب المناسبات والدواعي والاغراض التي تدعو الى تأليفها وتعبر عن هموم القلوب المحبة والنفوس المشتاقة عبر الحان وانغام مغناة تردد ارجاع أصدائها الوديان والجبال كما ترددها اروقة القلوب العاشقة في سيمفونية يشترك في ادائها خرير الشلالات وأغاريد الطيور وهمس النسيم ويتراقص على انغامها الشجر والحجر والطير .

ومن الطبيعي ان تكون هذه الاغاني واحاديث القلوب هذه غنية غنى كردستان بتنوع اجوائها الطبيعية والجغرافية وغزيرة غزارة

---

(١) الديكور السيمبولي .

حب الكردي لكردستان . والله وحده يعلم كم نظم منها ، وكم ضاع منها بضياع حفظتها ورواتها ! وكم بقي فيها مطموراً لم يكشف عنه بعد ! ..

ومما يذكر ان قائلي الاغاني الكردية شأن سائر الشفويات الفولكلورية غير معروفين الا مانُصّ على اسمه فيها مع ما نص عليه من اسماء الاماكن والاشخاص ، ويصار في نظمها من حيث الوسائل التعبيرية والابداعية والجماعية الى لغة التخاطب البسيطة والتشبيهات والوزن والقافية وفق الالحان الفولكلورية المتداولة . وتشكل عناصر الطبيعة جزء مهما منها في المقارنات المجازية ، فتشبه المعشوقة بالريم والازهار والتفاح والقرنفل الاخضر والاوز والسرو كما يشبه العاشق بالجبل والصخر والسيف وغير ذلك ...

اما فن النظم فانماط شتى وضروب مختلفة ، فمنها الرباعيات مثل :

. . . . . م

. . . . . م

. . . . . ن

. . . . . م

ومنها المثنويات مثل :

. . . . . ر

. . . . . ر

. . . . . د

. . . . . د

ومنها مايلتزم فيه التقفية بين الشطر الاول من الاغنية والشطر الاخير منها اذا كانت للمطرب الفرد مثل :

. . . . . ى

. . . . . س

. . . . . ك

. . . . . ل

. . . . . ى

كما يلاحظ ان اسلوب النداء في هذه الاغنيات فمتنوع هو الآخر ، ينادي المحب عادة بحرف النداء ( وٓ ) وتنادى المحبوبة بحرف النداء ( ىٓ ) في آخر المنادى كقولهم : لوٓلوٓ ، و لىٓلىٓ . وقد تتكرر النداءات ، وربما تكررت بعض الكلمات في مطالع الاغنية او بعض المطالع برمتها اكثر من مرة ، وقد تصادف منها الترجيع بند والتركيب بند واحياناً المركب من لغتين كالمركب من الكردية والارمنية .

* * * * * *

# زمانی عەرەبی و کێشەی زاراوەی کوردی

ئەندامی یاریدەر : کامیل بەصیر

زمان نییە لەم جیهانەدا کێشەی نەبێت* و لە چنگی کەم و کورتی رزگار بتوبێت ؛ بۆیە ئەتوانین بڵێین : هەمو زمانێك تا لە ژیانەوە نزیك بێت و هۆی دەربڕینی بیر و باوەڕ و هەست و نەست بێت کێشەی زۆر ئەبێت و کەم و کورتیەکانیشی بە جۆرێکی سامناك خۆیان ئەنوێنن . ئەگەر بمانەوێ سەرچاوەی کێشەو کەم و کورتیەکانی

---

* هەر وەك لە سەرەتای ئەم گۆڤارەدا بلاومان کردۆتەوە هەمو خاوەن وتارێك خۆی بەرپرسیارە لە ناوەرۆکی وتارەکەی . لەوانەیە لەم وتارەی ئەندامی یاریدەری کۆڕ مامۆستا کامیل بەصیردا چەند بیروڕایەك هەبێت کە لەگەڵ بیری ئەنجومەنی کۆڕ یا بڕیارەکانیدا نەگونجێن . بەلام ئەنجومەنی کۆڕ بلاوکردنەوەی هەمو بیر و پێشنیارێکی زانستی لە بارەی هەڵبژاردن و داڕشتن و داتاشینی زاراوی کوردییەوە بە کارێکی پێویست دادەنێ چونکە لەو بڕوایەدایە کە بە هاریکاری هەمو لایەك دەتوانین ئەرکی دانانی زاراوی کوردی باشتر بە ئەنجام بگەیێنین .

ـ لیژنەی گۆڤار ـ

زمانێکی زیندوو دەست نیشان بکەین ، بە هەڵەدا ناچین گەر پەنجە بۆ وشەکانی درێژ بکەین .

## وشە لە زماندا :

لە زمانەوانیدا ئاشکرایە کە زمان داڕشتەیەکە[1] و ئەم داڕشتەیە بەرهەمی یەکگرتنی[2] توخمەکانی[3] وشە و ڕێزمانی رستەسازی و دەستووری پێکهێنانی ئاخاوتنە . بێگومان ئەم یەکگرتنەی بە جۆرێکی میکانیکی نابێت ، بەڵکو بە کارتێ کردنی چەند هۆیەکی کۆمەڵایەتی و سروشتی و دەروونی و بیری لە بۆتەی[4] مێشکی میللەتدا ئەنجام ئەدرێ . زمانەوانەکان هەوڵیان داوە بۆ نرخ پێدانی ئەو توخمانە ، بۆ ئەوەی رادەی پلەی هەر توخمێك لە بوونی زماندا دەست‌نیشان بکرێ ؛ لە ئەنجامدا زمانیان بە درەختێك داناوە و وشەکانیان بە گەڵای ئەو درەختە لە قەڵەم داوە .

ئەم دانانە شایانی مشتومڕە ، ئێمە لەو باوەڕەداین کە ئەم دانانە ناتوانێ لە نرخی وشە کەم بکاتەوە و توخمەکانی تری زمان بە سەریدا

(١) داڕشتە : سبيكة .

(٢) یەکگرتن : تفاعل .

(٣) توخم : عنصر .

(٤) بۆتە : بودقة .

بسەپێنێ ، چونکە رووەك زانین(٥) ئەسەلمێنێ : گەڵا ستی درەختە و کارگەی سازداتی خواردەمەنییەتی .

بەم پێیە ئەتوانین نرخی وشە لە زماندا بە بەرزتی بهێنینە کایەوە و بە سەر سوڕمانێکەوە بپرسین : ئایا وشە واتا دەرنابڕێ ، ئایا وشە بەردی بناغەی رستە نییە ؟ ، ئایا وشە پردێك نییە بۆ بیر و باوەڕ و هەست و نەستی قسەکەر ؟ . دوا بە دوای ئەمانە هەمتی ئایا وشە بەرهەمی درەختی زمان نییە کە لە دڵی کۆمەڵگادا رواوە و رەگ و ریشەی بە درێژایتی مێژوی دێرینی میللەت بۆ هەڵمژینی خواردەمەنی بۆن و قەوارەی راکێشاوە ؟. کەوابوو وشە ژمارەیەکی وشك و نیشانەیەکی مردوو بۆ واتایەك نییە ، بەڵکو تۆخمێکی زیندووە و بە ژیانی ئەو میللەتەی کە بەکاری ئەهێنێ ئەژی و بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵئەستێ .

ئەم راستیانە سەرئەنجامێك رەچاو ئەکەن کە فەرهەنگی وشەی زمانی نەتەوەیەك ـ لە زۆر رووەوە ـ لە فەرهەنگی زمانی نەتەوەیەکی تر جیاوازە لە ژێر تیشکی ئەم سەرئەنجامەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە و ئەپرسێت : تا چ رادەیەك زمانی عەرەبی ، ئەتوانێ کێشەی زاراوە لە زمانی کوردیدا چارەسەر بکات ؟ .

(٥) رووەك زانین : علم النبات .

## ڕێبازی زمانی عەرەبی لە داهێنانی وشـەی نوێـدا :

وەلامی ئەو پرسیارە پێویستی بە سەرنجێك لە سروشـتی زمانی عەرەبی هەیە بۆ ئەوەی بتوانین بە کورتی ڕێگاکانی ئـەم زمانە لە داهێنانی وشەی نوێدا دەستنیشان بکەین .

ئەم ڕێـگایانە زۆرن ، زمانەوانەکان تەنیا بایەخیان بە چواریان داوە کە ئەمانەی خوارەوەن :

١ـ (ڕێـگای مەجاز)[٦] . ٢ـ (ڕێـگای دارشـتن ـ بە هەمو جـۆرەکانیـەوە)[٧] . ٣ـ (ڕێگای داتاشـین)[٨] . ٤ـ (ڕێـگای لێکدان)[٩] . ئەوەی لـەم ڕێگایانە پەیوەنـدی بە لێـکۆڵینەوەکەمانەوە هەبـێ ڕێگای مەجازە ، چـونکە زمانی عەرەبی ئەم ڕێـگایەی گرتۆتە بەر بۆ داهێنانی زاراوەکانی کە هەندێ لە زمانەوانەکانی کورد بە سەرچاوەی زاراوەی کوردی دایان ئەنێن و پشتیان پێ ئەبەستن بۆ چارەسەرکردنی تەنگوچەڵەمەی زمانی کوردی بە وشەی نوێ بۆ دەربڕینی واتا تازەکان .

---

(٦) مەجاز : Metaphor .

(٧) دارشتن : الاشتقاق .

(٨) داتاشین : النحت .

(٩) لێکدان : للترکیب .

## مەجاز و وشـەی عەرەبی :

لێرەدا بە ئەرکی سەرشانی دەزانـین کە تۆزێـك لە ڕێـگای مەجاز بدوێین بە هیوای شتیکردنەوەی سروشتی وشـەی عەرەبی و چۆنیەتی داهێنانی واتا زاراوەییەکانی .

مەجاز لە سنووری « سیمانتیکدا »[10] گواستنەوەی وشـــەیەك لە واتایەکەوە بۆ واتایەکی تر ئەگەیەنێت و ئەم وشەیە بە زاراوە ناو ئەبرێت . لە دایك بوونی زاراوە بەهۆی مەجازەوە لەسەر سێ بناغە دامەزراوە :

بناغـەی یەکەم : واتا دێرینەکەی زاراوەیەکە کە لەمەوپێش لە قسە و دەقی وێژەییدا بۆی بەکارهێنراوە .

بناغەی دووەم : واتـا تازەکەی زاراوەیەکە کە وشـــەکە گواستراوەتەوە بۆ دەربڕینی .

بناغەی سێیەم : چەشنە پەیوەندییەکە لە میانی واتا دێرینەکەی زاراوەکە و واتا تازەکەیدا . لەدایك بوونی زاراوەی عەرەبی بەم جۆرە ڕوداوێکی هەڕەمەیی نییە ، بەڵـکو ئەنجامیکی سروشتییە پەیوەندی بە دەروون و نەریت و خووی کۆمەڵـگای عەرەبەوە هەیە .

## شتیکردنەوەی چەنـد زاراوەیەکی عەرەبی :

جا بۆ ئەوەی لە چۆنیەتی داهێنانی زاراوەی عەرەبی بگەین با

(١٠) سیمانتیك : علم الدلالة .

سەرنج لە لەدایکبوونی ئەم سێ زاراوەیە بدەین .

زاراوەی یەکەم : وشەی ( عەقیلە )یە وشەی « العقیلة » لە بناغەدا بۆ واتای - بەپەت بەستراو - بەکارهێنراوە ، عەرەب لە سەردەمی جاهیلیدا وتویەتی ، — ( عقلت الناقه بالعقال ) واتا دەست وپێی حوشترەکەم بە پەت بەستەوە ؛ ( فالناقة عقیلة ) : حوشترەکە بە ستراوەتەوە . دوا بە دوای ئەمە کۆمەڵگای عەرەب ئەم وشەیەی بۆ واتایەکی نوێی گواستەوە و بە واتای کەیبانۆ « السیدة » بە کاری هێنا و ئێستا کە لە زمانی عەرەبیدا دەربڕینی ( عقیلة فلان ) ئەبیستین واتای ( سیدة فلان ) ئەگەیەنێ . پەیوەندیی میانی ( عەقیلە ) بە واتای بە پەت بەستراو و ( عەقیلە ) بە واتای کەیبانۆ لە نرخ پێدانی کۆمەڵگای عەرەب بۆ ئافرەت هەڵقولاوە ، چونکە ئافرەت لە کۆمەڵگای خێڵایەتی عەرەبدا بە مێردەکەیەوە بە ستراوە و مافی جیابونەوەی نییە و هەمیشە بە دیلی پیاو ئەژمێررێ .

زاراوەی دووەم : وشەی ( مەسرەح )ە . مەسرەح لە زمانی دێرینی عەرەبیدا بە واتای لەوەڕگا بەکاردێت ؛ عەرەب دەڵێن : ( سرحت الأبل ) : چوون بۆ لەوەڕگا ؛ چونکە مەسرەح ناوی جێگای[11] فەرمانی « سرح » یە ، بەڵام لەم ڕۆژانەدا عەرەب ئەم وشەیە بە واتای شانۆ بەکارئەهێنن . سەرچاوەی ئەم واتا تازەیەی وشەی ( مەسرەح ) سروشتی وڵاتەکەی میللەتی عەرەبە ، دیارە میللەتی

(۱۱) ناوی جێگا : اسم المكان .

عەرەب کە لەم رۆژانەدا زاراوەی « المسرح »ی داهێناوە پەیوەندی مەیانی هەردوو واتاکەی لەسەر بناغەی سەربەستی ئازاڵەکان لە لەوەڕگا و ئازادی بزوتنەوەی هونەرمەندەکان لەسەر شانۆدا دامەزراندووە.

زاراوەی سێیەم : وشەی « فنان »ە ، ئەم وشەیەش وەکو هەمو زاراوەیەك لە زمانی عەرەبیدا دوو واتای هەیە : لە هەندێ دەقی عەرەبی کۆندا وشەی « فنان » بە واتای چەشنێك لە کەر ، کە پێستەکەی بەڵەك و رازاوەیـە ، بەکارهێنراوە . بـەڵام لەم رۆژانەدا ئەم وشەیە بۆ دەربڕین لە هونەرمەند ساز ئەدرێ ، پەیوەندی واتا کۆنەکەی وشەی « فنان » و ئەم واتا تازە سـەیرەی رەنگە لە سـەرەتای مێژوی پەیدابونی هونەرمەند لە کۆمەڵگای عـەرەبدا هەڵقولابێت .

ئەوەی لە مێژوی هونەرمەندی عەرەب بکۆڵێتەوە ئەبینێ ئەم مرۆڤە پایەبەرزە لە سـەرەتای بەجێهێنانی ئەرکەکانی سەرشـانی جلی رەنگاورەنگی لەبەر ئەکرد و دەموچاوی بە بۆیە ئەگۆڕی ، جا بەم جۆرە لەسـەر شانۆدا دەرئەکوت ، مێشکی عەرەب واتا کۆنەکەی « فنان »ی یاد کردەوە و گواستیەوە بۆ ئەم واتا پیرۆزەی زاراوەی « فنان » .

شیکردنەوەی ئـەم سێ زاراوە عەرەبییانە هەمان راستیمان پێ ئەسەلمێنێ کە پێویستە لێرەدا دوپاتی بکەینەوە و بڵێین :

زاراوەی عەرەبی وشەیەکی رون نییـە ، بەڵکو بەرهەمی

سروشـــتی زمانی عەرەبی و دەروون و نەریت و خوی عەرەب و ولاتەکەیەتی .

لە چوارچێوەی ئەم راستییەدا ئەبێ بڕوانینـە ئەنجامی کاری ئەو زمانەوانە کوردانەی کە ئەیانەوێ کێشەی زاراوەی کوردی بـە وەرگرتنی لە زمانی عەرەبی چارەسەر بکەن و بە خەزنەی ئەو چەشنە زاراوە عەرەبییانە زمانی کوردی هەژار دەوڵەمەند بکەن .

## ڕێگاکانی وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی :

ئەگەر بمانەوێ بە جۆرێکی زانیاری پەردە لەسەر ئەو ئەنجامە لابدەین و نرخ بە کاری ئـــەو زمانەوانانە بدەین ، ئەبێ لە ڕێگا سەرەکییەکانی وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی بکۆڵینەوە . بە وردبونەوە لە کۆمەڵە زاراوەیەکی عـەرەبی لە زمانەکەماندا بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم زاراوانە بە یەکێك لەم ڕێگایانەی خوارەوە وەرگیراون :—

١— وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی بەبێ دەستکاری : بەرهەمی ئەم ڕێگایە لە زمانەکەماندا زاراوەیەکی زۆرە ، لەم زاراوانە وشەی (ئەدەب)ە . جا با بزانین مێژوی ژیانی وشەی ئەدەب لە زمانی عەرەبیدا چۆنە ؟ .

لە سەردەمی جاهیلیدا لە چاوگی « الأدب » ناوی بکەر « الآدب » بە واتای : میوانیکەر هاتووە هـــەر وەکو لەم دێڕەی خوارەوە دەرئەکەوێ :

نحن في المشتاة ندعو الجفلى لا ترى الآدب منا ينتقر

لە سەرەتای ئایینی ئیسلامدا فەرمانی «أدب»ە و چاوگی «تأديب» لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر (د.خ.) بە واتای خوو و رەوشت هاتووە . پێغەمبەر (د.خ.) فەرمویەتی : (أدبني ربي فأحسن تأديبي) . لە سەردەمی ئەمەویەکاندا ، وشەی «مؤدب» لە جیاتی مامۆستای فێرکەری هۆنراوە و پەخشان و مێژوو و لقەکانی تری رۆشنبیری بەکارهێنراوە .

بەم جۆرە لەم سێ قۆناغەی ژیانی وشەی ئەدەبەوە بۆمان رون دەبێتەوە کە بە هیچ جۆرێك ئەم وشەیە بە واتای هۆنەری و وشەسازی و ئاخاوتن بەکارنەهێنراوە و واتا کۆنەکانیشی (میوانداری و خوو و رەوشت و فێرکردنی خووی باش) تا ئێستا زیندون . بەکارهێنانی وشەی ئەدەب بە واتای هۆنەری و وشەسازی و ئاخاوتن چەشنێکە لە مەجاز و ئەم بەکارهێنانە لەگەڵ سروشتی زمانی عەرەبی ئەگونجێت و زەوقی میللەتی عەرەب پێی قایلە . بەلام لەبەر چ هۆیەك هەر ئەبێت زمانی کوردی زاراوەی (ئەدەب) بەو مێژووەوە وەربگرێت و پشت بکاتە گەنجینەی وشەکانی ؟ . وەلامی ئەم پرسیارە چەند بیەوێ زمانی کوردی بە هەژاری گوناهبار بکات ، ناتوانێت فەرامۆشی ئەو راستییە بکات کە لە شیکردنەوەی ژیانی وشەی ئەدەبەوە هەلئەقولێت و ئەلێت : ئەم وشەوەرگیراوە لە زمانی کوردیدا واتاکەی ناگەیەنێت و پێی

ناکرێت جێگای وشـەی وێژەی کوردی پڕبکاتـەوە . ئـەوەی سەیرە ـ بەم بۆنەیەوە ـ کۆمەڵێك لە وێژەرانی کورد کە ویستیان ناوێـکی کوردی بۆ یەکێتیەکەیان بدۆزنەوە خۆیان لە وشـەی (ئەدەب) دوور خستـەوە ، بەڵام چونکە توشی گرێی وەرگرتنی زاراوەی عەرەبی بوبون وشەی وێژەیان فەرامۆش کرد و زاراوەی توسەریان بەکارهێنا بەبێ ئەوەی ئاگاداری ئەوەبن کە زاراوەی نوسـەر جێگای وشەی وێژە ناگرێت و تەنیا یەکێك لە لقەکانی وێژە ـ واتا پەخشان ـ ئەنوێنێ .

٢ــ کردن بە کوردی[١٢] یەکێك یان پـتر لە دەنـگەکانی زاراوە عەرەبییەکە :

نمونە بۆ ئەم رێـگایە وشـەی (کتێب)ە ، وشەی (کتێب) لە زمانی کوردیدا لە زاراوەی «کتاب»ی عەرەبییەوە بە گۆڕینی پیتی (أ) بە پیتی (یـ)ی کوردی وەرگیراوە .

ئەگـەر سەرنجێك لە فەرهەنـگەکانی عەرەبی بدەین بە مەبەستی دەست نیشان کردنی واتاکانی «کَتَبَ» بۆمان دەرئەکەوێ کە ئەم وشەیە لە بناغەدا بە واتای رازانەوەی کونە بە مورو بەکارهاتووە . لە عەرەبیـدا ئەوترێ : (کتبت القـربة إذا زینتهـا بالخرز) ، هەنـدێ جاریش بـە واتای گرش کردنی قاچ و قول هاتووە .

(١٢) کردن بە کوردی : نـکرید ، Transliteration .

لە عەرەبیدا ئەڵێن : (کتبت البغلة قوادمها إذا جمعتها) . زاراوەی «کتاب» کە لە عەرەبیدا لە «کتب»ەوە داڕێژراوە ، پەیوەندی بەو دوو واتایەوە هەیە ، چونکە «کتاب» بە (بیت) رازاوەتەوە و چەشنێك لە زانیاری تێدا کۆکراوەتەوە ، زەوقی عەرەبیش کە بە گواستنەوەی ئەم وشەیە لە واتا کۆنەکانیەوە بۆ ئەم واتا تازەیە قایل بووە ، ئەم قایلبوونەی لە سەر بناغەی مەجاز دامەزراوە .

زمانی کوردی چ پێویستییەکی بە وشەی «کتاب» هەیە ؟ ئایا ئەگەر هاتو دەنگی (أ)مان گۆڕی بە دەنگی (ێـ)ی کوردی مێژووی واتای ئەم وشەیە ئەگۆڕێ و لەگەڵ زەوقی نەتەوەکەمان و سروشتی زمانی کوردیدا ئەگونجێ ؟ ، وەڵامی ئەم دوو پرسیارە لەو راستییەوە هەڵئەقوڵێ کە ئەڵێت وشەی کتێب لە فەرهەنگی کوردیدا هیچ واتایەکی نییەو لای شارەزاکانی زمانی عەرەبی سێبەری واتا عەرەبییەکانی کەرەسەی پیتانی : ك ، ت ، ب ، پێوەی توساون و لێی جیانابنەوە . نازانم بۆچی ئەم راستییە لەلای ئەوانەی بەربەرەکانی وشەی (پەڕتوك) ئەکەن هیچ دەنگی نەداوەتەوە ، ئایا هەر لەبەر ئەوەیە کە شتی خۆماڵی لای هەندێکمان نرخی نییە ؟ ، یاخود لەبەر ئەوەیە کە ئەم هەندە ئاشناییان لەگەڵ مێژووی وشەی (کتێب)دا نییە ؟ . هەرچۆنێك بێت ئێمە لەو بڕوایەداین کە کردن بە کوردی دەنگی وشەی عەرەبی لە بەرهەمهێنانی زاراوەی نوێی بۆ زمانەکەمان رێگایەکی

سەرکەوتو نییە .

٣— کردن بە کوردێ دەنگی زاراوەی عەرەبێ و پەرەپێدانی واتاکەی :

ئەم ڕێگایە چەند زاراوەیەکی خستۆتە ناو زمانەکمان لەمانە وشەی ( قوتابی )یە . وشەی قوتابی لە دەربڕینی « کُتّابی » ی عەرەبییەوە وەرگیراوە ، ئەم دەربڕینە لە وشەی « کُتّاب » ; بە واتای حوجرە و پیتی یای نەسەب پێکهاتووە ، کەوابێ وەرگرتنی وشەی قوتابی بە سێ هەنگاو ئەنجام دراوە : هەنگاوی یەکەم : دەنگی ( ك ) کراوە بە ( ق ) . هەنگاوی دووەم : لەو دوَ ( ت ) یێیە یەکێکیان فڕێ دراوە . هەنگاوی سێیەم ، واتای « کُتّابی » لە خوێندکاری حوجرەوە پەرەی سەندووە بۆ واتای خوێندکاری خوێندنگاو زانکۆ .

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە ئەم پەرەسەندنەی واتای « کُتّابی » لە زمانی کوردیدا لەسەر چ بناغەیەك بووە ؟ بێگومان ئەم بناغەیە هەر چییەك بێت پەیوەندێ بە زمانی کوردییەوە نییە و ئەوانەی لەسەر بەکارهێنانی سوورن کەڵك لە نەزانینی بناغە عەرەبییەکەی وەرناگرن . جا بۆمان هەیە کە بپرسین ، ئایا هەر بەردەوام ئەبن لە پشتێکردنی وشەی خوێندکار و بەکارهێنانی دەربڕینی قوتابی یاخود لە مەودوا — وەکو کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئەوروپا — وشەی خوێندکار بەکارئەهێنن ؟ .

٤ — وەرگێڕانی زاراوەی عەرەبی ، زۆر ئاشکرایە کە هەر نەتەوەیەك بەگوێرەی چۆنیەتی بیرکردنەوەی تایبەتییەکانی ڕوداو ، شتەکان هەڵئەسەنگێنن و دەست نیشانیان ئەکەن ، بۆیە وەرگێڕی واتای وشەیەك یا رستەیەك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ئەبێ ئاگای لەو چۆنیەتی بیرکردنەوەیە ببێت و بزانێت خاوەنی ئەو وشە و رستەیە لە نەتەوەکان بە چ پارسەنگێك لە تایبەتییەکانی ڕوداو و شتەکان گەیشتووە .

هەندێ لە زمانەوانەکانی کورد کە زاراوەی عەرەبی وەرئەگێڕنە سەر زمانی کوردی زۆر ئاگایان لەو راستییەی سەرەوە نابێت . بەڵگەمان بۆ ئەمە بە هەڵەدا چوونی وەرگێڕانی « المظاهرة » یە لە عەرەبییە بۆ کوردی . وشەی «المظاهرة» لە زمانی عەرەبیدا لە فەرمانی «ظاهرة»ەوە ، وەرگیراوە «ظاهرة»یش لە عەرەبیدا بە واتای (پشت گرتن) هاتووە . عەرەب ئەڵێت : (ظاهر فلان فلاناً أي سند ظهره وآزره) ، کەچی وەرگێڕی کورد وای زانیوە ، وشەی « المظاهرة» لە فەرمانی «تظاهر»ەوە هاتووە بۆیە واتاکەی بە وشەی (خۆپیشاندان) دەربڕیوە ، سەرەڕای ئەم هەڵەیە وشەی (خۆپیشاندان) تایبەتییەکانی ڕوداوەکە ناگەیەنێت و مەبەستی جەماوەران لە و کارەدا دەرناخات .

٥ — داتاشینی زاراوەی کوردی بە رابەری زاراوەی عەرەبی : نموونە بۆ ئەم رێگایە وشەی زانکۆیە لە رەگی چاوگی (زانین) و وشەی (کۆ) داتا شراوە ، وشەی (کۆ) یش ، ئەوە ئەسەلمێنێ کە داتاشەری

زاراوەی زانکۆ چاوی لە زاراوەی «الجامعة» بووە، چونکە «الجامعة» ناوی بکەری فەرمانی «جَمَعَ» یە. ڕەنگە لێرەدا بە ڕەنگاری پرسیارێك ببین کە بە سەرسوڕمانێکەوە بڵێت جا زیانی ئەوە چییە؟! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە پێویستیمان بەیەکالا کردنی زاراوەی «الجامعة» ئەبێت. «الجامعة» ئاوەڵناوی وشەی مەدرەسەیە کە نێری دراوە. عەرەب کە ئەڵێت: «الجامعة» مەبەستی ئەوەیە کە بڵێت: المدرسة الجامعة واتا خوێندنگای کۆکەرەوە. جا ئەم خوێندنگایە خوێندکاران کۆئەکاتەوە یاخود چەشنەکانی زانیاری و وێژە؟. وشەی «جامعة» ئەوە دەرناخات هەرچەند هاوتاکەی کە وشەی زانکۆی کوردییە ئەوە دەرئەخات کە کۆکراوەکە زانیارییە. بەڵام ئایا زانکۆ زانیاری کۆئەکاتەوە یاخود سەرچاوەی زانیارییە و چەشنەکانی زانست و وێژەی لێ هەڵئەقوڵێت و بەناو مێشك و دڵی خوێندکارەکانیا بڵاوئەبێتەوە؟ بێگومان زانکۆ سەرچاوەی زانیارییە بۆیە ڕێگا لە وشەی زانستگا ناگرێت کە لە جیاتیی بەکار بهێنرێ.

ئەم پێنج ڕێگایە ـ هەروەکو لە شیکردنەوەی بەرهەمەکانیان، دەرئەکەوێت ـ کێشەی زاراوە لە زمانی کوردیدا چارەسەر ناکەن و فەرهەنگی کوردەواریمان ئەئاڵۆزێنێ لەمەش سامناکتر

ئەوەیە ئەگەر زمانەوانی کورد ئەم ڕێگایانە بگرێتەبەر دەروازەکانی زمانی نەتەوەکەی لەڕوی خۆیدا دائەخات و سەرچاوەی وشە و زاراوە داتاشراوەکان و لێکدراوەکان کە لە سروشتی زمانی کوردیدا هەڵقوڵاوە وشك ئەکات .

* * * * * *

## ـ ملخص المقال ـ

# اللغة العربية ومشكلة وضع المصطلحات الكردية

العضو المؤازر : كامل البصير

لاريب في ان اللغة صياغة حاصلة من تفاعل عناصر الكلمة والقواعد واساليب التخاطب ، ومن المعلوم ان ذلك ليس مجرد صدفة ارتجالية ، وانما نتيجة عوامل اجتماعية وطبيعية وانصهار الأفكار وصياغتها في بوتقة معينة .

لقد حاول اللغويون ان يهتموا بتلك العناصر كي يسجلوا درجة كل عنصر في تكوين اللغة . ونستطيع ان نظهر قيمة الكلمة في اللغة عالية فهي تظهر المعنى وهي اساس الجملة ووسيلة التعبير عن المشاعر والمعتقدات للمتكلم واخيراً انها ثمرة شجرة الكلام التى نبتت في ضمير الشعوب وأصّلت جذورها عبر التاريخ الطويل لتمتص غذائها وتستوى على سوقه الباسقة ، إذاً لاتُعدّ الكلمة رمزاً مهملا ميتاً للمعنى بل عنصر مهم حي وتعيش بحياة الشعوب التي تتكلم بها ، ان هذه الحقائق تهدينا الى ملاحظة هي : ان قاموس لغة أمة يمتاز عن قاموس لغة أمة اخرى ويختلف عنه ، وهنا سؤال يفرض نفسه وهو : الى اى مدي

تستطيع اللغة العربية ان تضع حلا لمشاكل اللغة الكردية .

ان جواب هذا السؤال يحتاج الى النظر في طبيعة اللغة العربية كى يتسنى لنا التعرف الى اساليب هذه اللغة في وضع الكلمات الجديدة ، ولاشك ان طرق ذلك كثيرة ، واهتم علماء اللغة بطرق اربع منها وهى : المجاز والاشتقاق بانواعه والنحت و التركيب وألصق هذه الطرق ببحثنا طريقة المجاز لأن اللغة العربية اتخذت هذه الطريقة لوضع المصطلحات ، وسارسيرتهم بعض علماء اللغة الكردية وجعلوا المجاز مصدراً ثرّاً لوضع المصطلحات واعتمدوا عليه في حل المشاكل التي تواجههم في اللغة الكردية للتعبير عن المعاني الجديدة . ولكن تحليل بعض المصطلحات العربية يبين لنا بشكل جلي ان المصطلح في اللغة العربية هو نتيجة تفاعل بين طبيعة لغتهم وسليقة اعرافهم وآدابهم في صياغة الكلام في بيئتهم . وعلى ضوء هذه الحقيقة ينبغى ان ندرك مايقوم به بعض اللغويين من فقهاء اللغة الكردية من حلّ مشاكل المصطلحات الكردية بأخذ ما جرى في اللغة العربية وحل مشاكلها وجعل اللغة الكردية الفقيرة ثرية بذلك الأخذ . وهم يتبعون في ذلك اسلوب النقل المباشر دون تصرف او يحاولون (تكريد) مصطلحات عربية عن طريق تبديل اصول كتابتها او ترجمتها الحرفية وفي اغلب الاحيان ينسون او يتناسون كلماتهم الأصيلة كما لايأخذون خصائص اللغة الكردية والذوق الكردي بنظر الاعتبار .

ومن الأمور المسلمة ان كل امة تعبر وتظهر القضايا حسب مفاهيمها وادراكها الخاص وتزن بميزانها ، ولهذا لابد لمن يتعرض الى

ترجمة فكرة او قضية ان يضع نصب عينيه للمفاهيم التي يريد ترجمتها الى لغته وان يكون دقيقاً في ذلك . فنجد بعض الأكراد يترجمون بعض النصوص والكلمات ولا يلاحظون الحقيقة التى ذكرناها ونضرب لذلك مثلا ترجمة كلمة « المظاهرة » العربية الى اللغة الكردية ، فهذه الكلمة في العربية مأخوذة من « ظاهرة » وهي بمعنى المساندة يقال : « ظاهر فلان فلاناً اي اسند ظهره وآزره » ، ولكن المترجم الكردي اعتقد انها من « التظاهر » ولهذا ترجمها بكلمة « خۆپيشاندان » الكردية وهذه الكلمة قاصرة عن تأدية المعنى المطلوب .

ومن هنا فان من واجب اللغوي الكردي ان يكون حذراً ، دقيقاً يأخذ بالحسبان خصائص لغته وطبيعتها التى فسحت مجالا كبيراً للنحت والتركيب من جذور كردية أصيلة وان ياخذ بنظر الاعتبار ايضا خصائص اللغات الاخرى التي تخضع لقوانين معقدة مرتبطة بعوامل طبيعية وتطورات تأريخية عميقة وهو بذلك يستطيع تجنب خلق عثرات ومشاكل جديدة امام معاجم لغتنا .

* * * * * *

# ئەحمەدێ خانی یێ نەمر

ئەندامی یاریدەر : صادق بەهادین ئامێدی

هەکە مرۆڤ هویرك و لسەر خو بەرێ خو بدەتە دویرۆکا مللەتێت جیهان ئانکو بخوینیت ؛ دهەمی دەم و چەرخێت ژینا مرۆڤی ئو مرۆڤاتیێدا ، هەر ژ ئەلندێ ( بەری بەیانێ ) دیاربونی ئو ئەفراندن و پەیدابونی ئو ئاکنجی بوین و جهوار بوینا مرۆڤی لسەر رویێ ئەردی (کادی ) هەتا نهو ڤێ گاڤێ ژی ، دێ بێنیت کو چو مرۆڤ ، چو دەستەکێت مرۆڤان یا چو ئۆبێت وان ژی ؛ چو جڤات (کومەل ) و چو مللەت ژی ژ مرۆڤێت گرە ـ گرە ئو کەنکەنە ئو فێهرسان ، ژجامێر و ژێ هاتیان ، ژقەهرەمان و پەلیڤان و پەهلەوانان ؛ ژزانا ئو رەوشەنبێرێت بەرکەفتی ئو ئێکانە بێ پشك و زێبەهرە نەبوینە ئو نابن . هەر دێ تێدا ئانکو دناڤدا دیاربن ، چ کێم یان گەلەك (زۆر) هەکە هات ود نیڤ چەرخەکی یا دچەرخەکیدا دیار و خویا نەبن ، دێ دچەرخێ پاشتردا هەر پەیدابن . بەلێ کەنکەنە ، فێهرس و ئافرەتوین و هەلکەڤتی ، هەکە ژهەمی مللەتان ژی بێ جودایێ

رابین ؛ بەلێ ژتەمەت ( هندی ) تلێت دەستانە ، ئانکو دکێم و کەتکەتەنە ؛ کو دژینا دویر و درێژا ملەتاندا ، هەر چەند کەسەك هەکە دچەرخەکێدا رابین ، ئانکو پەیدا ببن نەکێمن .

لسەر ڤی رێدارا ( یاسا ) سروشتێ یاکو هەمی ملەتان یا هەمی مروڤاتیان بێ جودابی دگریت ؛ ملەتێ کورد ژی بێگومان ژوان کەتکەتە مروڤان ، ژوان کەنکەنە ئو ڤێپهرسان ، ژوان هەلکەڤتی ئو ئافرەتوین و گرە ـ گران بێ پشك و زۆربەهرە نەبویە ئو نابیت ژی ؛ ئەگەرچی رەنگە دملەتێ کوردا نەژتەمەت ملەتێت پێشکەڤتێ رابین ، ژبەر سال و دەمێت گران ، ژبەر ئالۆزی ، سختی ئو تەنگاڤی ئو بار و زروفێت خـومالی ییت ملەتێ کوردانە ، کو بێگومان گەلەك ژناڤدار و هێژا ئو هەلکەڤتییانە ( هەلکەڤتییانە ) کو هێژ لاو بەرکەپی رەش نەبویی بارکرنە ئانکو مرنە نەمانە : خانیێ نەمر دمەم و زینێدا ، بوان ئالۆزی ئو تەنگاڤیا دئاخڤیت ، دبێژیت :

ئــەڤ رۆم و عەجەم بوان حسارن
کـرمانج هـەمێ لچار کنارن

هــەر دۆ تەرەڤان قەبیلی کرمانج
بــو تیری قـەزا کرینە ئامانج

ئەڤ قولزمی رۆم و بەحـری تاجیك
هندی کو دکن خروج و تەحریك

کرمانج دبن بخون مولـەتەخ
وان ژێکمە دکن مثالی بەرزەخ[(١)]

راستە نامرن ئەو کەسێت کو ددلێ مللەتادا دژین، بەلێ راستە گومان تێدا نینە، هەروەکی پیرەمێردی نەمر دەلۆزانا بنەڤروزێ گوتی دبێژیت :

ئـەوا رۆژ هەلات ، لە بەندەنی بەرزی ولاتەوە
خوێنی شەهیدە رەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە
تا ئیســتە روی نەداوە لە تاریخی میلــەتا
قەلغانی گوللە سـنگی کچان بێ لە هەلمەتا
پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گریین
نامرن ئــەوانە وا لەدلی میللەتا ئەژین[(٢)]

مرن ژبو وان توخمە مرۆڤان ، وان هەلـکەفتی ئو کەنکەنـان نینە ، هەر دزیندی‌نە ئانکو دساخن ، دێ هــەر ژی زێندی ئو ساخبن ؛ هەکە هات و لەشــێ وان ژی ئانکو گوشت و پیست و هەستی ژی بژرن نەمینن ، ببنە ئاخ بەلێ جانێ وان ، جانێ پاکژێ

(١) م. ب. رۆدینکۆ ، مەموزینی ئەحمەدی خانی ، مسکوا ، نشرخانا ئەدبیەتا رۆهلاتی ، ١٩٦٢ ، بەربەر ٣٣ .
( تێکستا ڤێ سەرۆکابێ من کرە بنیات ـ تفیسەڤان ) .

(٢) محمد رەسـولٚ هاوار ، پیرەمێردی نەمر ، بەغدا ، ١٩٧٠ ، بەربەر ١١٩ ـ ١٢٠ .

وان هەرێ زێندی ئو ساخە ئو دلێ هەتا هەتا ژی زیندی ئو ساخ مینیت چەند دلۆپەکا خوینی دلەش و ددەمار و دژهیت کەسەکێ بتنێ ژنفش و نەژادێ وی ملەتی ئەو ژێ مابیت . ژبەرکو ئەو کەسێت ددلێ ملەتاندا دژین ، ئەو ژێهاتی ئو جامێر ، دلسۆز و ئەگیدن یێت سەر و سامانێ خو دوەغەرا ملەتێ خودا گورێکری ، کو ژبەر هندی جهگێر ، خوجهو ئاکنجی بوینە دخوین ، دگەه ، دژه ئو ددەمارێت هەر جامێرەکی ، هەر خوڕتەکی ئو ئازایەکی ژجامێر و خوڕت و ئازایێت وی ملەتی . بێ گومانە سەیدایێ نەمر ئەحمەدێ خانی ، کوڕەکێ ژێهاتی ، جەگەر و هنافسوتیێ ملەتێ کوردانە دڤێت ژهەمی کەسێت دی ،ژخوڕت و ئازانە، ژرەوشنبیر و زانایانە؛ ژ دانا ئو توێژڤانانە ، ژ هۆزانڤان و خویندەڤانان ، جهگیرتر و ئاکنجتیر و خو جهتر بیت ددل و هناف و دەروونانە، دخوینا هەر هنەرمەندەکی ، جامێرەکی ئو ژیهاتیەکێ ژملەتێ کوردانە . ژبەرکو سەیدایێ خانیێ نەمر کوڕێ هنافسوتی ئو جەگەر کوزریێ باب و باپیرانە، خەمخور و پشتی گرانێ هەمی کوردانە بهەمی هێز و ڤەژەن ، بهش و بیر و ئاشۆپ ، بلەش و هەمی هەدامانە ، بسەر و بجانە . هەر خانی ، خانی بتنێ دچەرخ و ددەمێ خودا ژهەمی کەسان ژکەلتر و ژدل ، بدل خۆشی ئو شادی ئو بەختیاری ، هەمی سەرمایێ خو ، هەیی ئو نەیێ خو ، ژبو سەربلندی ، ژبو سەرفەرازی ، ژ بو گەردەن ئازایێ ئو خوبوین و خوسەرییا ملەتێ

مەزخاندبو ئو تەرخانکربو .

ژ هوزانڤانێت کەڤن (کلاسیکێ) نەمازە دسەدێ هەڤدێ ئو سەرێ سەدێ هەژدێ ژبوینا عیسایی دئاسمانێ تۆرێ کوردیدا ، یێ ژهەمیا مەزنتر ، ناڤدارتر ، پێشکێش و ژیهاتیتر ، هونەرمەند و دەستبالاتر ، پایە ئو پەبیسکبلندتر ، سەرکێش و رێبەرێ بێ بەڤل ، شەهرەزا ئو پوسپور ، سەیدایێ هەمی زانا ئو رەوشەنبیرێت کورد ، رێڤەوژێر و رێبەرێ ملەتێ کوردێ بەلەنگاز و بێ سەمیان ئەحمەدێ خانیێ نەمرە[۳] .

ئەحمەدێ خانێ گەلەك ژهەیڤا چاردە شەڤێ دمەها کەوچەرێدا روهن و رەوشەنترە دئەسمانەکێ ڤال و شێن ، یێ کو چو خیشالەکا ئەڤری تێدانە . روهن ئو رەوشەنیا خانیێ نەمر وەنەبت وەکی ستێرێت دی بێت گەلەمپەرێیە کو روناهیا وێ هەر ڤانەك ، لایەك یا پرتەك ژچار رەخێت خو روهن و روشەنکربت و روشەنبکەت ژئەسمانێ تۆرێ کوردێ ؛ نەخێر روهنیا وێ ئەسمانێ تۆرێ کوردێ سەراسەر روهنکرییە دگەل وەلاتێ کوردان کۆ کوردستانە بتەری ئو بهشکیڤە ، بچاڤرێ ئو بدار و بارڤە ، بمری ئو زێندیڤە ژبەرکو ئەحمەدێ خانیێ نەمر بویە ، بێ بەڤل و بێ هەڤال و بێ هەڤکور بویە ، ئێیکانێ دایبابا بویە ، کەسێ دی بەهردار و پشکدار نەبویە ،

(۳) مارگرێتا رۆدینکۆ ، چەند گلی دەرحەڤا ئەحمەدێ خانێ ، ـ « ریانازە » ، ۱۵ و ۱۹ ئاڤگوستی ۱۹۷۰ .

ئەوزانان و روشەنبیران ئەوی ژخوش مێر و خودان هونەر و رویەتان ودسا ژدل و ژکەل مللەتێ کورد کربتە ئەڤیندار و جهگەرا خو ، ئەمازە دچاخ و ددەمەکێ وەسادا دسەدێ هەڤدێ ئو سەرێ سەدێ هەژدێدا ، سەدێ کو هێز بیر و رایێت نڤشی ئو نەژادی ئو وەلاتپاریزیێ لوەلاتێت جیهان بەلاف نەبوین ، مللەت هێژ لوەلاتێت رۆژهەلات و رۆژئاڤا بشەر و هنگامێت توری ، ئولی ئو ئاییندیڤە دمژویل بۆن ، لرۆژهەلاتا ناڤین و ناڤەراست هەڤرکی و شەر و هنگامێت سونی ئو شیعان بۆن و لوەلاتێت ئەوروپایی شەرێت دوژوار دبۆن ، دناڤبەرا کاسولیکی ئو پروتستەنتیێیان[٤] .

ژبلی هندێ ژی دەلیڤا خانیێ ئەمر تێدا ژی ، دنیڤا دوویێ ژسەدێ هەڤدێ ئو سەرێ سەدێ هەژدێ دەلیڤەك و قوناغەکا چەند بێژی پڕ ئاستەنگ ، سخنێ ، تەنگاڤی ، ئالۆز و شەپرزەبۆ ؛ کو بهزرا من ،ژین و ژبار و پاشەرۆژا دویر و مان و نەمانا مللەتێ کوردی ددەستێ دوژمن و نەیاراندا لاواز و بێ هێز بۆی لسەر دهاتە دانان . ئەو چاخ و دەم و ئەو دەلیڤەبۆ یاکو کوردستان یا پرت پرت و وێران و لێكڤەکری لناڤبەرا هەر دو دەولەتێت مەزن و بهێز لرۆژهەلاتا ناڤین و ناڤەراستدا ، لناڤبەرا دەولەتا عوسمانی یاپێتر ژدو سێکیێت کوردستانێ دبن دەستیڤە ، ژکوردستانا تورکی ئوعیراقێ ئو هندەك ژسوریێ ئو دەولەتا سەفەویێیا کوردستانا

(٤) « هاوار » ، هەژمار ٣٣ ، سالا نەهێ ، شام ، ١٩٤١ .

ئیرانی ژلورستانێ بگرە ژلایێ رۆژئاڤا ژێریڤە هەتا خێ ل توخویب و سنورێ سـوڤیتێ ددەت . ئەڤ هـــەر دوَ دەولەتێت مەزن یێت هەڤژك لسەر ڤەگرتنا کوردستانێ کو بکەنە سنۆرێ خو دگەل دەولەتا دی ئو بشـــین بشکێنن هەکە هزرا شەرێ وێ کر ژبەرکو جهێ کوردستانێ یێ سـەخت و ئاسێیە ، ڤەگرتن و ستاندنا وێ نەهند ساناهیە ؛ ژبلی هندێ ژی ئاگنجێت وێ کوردن کو ددویرۆکا مللەتاندا بچەلەکتی ئو زراڤستویریێ ناڤدارن دێ بو خو کەنە دێمجامە لسنگێ شەری دانن . بەلێ پاشی چو ژهەر دوَ دەولەتان نەشیاین مللەتێ کورد بدرستی داننە دبن فەرمانداریێا خوڤە ئو ژشـــەرِ و جەنگێ ئێك و دوَ ژی وەرسبوین و هەر دوَ ژی ژمللەتێ کوردێ ئازا چاڤ ترسیای بێن ، سیاسەتا هـــەر دووا بو ڤێکرا بەردانا میرگەهێت (مێرنشینێت) کورد داکو لاواز و بێهێز بکەن بشێن لسەر تپـلا (تلا) خو بزڤرینن . میرگەهێت کورد ژی وەنەبیت وەکی مللەتێت چارکنارێ کوردسـتانێ دبالبەر و دویرین ، زانا ئو جامێرین کو هزرا مللەتێ کورد لبیرێ بت و پاشـەرۆژا وی ، کو بزانن کورد یێکو دوژمنیا وان دکەن ئەون مفایێ وان ، ئەون دێ وجهێ ژێ گرن ، دێ دتەنـگاڤێ ئو ئالوزیاندا دەســـتی لسەرێك هەلینن و دتانا وان هێن ، ژبەرکو ئەون هەڤ خوین و هەڤ نەژاد و هەڤ ئارمانج ، ژبەر هنـدێ دڤێت ب پڕوپاگاندا دوژمن و نەیارا بناڤێ ئۆلێ ئو ئاینێ دسەردا نەچن ، پشتا ئێکو دوَ بگرن دا بهێز

بکەڤن بشێن لبەرانبەری دوژمنا راوەستن . ژبەر هندێ سەیدایێ خانی یێ خو کری یە بەرەڤانێ مللەتێ کورد ، نەلژێزا تۆرەڤان و زانان و رەوشەنبیرێت کوردە لنك کورد و بیانیان ، بەلی گەلەك ژوان پایە ئو پەییسك بلندترە(٥) . خانی گەوهەرا ئێکانەیە دناڤ ستێرانکێ تۆرەڤانێت کەڤن یا کلاسیکێت کوردا ، هەر وەسا ژی گەوهەرا ئێکانەیە درستکا دوڕ و مراریێت کەنکەنە ئو ناڤداریێت رۆژهەلاتا ناڤین و ناڤەراست دا دسەدێ هەڤدێ ژبوینا عیسای . هەر ژبەر وێ ئێکێ ژی ، نرخەك و بهایەکێ خومالی بو دادنن ، لژێزا فردەوسی یێ فارسی ئوروستاڤیلی یێ جورجی(٦) ، ژبەرکو سەرهشکیا پسمیرێت کورد یان میرگەهێت وان رێ دا دەولەتا — عوسمانی ئو سەفەویا کو سیاسەتا خو دگەل میرێت کورد ب بەلەسەر ، سەرهەتیا کوردان هاتە دیتن(٧) : هەکە کرمێ دارێ ژدارێ بخو

(٥) م. ب. رۆدینکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ( پێشگوتنارا داکتور قەناتێ کوردۆ ) .

(٦) محمد هەمزە ، مەم و زین ، ئەستانبول ، ١٩٤٧ ، ( سەرەنا ) .

(٧) ئەڤ سەر هاتیە ژبو ئێکانی ئو پشتەڤانی ئو دەست لسەر هەلبنانا فامیلێ ( خێزانێ ) ئبلی ئو مللەتی ژی تێتە گۆتن . هەکەهاتو هەدامێت فامیلەکێ ئێك دل بۆن ، دێ شێن شاد و سەرفەراز ژین ، هەروەسا ئێل ژی هەکە ئێك دل بۆ دێ بروعەت و سەربلند ژیت هەر وەکی وان مللەتا ژی ؛ بەلێ دەردێ کوردایی بۆدەرمان هەر ئەڤەیە کەس بۆ کەسێ دی سەرێ خوشۆڕ ناکەت . ژبەرهندێ مەزن دبێژت : ( ئەز چیا ئەو چیا گولك ما بێ لیا ) .

نەبیت ، چــو نەمان ژبو دارێ تێنە . ئانکو هەکە کورد بخو بەرهنگاری ئێك و دو نەبن ؛ کەسێ دی نەشێت چو چارا پێ ببەت . هەر لسەر هندێ ژی خانی فەرمویە :

هەر میرەکێ وان ببەزل حاتــەم
هــەر مێرەکێ وان بڕەزم روستەم
جامێری ئو همەت و ســەخاوەت
مێرینی ئو غــیرەت و جەلادەت
ئــەو خەتمە ژبو قەبیـلی ئەکـراد
وان دانە بشــیر همەت و داد
هندی ژشــەجاعەتێ غەیورن
ئەو چەنــد ژمننەتێ نفورن
ئەڤ غیرەت و ئەڤ علوێ همەت
بو مانع حەمـلی باری مننــەت
لەو پێکڤە هەمێشە بـێ تفاقن
دائـم بتەمـەڕود و شقاقن .

خانیێ نەمر دڤێ دەراڤێ هو پێ تەنگ و تاریێ ئو ئالۆزدا کو کوردستان یا وێران و مللەتێ کوردێ سەرگەردان و پەرێشان ، پێ ڤێکرا بەردایی ئو هەڤرویشی سەرێ ئێـك بویی ، دوژمــن و نەیار ژی بڕەخڤە دلشاد و بەختیارن دەستێت خــو بو دقــوتن ژبەرکو نەزان و نێزیك بین ، نەدویر بین .

خانیێ نەمر بچاڤێت سورێت هنگرییایێ ژکەربان و ژدل پێڤە بوبیڤە ، ژبوسیدە بوبی ئو غەیدینێ ئو بوغومینبی ، بمێرانی ئـو زراڤتوری هندی ژدەسـتی هاتی بەژەڤانی‌یا خـــو کر . ئەگەر چێ پەلیڤانێ بتنێ ژی بو دمەیـدانا پشتەڤانێ ئـو بەژەڤانیێ‌دا ، کەسێ دی ژزانا ، ژخـــویندەڤانا ، ژرەوشەنبیرێت کوردا هـاری خانـێ نەدکر ، هەی لەوی بابێ وی دەستێ خو بـەرێ خـو ڤەنیت هـەر وەکی دبێژن داکو چو تەپ نەهێنی ، گوهێت خو ژی بخو داددان ، خو کرژ دکر هەر وەکی نە هاژ چێ نینە نە گول چێ نینە ، چاڤێت خو ژی دنقاندن وە لخو دکر هەر وەکی یێ حوتمە بدرستی خـــو سیناهیەکێ ژی نابینیت ؛ سەیـو ، نەبینە نەژەوە هـــەر وەکی تێتە گوتن .

بەلێ خانیێ نەمر ، یێ جامێر و ژبەرخو دەرکەڤتی رێـکا وان بێ زەڤەر ، ســـەر شۆر ، خو پەرست و یارێت کاڤێ ئو کولاك بەشـا گرتی ، ئەو چەند گەلەکا ژ خوژتەکی وەکی خانی دویر بو ؛ ژبەرکو ئەو کار ؛ کارێ چـــەپەل و نەژرەنـك ، نەکارێ مرۆڤێت ژێهـاتێ ، جامێر و هنەرمەندەکێ وەکی خانیێ رویمەتدارە ، یێ‌کو سـەرهاتیێت کوردان یێت بمێـرانیێ گۆتین توی تێ ددان کو بژاڤا خو خورتر لێ‌کەت وەکی ڤێ سەرهاتیێ : رێ رێیا مرنێ ژی بت ، تو هەر لپێشێ‌بە . یان ژی ڤێ : یان مێرێ باش بە ، یان بفر و

داس بە ، یان ڤێ : دلێ ترسوك ، سنگێ گەورێ نابینت[8] . کو رۆژا بەرەڤانیێ ، رویەتێ ئو هاریکاریێ دا چەوا ژمەیدانا شەرێ ئو جەنگێ خو ڤەکێشیت ؟!

ئەحمەدێ خانیێ نەمر بتنێ بێ هاریکاری یا کەسەکێ دی دەست ژمللەتێ بێ کەسێ بێ خودان و سەرگەدان ؛ دەست ژمللەتێ کوردێ بەرێشان بەرنەدان ؛ نەژی دەست و دلێت وی ژبەرەڤانیێ سار بۆن ، نەمازە دوی دەراڤێ هندی ، بێژی ئالۆز تەنگاف و فرۆکژی دا کو پاشەرۆژ ، مان و نەمانا مللەتێ کورد ژی لسەر دهاتە دانان ؛ نەخێر ئەو کار ، ژدویر ـ بینەکی وەکی خانێ ژدلسۆژەکی وەکی وی دویربۆ ؛ بەروڤاژی وەکی شێر ، ئەگید ، جامێر و پەلیڤانان هاتە مەیدانا شەر و جەنگێ بەرەڤانیێ ، دەست ببەرەڤانیێ کر ، بەلێ بەرەڤانی یەکا لسەرخو ئو پوسـپۆرانە ؛ رێکا بەرەڤانیێ ژی هەڤبەری دوژمن و نەیاران دانا ژبو کوردانە ، دگەل رێکا قورتالبوینێ ئو رزگاربوینێ ژدەست نەیارا روهن و خویاکر وەکی رۆژا نیڤرو لبەر کوردانە ، دگەل رێکا سەربەستی ئو سەرفەرازی ، سەربلندی ئو ئازادیێ دانا بەرچاڤێت وانە[9] گۆتی : کوردینو ! ئەڤەیە رێکا راست دڤێ بگرن لسەر بچن . گەلی مللەتێ بەلەنگاز و سەرگەردان و بێسەمیانێ کوردانە ؛ داکو ژبەنیاتێ ئو دیلیێ ئازاد بن ، نەمینن دبن دەستێ دوژمن

(٨) ئەمیر کامیران بەدرخان ، زمانی کوردی ، پاریس ، ١٩٥٣ .

(٩) محمد هەمزە ، سەرچاوەی ناوبراو .

و نەیارانە . بێ گومان ئەو کەسێ هندێ بکێرهاتێ ئو ژێهاتی ئودەست هەل بیت کو بتنێ بێ هاریکار و پشتەڤان بەرەڤانی یا مللەتێ خو بکەت وەکی نەهەنگ و شیرانە یا کیم نەدانیت و ملێت خو بدەتە بن بارێ گرانێ کوردانە ، ئەڤ توخمە کەسێت وەکی سەیدایێ خانێ وەسا خەمهەلگر و خوّ کرییە رێبەرێ مللەتێ بێ کەس و بێ خودانە ، نەکو کوڕێ راستێ بابانە ، نەبتنێ دلسۆز ، دلسوّتی و جەگەرو هناڤسوّتی (هناڤسوتی) ئو شەیدایێ بێ بەڤل وئێکانە ، بەلێ پویتە پێ کەرۆ پشتی گرانێ راستێ مللەتێ کوردانە ؛ بکێر هاتی ئو بەرکەفتییە ئو ژرەنگە بتە سەروکێ هەمی زانا ، رەوشەنبیر ، تۆرڤان و هۆزانڤانانە ، هەر وەسا ژی ژفەیرس و ئافرەتوین و هەلکەفتێت مللەتێ کوردێ سەرگردانە[10] .

سەیدایێ خانییێ نەمر ، ناڤێ وی (ئەحمەد)ە ، ناڤێ بابێ وی الیاس و ناڤێ باپیرێ وی روستەم . ژبنەمال و مالباتا خانیانە کو ئێلێ (هۆزێ) خانیان ژرێڤە لدەڤەرا بۆتا بویە پاشی بنەمالا وان لباژێرێ بایەزیدێ کو ژشەرگەهێت رەوشەنبیریێ یێت ناڤدار بویە لکوردستانا ژۆرێ ئاکنجی بویە[11] .

---

(١٠) م. ب. رۆدینکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ( پیش کوتنا رادا کتور قەنانێ کوردۆ ) .

(١١) علاءالدین سجادی ، مێژوی ئەدەبی کوردی ، بەرگی یەکەم ، ١٩٥٢ ز – ١٣٧٢ ك .

ئەحمەدێ خانی لسالا (١٠٦١)ی مشەختی (كۆچی) هەڤبەری (١٦٥٠)ێ ژدایبوینی یا عیسای لباژێرێ بایەزیدێ لکوردستانا تورکی هاتیە دنیا روهن ئانکو ژدایکی بویە ، هەروەکی سەیدایێ خانی دڤی مالکا هۆزانێدا وێ چەندێ روهن و خویادکەت :

لەوڕا کــو دەما ژغەیب فــەکبۆ
تاریخ هزار و شێست و یەك بۆ[١٢] .

بەلێ وەنەبیت هەمی زانا ئــو رەوشەنبیرێت کورد وێ چەندێ پەسندبکەن زانایێ ناڤدار م. ئەمین بوزارسلان دژینەنیگاری ئانکو سەرگــوزەشتی‌یا خانی یاکو دمەم و زینا خودا یا بکوردی وتورکی نڤیسی دبێژیت[١٣] : ئەحمەدێ خانی سالا ١٦٥١ێ زاینی ائێلا هەکاری لگوندێ خانێ هاتیە دنێ . بەلێ لدوی زانینا من هەکاری نەئێلەکە بەلێ دەڤەرەکە (هــەرێمەکە) ژدەڤەرێت ناڤدارێت کوردســـتانێ ، ژشەرکەهێت رەوشــەنبیری ئو تۆرێ کەڤنێ کوردی یێ کو زانا ئو رۆژهەلاتزان بناڤێ تۆرێ (ئەدەبێ) کلاسیکی ژي بناڤدکەن ، ژئێلیت ناڤدارێت هەکاری ئەرتوشی ، پنیانشی و شەمزینی‌نە هــ . د . ئەگەر چی بجهێ هەکاری‌یا بناڤدکەن براسان و پەژنا جهوار و ئاکنجیان . بەلێ گوندێ خانێ گوندەکی هەکاری‌یانە و من ژزار دەڤێ گەلەك کەسا

(١٢) « هاوار » ، هەژمار ٣٣ ، ١٩٤١ .

(١٣) M. E. Bozarsalan, Mem û Zîn Ehmedê Xanî, Istanbul 1968, L. 14, S. 15.

وەکی ئەحمەد حاجی عبداللطیفێ کو چەند سالا لناڤ هەکاریا ژی
دەستەکێ چاك دتۆرێ کەڤندا هەی ئو هندەکەسێت خەلکێ رەخێت
جولەمێرکێ ئو باشکالا کو ئەحمەدێ خانێ خەلکێ گوندێ خانێیە.
سەیدایێ م. ئەمین بوزارسلان رەنگە شەهرەزا بیت دڤێ چەندێدا ،
ژبەرکو ئی. ب. سۆن دکتێبا خودا[١٤] دبەرپەرێ چارێ سەرەتاتێدا
دژێزا (١٣)یێ دا لسەر ئەحمەدێ خانێ تاخڤیت دبێژیت: ئەحمەدێ خانێ
یێ هەکاریێ یێکو کریارێت وی یێت زۆر ( گەلەك )
ج کورد پەروەردەیێ یان ژلایێت دی ڤە ژهەمیا بناڤ و دەنگترن
لکوردستانێ ئو ژدەرڤە. خانێ خویندنگەهەك ڤەکر لبابەزیدێ
دگەل مزگەفتەکێ ... هـ. د. ژبلی هندێ ژی نیزیکی جهێ
بوینا وییە ئو دمەم و زینیدا شەهرەزایە ژبەر هندی رەنگە بێرو
باوەرێت وی سەنگەك هەبت ، ئەگەرچی یێتڤییە بێتە گۆتن کو ئی.
بی. سونی مەلایێ جزیرێ ژی دکەتە هەکارێ گاڤا دژێزا یەکێ
هەر ژوی بەرپەرێ (بەرپەرێ چاری) لسەر جزیری تاخڤیت دبێژیت:
یێ پاشی وی ئانکو عەلی حەریرێ، شێخ ئەحمەدێ جزیرییە یێ خەلکێ
هەکارێ[١٥] ... هـ. د. بهزرا من ئەو هۆزانڤانێت مێجەرسونی
دسەرتا کتێبا خودا نڤیسین پێتری وان هەکارینە ، ژبەر هندێ ناڤێ

(١٤) E. B. Soane, Grammar of the Kurmanji or Kurdish Language, London, 1913.

(١٥) Ibid

هەکاری لنك وی بتۆرێ کەڤنڤە هاتیە گرێدانێ ؛ نەمازە ئەو ژوان رۆژهەلاتزانایە یێت جهێ ناڤبەرا گۆلا ئورمیێ ئو گۆلا وانێ بوارێ ژرێڤە یێ مللەتێ کورد داتنن کو ژوێرێ بو هەر سێ لاێت دی باکورا ژۆرێ ، رۆژئاڤا ئو باشۆرا ژێرێ بەلاڤبوینە ، ئەو جهێ باینیێ یێ مللەتێ کورد پێتر ژ ٨٠٪ژێ ژدەڤەرا هەکاریێیە . هەکە بێت و سالا دنیا رۆهنبوینێ یا ئەحمەدێ خانێ سالا (١٠٦١)ێ مشەختێ (کۆچێ) بیت خانیێ نەمر دنیڤا دووێ ژسەدێ ژدایبوینییا عیسای ژێیە ، بەلێ هەر وەکی دویروکا ژدایبوینیێ رۆهنە ، دویـــروکا دونیا لێ تاریبونێ ئانکو چۆنە بەر دلۆڤانییا خودێ رۆهن نێنە ئەگەرچی گەلەك ژ کوردزانا سالا (١٧٠٦)ێ ژدایبوینییا عیسای بسالا دەستویری خازتنا وی دادنن . ئو دبێژن سـەیدایێ خانێ دناڤبەرا سالا ( ١٦٥٠ ـ ١٧٠٦ )ێدا ژێیە[١٦] ئەحمەدێ کورێ الیاس کورێ رۆستەمبەگێ ، یێ ژئێلێ خانیان لوەلاتێ بایەزید و بوتان ، (١٦٥٠)ێ ژدایێ بو ئو دژیێ پێنجەهـ و هەشت سالیێدا لبایەزیـدێ دونیا لێ تاری بویە ئو لوێرێ ڤەشارتییە[١٧] . نیشانا خانێ کو ناڤێ وی یێ

---

(١٦) اسەر گنجێ بەرگێ مەم و زینێ یا محمد رەمضان بوتێ سالا (١٩٥٨)ێ ، بزمانی عەرەبێ چاپکری نڤیسییە : هۆزانڤانی مە سالا ( ١٦٤١ )ێ لبازێری بایەزید کو نها لناڤ تورکییە رزدایی بوّیە ، ( بیروت ، مطابع دار العلم للملايين ) .

(١٧) هەژاری موکریانێ ، مەم و زینی خانێ ، بەغدا ، ١٩٦٠ ، بەربەرێ ٣ ، ـ پ ـ رێزا ٢٣ .

چۆیە ، ژئێلێ خانیان بویە[١٨] . یان ژی ژگـوندێ خانێیە هەر وەکی ناڤدار لناڤ هەکاری‌یا . سەیدایێ بوزارسلان دبێژت :

ئەحمەدێ خانی لدوی رێز و رەوشـــت ؛ تەرتیف و تیتـالێت کوردا ، لچاخو ددمێ تێدا ژی ( ١٦٥٠ — ١٧٠٦ ز ) پاشی پەیاورك وبسپورك بوی وەکی هەمی کوژێت مالبات ، خانەدان و دەستهاتیان ، دانایە بەر خوینـدنێ لچێترین خویندنـگەها لبایەزیدێ یا دگوتێ : خویندنـگەها مرادیێ[١٩] . پاشی هەیامەکی لوێرێ خویندی ، هوی ( فێری ) خویندن و دەســـت بنڤیسنێ کری ؛ قورئان خویندی ، دەست بخویندنا کتێبێت شریعەتی وەکی هەمی شاگردیت خویندنگەها کری ، چەندەك ژێ خویـندی ؛ لدوی دەستور و رێزو رەوشتێت وی چاخی ئو دەمی کو شاگردێ بسپورك بوی دبنـگەهێت خویندن و نڤیـسنێدا ، چەرخەکێ لخویندنـگەهێت وەلاتی بدەن داکو ژزانینـا زانایێت ناڤدار و شەهرەزا پێت کو دبەلاڤ لـگەلەك جهان زۆبەهر نەبن ، خانێ ژبایەزیـدێ چویە ئۆرفە ( رهایێ ) ، هەیامەکی لوێرێ خویندی‌یە ، پاشی چۆیە ئەخلاتێ ، لوێرێ ژی هەیامەکێ خویندی‌یە ، پـاشی چۆیە بتلیسێ[٢٠] . یاکو ژشەرگەهێت بناڤ و دەنگ بۆیە

(١٨) هەمان سەرچاوە .

(١٩) هەمان سەرچاوە .

(٢٠) هەمان سەرچاوە .

دکوردستانێدا بزانا ، کەنکەنا ئو رەوشەنبیر و خویندنـگەهێت ئاڤا ئو بەرکەفتی ، پاشی زوێرێ ژی ڤەگەریایە بایەزیـدێ . ژبایەزیدێ ژی چۆیـە جزیرا بۆتا ، دەمەکێ درێژ لوێرێ مایە ژبەرکو میرێت وێ ناڤدار بوینە دچاخێ خو دانا زانا ئو رەوشـەنبیرێت وەکی وی ئو جزیرێ . لجزیرێ ، خوینـدنا خو بدویماهی ئینایە ، ئەگەرچی نەهاتیە زانین کانێ کێژ سال بویە ئو کێژ سەیدایێ خویندننامە دایێ . هندە کورد زان لسەر ڤێ بیرو رایێنە کو سەیدایێ خانێ وەکی زانا ئو رەوشەنبیریت کەڤن ( کلاسیکی )[21] . پاشی دویماهی بخویندنا خو ئینایە ؛ بسەرەدان ، سەرا چەند دەڤەرێت کوردستانێ وەکی بەهدینا ، بوتان و سەرحەدان دایە ، هەر وەسا بسەرەدان چۆیە سوریێ ئومیسرێ « مصر »ێ[22] . کو هەر دوَ وەلایەتێت عوسمانی بوینە ئەڤ سەرەدانا پاشی ڤوناغا دویماهیێ ئینـان بخویندنێ ، وەنەبیت ژبو خۆشیێ ئو شادیێ ئو خو ژبیرڤەکرنێ بویە و دبیت ، بەلـکو ژبو پوسپۆری ، شەهرەزابوینێ ئو هایداریێ ( ئاگەهداریێ ) بویە ، دگەل روهنکرن و خویاکرنا گەلە لایێت ئالۆز ، کو یری ئو بکرێ ، کو گەلەك بێر و رایێت زانا لسەر و گەلەك تا ژێ دچن وەکی گرفتاریێت شریعەتێ ، کو بخوینـــدنێ ئەو هزرکرنێ ئو تێـکەلیا زانا ئو رەوشـەنبیر و خویندەڤانان بتنێ رەنگە نەچیتە سەر ؛ نەمازە هەکە زمانێ خویندن و

---

(۲۱) وەکی سەعدی شیرازێ ، فەقی تەیران کو هندی ناڤی وی چۆیە بڤەڤێ گەرۆك هاتیە ناڤ کرن .

(۲۲) هەزاری موکریانی ، سەرچاوەی ناوبراو .

نڤیسێنێ زێدەبار شریعەت و حەدیسێت پێغەمبەری بزمانێ عەرەبی بوینە ، کو زانایێ ئو شەهرەزایەکا چاك بێتڤیە خاصما دزارێت خوجهدا رەنگە پێتر هەبن ، کو بکەشت ، گەریان و سەرەدانا رێ بوڤەبت بکەڤنە کەشەکەش و کێنگەشان بشێن گەلەك لایێت ئالۆزیان ئو نەدروهن ژکولتور و شەهرستانیا رۆژهەلاتێ ئو بوسولمانەتیێ روهن و خویا بکەن . بەلێ هەتا نهو ڤێ گاڤێ ژی روهن نینە کا راستە سەیدایێ خانی لکوردستانێ یان ژی ژدەرڤەی کوردستانێ گەریایە کو سەرا سوریێ ئو مسرێ دایە ، یاکو گومان تێدا نینە ئەڤەیە سەیدایێ خانی سەرا دەڤەرێت چارنکاری بایەزیدێ وەکی دەڤەرا بۆتا ، هەکاری ئو رەنگە دەڤەرا بەهدینا ژی دایە ؛ بەلێ پێتر لبایەزیدێ ئو جزیرێ ژیە .

مخابن ژڤوناغا بچویکینی ، زڕکوڕەیی تۆلازی لاوینی یا خورتیا سەیدایێ خانی هەتا نهو ڤێ گاڤێ ژی چووێ وەسا ژێ نەهاتیە زانین کو سوی ژی پێ بێتە شکاندن ئانکو هندی بێژی چو نینە ، ئەو تشتێ گەلەکێ کێم لسەر هزر و بیر و رایێت کەسی نە کو باوەری پێ ناهێتەکرن کو ببتە بنگەهەك بو زانینا ئەگەرێت دەستهاتن ، ژێهاتن و فێهرسیا وی ، دوی چاخی و دەمێ گەلەکێ ئالۆزیێ ، تێکچۆیی ئو تەنگاڤیدا . تشتێ ژێ هاتیە زانین هەر کار و کریار ، بڕیار و شوینەوارێت سەیدایێ نەمرێ خانی نە کو ژهنگی وەرە هەتا نهو ئو هەتا دێ ناڤو دەنگێ

سەیدای لکوردستانێ ئو چار کناریت وی ڤەدەت و بەلاڤـکەت

هەمی زانا بجارەکی ژکورداں و بیانیاں ، ژ رۆژهەلاتیاں بگری هەتاکو دگەهیە رۆژهەلاتزانان دهزر و بیر و رائیت خو یا ئێکن (یەکن) یان ژی نێزیکی ئێکن ، دبێژن : سەیدایێ خانی هندی بێژی زانا ، رەوشەنبیر ، دانا ، هێژا ، زیرەك ، شـەهرەزا ئو پوسپور بویە دکولتور ، دتۆر وشەهرستانیەتا رۆژهەلاتێدا ، ژبلی هندێ ژی دەستەکێ بلند و بالا دزمانێت رۆژهەلاتێدا ژفارستی ئو عەرەبی بگرە هەتا کو دگەهیە زمانێ تورکی ، ژبلی زمانێ ماکی کو کوردی ژارێ کرمانجی هەبویە[٢٣] . ژبەرکو بزارێ کرمانجی دوی چاخو دەمیدا پێ دهاتە نڤیسین ، ئەگەرچی پێتری ڤیسینێت کوردی ، هۆزان و چیرۆك بوینە ، کو سەیدایێ خانی دەستەکێ بلند و بالا دزمانێ کوردیدا هەبویە ، هەر وەکی ئەو بخو ددیباجا مەم و زینێدا وێ چەندێ رۆهن و خویا دکەت دبێژیت :

کرمانج نەپڕ دبێ کەمالن
ئەمـا دیەتیم و بێ مەجالن

بالجملة نەجاهل و نەزانن
بەلکی دسەفیل و بێ خودانن

---

(٢٣) م. ب. رۆدینکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ( پێشگوتنارا قەناتێ کوردۆ ) .

گەر دێ هەبویا مەزی خودانەك
عالی کەرەمەك لەطیفەدانەك

علم و هنەر و کەمال و ئزعان
شعر و غەزەل و کتێب و دیوان

ئەڤ جنسە ببا لبال وی مەعمول
ئەڤ نەقدە ببا لنك وی مەقبول

من دێ علما (علمێ) کەلام مەوزوَن
عالی بکرا لبان گەردوَن

بینافە رحا مەلێ جزیری
پێ حەی بکرا عەلی حەریری

کەیفەك وە بدا فەقێهی تەیران
حەتا بئەبەد بمایە حەیران

چ بکم کو قەوی کەسادە بازار
نینە ژقماشرا خریدار(٢٤)

هەر وەسا ژی ژڤەماندن و دانان و لێك ئینانا نوبهارا ەیدایێ خانێ بو زاروکێت کورد دانای کو هوی (فێری) زمانێ عەرەبێ ببن بشێن دکتێبێت عەرەبی بگەهن . ژزانا ئو هۆزانڤان و رەوشەنبیریت کورد ییت کو لسەر رێچ و شۆپا خانێ چوین ، چەند

(٢٤) م. ب. رۆدینکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەرپەڕ ٢٥ .

جارا دهۆزانێت خودا، ناڤێ سەیدایێ خانێ ئو مـــەم و زینا وی یاکو براستی داستانا ملله‌تێ کوردە دبێژیت :

ئەحمەدی خانێ صـــاحبی مەم و زین
شاهبازی فەضـــلی عللیێن[25] .

یان ژی :

مسئەلەیێکی مەشهورە گەر قوژ دەکەی بەسەرتا ( بەســەردا )

ئەکسیرە خاك و خۆلی دەرماڵی گەورە مالان
تەنها ئێمە (ئەمە) وەهاتێن دیباجەیێ مەم و زین
حالیت دەکات چلونە ئەحوالیان سوخەندان[26]

یان ژی ڤێ مالکێ :

جیهان بۆتـــە جزیرەی بەحری کریـــەم
بەبێ بوهتـــان ئەتو زین و ئەمن مـــەم[27]

بەلێ سەیدایێ هەمزە بەگ یێ کو مەم و زینا خانیێ نەمر ، ســالا (١٣٣٥) ێ مشــەختێ ( کۆچێ ) لچاپخانا نەجم اســتقبال

---

(٢٥) عبدالرحمن ســعید ، کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی ، بەغدا ، ١٩٢٥ ، بب ١٥ .

(٢٦) هەمان سەرچاوە ، بەربەر ٥٣ .

(٢٧) هەمان سەرچاوە ، بەربەر ٣٢ .

چاپکری دبێش گۆتنا مەم و زینێ نقیسی‌یە دبێژیت(۲۸) : « مەم و زینا خانی ، سەرێ تاج و دل خۆشی‌یا کوردان ، ئەحمەدێ خانی ( سالا ۱۱۰۵ ) یێ نقیسی‌یە هەروەکی دڤێ مالـکا مـەم و زینێدا روهن و خویا دبێت :

ئیسال گەهشتە چهل و چاران
وی پێشـڕەوی گوناهکاران »

پاشی گۆتی‌یە : « سەیدایێ خانی ، ئەو مروڤێ هندێ ژخودێ ترس و ئۆلدار ، خودانێ وێ بیرتیژی ئو هۆشمەندێ ، دەستهاتن ، ژێهاتن ، شەهسواری ئو فێهرسیێ دزانیت ، ئۆلی ئو ئاینیێدا ، دلایێت فیلوسوفی ئو حەکیمیێ ، دتۆری ئو تۆرڤانیێدا ، کو چەند بێژی دناڤ مللەتێ کورددا ناڤدارە » ، پاشی دبێژیت : دمللەت پەروەریێدا ئانـکو وەلاتپارێزیێ ئو کوردپەروەریێدا وەکی فردەوسی توسی بۆیە بو مللەتێ کورد . رامان و پەژنا سەیدایێ هەمزەی ئەڤە بویە هەروەکی گۆتی‌یە : ئەحمەدێ خانی وەکی فردەوسی ژبو مللی‌یەتا خو خەبتی‌یە ، چەند هێز و ڤەژەن ، هزر و بیر و دەستهاتن ، زیرەکی ، بیر تیژی ئو هێژاپا خو دوێ رێدا ئانکو دژێـکا مللەتێ کورددا مەزخاندی‌یە . شوینەوارێت رەنگینێت سـەیدایێ نەمر ، ئەحمەدێ خانی دکوردستانێدا ، هندی بێژی ، بنرخ وبهانە ، هەر کوردەك و

(۲۸) محمد هەمزە ، سەرچاوەی ناوبراو .

هەر ئاكنجى‌يەكێ كوردستانێ بچاڤەكێ بلند بەرێ خو ددەتێ ئو بناڤ دكەت . بەلێ كارێ سەيدايێ خانى دمللەتێ كورددا كرى نەگەهشتى‌يە كارتێكرنا فردەوسى دمللەتێ فارسدا كرى ؛ ژبەركو فردەوسى بقەلەما خوە ( بقەلەمێ خو ) ئيران ڤەژاند ئانكو ژياندڤە جارەكادى . ئەحمەدێ خانى نەهێلا كو كوردستان بدرستى بمرت ئو ژمرنا هەتا هەتايى قورتال و رزگاركر ؛ بەلێ بدرستى نەڤەژاند و زيندى‌كرەڤە ؛ ژبەركو چاخ و دەمێ فردەوسى پشتگر و پشتەڤانێت هزرو بير و رايێت وى هەبون ؛ بەلێ چاخ و دەمێ ئەحمەدێ خانى چەند بێژى ئالۆز و تەنگاف و بەربات بو ؛ ژبەركو دەولەتا عوسمانى دگەل دەولەتا ئيرانێ لسەر لێك‌ڤەكرنا كوردستانى دنابەينا خودا پێك‌هاتبون و بريار لسەر دابو كو دەست و پێت وان ئانكو ميرگەهێت ( ميرنشنێت ) كورد وەسا گريدابون و كربون دبن زكى‌ڤە كو بچو رەنگ و ئاوايان نەدكارين ئانكو نەدشيان بلڤينن ؛ ژبەركو دگەل خو دلڤاند ، دالەشكرى لدوى لەشكرى هنێرنە شەرێ وان و بفند و فێل و خاپاندن و دسەردا برێ وان ڤێكرا بەردەن ؛ بەرهنگار و هەڤرويشى ئێك كەن ، كو ژبەر ڤێ يەكێ ، سەيدايێ خانى ، بێ خەمخور و پشتەڤانێ مللەتێ كوردێ بێ‌كەس و بێ سەميان گاڤا ددیت مللەتێ كورد وەسايێ شەپرزە ، سەرگردان و بێ خودانە ، بەلەنگاز و بێ سەميانە ؛ جەگەر و هناف لێ دسوژتن ( سۆتن ) و دكوزرين ، چاف لێ سور دبون و هندگريان و

گدگدین ، زێدەبار گاڤا بەرێ خو ددایێ کەسێ دەستێ هارێـکارێ بو ڤی مللەتی درێژ نەدکر ، ئەڤی دەست لسـەر دەهلینـا ئو هاڤی دکر ، ژ سۆتنیا جەرگ و هناڤا هاوار دکر دگوت :

ئەز مامە دحـــکمەتا خودێدا
کرمانج ددەولەتـــا دنێدا
ئایا بـچ وەجـە مانە مەحـــرۆم
بالجمـلة ژبو چ بوونە مەحکوم[۲۹]

پاشی دامینیت لسەر خو بەرێ خو دەتەکورد و کوردستانێ ، دا تەماشەکەت و هزرێت خو دمللەتێ کورددا کەت ، دابینیت کو مێرانێ ، زراف ســتویری (دلێریێ) ، ئازایێ ئو خورتی‌یا دمللەتێ کورد ددێـت دچو مللەتێت دی‌دا نەددیت و نەبۆ ، ژبەر ڤێ یەکی دەس (دەست) بپەسندکرنا مللەتێ کورد دکر دگۆت :

هـەر میرەکێ وان ببـەزل حاتەم
هەر مێرەکێ وان بڕەزم روستەم
بفکـر ژعەرەب حەتاڤە گورجان
کرمانجی‌یە بوویـە شبهی برجان[۳۰]

ئەگەرا ئالۆزێ ئو لێك کەڤتن و هەڤرویشی سەرێ تێك بوینا

(۲۹) م. ب رۆدینکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ، بەرپەڕ ۳۳ .

(۳۰) هەمان سەرچاوە ، بەرپەڕ ۳۲ .

کوردان دکوردستانێ دا ، مێرینیێ ئو ئازایێ ئو زراڤتوری‌یا کوردانە ، دگەل مەردینیێ ئو جامێری‌یا وانە یاکو بێ‌کێشان و پیڤانە ، لەوا ژی نەدجهێ خودانە ، سەیدایێ خانێ دبێژیت :

لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن
دائم بتەمەرود شقاقن[31]

رۆژهەلاتزانێ بناڤ و دەنگ ئەکادمیك یوسف ئەبگاروڤیچ ئۆربیلێ ( ١٨٨٧ — ١٩٦١ ) ، لسەر بیرهاتنا چەرخێ زانایێ بناڤ و دەنگێ گورجی رۆستاڤیلێ ، یاکو دسالا ( ١٩٣٨ ) یێدا بزمانێ روسێ چاپکری ل لینینگرادێ دبێژیت : « هەکە ئەم هزر و بیرا وەلاتپارێزی‌یا هۆزانڤانان بکەین ؛ پێ‌تڤی‌یە ئەڤ هەڤبەرکرنە لناڤبەرا سێ هوزانڤانێت ئێکجار مەزن و کەنکەنێت رۆژهەلاتا ناڤین بکەین ؛ فردەوسێ ئیرانێ ، روستاڤیلێ یێ گورجێ ئو خانیێ کورد ؛ ژبەرکو ئەڤەنە هۆزانڤانێت کو مللەت پەروەر بوون . ئەڤ هوزانڤانێت مللەت پەروەر ددلێ مللەتاندا دژین ، ژبەرکو هوزانێت ڤان مللەت پەروەران دناڤ مللەتێ واندا دهێنە خویندن و گۆتن ، هەتا کو ژلایێ وان کەسانڤە ژی یێت کو هەر خو تیپەکا بتنێ ژوی زمانی نزانن[32] » .

(٣١) هەمان سەرچاوە .

(٣٢) هەمان سەرچاوە ، ( پیشگوتنارا داکتور قەنانێ کوردۆ ) ڕبەرپەڕ ٩ .

سەیدایێ جگەر و هناڤ‌وتی ئو خەمخورێ زمان ، کولتور و تۆرێ کوردان نەمر هەرەکول عەزیزان کو ناڤێ نەبەنێ میر جەلادەت بەدرخانی بو ، بیر و رایێت نەمر حاجی قادرێ کۆیی لسەر مەم و زینا سەیدایێ خانی دبەرپەرێ (٦٨٧) یێ دا ژ کوڤارا هاوارێدا[٣٣] . دبن ڤی بابەتی : « مەم و زین » گۆتی‌یە : رەحمەتی حاجی عبدالقادرێ کۆیی دەر حەقێ مەم و زینێ دگۆت : « کتێبا مللەتێ مەیە » . هۆلێ دگۆت ؛ ژبەرکو دگۆتنا « قورئان ئان مسحەفا مللەتێ مەیە »دا ، زقورئانا ، عەزیشأن (عظیم الشأن)دا کێم حورمەتەك ددیت . پاتن بیچ ئاوایی بێنە ئەشکەرەکرن ، مەخسەد و مرازی دخوەدا ڤەدشێرن . پاشی دبێژیت : هەر وەکی مە دبەندا « کلاسیکێن مە »دا گوت (هاوار : ٣٣) حاجی پەرستشکارێ خانی بو (خانی پەرست‌بو) ئو خو بشاگرتێ خانی ددا قەلەمی . حاجی ددیوانا خوەدا گەلەك چێل لخانی کری‌یە . ئەفسوس ئەو دیوان ژبو ئیرو وندایی‌یە ، ئانکو حاجی ددیوانا خودا گەلەك پەسنا خانی کری‌یە ، مخابن ئەو دیوان ژبو دەمێ ئەم تێدا نەمایە ، وندا بویە . بتنێ شەعرەکە وی ئەنرە هەیە حاجی ئەو شعر بدەستێ خوە لسەر مەم و زینا باڤێ من ئا دەستنڤیس نڤیسی‌یە . ئەز ولێ شعرێ جارەکەدن دکوهێژینم ستونێن هاوارێ :

(٣٣) «هاوار» ، هەژمار ٤٥ ، سالا (١٠)یێ شەممبی ، ٢٠ خزیران ١٩٤٢ ، بەرپەڕ ٦٨٧ .

زەمانە رەسمی جارانی نەماوە
چراغی نازم و مونشیء کوژاوە

لە دەوری ئێمە رۆمان و جەریدە
ئەگەرچی مەقسەدە زانینی باوە

ئەمان قەدری بزانە ئەم کتێبە
لە دنیا ئێستەکی هەمتای نەماوە

لە ئەیامی حەیاتی شێخی خانی
لە سەر نسخەی خەتی (خط) ئەو نوسراوە

لەلای ئەربابی خۆی بۆ قەدر و قیمەت
خەزینەی گەوهەرە و کیسەی دراوە

لە مەجموعی دوەل سۆران و بۆتان
لە سایەی ئەم کتێبە ناسراوە

لە کوردان غەیری حاجی و شێخی خانی
ئەساسی نەزمی کوردی دانەناوە[34]

حاجی قادرێ ئەڤ دهۆزانا ژۆریدا بپەشکەرایی دبێژیت :
« سەخمەراتی مەم و زینا خانی ملەتێ کورد لکوردستانێ ئو ژدەرڤە ناڤدار بویە ئو هاتیە نیاسین . سەرێ ملەتێ کورد ژی بخانی ئو

(34) رۆژناما « کردستان » ، هەژمار ـ ( ٣ ) ، پێنج شەمبی ، ٢٨ ذو الحجە ١٣١٥ ، ١٣١٤/٥/١٧ .

مەم و زینا خانێ دناڤ مللەتاندا بلندە » .

دیسا سەیدایێ نەمـــر هەرەکول عەزیزان دهەژمارا ( ٣٣ ) ێ ژکوڤارا هاوارا سالا نەهێ (٩)[٣٥] دبن ڤێ مانشێتێ : « کلاسیکێن مە » . ڤان بیر و را لسەر سەیدایێ خانیێ نەمر دبەرپەرێ (٩)ێ دبێژیت : مەلا جامێ دەر حەقێ مەولانا جلال‌الدین رۆمێ ئو کتێبا وی « مثنوی »دا گۆتی‌یە :

من چە گویم وصفی آن عالی جنـاب
نیسـت پیغمـــبر وەلی دارەد کتاب

یانی : ئەز دەر حەقێ وی عالی جەنابی ئەنـکو پەییسکبلنـدی چ بێژم ؛ نەپێغەمبەرە ، لێ کتێبا وی هـەیە . ئـــەڤ پەسنەکا بلند و هێژایە ئـــو بەر ئاوایی لبەژنا مەولانا تێت ، ئانـکو بکێیرهاتی‌یە پێڤە بێتە گۆتن .

بەلێ دحەقی ئەحمەدێ خانێ ئو کتێبا مەم و زینێدا بـەن بە ئانـکو بەزرا من مروف دکارە ـ دشێت ـ ژی بێتر ژی ببێژە ، بەلێ خانێ خودان کتێبە بەلێ خانێ پێغەمبەرە ژی ؛ پێغەمبەرێ دیانەتـا مللی‌یە پێغەمبەرێ ئولا مە یا نژادین[٣٦] . پاشی گۆتی‌یـە ؛ خانـێ

(٣٥) « هاوار » ، هەژمار ٣٣ ، ١٩٤١ .

(٣٦) سەیدایی عەلائەدین سەجادی لسەر سەیدایێ خانیێ نەمر نفیسییە گۆتییە : پێغەمبەرێ هوزانا مللی ئو چیرۆکێ لجهێ بایەزیدێدا سەرۆکانی‌یا ئەدەبێ=

ددەراڤەكێ وەسادا رابوٚكو بەری نهو بسیسەد و نەھ سالان (٣٠٩)؛ نەكو لـكوردستانێ یان لرۆژهەلاتا ناڤین و ناڤەراست؛ لێ لئەوروپای ژی خەلك هێژ لمللەت و لنەژادێ خو هشیار نەبوٚن، خـورت و زەلامێت ژمللەتەكێ هەڤ و دوٚ (ئێـــكو دوٚ) ژبو كاسولیكتی ـ (كاسولیكتی) ئان پروتستانتی دكـوژتن. دوی وەخـــتی ئو دوی هەیامیدا، خانێ بیرا كوردینییا خـوٚ دكر؛ دگوٚتە كوردان: بـەری هەر تشتی هوٚن كوردن؛ رابن سەرخو، دەولەتەكا كوردی چێكن، نەكەڤن بن دەستێ مللەتێت دی. بەلێ كەسێ ببانگێ خانێ نڤێـــژ نەدكر، ئانكو كەسێ داخازا وی خاستی بجهنەدئینا؛ ژبەركو ئـەو تشتێت خانێ دخازتن، ئەو گوٚتن و ئاخفتن و پەیـڤ و شـورێت خانێدكرن بیرنەدبرن ئانـكو دمەغزێ واندا نەدچـوٚن. ئەو دمەغـز نەچوٚنە وەكی هـــەر مروڤێ مەزن یا هەر هەلـكەفتییەكی یاـــژی پێغەمبەرێ بەرێ وەختی هاتبت. خانیێ نەمر ژی بەری وەختێ خو هاتبوٚ، وەختێ وی ئانكو چەرخێ ئەو تێدا ژی یا هاتی، مللەتێ وی ئەو سەهنەكربوٚ ئانـكو دوی نەگەهشتبوٚ كا وی چ دڤێـــت، داخازێت وي ژزانین و ســـەنتا رەوشەنبیری ئو كولتوٚرێ كـوردا بلندتربوٚ. گـاڤا خانێ بەرەڤانییا مللەت، نەژاد و وەلاتێ خوٚ دكر،

═ كوردێ ئو باوەرییا كوردێ زكوردا خانیيه، برێڤـه: علاءالدین سجادی، مێژووی ئەدەبی كوردێ، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٧١، بەرپەر ٢١٤.

وەلاتی یێت وی کو کوردن هزرا وان کار و تشتێت دی بتو . پاشی دبێژیت : هەکە مەگۆت کو خانی وەکی هەمی مروڤێت مەزن و سازکەران و هەر پێغەمبەرێ بەرێ وەختێ خو هاتیە ! ماکەلو وەلێ ( وەسا ) یە ؟! ئان ئەوێ دوەختێ خوەدا تێن تۆڤی بئەردی وەردکەن . ئەڤ تۆڤە یێ بئەردی وەرکری هەتا شین دبیت ، هەیامەکێ درێژ دبن ئەردیڤە دمینت . بەلێ هەنە دبێژن بەری وەختێ خو هاتنە . تۆڤێ سەیدایێ خانێ ئەڤە سێسەد سالن دبن ئەردێ دایە ما هێژ دەمێ شینبینیێیا وی نەهاتییە ؟!

ئەڤە چەند سالن زەڤیا خانی توڤ کری دبن جهاندا دەست بشینبونیێ کرییە ، ئانکو داخاز و ئارمانجێت خانی بو دخەبتی بەرە بەرە مللەتێ کوردییێ بو دچت . ژڤان بیر و رایێت زانایێ کوردێ ناڤدار میر جەلادەت بەدرخان یێ نەمر دیار و خویا دبت کو سەیدایێ خانی پێغەمبەرێ بیر و رایێت نەشتی ، نەژادی ، وەلاتپاریزی ئو کورد پەروەرییە . کتێبا وی ژی وەکی هەمی هەلکەفتێت جیهانی مەم و زینە .

سەیدایێ تۆرڤان و هۆزانڤانێ ژیهاتی ئو هێژا ، ئەڤیندار و شەیدایێ بیر و رایێت سەیدایێ خانیێ نەمر ، سەیدایێ کوردێ موکریێزار ناڤدار و سەرگەردان و بەلەنگاز عبدولرەحمان هەژار یێ کو چەند سالا کەریاریێ ئو خو وەستاندی هەتاکو مەم و زینا خانی بڤەهاندن و لێك ئینان وەرگێرایە سەر زارێ شرینێ کوردێ موکریاتی

دبێژیت : « سەیدایێ خانیێ نەمر ، نە هۆزانڤانەك و تۆرڤانەك و زانایەکە وەکو هەمی هۆزانڤان و تۆرڤان و زانایێت دی یێت کورد ، بەلێ هەلکەفتیەکێ ئێکانەیە ( یەکانە ) ، بەڤلێت وی دکێمن ، ژبەرکو ئەو موعجزەکە ژموعجزان . پاشی دبێژیت : « خانیێ نەمر پێغەمبەرێ ئاخفتنێت ڤەماندییە . خانی ئافرەتوین و بلیمەتێ کوردانە . خانی ئالا هەلگرێ ئازادییا کوردستانێیە . کوردستانا گدیانەکێ (رۆلەیەکێ) وەکی خانی خو تێ ـ وەراندی ، سەخبێر و خودانکری ، هەتا کو مەزنکری ؛ د بن سیبەرا شور و ئامۆژگاریێت وی دی هەر ڤەحەوێت و هەتا هەتا دلێ مینت نامرت . نەمری بو خانی ، ژبەرکو ناڤێ کورد و کورستانێ بلندکرییە ؛ خۆشی ئو شادی ژبو کوردستانێ ژبەرکو کوژ و خورتێت ژێهاتی ، هێژا ئوبەرکەڤتی وەکی خانی خودانکرینە ، هەتا کو بسپورکرینە بوینە پەلیڤان وناڤدار » .

پاشی سەیدایێ هەژار لسەر مەم وزینا خانی تاخڤیت دبێژیت : « مەم و زینا ئەحمەدێ خانی بەهەشتەکا دەرگەهـ گرتی ئو داێخستییە چونکی هەتا نهو ڤێ گاڤێ ژی هێژ نەهاتیە دیتن بدرستی ؛ لسەر نەهاتیە ئاخفتن و وەسفا وێ نەهاتیە کرن ، ژبەرکو هێژ چو فەلووەرا ( موکتەشفا ) ژفلووەرێت بێرەوەر وەسا بشەهرەزایی ئو پوسپورانە تێدا نەگەریانە ، هەروەکی گەرەك و پێتڤییە ، هویرك ئو لسەر خو بەرێ خو بدەتێ ئو هزرێت خو تێدا بکەت کو ئەو بهزاران مەیەوێت خۆش و شرین ؛ بسەد هزار گولێت رەنگین یێت کو

لباخچەیێ خانێ هلدایی ئو شین بویی تام کەتیێ ، بێهنا وان هەلمرویسیت ، دزنوی باش بو دیار و خویا بت کو مەیەوێت بەهەشتا سوزدایی ئو گولێت وێ نەچارن هەڤبەری بەرهەمێت (بزیارێت) خانێ ئو بەرێ‌مەژی ئو مەژکوتکێ وی دتەحلین، دژویق و بێ بێهنی و بێ خەمل و رەوشەن بدنە قەلەمی» ، پاشی سەیدایێ هەژار دبێژیت : « مەم وزینا ئەحمەدێ خانێ دەریایەکا بسەهم و پر پێلە ؛ بەلێ هەمی خێز وزیقرەبەر وخیزکێ وێ یێ‌بن دەریایێ ئو هەر چار کنارێت وێ ، هەمی بجارەکێ دوڕ و مراری ئو مەرجانن . ژبەر ڤێ یەکێ هەمی کەس نەژێهاتی ئو بکێرهاتی‌نە کو بشێن بدنە وێ دەریایا وەسا بسەهم و پێل خوڕت و بلند . مەلەڤانێت ئێکجار شەهرەزا ، زانا ئو بوسپور پێ‌ڤی‌نە هەبن کو وەسا بکار و بزاڤین بشێن ژوان پێلێت بلند یێت کو شلقێت مەزن تێخنە روێ ئاڤێ دەرباز ببن ولهەمی جهێت کویر و مەنداڤ بگەڕن . ئەڤە ژی بهەمی کەسانڤە ناهێت ، ژبلی وان نەبن یێت کو بشێن دەمەکێ درێژ بێهنا خو بەنەڤە . ئەڤ جۆرە کەسەنە نەزۆرن کو بوی کاری رابن[٣٧] » .

پاشی چەند را و بیرێت زانایێت کورد و بیانیان ، ژ هۆزانڤان و زانا ئو رەوشەنبیران لسەر خانیێ نەمر ، ئەز بکەرمك و

(٣٧) ئەڤ بیر و رایەنە بەرسڤا چەند پرسیارا بوون ، یێت من ژ سەیدایێ هەژار کرین سالا ( ١٩٦٨ )ێ ، کو بخەتێ خوّ بوّ من نڤیسین خودێ کاری وی راست بێت .

پێ تڤی دزانم ، ڤێ پرسیارێ بکەم ولدوی زانینا خو بەرسڤا وێ بەرسڤا وێ بدەم : گەلو سەیدایێ خانێ یێ ئەمر ، رێبەر و سەرکێش و سازکەرێ راستێ بێ بەڤلێ کوردانە زێدەبار دچاخو دەمێ خودا ئانکو دسەدێ هەڤدێ ژدایبوینیا عیسا پێغەمبەر ئو بکێرهاتێ ، ژێ هاتێ ئو بەرکەڤتنیە ببتە ' سەروکێ تۆژڤان ، هۆزانڤان و خویندەڤانێت کوردان ؟

بەرزا من بەرسڤا ڤێ پرسیارێ بناوایەك و چیشنەکێ زانستێ یا دانایێ ژبو خو دویر ئێخستن ژپشتەگرتن و پشتەڤانیەکا ژخو ئو یا بێ ئەگەر ئانکو بەلگە ، داکو وان هزر و بیرا نرخەك و بهایەکێ زانستێ و زانیارێ بوبێتە دانان و ژبنیات و بنگەهێ زانستێ پێراست بیت ، کو رێ ژبۆ ڤینك لێ ئێنانێ ئانکو (رەخنەگرێ) ژی ، ژێ بێتە برین . بەن وەرە هەر وەکێ کولتور وتۆرێ جیهان دڤێت ؛ کێشانەك ، پیڤانەك ؛ سەنگ و هەلسەنگراندنەك هەبت ؛ کو بسەنگ و پارسەنگێت بو کێشانێ دترازێدا داتنن شوینەوارو بریاربن ئانکو بەرهەم و بەرێ دەست و مەژێ زانا ، دانا ئو رەوشەنبیرێت کورد بیت بوان سەنگان بکێشن . خەبات و بزاڤ ، کار وکریارێت هەر ئێکێ ژوان بپیڤەرەکێ بێتە پیڤان . هەرچێ ژهەمیا بسەنگتر و بنرختر بت ئەو دێ بتە سەرکێش و سەرهۆستا . بەلێ دیسا ئەو پیڤان و کێشان و سەنگە جهێ پسیارکرنێنە : گەلو رەنگە هەمی کەس نەبوێ

کێشان و وێ پیڤانێ ، ئەڤێ بوان سەنگ و وان پارسەنگان قایل نەبن ؛ ژبەرکو ژ گەلەك لاڤە دتێڤەل و دجودانە ، چ ژلایێ ئاراستەیێ خویندەڤانیی ڤە بکری یان ، ژلایێ هەست و هش و بیران یان ژی ژلایێ ڤیان و نەڤیانا ئانکو پەسندکرن و نەپەسندکرنا بەر و بەرهەمان .

بێگومان ئەڤ پرسیارە دجهێ خودایە بێتە کرن ؛ گەلو لدوی پیڤان و کێشان ، سەنگ و پارسەنگێت جیهانی دڤیتن بچن کو هەمی مللەت بێ جوداییێ لسەر دچن ؛ یان ژی لدوی سەنگ ، پیڤان و کێشانێت دەستەکەکا تێرڤان و هێزانڤان ، زانا و رەوشەنبیرێت کورد دانن کو . جهێ باوەرێنە بچن ؟! بێ گومان مللەتێ کورد ژی دڤیت پیڤان و کیشان ، سەنگ و پارسەنگێت :

١ — جیهانیێ پەسندبکەن . بەلێ ئەز وەسا دبینم و باوەریێ پێ تینم ، سەنگو و پارسەنگا ژهەمیا بسەنگتر و گرانتر بو وان هش و بیران بو وی بەر و بەرهەمێ رەوشەنبیر و زانایێ کورد بێتە دانان یێ کو مەژی مەژکوتك (مەغز و مەژی) هزر و بیر و را ئو قەلەمێ خو ژبو مللەتێ خو یێ کوردێ بێسەمیان و سەرگردان[٣٨] . ژبو دەرمانکرنا ئێش و کول دەرد و ئازارێت ، جڤاکی (کۆمەلایەتی) ، ئەبوریێ ، یا نەخویندەڤانیێ . هەر وەسا ژبو نەهێلانا کەند و

(٣٨) ئەڤ توخمە کەسە ژبو مرۆڤێ ئو مرۆڤانیێ دخەبتن کو سەنگا گرانێ یا جیهانییە .

کور ، گێزم و ئاستەنگێت درێژکا پێشڤەچوونا مللەتێ وی یێ کورد ، کو بنەهێلانا وان ڤەهێلکان ریکا راست یا وەکی دەشت و لەیلانا لبەر مللەتێ کوردێ پاشکەڤتی بێتە ڤەکرن کو تێرا بچیت بگەهیتە خوزی ، دارخاز و ئارمانجێت خو ؛ ئەو هش و بیر و را ئو قەلەم ژبو وێ چەندێ تەرخانکربن .

٢ــ سەنگا دووێ ( دوەهەمین ) ، سەنگا بەر و بەرهەم و شوینەوارێت هەر زانا ئو رەوشەنبیرەکێ کورد پاش خوڤە بو مللەتێ خو ئو بومرووڤاتیێ پاشخوڤە هێلانیە ، نەمازە وان بەر و بەرهەمێت کو چ گرفتاریەکا بەرهنگاری مللەتێ کورد بوی ، بو روهن و خویا ئو چارەسەر بکەت ، یان ژی رێکا ژێ قورتالبوینێ داتە بەر چاڤ ، چ ژی ئێش و دەرد ، چ نەخوشیێت جڤاکی ئو مللێ پێ بێنە دەرمانکرن و پێ هاتینە دەرمانکرنێ .

٣ــ سەنگا سێ بجن وەرە سەنگا تازەیێ ، سپەهیاتیێ ، جوانیێ ئــو رندیێ ئو لەوەندیێ ئو کەلەشیێ‌یا بەرو بەرهەم و شوینەوارانە دڤەوارەك و دخزکەك و پەروازەکێ تورێ ئو تورڤانیێدا ، کو بریتیە ژسەنگا دارێژتنا بابەتی چ پروس ( پەخشان ) یان هوزان بت دقەوارەکێ تورڤانی‌یا بەرکەڤتی‌دا ؛ سەنگا ئێکاتی‌یا رامان و پەژنان ، هزر و بیران ، سەنگا ئاشوێا ( ئەندیشەیا ) فرەهو داڤەگەر ، سەنگا وەکی ئێکیا لێك ئینانێت شەنگ و دجهێ خودابن و گەلەپەرن ( تەبیعی ) نە :

هەکە ئەم ڤان سەنگ پارسەنگا دترازیەکێدا دانین و بەر و بەرهەم و شـوینەوارێت کەنکەنە ، فێهرس و هەلـکەفتیێت مللەتێ کورد لبەر بکێشین ، دێ بینین کو سەنگا ســەیدایێ خانیێ نەمر بەزرا من ژهەمیا دێ‌گرانتر و بسەنـگتر بیت . چو کەس ژزانا ئو رەوشەنبیرێت کورد دوارگەهێ خانێ تێدا دژی دوێ ئالۆزێ ئو تەنـگاڤیێدا هـەتا نهو ڤێ گاڤێ ژی نەگەهشتینە پەییسك و پایێ خانـێ دسەدێ هەڤدێدا گەهشتێ ، ژبەرکو هەکە هاتو ئەم لدوی ســەنگا ژۆری یاکو مەدانای بو هەڤبەکرنێ چوین ؛ کو سەنـگا گرانتر بو وی زانایی یا رەوشەنبیرێ کورد یێ ، هش و بیر ، مەژی ئو هەمی بزاڤا خو یا زانستێ ژبو مللەتێ خویێ کورد تەرخانـکری ئو درێـکا پێشڤەبرن و پێشڤەچوونا وی مەزخاندی‌یە ؛ دێ بینین کو سەیدایێ ئەحمەدێ خانێ نەکو لپشیا هەمیانە ، بەراهی ئو سەرکێشێ گشـکانە ؛ لێ بەلێ بێ گومانە کو ئەفراندەر و فیلووەرێ بیر و را ئو باوەرێت مللی ، نڤشی ئو نەژادی‌یە لـکوردستانە . هــەر ژبەر هندێ‌یە ژی ، ناڤ و دەنـگێ وی ژهەمی زانا و خوینــدەڤانێت کوردانە پێتر بەلاڤ بویە نەکو لـکوردستانە بەلێ لوەلاتێت جیهانە . هەر ژبەر هنـدێ‌بە ژی ماڵێ خانێ بلێ هوزانڤانێت مللەتپەروەرڤە لژۆژهــەلاتا ناڤین و ناڤەڕاست گرێدایە ئو لرێزا وان دانایە ، کو هەڤبەری فردەوسێ یێ ئیرانێ ، روستاڤیلێ بێ گورجی‌بە(۳۹) ئەف

(۳۹) م. ب: رۆدینکۆ ، سەرچاوەی ناوبراو ، ( پێشکۆتنارا قەناتێ کوردۆ ) ، ب ب ۳۳ ، رێزا ( ۸ )ێ .

راستى‌يه ئانكو مللەت‌پەروەرى‌يە وەكى رۆژا نيڤرو روهنـە ددیباجا مەم وزينـــا خانىٖدا ، تو خو دبێژى وێنـەكێ فوتوگرافى‌يە بێ كورد و كوردستانێ ڤان لايێت ژێرى ژێ چاك ئەشكەرا دكەت :ـ

١ ــ ئەگەرێت ڤەمان ، پاشكەڤتن ، بندەستى و بەنى‌يا (ديلى‌يا) مللەتێ كورد وەكى نەيينكێ روهنكرى‌يە ، ژلێك كەڤتن ، بەرهنگارىٖ ئێكبوين و هەڤزويشى ســــەرێ ئێكو دوَ ( هەڤدى ) بوينا كوردا دناڤبەرا خودا ؛ ژبەرێك نەدانانا ئێـكى بو بێ دى ، بەروڤاژى وێ چەندێ بدرستى بو بيانيان ، بو دوژمن و نەياران بوينـە بەندە ئو بەنى ، كو ئەڤەيە بێ‌گومان دەردێ بێ دەرمانێ كوردا ، ئەو دەردێ بتۆيە كۆڤانـ دجەرگێ مللەتێ كورددا ، بچو دوختور و لوقمانا ڤەناهێت چارەسەيەكێ لێ بكەن . سـەيدايێ خانىٖ ژهناڤ وجەرگ سوتنى‌يا خو دكەتە هەوار دبێژيت :

ئەز مامـــە دحكمەتا خودێ‌دا
كرمانج ددەولـــەتا دنێ‌دا

ئايا ب چ وەجه مانە مەحروَم
بالجملة ژبو چ بونه مەحكوَم

ئەڤ رۆم و عەجەم بوان حسارن
كرمانج هـەمى لچار كنارن

هەر دوَ تەرەڤان قەبيلى كرمانج
بو تيرى قـــەزا كرينه ئارمانج

ئەڤ قولزمی رۆم و بەحری تاجیك
هندی کو دکن خروج و تەحریك

کرمانج دبن بخوێن مولەتەخ
وان ژێکڤە دکەن مثالی بەرزەخ

لەو پێکڤە هەمیشە بێ تفاقن
دائـم بتەمەرود و شقاقن

٢— سەیدایێ خانی یێ نەمر نەکو هەر بتنێ ئێش و دەرد ، کول و کۆڤانێت مللەتێ کورد لبەر چاڤان دانایـنە ئو بەس ؛ بەلێ وەکی هەمی خەمخۆر و خەمهەلگرێت مللەتان و پشتەڤانێت وان ، سازکەر و راستکورمەندان دەرمانێت نوژداری بو ئێش و کول و دەردان ، بو کۆڤانان وەکی حەکیم و لوقمان داتنن کو هەر هـادر پێ ساخبین وەسا دانایـنە . دەرمانێ نوژداری یێ کو هەمی ئێش و کول ودەردێت مللەتێ کورد پێ ساخدینە ڤە ، یێ خانیێ لوقمان بو دانای ، ئێکدلی ئو ئێکبوینتی‌یە دین سەروکاتی ئو سەرکیشی ئو سەروەری‌یا ژێهاتی ئوبکێیرهاتیەکێ پێش کێش و دلسۆز ، جامێر و لسەر خو ئو دویربینڤە . هەکە هاتو مللەتێ کورد بو ئێك دبن سەرکیشی ئو سەروەری‌یا رێبەرەکێ کورد پەروەردا ، هەر دجهدا رێکا سەربەستی ئو ئازادیێ ، رێکا سەربخویتی ئو گەردەن ئازایێ دێ بو ڤەبت ؛ هەکە گرت و تێژا چو ؛ وەکی هەمی مللەتێت جیهان دێ بتە خو

کەرێ خو سەر ؛ نەکەس دسەردا ، نەژی دبەردا دبت . لەوا ژی خانی گوتی یە :

گەر دێ هەبووا مە سەرفەرازەك
صاحب کەرەمەك سخەن نەوازەك
نەقدێ مە دبو بسکە مەسکوك
نەدما وەهە بێ رەواج و مەشکوك
گەر دێ هەبووا مە پادشاهەك
لائق بدیا خودێ کولاهەك
تەعیین ببویا ( ببوا ) ژبو وی تەختەك
زاهر ڤەدبو ژبومە بەختەك
حاسل ببویا ( ببوا ) ژبو وی تاجەك
ئەلبەتە دبو مەژی رەواجەك
خەمخۆرتی دکر لمە یەتیمان
تینانە دەرێ ژدەست لەئیمان

بەلی سەیدایێ خانی پێ نەبیت هەرلهندێ راوەستابت و رێکا گەهشتنا وێ دارخاز و ئارمانجێ لبەر مللەتێ کورد روهن نەکربت ؛ نەخێر خانی ئەو رێ یاکو کورد دڤێت بگرن تێدا بچن و ژێ دەرنەکەڤن روهن و خویاکریە گوتی یە :ـ

هەرچی برە شیری ددەست همەت
زەبتکر ژخـوەرا بمەردی دەولەت

لەورا کو جیهـان وەکی عەروسـە
وێ حکم ددەسـت شیری رۆسـە

پرسی ژدنێ من ئـەو بحکمەت
مهرا تە چ، گۆتە من کو همەت

٣ــ پاشی خانیێ نەمر رێنیشا ملەتێ کورد دایە، راست و راسـت، بێ چەپ و چوێر، دەرمانێ دەرمانکرنا نەخوشیێت جڤـاکی یێت بەرهنـگاری ملەتێ کورد بوین ژنەڕا بەڕا بوییێ کو بێ هێز و ڤەژەن بوینی وەکی پسپۆرەکێ وان دەرمانا لبـەر چاڤان دادنیت کو پێ بێنە دەرمانـکرنێ دبێژیت :

گـەر دێ هەبووا مـە ئتفاقەك
ڤێکرا بکرا مـە ئنقیادەك

رۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی
هەمیان ژمەرا دکر غولامی

تەکمیل دکر مە دین و دەولەت
تەحسیل دکر مـە علم و حکمەت

تەمیز دبوون ژهـەف مەقالات
مومتاز دبوون خودان کەمالات

دیسا سەیدایێ خانی هندی چاڤێ خو گێرایە ، هەر وەکی دیارە ، کەسێ وەسا یێ‌کو بکێر بێت بچاف نەکەفتی‌یە کو کارێ سەرکێشی ئو رێبوریا مللەتێ کورد پێ رابسپێرن لەوا گوتی یە :

گەر دێ هەبووا مەژی خودانەك
عالی کەرەمەك لەتیفە ( لطیف ) دانەك
علم و هنەر و کەمال و ئیزعان
شیعر و غەزەل و کتێب ( کتاب ) و دیوان

هەکە هاتو خودان کەرەمەك لمللەتێ کورد بو خودان ؛ وی دەمی و چاخێ ، ئەز دا گوتن و ئاخفتنێت ڤەهاندی هند بلندکەم کو ناڤێ کوردا لچار کنارێت جیهان بەلاف ببیت و دەنگ ڤەدەت ؛ زبەر ڤێ یەکێ دبێژیت :

من دێ عەلەما ( علما ) کەلامی مەوزوَن
عالی بکرا لبان گەردوَن
بیناڤە رحا مەلێ جزیرێ
پێ حەی بکرا عەلی حەریرێ
کەیفەك وە بدا فەقیهی تەیران
هەتا بئەبەد بمایە حەیران

هەکە ژلایێ تازەیێ ، سپەهیاتیێ ، جوانێ ئو رندیێ ، لەوەندی و کەلەشیا بەر و بەرهەم و شوینەوارانڤە ژی بیت کو دقەوارەك و دپەروازەکێ

تۆری ئو تۆرڤانییێدا بەرێ خو بدەینێ ، ئـەو بەرهەم ﭺ هۆزان یان ژی پروس (پەخشان) بن ؛ دیسا سەیدایێ خانیێ نەمر وەکی هەمی هۆزاڤان ، تۆرڤان ئو زانایێت چاخ و دەمێ خو بویە هەکە زوان چێتر ژی نەبیت دهۆزان ڤەهاندن دارێژتن ؛ لێـك ئینان وێ خستنە بەرێـکا گۆتن و ئاخڤتن و پەیڤێت دلڤەکەر و سازگار و رێزکرنا وان نەمازە یێت کو بئەڤینێ ئو ئەڤینداریێ ، ببەژن و بالا ، ببسـك و خالا ، بگەردەن کێـــل و چاڤ بەلەك و کالان ؛ کو چێترین و سپەهیترین و پەیڤسکبلندترین نمونە ئونیشانە (بەلـگە) مەم و زینا رەنگینا خانی‌یە یاکو زانایێت کورد و بیانی بتێـکرایی لسەر ڤێ بیر و رایێنە کو بلندترین بەرهەمی تۆرێ کوردێ کلاسیکی‌یە. ژبلی هژمارەکا هۆزانێت سەیدایێ خانێ بئەڤینێ ڤەهاندین کو دکەڤنە کەشکۆل و فەروزێت کەڤنە کتێبانداا بدەست دکەڤن وەکی هوزانڤانێت بـــەری خانێ ، ژعەلی حەریرێ ، جزیرێ ، فەقێ تەیران و باتەیێ بگری هەتا کو دگەهیە یێت پاشی وی وەکی ئیسماییل بایەزیدێ ، مراد خانێ بایەزیدێ پەرتو هەکارێ ئو بەکر بەگێ ئەرزێ. بـەلێ مخابن چەندەك ژێ نەبن یێت دکەشکولادا هاتینە نڤیسین ، مانە ئەویت دی هــــەمی نەماینە. بو نمونە ئـــەڤێ هۆزانا ژێری یاکو ژکەشکولێ سەیدایێ زانست و تۆرڤان مەسعوود حاجێ مستەفا ئامێدێ بو من لبەر نڤیسی کو چەندەك ژێ دمـــەم زینا سەیدایێ گیوی موکریانێ سالا (١٩٦٨)ێ‌دا چاپکری هاتبو بەلاڤکرن ، دێ هەمیێ

دانینە بەرچاڤێت خوێندەڤانان بدرستی :

ئەز چۆمە باغێ سور گولان
وەختێ سەحەر گاهێ بخەف

من دێ سەدایا بلبلان
داگرتبون هەر چار تەرەف

سەوتا هەزار و قومریان
دەنگێ رەباب و موغنیان

تەشبیهی بەزما بەنگیان
هو دەنگ هو بون چەنگ و دەف*

مانەندی مەست و سەرخوەشان
ئەز چۆمە بەزما مەهوەشان

ئەبرو کەمان و چاڤ رەشان
جەرگ و دلێ من کر هەدەف

پەیکان دجەرگێ دل بەری
تەنبویە سندوقا بەری

سەددەق ژحوسنت ئەی پەری
هێژا لمن بو کەرب و گەف

---

* یان : تەشبیهی بەزما بەنگیان    هەف دەنگی هەف بون چەنگ و دەف .

